| | | |
|---|---|---|
| سرشناسه | : | اردبیلی، محمدبن عبدالغنی، - ۶۴۷ق. |
| عنوان قراردادی | : | شەرحی «الانموذج» بە کوردی.شرح، کردی |
| عنوان و نام پدیدآور | : | شرح‌الانموذج فی‌النحو/ تالیف جمال‌الدین‌محمدبن‌عبدالغنی‌الاردبیلی؛ شرح، کامەران سەلام ڕەسوول هەرووتی . |
| مشخصات نشر | | سنندج : کردستان، ١٤٠٢ |
| مشخصات ظاهری | | ٣٦٠ص. |
| شابک | | ٩٧٨-٩٦٤-٩٨٠-٤٩٥-٨ |
| وضعیت فهرست نویسی | | فیپا |
| یادداشت | | زبان کردی. |
| یادداشت | | کتاب حاضر شرحی بر " الانموزج فی‌النحو " که خود برگزیده و تلخیصی از " المفصل " تالیف زمخشری است. |
| یادداشت | | کتابنامه : ص. ۳۵۰ - ۳۵۵ ؛ همچنین به صورت زیرنویس. |
| موضوع | | زمخشری، محمودبن عمر، ۴۶۷ - ۵۳۸ق . الانموزج فی‌النحو - نقد و تفسیر |
| موضوع | | زمخشری، محمودبن عمر، ۴۶۷ - ۵۳۸ق . المفصل-- نقد و تفسیر |
| موضوع | | زبان عربی -- نحو<br>Arabic language -- Syntax |
| شناسه افزوده | | سلام رسول هروتی، کامران، ١٩٨٤- |
| شناسه افزوده | | زمخشری، محمودبن عمر، ۴۶۷ - ۵۳۸ق . الانموذج فی‌النحو . شرح |
| شناسه افزوده | | زمخشری، محمودبن عمر، ۴۶۷ - ۵۳۸ق. المفصل |
| رده بندی کنگره | | PJ۶۱۵۱ |
| رده بندی دیویی | | ۴۹۲/۷۵ |
| شماره کتابشناسی ملی | | ۸۵۲۳۵۵۴ |
| اطلاعات رکورد کتابشناسی | | فاپا |

# شەڕحی

# «الأنموذج»ـی

عەللامە «جارالله الزّمخشري»

## بە کوردی

دانراوی:

«محمد عبدالغني الأردبيلي»

ڕوونکردنەوەی:

م.کامەران سەلام ڕەسوول هەرووتی

پێداچوونەوەی:

پ. دکتۆر جەمیل عەلی سورچی
دکتۆر مادح بەرزێوەیی




سـنـه




# شەرحی «الأنموذج» بە کوردی

## بەرگی (١)


| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | شەرحی «الأنموذج» بە کوردی |
| ✓ دانەر (نویسنده): | جارالله الزّمخشري - محمد عبدالغني الأردبيلي |
| ✓ لێکدانەوە (شرح و تحقیق): | م. کامەران سەلام ڕەسوول هەرووتی |
| ✓ پێداچوونەوە (بازخوانی): | دکتۆر جەمیل عەلی سورچی - دکتۆر مادح بەرزێوەیی |
| ✓ دیزاین و هەڵەگری بەشی کوردی (صفحه‌آرایی و ویراستاری قسمت کوردی): | مەلا ڕەفیق ڕۆستەمی |
| ✓ کەڕەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول) / ١٤٠٢ ش ٢٠٢٣ ز |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ١٠٠٠ بەرگ (جلد) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕە و قەوارە (تعداد صفحات): | ٣٧٢ لاپەڕە (صفحەی وزیری) |
| ✓ دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کُردستان) |
| ✓ شابك: | ٨ - ٤٩٥ - ٩٨٠ - ٩٦٤ - ٩٧٨ |





سنندج ـ چهارراه شهدا ـ پاساژ عزّتی ـ انتشارات کُردستان ـ تلفن: ٠٨٧٣٣١٦٥٣٨٢

سنە ـ پاسازی عیزەتی ـ بڵاوکردنەوەی کوردستان ـ تەلەفوون: ٣٣١٦٥٣٨٢ ٨٧ ٩٨+

# ناوەرۆک

## ئەی قوتابی ڕێزدار و خۆشەویست

بۆ فێربوونی زانستی «نَحو» و تێگەیشتنی ئەم کتێبە بە تەنها پشت بە زانستی خۆت مەبەستە، بەڵکو پێویستە لە خزمەت مامۆستایەکی شارەزا لە زانستە ئالییەکان ئەم کتێبە وانە لە دوای وانە بخوێنی و یاسا و «قَاعِدَة»ـەکان دەرخ بکەیت و ڕۆژانە «مُراجَعَة»یان بکەیتەوە، چونکە وەکوو گوتراوە «إِنَّماَ الْعِلْمُ بِالتَّعَلُّمِ» چونکە هێندێك بابەت هەن لێرەدا زۆر بە کورتی ئاماژەیان پێ کراوە بۆیە پێویستە بە تەنها پشت بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە نەبەستیت.

# پشتگیری و پەسندنامەی یەکەم

زانستی «نحو» زانستێکی زۆر گرنگ و پێویستە بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی و تێگەیشتن لە دەقەکانی قورئانی پیرۆز و فەرمایشتەکانی پێغەمبەرمان -دروودی خوای لەسەر بێت-، وە هەروەها بۆ تێگەیشتن لە دەقی پەرتووکەکان کە بە زمانی عەرەبی نووسراون، بە تایبەت بۆ مامۆستایانی ئایینی کە پێویستە ئەم زانستە زۆر بە چاکی بزانن، بۆ ئەوەی جوانتر و باشتر لە پەرتووك و دەقی زانایانمان تێبگەن و بتوانن ڕاڤەی دروست بۆ نووسینەکان بکەن، زانایانمان لە کۆنەوە -بە تایبەت لە نێو کوردستان- زۆر باش لەم ڕاستییە تێگەیشتوون، لەبەر ئەوە دەبینین هەر لە کۆنەوە لە میتۆد و پرۆگرامی نێو حوجرەکان زۆرترین فۆکس و تەرکیز لەسەر زانستە ئالییەکان بووە، وەکوو «النَّحو، الصَّرْف، البَلاغَه، اَلْمَنْطِق...».

وە زانایانی کورد لەم بوارەدا ناوبانگیان دەرکردووە، تا ئەو ڕادەیەی کە زیاتر لە زانا عەرەبەکان لە زانستی «نَحْو» و زانستی «صَرْف» شارەزا و ئاگادارتر بوون، بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییەش زانا چاکەکانی کوردستان بە تەدریس و نووسینی پەراوێز و پەرتووك لەم بوارە باشترین نموونەی ئەم ڕاستییەن، بەڵکوو هەر لە کۆنەوە زاناکانمان کەسانی دانا و ڕۆچوون لەم بوارەدا، وەکوو زانای گەورە ئیبنوحاجبی کوردی خاوەن هەردوو پەرتووکی بە ناوبانگ: «الكافِية فِي عِلْمِ النَّحْوِ، وَالشَّافِية فِي عِلْمِ الصَّرْفِ» کە دەیان شەرحیان لەسەر نووسراوە.

وە یەکێك لەو پەرتووکانەی کە زۆر گرنگی پێدراوە لە حوجرەکانی کوردستان پەرتووکی «شَرْحُ الأُنْمُوذَج»ـە لە زانستی «النَّحْو»دا کە بە شێوازێکی زانستی و مەنهەجیی داڕێژراوە، خاوەن شێوازێکی سەهل و ئاسانە بۆ فێربوونی زانستی «النَّحْو»، وە پڕیەتی لە بڕێکی زۆر زانیاری دەربارەی هەرسێ جۆرەکانی وشە: «اسْم، فِعْل، حَرْف» لە زمانی عەرەبی بە شێوازێکی ئاسان و زانستی.

لەبەر گرنگیی ئەم کتێبە، برای بەڕێزمان مامۆستا «کامران سلام هەروتی» هەڵساوە بە شەرحکردنی ئەم پەرتووکە بە زمانی کوردی و داوای لە من کرد کە پێداچوونەوەی بۆ بکەم، دوای پێداچوونەوەم بۆ شەرح و وەرگێڕانی بەڕێزیان، دڵنیام کە مامۆستا توانیویەتی شەرحێکی ڕاست و جوان و دروست بکات بۆ پەرتووکەکە بە شێوازێکی ڕوون و ئاسان بۆ تێگەیشتن، لەبەر ئەوە پێم وایە ئەم شەرحە شایەنی بە چاپگەیاندنە، چونکە مامۆستایان و فەقێیان سوودی زۆری لێ دەبینن.

وە هیوادارم مامۆستا «کامران سلام رسول» بەردەوام بێت لە خزمەتکردن بە حوجرە و زانستە ئیسلامییەکان لە ڕێگەی وانەگوتنەوە و شەرحکردنی پەرتووکەکانی مەنهەجی حوجرە بە زمانی کوردی، بۆ ئەوەی فەقێیان و ئەهلی عیلم زیاتر بتوانن سوودی لێ وەرگرن.

**لەگەڵ ڕێز و خۆشەویستیم**

**پ. د. جمیل علی رسول سورچی**

**ڕاگری کۆلێژی زانستە ئیسلامییەکان/ زانکۆی سەلاحەدین هەولێر ـ خانزاد**

**٢٠٢٣/٨/١**

# پشتگیری و پەسندنامەی دووەم

بەناوی خوای خودای گەورە و میهربان، سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهان، کە مرۆڤی پاڵاوتە کردووە لە ناو بوونەوەران بە عەقل و زمان، وەزانستی پێ بەخشیوە بە فێربوونی خوێندنەوە و نووسینەوەی زانستەکان بە پێنووسی ڕەوان لە لاپەڕەی تێنووسەکان.

درووود و سەلام بۆ سەر ڕۆحی پاکی سەروەرو گەورەمان، سەردەفتەری پێغەمبەران، تاجی سەری گشت ئەولیا و پیاوچاکان، حەزرەتی «محمد المصطفى»ی پێشڕەوی ئوممەت ـدروودی خوای لەسەر بێت ـ، خاوەنی ڕەوشتی جوان و ڕێنیشاندەری گشت کارە چاکەکان و خاوەنی موعجیزەی قورئان، کە لووتکەی ڕەوانبێژی و سەرچاوەیە بۆ زانستە بەسوودەکان، ئەو قورئانە پیرۆزەی بە زوبانی عەرەبی دابەزیوە بۆ سەر سەردار و خاتەمی پێغەمبەران، سەرچاوەی هیدایەتە و بناغەی شەریعەتە، بۆیە موسوڵمانان خزمەتیان کردووە بە لەبەرکردن و خوێندنەوە و ڕاڤەکردن و سوود وەرگرتن لە زانستەکانی، بۆ جێگیربوونی ئیمان لە ناو دڵان.

بۆ پاراستنی ئەو قورئانە پیرۆزە و چاك خوێندنەوە و تێگەیشتن لە واتا جوانەکانی، پێویستە موسوڵمانان خۆیان فێری زمانی عەرەبی بکەن و شارەزایی پەیدا بکەن لە زانستی نەحو و سەرف، بۆیە گەلی موسوڵمانی کورد لە سەرەتای موسوڵمانبوونی، بە ویستی خۆی خزمەتی زۆری کردووە بە قورئان و زانستەکانی، وە بە هەزاران زانای تێدا هەڵکەوتووە کە شارەزا بووینە لە زانستە شەرعییەکان، وەکوو «ابن صلاح» شارەزووری و «ابن حاجب»ی کوردی، نۆدەهی و بەیتووشی و....

ئەو زانا بەرزانە بە چاوساغی و شارەزایی و لێهاتوویی پەیڕەوییان لە مەزهەبی ئیمامی «شافیعی» لە شەریعەتدا، وە لە عەقیدە و بیروبڕوادا پەیڕەوییان لە عەقیدەی پێشەوا «ئەبولحەسەنی ئەشعەری» کردووە، کە هەمان عەقیدەی ئیسلامی ڕەسەنی پێغەمبەری خۆشەویستمان ـدروودی خوای لەسەر بێت ـ بە یارانی خۆی ڕاگەیاندووە.

زیاتر لە هەزار ساڵە ئەو مەزهەب و عەقیدە لە نێو کوردان باوە، هیچ گرفتێکی نەبووە و میللەتی کورد کێشەی ئایین و مەزهەبی نەبووە، زۆر جوان دینداری

کردووە، مامۆستایانی پێشوو بە دڵسۆزی و ئەمانەت ئەو دینە پاکەیان بۆ میللەتی کورد شی کردۆتەوە، وە بە دەرس و وانە بە فەقێکانی خۆیان گوتیتەوە، بۆیە کوردستان لە سایەی دینداری و نیازپاکی مەلا و فەقێ، دینداریکی میانڕەوی ڕەسەنی هەڵبژاردووە، بۆیە دەبینین هەرچی زانا و دانا و سەرکردە و شاعیر و ئەدیب و پیاوی هەڵکەوتووی هەبووە، هەموویان لەم حوجرانە پێگەیشتوون، حوجرەکانی کوردستان سەرچاوەی زانست و هەستی کوردپەروەری بوونە و هیچ بیروباوەڕێکی نامۆ و توندڕەوی لەم حوجرانە بەرهەم نەهاتووە... چونکە مەنهەجێکی تۆکمە لەم حوجرانە دیراسە کراوە و خەڵکی لە سەرلێشێوان و دڵەڕاوکێ پاراستووە.

وە یەکێك لەو پەرتووکە ڕەسەنانەی کە مەنهەج بووە لە حوجرەکانی کوردستان پەرتووکی «شرح الأنموذج» بووە لە زانستی نەحوی عەرەبی کە فەقێکانی کوردستان لە دێرزمانەوە و تا ئێستا هەر بەردەوامە و پەرتووکێکی زۆر بەسوودە لە بواری خۆیدا، بەڵام بە کوردی نەکرابوو، تا برای بەڕێزمان مامۆستا «کامران سلام هەروتی» دەستی هیممەتی لێ هەڵماڵی و وەری گێڕایە سەر زمانی شیرینی کوردی، بۆ ئەوەی فەقێیەکانی کوردستان لێی سوودمەند بن، کارێکی زۆر چاکی کردووە، وە جوان بەم ئەرکە هەستاوە، خودا جەزای بەخێری بداتەوە، شایستەی ئەوەیە کە بەم شێوەیە بە دەرس بخوێندرێت.

لە سەردەمی ئیمڕۆدا بۆ پاراستنی یەکڕیزی ئایینی و دینداری ڕاستەقینەی ئیسلامی میانڕەو و پاراستنی گەنجەکانمان لە هەموو مەترسییەکی هزری و پاراستنی ئاسایشی نەتەوەییمان، پێویستە بگەڕێینەوە بۆ سەر ئەو مەنهەجە ڕەسەنەی کە لە کوردستان دەخوێندرا و دەبێت پەرەی پێ بدرێت، هیوادارم وەزارەتی ئەوقاف زیاتر بایەخ بە حوجرەکانی کوردستان بدات، چونکە زانستی ڕاستەقینە و بەسوود لەم حوجرانە دەست دەکەوێت، هەروەها ئەم حوجرانە زامنی پاراستنی هزر و ئایینی گەنجەکانمانن و کلیلی پاراستنی ئاسایشی نەتەوە و وڵاتەکەمانن.

«وَصَلَّى اللَّهُ عَلى سيّدنا محمّد وآله وصحبه وَسَلَّمَ»

**د. مادح مەلا محمد بەرزێوەیی**

**٢٠٢٣/٧/١٠م**

# پێشکەشە:

- بە هاوڕێ و برای خۆشەویستم مامۆستا مەلا «عبد الخالق حسن» شیرەیی جوانەمەرگ[1].

- بە دایکی ئازیز و باوکی خۆشەویستم کە منیان کرد بە خزمەتکاری زانست و شەریعەت و بە خوشك و برا بەڕێزەکانم.

- بە هەموو ئەو مامۆستا بەڕێزانەی کە ڕۆژگارێك لە خزمەتیان بەهرەمەند بووم، بەتایبەت مامۆستا «ملا عماد گوانی» و مامۆستا «مەلا فتح اللّٰه» خەلیفانی و مامۆستا «مەلا عبداللّٰه» هەرتەلی و مامۆستا «مەلا جلال» خەیلانی و مامۆستا «بهاءالدین» خەتی»، خوای گەورە پلە و پایەیان بەرزتر بکات.

- بە فەقێ و فێرخوازانی زانستە شەرعییەکان لە هەر شوێنێك بن، بە تایبەت بە فەقێ و قوتابییە بەڕێز و خۆشەویستەکانم.

- بە هاودەم و هاوخەمی ژیانم، هاوسەری خۆشەویستم.

- بە ڕۆڵە و جگەرگۆشەکانم، خوای گەورە لە سایە و سێبەریان کەم نەکات، لەسەر ڕەوشتبەرزی و خواناسی و دینداری تەمەن‌درێژیان بکات.

---

١. مامۆستا «عبدالخالق» لە بەرواری ١٩٧٦/١/٣ لە دایك بووە، خەڵکی گوندی شیرێی دۆڵی بالیسانە، لە قۆناغی خوێندن فەقێیەکی زۆر زیرەك و بیرتیژ بوو، کەسێکی تا بڵێی مەجلیس‌خۆش و ئاوەدان بوو، زۆربەی کتێبەکانی مەنهەجی مەلایەتی تەواوکردبوون، بەداخەوە کە تووشی نەخۆشییەك ببوو یەخەی بەر نەدەدا، من لە مزگەوتی شێخ عومەر بالیسانی دوو دەرسی کتێبی «الأنموذج»م لە خزمەتی خوێندووە و سێ دەرسیشی لەگەڵ گوتوومەتەوە، زۆر جار دەیگوت: ئەگەر لەبەر نەخۆشی نەبوایە ئەم کتێبەم هەموو پێ‌دەگوتیت. مامۆستایەکی زۆر «مُعَلِّم» بوو، من ئێستاش شوێنی دەرسەکانم لە بەرچاون، بەداخەوە لە بەرواری ٢٠٠١/٥/٣م بە هۆی سووتانەوە گیانی لە دەست دا، لە دوای خۆی کوڕێکی بەجێ هێشتووە بە ناوی «سلیمان عبدالخالق»؛ خوای گەورە لە گوناهەکانی ببوورێت و جێگا و مەکانی بەهەشتی نەبڕاوەی پەروەردگار بێت.

# سوپاس و پێزانین

لە سۆنگەی ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێت- کە دەفەرموێت: «لا يَشْكُرُ اللَّهَ مَنْ لا يَشْكُرُ النَّاسَ»[1] واتە: کەسێك شوکرانەی چاکەی خەڵکی نەکات، ئەو کەسە شوکرانەی خوای پەروەردگاریش ناکات، بە پێویستی دەزانم پاش تەواوبوونی ڕوونکردنەوەی ئەم کتێبە نایابەی مامۆستا «جار اللّٰه الزَّمَخشـري» زۆر سوپاسی هەموو ئەو مامۆستا بەرێز و هاوڕێ ئازیزانەم بکەم کە هاوکار و یارمەتیدەرم بوون بۆ تەواوکردنی ئەم کتێبە بە تایبەت:

یەکەم: زۆر سوپاسی مامۆستای مامۆستای بەڕێزو خۆشەویستم مامۆستا «دکتۆر مادح مەلا محمد بەرزێوەیی» بکەم کە پێداچوونەوەی بۆ ئەم کتێبە کرد و بە کۆمەڵێك سەرنج و تێبینی ئەم کارەی جوانتر کرد.

دووەم: هەروەها زۆر سوپاسی مامۆستای ڕێزدار و خۆشەویستم پرۆفیسۆر «د. جمیل علی رسول سورچی» ڕاگری کۆلێژی زانستە ئیسلامییەکانی زانکۆی سەلاحەددینی هەولێر دەکەم کە سەرەڕای سەرقاڵی و کەمدەرفەتی، تەواوی کتێبەکەی خوێندەوە و بە کۆمەڵێك سەرنجی ورد ئەم بەرهەمەی جوانتر کرد، خوای گەورە پاداشتی بداتەوە.

سێیەم: هەروەها زۆر سوپاسی هەردوو برای بەرێز و خۆشەویستم مامۆستا «سیروان مصطفی توتمەیی» و مامۆستا «زیوەر أحمد جۆلەمێرگی» دەکەم کە بە کۆمەڵێك سەرنجی بەنرخ و ڕاستکردنەوەی کۆمەڵێك هەڵەی تاپکردن ئەم بەرهەمەیان دەوڵەمەنتر و جوانتر کرد، خوای گەورە پاداشتی بەخێریان بداتەوە.

* ◌ *

---

1. رواه أبو داود فی سننه: (١٠٢/٥) كتاب الأدب، باب فی شكر المعروف، برقم: (٤٨١١) والترمذی فی سننه: (٣٣٩/٤) كتاب البر والصله عن رسول الله، باب ما جاء فی الشكر لمن اهدى إليك برقم: (١٩٥٤) وقال حديث حسن صحيح.

# پێشەکی

گومانی تێدا نییە، کە قورئانی پیرۆز بە زمانی عەرەبی دابەزیوە، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾[1]، هەروەها تەواوی فەرمایشتەکانی سەروەر و سەرجەمی سەرچاوە زانستییە شەرعییەکان و پەرتووکە فیقهییەکان و کتێبەکانی تەفسیر، هەموویان بە زمانی عەرەبی نووسراون و گەیشتوون بە ئێمە، بۆیە ئەگەر کەسێك بیەوێت لەم دەریایە بەهرەمەند بێت و لەم جیهانە فراوانە پەی بکات دەبێت بە باشی خۆی شارەزا بکات لە زمانی عەرەبی...

ئینجا بزانە ئەی قوتابی خۆشەویست و خوێنەری بەڕێز، دەروازەی شارەزابوون لە قورئانی پیرۆز و کلیلی تێگەیشتن لە زمانی عەرەبی... بریتییە لە کۆمەڵە زانستێك کە لە کۆنەوە لە ناوەندە زانستییەکان و مەداریسە شەرعییەکان گرنگی و بایەخێکی زۆریان پێدراوە و کراون بە مەنهەج و پرۆگرامی خوێندن بە درێژایی سەدان ساڵ؛ یەکێك لەم زانستە ناوازانە بریتییە لە زانستی «النَّحْو» هەروەها زانستی «الصَّرْف» کە شارەزابوون و تێگەیشتن لە زمانی عەرەبی و فەرمایشتەکانی خوای گەورە بەبێ دیراسەکردن و گرنگیدان بەم دوو زانستە بە شتێکی ئەستەم دادەندرێن، بۆیە زانایان گوتوویانە: «النَّحْوُ أَبُو الْعُلُومِ وَالصَّرْفُ أُمُّهَا»[2] واتە: زانستی «النَّحْوُ» بە باوکی هەموو

---

١. سورة يوسف: الآية (٢) .

٢. بڕوانە: مراح الأرواح: لابن مسعود أحمد: ل، ٣.

زانستەکان و هەروەها زانستی «الصَّرْف» بە دایکیان دادەندرێن، ئینجا سەرنج بدە: خێزانێك کە بێ دایك و باوك بێت، دەبێت حاڵی منداڵەکانی چۆن بێت؟ کەواتە زانستەکانیتریش بەبێ ئەم دوو زانستە بەم شێوەیەن.

هەر بۆیە ئەی قوتابی بەڕێز، درێخی مەکە لە گرنگیدان و خۆشارەزاکردن لە فێربوونی ئەم زانستانە، چونکە تا زیاتر شارەزاییت هەبێت لەم دوو زانستە، ڕوونتر و وردتر لە مانا و مەبەستەکانی قورئانی پیرۆز و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر -دروودی خوای لە سەربێت- تێدەگەیت، ڕاست دەفەرموون ئەوانەی دەڵێن: زانستی «النَّحْو» بریتییە لە شارەزابوونی شێوازی خوێندنەوەی کۆتایی وشەکانی زمانی عەرەبی لە ڕووی «إِعْراب» و لە ڕووی «بِناء»ـەوە، بەڵام دەبێت ئەوە بزانیت کە هەر «حَرَكَة» و «سُكُون»ـێك هەر «تَقْدِيم» و «تَأْخِير»ێك هەر «فَصْل» و هەر «وَصْل»ـێك لە زمانی عەرەبیدا مانا و مەدلولی جیاوازی هەیە، بابەتەکە ئەوەندە پەیوەست نییە بە لایەنی «لَفْظ»ـەوە بە ئەندازەی ئەوەی کە پەیوەستە بە لایەنی «مَعْنى»وە، بۆیە هەر گۆڕانکارییەك کە بەسەر شێوازی خوێندنەوەی وشەدا بێت لە زمانی عەرەبی، بەبێ گومانی گۆڕانکاری بەسەر مانای وشەکەشدا دێت «عَلِمَهُ مَنْ عَلِمَهُ وَجَهِلَهُ مَنْ جَهِلَهُ».

بۆیە ئەی قوتابی خۆشەویست، تا بۆت دەکرێت ئەم زانستانە لەبەر بکە و ڕۆژانە «مُراجَعَة»یان بکەوە تاوەکوو دەبن بە «مَلَكَة» و بە تەواوی کەوی وماڵیی دەبن، وە گرنگییەکی تەواو بدە بەم پەیڕەو و «مَنْهَج»ـە ڕەسەنەی کە زانایانی کۆن لە سەری ڕۆشتوون و بە سەدان و هەزاران زانای بلیمەت و پێشەوای ناوداری پێگەیاندووە لە بوارەکانی «تفسیر» و «حديث» و «فقه» و «أصول» و «لغة» و «شعر» و «تاريخ»ـدا، دەیان بلیمەتی گەورەی ئەم ئوممەتەی وەکوو «شيخ فخر الدّين الرّازي» و «جارالله الزّمخشري» و پێشەوا مالیك و ئیمامی حەنەفی و ئیمامی شافیعی و «شيخ عبد القاهر»ی جورجانی و «شيخ سعدالدين» تەفتازانی و ئیمامی غەزالی و «ابن الحاجب»ی کوردی و شێخ سەعیدی نوورسی و «ابن صلاح» شارەزووری و مامۆستا «عبدالكريم مدرس» و...

ئینجا بزانە ئەی قوتابی خۆشەویست، گرنگیدان و سەرقاڵبوون بە زانستە

ئالییەکان و بەتایبەت زانستی «النَّحْوُ» ناڕاستەوخۆ گرنگیدانە بە قورئانی پیرۆز و فەرمایشتەکانی حەزرەتی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێت-، چونکە ئەگەر تۆ بە باشی ئەم زانستانە دیراسە نەکەیت، ناتوانیت وەکوو پێویست لە دەریای بێ بناوانی قورئان و سوننەتدا دەستت بگاتە هیچ دوڕڕ و گەوهەرێك، چوون هەر فەرمایشتێك چەندین مانا و مەبەست و مەدلوولی جیاوازی لێ وەردەگیرێت، بە شارەزابوون لە هەر زانستێك لەم زانستانە دەرگایەك لەسەر ئاسۆی فیکر و مەعریفەتی خۆت والآ دەکەیت تا دەگەیتە پلەی ﴿وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ﴾.

بۆیە پێشەوایانی ئیسلام هەرکاتێك گوێبیستی هەڵەیەك دەبوون لە زمانی عەرەبیدا تەنانەت ئەگەر گۆڕینی یەك «حَرَكَة» بوایە یەکسەر تووڕە دەبوون، کەسی بەرامبەریان سەرزەنشت دەکرد. **سەرنج بدە:** جارێکیان پێشەوا زەمەخشەری گوێبیستی پیاوێکی ئەعرابی بوو کە بانگی دەدا گوتی: «أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولَ اللّهِ»، یەکسەر تووڕە بوو و گوتی «ویحك. یفعل ماذا؟»[1].

بە هەمان شێوە پێشەوا عەلی -ڕەزای خوای لێ بێت- گوێبیست بوو پیاوێك ئەم ئایەتەی خوێندەوە و گوتی: ﴿لَّا يَأۡكُلُهُۥٓ إِلَّا ٱلۡخَٰطِـُٔونَ﴾ یەکسەر ڕووی گرژ بوو و خۆی لە پیاوە دەشتەیەکە تووڕە کرد.

تەنانەت پێشەوا عومەر -ڕەزای خوای لێ بێت- ڕۆژێکیان لە نێو کۆمەڵە کەسێکی دا و بە توندی سەرزەنشتی کردن کە خەریکی ڕاهێنان بوون لەسەر تیر هاوێشتن و نەیاندەپێکا، کاتێك پرسیاری لێکردن، گوتیان: «إِنَّا قَوْمٌ مُتَعَلِّمِينَ» یەکسەر تووڕە بوو و گوتی: «**وَاللّهِ لَخَطَؤُكُمْ فِي لِسانِكُمْ أَشَدُّ عَلَيَّ مِنْ خَطَئِكُمْ فِي رَمْيِكُمْ**»[2] واتە: سوێند بە خوا ئەم هەڵەیەی کە لە شێوەی خوێندنەوەی وشەکە کردتان لەسەر دڵم قورستر بوو لە هەڵەی تیرهاوێشتنتان.

تا کار گەیشت بەوەی ڕۆژێکیان پێشەوا عەلی گوێبیستی پیاوێکی ئەعرابی بوو ئەم ئایەتەی بە هەڵە خوێندەوە: ﴿أَنَّ ٱللَّهَ بَرِيٓءٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ وَرَسُولِهِ﴾[3] واتە:

١. بڕوانە: الموسوعة الشاملة في النحو والصّرف: ل ٢١.

٢. بڕوانە: معاني النحو: ل، ٢١.

٣. سورة التوبة: الآية: ٣.

بە دڵنیایـی خـوای گـەورە لـە هاوبـەش دانـەران و پێغەمبـەر بەرییـە، بۆیـە هەسـتی بـە مەترسـییەکی گـەورە کـرد و نـاردی بـەدوای «أَبُـو الأَسْـوَد الدُّؤَلِـي» نامەیەکی دایە دەستی، تیایدا نووسیبووی: «بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ، اَلْكَلامُ كُلُّهُ: اِسْمٌ وَفِعْلٌ وَحَرْفٌ، فَالاِسْمُ مَا أَنْبَأَ عَنِ الْمُسَمَّى، وَالْفِعْلُ مَا أَنْبَأَ عَنْ حَرَكَةِ الْمُسَمَّى، وَالْحَرْفُ مَا أَنْبَأَ عَنْ مَعْنىَ لَيْسَ بِاسْمٍ وَلَا فِعْلٍ، ثُمَّ قَالَ لِي: تَتَبَّعْهُ وَزِدْ فِيهِ مَا وَقَعَ لَكَ، وَاعْلَمْ يَا أَبَا الأَسْوَدِ أَنَّ الأَشْياءَ ثَلاثَةٌ: ظَاهِرٌ وَمُضْمَرٌ وَشَيْءٌ لَيْسَ بِظَاهِرٍ وَلَا مُضْمَرٍ»[١]

ئینجا «أَبُو الأَسْوَد الدُّؤَلِي» دەستی کرد بە دانانی بنەما سەرەکییەکان و بنچینە گشتییەکانی زانستی «النَّحْو»، ئینجا دەفەرموێت: ڕۆژێکیان سەردانی ئیمامی عەلیم کرد و هێندێك شتم پیشان دا، یەکێك لەوانە: بریتی بوو لە «حُروفُ النَّصْبِ» کە پێنچ دانە بوون (إِنَّ، أَنَّ، كَأَنَّ، لَعَلَّ، لَيْتَ) من باسی وشەی «لَكِنَّ»ـەم نەکردبوو، بۆیە گوتی: بۆچی باست نەکردووە؟ من گوتم: «لَمْ أَحْسِبْهَا»، ئینجا پێشەوا عەلی فەرمووی: «بَلْ هِيَ مِنْهَا فَزِدْهَا»[٢].

ئینجا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زانایانی ئیسلامی و خەمخۆرانی قورئان و سوننەت دەیان و سەدان پەرتووکی نایاب و دانسقەیان نووسی لە بابەتی زانستە ئالییەکان و مەنهەجێکی تۆکمە و «متكامل»ـیان دانا کە گونجاو بێت لەگەڵ تەواوی قۆناغەکانی خوێندن، یەکێك لەو پەرتووکە بەنرخانە بریتییە لە کتێبی «الأنموذج» کە داندراوی زانای ناودار پێشەوا زەمەخشەرییە، ئەم کتێبە هێندە گەوهەرێکی نایابە و دەیان و سەدان ساڵە لە تەواوی مەدرەسە شەرعییەکانی جیهانی ئیسلامی کراوە بە مەنهەجی خوێندن، دەیان شەرحی لەسەر نووسراوە بە زمانی عەرەبی، یەکێك لەو شەرحە گرنگانە بریتییە لە «شَرْحُ الأُنْمُوذَج»ـی زانای پایەدار «جَمالُ الدِّينِ مُحَمَّد بن عبد الغني الأردبيلي» کە سەدان ساڵە لە مەدرەسە وحوجرەکانی کوردستان مەنهەجی خوێندنە و بایەخێکی زۆری هەیە لە لای زانایانی کورد.

---

١. بڕوانە: الموسوعة الشّاملة في النحو والصّرف: ل ٢١ ومعاني النحو: ل، ٢١، والكشاف: ٢/ ٣٣.

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

بەڵام ئەم کتێبە تا ئێستا بە زمانی کوردی هیچ شەرحێکی لەسەر نەنووسراوە، لە ڕاستیدا کۆمەڵێك وانەشی تێدا هەن کە تێگەیشتنیان تۆزێك قورس و گرانە و پێویستی بە خۆماندووکردن هەیە، بۆیە بەندە ئەگەرچی خۆشم بە سوارچاکی ئەم بوارە نازانم، شەرحێکی کورت و پوختم لەسەر نووسیووە، لە هەمان کاتدا بەراوردم لە نێوان چەندین نوسخەی کۆن و نوێ کردووە بە مەبەستی «تحقیق»کردنی «متن»ی کتێبەکە و ڕاستکرنەوەی ئەو هەڵە و کەموکورتییانەی لە هێندێك نوسخەی نوێدا هەن.

ئەم شەرح و ڕوونکردنەوەیە لە دوو بەرگ پێك دێت، بەرگی یەکەم شێست و نۆ وانە لە خۆ دەگرێت و لەسەر بابەتی «اَلْمَبْني» کۆتایی دێت، بەرگی دووەم بە تەواوبوونی تەواوی وانەکان کۆتایی دێت، لە ئایندەیەکی نزیکدا ئەویش ئامادەی چاپ دەبێت.

هیوادارم توانیبێتم خزمەتێکی بچووك پێشکەش بە کاروانی زانست و فێرخوازانی خۆشەویست و کتێبخانەی کوردی و مەنهەجی ڕەسەنی پەسندکراوی حوجرە و مەدرەسە ئەهلییەکان بکەم، کە تاکە سەرچاوەی پێگەیاندن و تێگەیاندنی سەدان و هەزاران زانای گەورە و عاریفی خواناس و شاعیری ناودار و سەرکردەی شۆڕشگێڕ و مێژوونووسی مەزن بوون.



# ژیاننامەی عەللامە زەمەخشەری

زانای پایەدار ناوی تەواوی «مَحْمُود»ی کوڕی «عُمَر»ی کوڕی «أَحْمَد»ە لە بەرواری «٢٧ رِجب» ساڵی «٤٦٧هـ» لە گوندی «زَمَخْشَر»ی نزیك شاری «خوارزم» لە دایك بووە[١] لە جیهانی ئیسلامیدا بە پێشەوا «جَارُ اللّٰه الزَّمْخَشَرِيّ»[٢] و لە وڵاتی خۆیشیدا بە «فَخْرُ خَوارزم» ناسراوە.

پێشەوا «جَارُ اللّٰهِ الزَّمْخَشَرِيّ» لە گوندی «زَمَخْشَرَ» دەستی بە خوێندن کردووە پاشان بە مەبەستی درێژەدان بە خوێندن چووە بۆ «بُخارىٰ» پاشان چووە بۆ «خُراسان» دواتر چووە بۆ «أَصْفَهان» لەم ماوەیەدا لە خزمەت دەیان زانای ناوداری ئیسلامی زانستە شەرعییەکانی خوێندووە، پاشان وڵاتی جێهێشتووە و ڕووی لە شاری «بَغْداد» کردووە، لەوێشەوە بەرەو شاری مەککەی پیرۆز بەڕێ کەوتووە و ماوەیەکی زۆر لەوێ ماوەتەوە، ناوبانگێکی زۆری پەیدا کردووە، دواتر گەڕاوەتەوە بۆ شاری «بَغْداد» لەوێشەوە گەڕاوەتەوە بۆ شاری «خوارزم» هەر لەوێ ماوەتەوە تاوەکوو لە شەوی «عَرَفَة»ی ساڵی «٥٣٨هـ»[٣] کۆچی دوایی کردووە.

---

١. بڕوانە: سير أعلام النبلاء: ٢٠/ ١٥٥، والأعلام: ١٧٨/٧.

٢. بۆیە پێی گوتراوە، «جار الله» چونکە زەمەنێکی درێژ لە شاری مەککەی پیرۆز ژیاوە، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ وڵاتی خۆی، بەڵام پاش ماوەیەك سۆزی هەڵدەستێت و جارێکیتر دەگەڕێتەوە بۆ شاری مەککە و لەوێشدا هەمیشە دراوسێی «بيت» بووە، بۆیە پێی گوتراوە: «جارُ بَيْتِ اللّٰهِ»، پاشان وشەی «مُضاف» واتە: وشەی «بَيْت» لابردراوە و «حَذف» کراوە و بۆیە بووە «جَارُ اللّٰهِ». بڕوانە: تاريخ الإسلام للذهبي: ٤٨٨، ومعجم الأدباء: ١٩/ ٢٨٠.

٣. بڕوانە: معجم الأدباء: ١٢٩/١٩، و إنباه الرواة: ٢٧٠/٣.

پێشەوا زەمەخشەری هەر بە مناڵی هۆگری ناوەندە زانستە شەرعییەکان بووە، عیشق و ئەوینێکی بێئەندازەی هەبووە بۆ فێربوون و شارەزابوون لە زانستە ئیسلامییەکان، بە ئەندازەی ناوبانگی، خۆی ماندوو کردووە، هەرگیز ڕۆژگارێك بۆ ساتێکیش پشتی لە کۆڕی زانست و وانەگوتنەوە نەکردووە.

پێشەوا زەمەخشەری خاوەن بیرو باوەڕێکی تۆکمە بووە، لە عەقیدەدا بە ئاشکرا و بە شانازیەوە پەیڕەوی لە مەزهەبی «مُعْتَزِلَة»[١] کردووە و هەروەها لە «فِقْه»دا حەنەفیمەزهەب بووە، لە زۆربەی بابەتە هەستیار و دیارەکانی بواری شەریعەتی ئیسلامی خاوەن سەرنج و بۆچوونی تایبەتی خۆی بووە.

پێشەوا زەمەخشەری کەسایەتییەکی خواویست و دونیا نەویست بووە، کۆڕ و مەجلیسی هەمیشە باسی بابەتی خواناسی و زانستی و دینداری بووە، وازی لە دونیا و خۆشییەکانی هێناوە، هەر بۆیە تا مردووە ژنی نەهێناوە، هەروەها خاوەنی یەك قاچ بووە، ڕۆژێکیان لە بەغدا «أحمد»ی کوڕی «علي» پرسیاری لێ دەکات و پێی دەڵێت: بەچی قاچت لە دەست داوە؟ ئەویش دەفەرموێت: بەهۆی دوعای دایکم.. ڕۆژێکیان چۆلەکەیەکم گرت و داوێکم خستە قاچیەوە پێم بەستیەوە، لە ناکاو لە دەستم فڕی چووە کونێکەوە، منیش چەند جارێك داوەکەم بە توندی ڕاکێشا و سەرەنجام قاچی لێ بوویەوە و دایکم بەم دیمەنە زۆر پەرۆش و دڵتەنگ بوو، بۆیە گوتی: «قَطَعَ اللّٰهُ رِجْلَ الأَبْعَد كَمَا قَطَعَ رِجْلَهُ» بۆیە کاتێك گەیشتم بە تەمەنی پانزە ساڵی بۆ دەستکەوتنی زانست ڕووم کردە «بخاری»[٢] لە ڕێگادا لە پێڕۆکەم کەوتمە خوارەوە و قاچم شکا و پاشان دوچاری بڕینەوە بوو، ئەو کات تێگەیشتم کە ئەم قاچبڕینەوەم بە هۆی ئەو ستەمە و دوعای دایکمەوە بووە.

پێشەوا زەمەخشەری، لە خزمەت دەیان زانای سەردەمی خۆی وانە زانستییەکانی

---

١. دەگێڕنەوە و دەڵێن: ئەگەر سەردانی دۆستێك یاخود شوێنێکی کردبا دەیفەرموو بەو کەسەی کە ڕوخسەتی چوونە ژوورەوەی بۆ وەردەگرت بڵێ: «أَبُو الْقَاسِمِ الْمُعْتَزِلِي» هاتووە، بڕوانە: تاریخ الاسلام: للذهبي: ٤٩٠.

٢.، بڕوانە: وفيات الأعيان: ٥/ ١٦٨، والزمخشري: ٧٠.

خوێنـدووە، لـە هەموو زانسـتەکان جێ‌پەنجەی وەکوو مانگی چواردە دەدرەوشـێتەوە، لە زۆربەی بوارەکاندا قسەکانی بە بەڵگەی یەکلاکەرەوە وەردەگیرێن، دەیان و سەدان زانای دیاری جیهانی ئیسلامی لە خزمەتیدا وانە زانستییە شەرعییەکانیان خوێندووە، وە لە خەرمانی پڕ لە گەوهەریدا بەهرەمەند بوون.

هەروەها خاوەنی زیاتر لە سی (٣٠) داندراوی تایبەت و نایابە لە بوارە جیاوازەکاندا، هەریەك لە بابەتی خۆیدا وەکوو شاکارێکی مەزن سەیر دەکرێت، دیارترین کتێبەکانی بریتیـن لـە تەفسـیری قورئانی پیرۆز بە ناوی «الكَشّـافُ عَنْ حَقائِقِ غَوامِضِ التَّنْزِيلِ وَعُيـونِ الأَقَاوِيـلِ فِـي وُجُـوهِ التَّأْوِيـلِ» هەروەها کتێبـی «الأُنْمُوذَج» کـە کورتکراوەی شـاکارێکی مەزنـە لـە زانسـتی ڕێزمانـی عەرەبیـدا بـە نـاوی «اَلْمُفَصَّـل»، کـە ئـەم کورتکراوەیـە دەیـان ڕاڤـە و شـەرحی لەسـەر نووسـراوە بـە زمانـی عەرەبی و لـە هەموو حوجـرە و مەدرەسـەکاندا مەنهـەج و پڕۆگرامـی خوێندنـە، هەروەها خاوەنی «أَسـاسُ الْبَلاغَة»یە کە گەوهەرێکی کەم‌وێنەیە لە زانستی ڕەوانبێژیـی «اَلْبَلاغَة»دا... هتد.[1]

* ◌ *

١. بڕوانە: شـرح الأنموذج: في النّحو: دراسـة و تحقيق، عدنان جاسـم محمد، ل: ٢٤. تأريخ الإسـلامی للذهبي: ٤٨٨، معجم الأدباء: ٨٥/١٤، و إنباه الرواه: ٣/ ١٢٦، وفيات الأعيان: ١٦٨/٥.

# ژياننامەی عەللامە «عَبْدُ الْغَنِي» ئەردەبيلی

زانای ناودار و مەزنی جيهانی ئيسلام، ناوی تەواوی بريتييە لە «محمد بن عبد الغني الأردبيلي» كە بە «جمال الدين» ناسراوە، خەڵكی شاری گەورەی «ئەردەبيل»ـە[1] و لە وڵاتی ئازەربايجان لە دايك بووە، بەڵام بە دياريكراوی ساڵی لەدايكبوون و كۆچی دوايی ديار نييە، ڕاجيايی زۆری لەسەرە لە نێوان مێژونووس و زانايياندا، بەڵام گومان لەوە نييە كە لە كۆتاييەكانی سەدەی هەشتەم و سەرەتاكانی سەدەی نۆيەم ژياوە.

پێشەوا «عبدالغني» ئەردەبيلی لە خزمەت دەيان زانای سەردەمی خۆيدا وانە زانستييەكانی خوێندووە، لە هەموو زانستەكاندا شارەزاييەكی نايابی هەبووە، هەروەها دەيان و سەدان زانای دياری جيهانی ئيسلامی لە خزمەتيدا وانە زانستييە شەرعييەكانيان خوێندووە و لە خەرمانی پڕ گەوهەريدا بەهرەمەند بوون.

مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبيلی لە شەرحكردنی كتێبی «الأُنْمُوذَجْ»ـدا مەنهەجێكی زۆر هاوسەنگی پەيڕەو كردووە، نە ئەوەندە درێژە خوێندكار تووشی ماندووبوون بكات، نە ئەوەندە كورتە قوتابی لێی حاڵی نەبێت، زۆر كەم بەڵگەی بە شيعری شاعيران هێناوەتەوە، لە هەموو كتێبەكەدا تەنها پێنج شيعری باس كردوون، زياتر بەڵگەی بە ئايەتەكانی قورئان هێناوەتەوە كە لە «٥٨» شوێندا «استشهاد»ی بە دەقەكانی قورئان كردووە، كەمتر خۆی لە فەرمايشتە كانی پێغەمبەرﷺ داوە، وەكوو پێشەوا زەمەخشەری مەيلی بۆچوونی «بَصْرِي»ـيەكانی كردووە، زۆر گرنگی داوە بە «العِلَلُ النَّحْوِيَّة» لە زۆربەی بابەتەكان هۆكارەكانی ڕوون كردوونەتەوە، لەسەر هەمان مەنهەجی مامۆستای دانەر (الْمُصَنِّف)رحمه الله ڕۆويشتووە.



---

[1] بڕوانە: الأعلام: ٢١١/٦، كشف الظنون: ل، ١٨٥،

# مُقَدّمَةُ الشّارِحِ

**الْحَمْدُ للهِ الَّذِي جَعَلَ الْعَرَبِيَةَ مِفْتَاحَ الْبَيَانِ، وَصَيَّرَهَا آلَةً يُحْتَرَزُ بِهَا عَنِ الْخَطإِ فِي اللِّسَانِ، قَوَّمَ بِسَبَبِهَا الْمَنْطِقَ الَّذِي هُوَ مُمَيِّزُ الإِنْسَانِ، وَهَيَّأَهَا سُلَّماً يُرْتَقَىٰ بِهَا إِلَىٰ ذِرْوَةِ حَقَائِقِ الْقُرْآنِ، وَالصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ عَلَىٰ خَيْرِ الْأَنَامِ مُحَمَّدٍ الْفُرْقَانِ، وَعَلَىٰ آلِهِ وَأَصْحَابِهِ رُؤَسَاءِ أَهْلِ الإِيمَانِ.**

---

## پێشەكیی مامۆستا «محمّد عبد الغني» ئەردەبیلی

(اَلْحَمْدُ لِلَّهِ)هەرچی سوپاس و ستایشە شایەن و لایەقی خوای پەروەردگارە (الَّذِي جَعَلَ الْعَرَبِيَّةَ مِفْتاحَ الْبَيانِ)ئەم خودایەی كە فێربوون و شارەزابوونی ڕێزمانی زمانی عەرەبی كردووە بە كلیل و مەرجی تێگەیشتن و جوان حاڵیبوونی زانستی ڕەوانگۆیی و ڕەوانبێژی (وَصَيَّرَها آلَةً يُحْتَرَزُ بِهَا عَنِ الْخَطَأِ فِي اللِّسانِ)هەروەها گێراویەتی بە ئامرازێك كە بە هۆیەوە مرۆڤ دەتوانێت خۆی بپارێزێت لە هەڵەكردن لە كاتی ئاخاوتن و گفتۆكردن بە زمانی عەرەبی (قَوَّمَ بِسَبَبِهَا الْمَنْطِقَ الَّذِي هُوَ مُمَيِّزُ الإِنْسانِ)بە هۆی فێربوون و شارەزابوونی ڕێزمانی عەرەبی، زانستی لۆژیكی (اَلْمَنْطِق) بەهێز و تۆكمە كردووە، كە بەم زانستە مرۆڤ جیا دەكرێتەوە لە بوونەوەرەكانی‌تر (وَهَيَّأَهَا سُلَّماً) هەروەها كردوویەتی بە پەیژەیەك (يُرْتَقَى بِهَا)كە بە هۆیەوە قوتابی سەردەكەوێت و دەگات (إِلَى ذُرْوَةِ حَقائِقِ الْقُرْآنِ)بۆ چڵەپۆپەی تێگەیشتن و چنینەوەی ڕاستییەكان و نهێنییە شاراوەكانی قورئان. (وَالصَّلاةُ)داوای ڕژانی ڕەحمەتی بێ‌پایانی خوای پەروەردگار و (وَالسَّلامُ)هەروەها بێ‌عەیبی لە هەموو كەموكوڕییەك دەكەین (عَلَى خَيْرِ الأَنامِ مُحَمَّدٍ الْفُرْقانِ)بۆ سەر گیانی باشترین بەندەی سەر ڕووی گۆی زەوی، كە پێغەمبەرە -دروودی خوای لەسەر بێت-كە جیاكەرەوەی ڕێگای ڕاستە لە ڕێگای چەوت و هەڵە، (وَعَلَى آلِهِ)وە هەروەها ڕەحمەتی خوای گەورە بڕژێتە سەر خزم و كەسوكار و خێزانەكانی (وَأَصْحابِهِ)هەروەها یار و هاوەڵە بەڕێزەكانی ئەم پێغەمبەرە نازدارە (رُؤَساءِ أَهْلِ الإِيمانِ)كە سەركردە و تاجی سەری بڕواداران.

**أَمَّا بَعْدُ: فَيَقُولُ الْإِمَامُ الْعَالِمُ الْفَاضِلُ الْكَامِلُ، أَفْضَلُ الْفَاضِلِينَ، أَشْرَفُ الْمُحَقِّقِينَ، الْمَوْلَى الْمُعَظَّمُ، الْإِمَامُ الْأَعْظَمُ، الْجَامِعُ بَيْنَ الْمَعْقُولِ وَالْمَنْقُولِ، الْحَاوِي بَيْنَ الْأُصُولِ وَالْفُرُوعِ، مُبَيِّنُ الْحَلَالِ وَالْحَرَامِ، الْمَصُونُ بِعِنَايَةِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، مَلِكُ الْقُضَاةِ وَالْحُكَّامِ، جَمَالُ الْمِلَّةِ وَالدِّينِ، مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِالْغَنِيِّ**

---

(**أَمَّاَ بَعْدُ**) پاش سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگار و داواکردنی داباریینی ڕەحمەت بۆ سەر گیانی سەروەر و شوێنکەوتووانی، (**فَيَقُولُ الإمامُ الْعَالِمُ**) ئینجا دەفەرموێت پێشەوای زانا و (**الْفَاضِلُ الْكَامِلُ**) گەورە و پایەدار و (**أَفْضَلُ الْفَاضِلِينَ**) سەرداری زانا گەورەکان و (**أَشْرَفُ الْمَحَقِّقِينَ**)[1] ڕێزدارترینی زانا بلیمەتەکان و (**الْمَوْلَى الْمُعَظَّمُ**) خاوەن‌شکۆی دیوانی داناکان و (**الإمامُ الأَعْظَمُ**) پێشەوای هەرە گەورە و مەزن و (**الْجَامِعُ بَيْنَ الْمَعْقُولِ وَالْمَنْقُولِ**) کۆکەرەوەی نێوان زانستی «عَقْلي» و زانستی «نَقْلي»[2]، (**الْحَاوِي بَيْنَ الأُصُولِ**) هەڵگری زانستەکانی تەفسیر و فەرمووده و (**وَالْفُروعِ**)[3] هەروەها زانستەکانی «عُلُومُ الْقُرْآن» و «عُلُومُ الْحَدِيث»...، (**مُبَيِّنُ الْحَلالِ وَالْحَرامِ**) ڕوونکەرەوەی شتە ڕێگاپێدراوەکان و شتە قەدەغەکراوەکانە لە ڕوانگەی شەریعەتی ئیسلامیدا، (**الْمَصُونُ بِعِنايَةِ رَبِّ الْعَالَمِينَ**) پارێزراو بە چاودێری قاپیی میهرەبانی پەروەردگاری جیهانیان، (**مَلِكُ الْقُضاةِ وَالْحُكّامِ**) پادشای قازی و دادوەرەکان، (**جَمالُ الْمِلَّةِ وَالدِّينِ**) شانازی پێکراوەی شوێنکەوتوانی پێغەمبەر و ئایینی پیرۆزی ئیسلام، مامۆستا (**مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْغَنِيِّ**) کە خەڵکی وڵاتی ئازەربایجان و (**الأَرْدَبِيلِيّ**) شاری ئەردەبیلە، کە یەکێکە لە شارە گەورەکانی ئەم

---

١. جیاوازی نێوان «مُحَقِّق» و «مُدَقِّق» بریتییە لەوەی کە «مُحَقِّق» بە کەسێك دەگوترێت کە بابەتێك بە بەڵگەوە ساغ دەکاتەوە (هُوَ مَنْ يُثْبِتُ الْمَسْأَلَةَ بِدَلِيلِها). بەڵام «مُدَقِّق» بە کەسێك دەگوترێت: کە بابەتێك بە بەڵگەوە ساغ دەکاتەوە لەگەڵ بەڵگەیەکی‌تر (مَنْ يُثْبِتُ الْمَسْأَلَةَ بِدَلِيلِهَا مَعَ دَلِيلٍ آخَرَ). بڕوانە: شرح الأنموذج في النّحو بتعليق: أنور بن أبى بكر الشيخيّ الداغستاني.

٢. مەبەست بە زانستە عەقڵییەکان: زانستی لۆژیك (اَلْمَنْطِق) و دانایی (اَلْحِكْمَة)یە. هەروەها مەبەست بە زانستە نەقڵییەکان: زانستە ئالییەکانە ـ وەکوو زانستی «النَّحْوُ، الصَّرْفُ، اَلْبَلاغَة».

٣. بڕوانە: شرح الأنموذج: في النّحو: دراسة و تحقيق، عدنان جاسم محمد، ل: ١٨.

**الْأَرْدَبِيلِيُّ، مَتَّعَ اللَّهُ الْمُسْلِمِينَ بِطُولِ بَقَائِهِ، وَأَدَامَ دَوْلَتَهُ بِحَقِّ خَالِقِهِ:**
**لَمَّا رَأَيْتُ مُخْتَصَرَ الإِمَامِ، الْهُمَامِ، عَلَّامَةِ الْعَالَمِ، أُسْتَاذِ أَئِمَّةِ بَنِي آدَمَ جَارِ اللَّهِ، ـقَدَّسَ اللَّهُ رُوحَهُ، وَنَوَّرَ ضَرِيحَهُـ أَعْنِي: أُنْمُوذَجَهُ فِي النَّحْوِ، قَلِيلَ اللَّفْظِ كَثِيرَ الْمَعْنَىٰ، صَغِيرَ الْحَجْمِ غَزِيرَ الْفَحْوَىٰ، مَرْغُوباً لِلْمُبْتَدِئِينَ وَغَيْرِهِمْ، مَطْلُوباً لِلسَّالِكِ سَبِيلَ خَيْرِهِ،**

---

ولّاته، (**مَتَّعَ اللَّهُ الْمُسْلِمِينَ**) خوای گەورە موسوڵمانان دڵشاد بكات (**بِطُولِ بَقَائِهِ**) بە دەستگرتن بە تەمەنیەوە (**وَأَدَامَ دَوْلَتَهُ بِحَقِّ خَالِقِهِ**) لە سایە و سێبەری كەم نەكات لە بەر خاتری ناوە جوانەكانی و سیفاتە بەرزەكانی.

دەفەرموێت: (**لَمَّا رَأَيْتُ**) كاتێك كە بینیم (**مُخْتَصَرَ الإِمامِ، الْهُمامِ**) كتێبە خنجیلانەكەی پێشەوای پایەدار و (**عَلّامَةِ الْعَالَمِ**)[1] زانای هەرە مەزن و پڕزانستی سەر زەوی (**أُسْتاذِ أَئِمَّةِ بَنِي آدامَ**) مامۆستای پێشەوایانی ڕۆڵەكانی ئادەم پێغەمبەر عليه السلام مامۆستا «محمود»ی كوڕی «عُمَر»ی كوڕی «مُحمّد»ە، كە بە (**جَارِ اللَّهِ**) زەمەخشەری ناسراوە (**قَدَّسَ اللَّهُ رُوحَهُ، وَنَوَّرَ ضَرِيحَهُ**) خوای گەورە پایەدارتری بكات و گۆڕی پڕ نوور بكات (**أَعْنِي:**) مەبەستم بە كتێبەكە (**أُنْمُوذَجَهُ فِي النَّحْوِ**) كتێبی «أُنْمُوذَج»ـە لە زانستی ڕێزمانی زمانی عەرەبی، (**قَلِيلَ اللَّفْظِ**) كتێبەكە وشەكانی كورت و پوخت بوون، بەڵام (**كَثِيرَ الْمَعْنَى**) مانایەكی زۆریان هەبوو، (**صَغِيرَ الْحَجْمِ**) قەبارەیەكی بچووكی هەبوو، بەڵام (**غَزِيرَ الْفَحْوَى**)[2] ناوەڕۆكێكی بەهێزوپێزی هەبوو، بینیم كتێبەكە (**مَرْغُوباً لِلْمُبْتَدِئِينَ وَغَيْرِهِمْ**) خواستێكی زۆری لەسەرە لە لایەن ئەم فێرخوازانەی تازە دەست دەكەن بە خوێندن و هەروەها لەلای خەڵكی تریش (**مَطْلُوباً لِلسَّالِكِ سَبِيلَ خَيْرِهِ**) هەروەك چۆن كتێبەكە دڵخوازی ڕێبوارانی ڕێگای ڕاستی و

---

١. «العَلّامَةِ الْعَالَمِ» ئەمە نازناوی پێشەوا زەمەخشەرییە (مِنْ بَابِ إِضافَةِ الشَّيْءِ إِلَى ظَرْفِهِ، أَيْ: العَلّامَة فِي الْعَالَمْ). لە سێ نوسخەی تری تەحقیقكراو نووسراوە «العَلّامَةِ الْعَالِمِ»، بەڵام لە ڕاستیدا بۆچوونی یەكەم تەواوترە، بڕوانە: (شرح الأنموذج) ت، الداغستانی.

٢. وشەی «غَزِير» بە مانای «كثير» دێت، هەروەها وشەی «اَلْفَحْوَي» بە واتای «اَلْمَعْنَى» دێت.

**وَلَمْ يَكُنْ لَهُ شَرْحٌ يَلِيقُ قَاصِدَهُ وَيُلْقِي إِلَيْهِ مَقَاصِدَهُ، وَقَدْ كُنْتُ أُرِيدُ تَلْمِيظَهُ لِلْمُبْتَدِئِينَ، مِنْ أَصْحَابِنَا الْمُنْخَرِطِينَ، فِي سِلْكِ أَحْبَابِنَا، لَا سِيَّمَا قُرَّةُ عَيْنِي الرَّمِدَةِ، وَسُرُورُ نَفْسِي الْكَمِدَةِ عَلَاءُ الْمِلَّةِ وَالدِّينِ، أَحْمَدُ بْنُ صَدْرِ الْإِمَامِ، رَئِيسِ الْأَنَامِ، أَقْضَى الْقُضَاةِ وَالْحُكَّامِ، مُظْهِرِ الْحَقِّ فِي الْأَحْكَامِ، عِمَادِ الْمِلَّةِ وَالدِّينِ، الْمُفَضَّلُ الْكَاشِي،**

سەرفرازیی بوو، (**وَلَمْ يَكُنْ لَهُ شَرْحٌ**)[١] لەگەڵ ئەوەشدا شەرحێکی ئاوای نەبوو (**يَلِيقُ قَاصِدَهُ**) کە تینوویەتی ڕێبوارانی بشکێنێت، (**وَيُلْقِي إِلَيْهِ مَقَاصِدَهُ**) هەروەها مانا و مەبەستەکانی بە شێوەیەکی جوان و کورت و پوخت بگەیەنێت.

(**وَقَدْ كُنْتُ أُرِيدُ**) لە ڕاستیدا من دەمویست (**تَلْمِيظَهُ لِلْمُبْتَدِئِينَ**)[٢] ئەم کتێبە خۆش بکەم و شەرحێکی کورت و پوختی لەسەر بکەم بۆ ئەم فێرخوازانەی تازە دەست دەکەن بە خوێندن (**مِنْ أَصْحَابِنَا الْمُنْخَرِطِينَ فِي سِلْكِ أَحْبَابِنَا**) لەم هاوڕێ ڕێزدارانەی کە تازە خۆیان گەیاندۆتە کاروانی خۆشەویستانمان لە ڕێبوارانی ڕێگای زانست و زانیاری، (**لَا سِيَّمَا قُرَّةُ عَيْنِي الرَّمِدَةِ**) بە تایبەت بۆ سۆمای چاوە کزەکانم، (**وَسُرُورُ نَفْسِي الْكَمِدَةِ**) شادی هێنەری دڵی پڕ خەمم، (**عَلَاءُ الْمِلَّةِ وَالدِّينِ**) سەربەرزی شوێنکەوتووانی پێغەمبەر ﷺ و ئایینی پیرۆزی ئیسلام، جەنابی (**أَحْمَدُ بْنُ صَدْرُ الإِمامِ، رَئِيسِ الأَنامِ**) گەورە و سەرۆکی خەڵکی ئیماندار (**أَقْضَى الْقُضاةِ وَالْحُكّامِ**) دادوەرترینی قازی و دادوەرەکان و (**مُظْهِرُ الْحَقِّ فِي الأَحْكامِ**) سەرخەری ڕاستی و دەرخەری دادپەروەری لە ڕاییکردنی ئەحکامە شەرعییەکان (**عِمادُ الْمِلَّةِ وَالدِّينِ**) پشتوپەنای شوێنکەوتووانی پێغەمبەر ﷺ و ئایینی پیرۆزی ئیسلام، (**الْمُفَضَّلُ**)[٣] زانای ڕێزلێگیراو و پایەدار (**الْكَاشِي**) کە سەر بە هۆزی

١. بڕوانە: شرح الأنموذج: في النّحو: دراسة و تحقيق، عدنان جاسم محمد، ل: ٢٤.

٢. مەبەست بە وشەی «اَللّماظَةُ» بریتییە لە «التَذَوُّق» واتە: تامکردن، زۆر جار نووسەرەکان ئەم دەستەواژەیە بەکار دەهێنن لە کاتی نووسیندا «لَمَّظْناهُمْ شَيْئاً يَتَلَمَّظُونَهُ قَبْلَ حُلولِ الْوَقْتِ» بڕوانە: لسان العرب: ١٢٥/٨.

٣. وشەی «المفضل» لە پێنج نوسخەیتری بەردەستم بەبێ ئەلف و لام هاتووە، بەڵام لە هێندێك نوسخەیتر بەم شێوەیە نووسراوە.

**بَلَّغَهُمَا اللَّهُ آمَالَهُمَا، وَضَاعَفَ فِي الْعَالَمِينَ إِقْبَالَهُمَا، أَرَدْتُ أَنْ أَشْرَحَهُ شَرْحاً يُفِيدُ طَالِبَهُ، وَيُفِيضُ عَلَيْهِ مَطَالِبَهُ، بِحَيْثُ لَا أَتَخَطَّىٰ مِنْ تَحْلِيلِ لَفْظِهِ خُطَى كَثِيرَةً، وَلَا أَتَجَاوَزُ عَنْ تَنْقِيحِ مَعْنَاهُ إِلَّا مَسَافَةً يَسِيرَةً، وَالْتَزَمْتُ أَنْ أَكْتُبَ أَلْفَاظَ الْمَتْنِ بِتَمَامِهَا مِنْ أَوَّلِ كِتَابَةِ الشَّرْحِ إِلَىٰ إِتْمَامِهَا، حَتَّىٰ يَكُونَ كَالزِّيَادَةِ لِلْمُتَعَلِّمِ عَلَى التَّعْرِيفِ، وَيُغْنِيَهُمْ عَنِ النُّسَخِ**

کاشییەکان(**بَلَّغَهُمَا اللَّهُ آمَالَهُمَا**) خوای گەورە ئەم کوڕ و باوکە بە ئاوات و مرازی خۆیان بگەیەنێت، (**وَضَاعَفَ فِي الْعَالَمِينَ إِقْبَالَهُمَا**) وە دە ئەوەندەی‌تر خەڵکیی ڕوویان تێ‌بکات بۆ ڕاپەڕاندنی ئیش‌وکارەکانیان.

(**أَرَدْتُ**) بۆیە من ویستم(**أَنْ أَشْرَحَهُ شَرْحاً يُفِيدُ طَالِبَهُ**) کە شەرحێکی وای لەسەر بنووسم، سوودێکی تەواو بە خوێنەرانی بگەیەنێت، (**وَ يُفِيضُ عَلَيْهِ مَطَالِبَهُ**) وە هەموو داواکارییەکانی بخاتە بەردەست، بۆ ئەوەی چاویان پێدا بخشێنێت و لێیان بەهرەمەند بێت، (**بِحَيْثُ**) شەرحەکە بە شێوەیەك بێت کە (**لَا أَتَخَطَّى مِنْ تَحْلِيلِ لَفْظِهِ خُطىً كَثِيرَةً**) هەنگاوی زۆر نەهاوێژم لە کاتی شەرحکردن و ڕوونکردنەوەی وانەکان و دەقەکان (**وَلَا أَتَجَاوَزُ عَنْ تَنْقِيحِ مَعْنَاهُ إِلَّا مَسَافَةً يَسِيرَةً**)[1] هەروەها زۆر قووڵ نەبمەوە و دوور نەکەومەوە لە کاتی پوختکردن و ساغکردنەوەی مانای ڕستەکان، تەنها بە ئەندازەی پێویست نەبێت (**وَالْتَزَمْتُ أَنْ أَكْتُبَ أَلْفَاظَ الْمَتْنِ بِتَمامِهَا**) بڕیاریشم وایە کە پابەند بم بەوەی کە لە نێو شەرحەکە دەقی وشەکانی مەتن وەك خۆیان بنووسمەوە (**مِنْ أَوَّلِ كِتابَةِ الشَّرْحِ إِلَى إِتْمامِهَا**) لە سەرەتای شەرحکردنی کتێبەکە تا بە کۆتایی دەگات (**حَتَى يَكُونَ كَالزِّيادَةِ**) بۆ ئەوەی وەکوو شتێکی زیادەی لێ بێت (**لِلْمُتَعَلِّمِ عَلَى التَّعْرِيفِ**) بۆ قوتابی و فێرخوازە خۆشەویستەکان، بۆ زیاتر ئاشنابوون و شارەزابوون لە بابەتەکان و نێوەڕۆکی وانەکان، (**وَيُغْنِيَهُمْ عَنِ النُّسَخِ**) هەروەها بۆیە دەقی مەتنەکە دەنووسمەوە بۆ ئەوەی قوتابییان پێویستیان نەبێ بەم

---

١. بروانە: الزمخشری: ٤٦. وشرح الأنموذج: في النّحو: دراسة و تحقيق، عدنان جاسم محمد، ل،، و٢٠تأريخ الإسلام: للذهبي: ٤٨٨، معجم الأدباء: ٨٥/١٤، و إنباه الرواه: ٣/ ١٢٦، وفيات الأعيان: ١٥٨/٥.

**الَّتِي لَعِبَتْ بِهَا أَيْدِي الْجَهَلَةِ بِالتَّحْرِيفِ، وَأَرْجُو مِنَ اللهِ تَعَالَىٰ أَنْ يُعِينَنِي عَلَى الْإِتْمَامِ، وَيَجْعَلَهُ قَائِدِي إِلَىٰ دَارِ السَّلَامِ، فَإِنَّهُ الْمُسْتَعَانُ، وَعَلَيْهِ التُّكْلَانُ.**

❃ ✹ ❃

نوسخانەی (**الَّتِي لَعِبَتْ بِهَا أَيْدِي الْجَهَلَةِ بِالتَّحْرِيفِ**) کە خەڵکی نەزان بە کەیفی خۆیان لێیان زیاد و کەم کردوون، بەبێ گەڕانەوە بۆ نوسخە بڕواپێکراوەکان و سەرچاوە سەرەکییەکان.

ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: (**وَأَرْجُو مِنَ اللهِ تَعَالَى أَنْ يُعِينَنِي عَلَى الإِتْمَامِ**) ئەپاڕێمەوە و تکاکارم لە خوای پەروەردگار کە هاوکار و یارمەتیدەرم بێت بۆ شەرحکردن و تەواوکردنی ئەم کتێبە (**وَيَجْعَلَهُ قَائِدِي إِلَى دَارِ السَّلَامِ**)[1] وە ئەم شەرح و ڕوونکردنەوەیە بکاتە دەستگر و هۆکار بۆ گەیشتنم بە ڕەزامەندی خوای پەروەردگار و چوونە بەهەشت، (**فَإِنَّهُ الْمُسْتَعَانُ**) چونکە بە دڵنیایی هەر ئەو هاوکار و یارمەتیدەرە بۆ هەموو کارێکی سوودبەخش و بەرهەمدار، (**وَعَلَيْهِ التُّكْلَانُ**)[2] هەروەها تەنها ئەویش پاڵپشت و جێگای ئومێدی خواناس و بڕوادارانە لە ڕاپەڕاندنی کار و ئامانجەکانیان.

* ◌ *

---

١. لێرەدا مەبەست بە وشەی «دارُ السَّلام» بە هەشتی خوای پەروەردگارە، چونکە یەکێك لە ناوەکانی بەهەشت «دارُ السَّلام»ـە، هەروەکوو خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ يَدْعُوٓاْ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَـٰمِ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ سورة يونس: الآية: ٢٥.

٢. مەبەست بە وشەی «التُّكْلانُ» بریتییە لە «تَوَكُّل» کە لە ڕووی زمانەوانی بە مانای «تَفْوِيضُ الأَمْرِ إلى اللّهِ» دێت، هەروەها لە ڕووی «اصطلاح»ـەوە بە مانای «طَرْحُ الْبَدَنِ فِي الْعُبُودِيَّةِ وَتَعَلُّقُ الْقَلْبِ فِي الرُّبُوبِيَّةِ» دێت، هەروەها ئەم وشەیە لە ئەسڵدا «وكلان» بووە، بەڵام لەبەر «قُرْبُ الْمَخْرَجْ» حەرفی «الواو» کراوە بە «التاء» بڕوانە: شرح الأنموذج: تعليق أنور الداغستاني. ل، ٢٢.

# تَعْرِيفُ الْكَلِمَةِ

**قَالَ الْمُصَنِّفُ** ـرَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَىٰـ: **الْكَلِمَةُ مُفْرَدٌ.**

**أَقُولُ: قَبْلَ الشُّرُوعِ فِي الْمَقْصُودِ لَا بُدَّ مِنْ تَقْدِيمِ مُقَدِّمَةٍ، وَهِيَ هٰذِهِ:**

---

## وانەی یەکەم: پێناسەی «الكَلِمَة»

**(قال المُصَنِّف:)** مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: **(الكَلِمَةُ)** وشەی «الكَلِمَة» لە زاراوەی زانایانی زانستی «نَحو»دا بریتییە لەم وشەیە و لەم دەربڕینەی کە لە دەم دەردەچێت و دەلاڵەت لەسەر مانایەکی **(مُفْرَدٌ)**[1] تاك دەكات، وەكوو: وشەی «زید» و وشەی «ضَرَبَ» و وشەی «مِنْ»؛ ئێستا هەر یەکە لەم سێ وشانە بریتین لە دەربڕینێك کە لە دەمی مرۆڤەوە دەرچوون و دەلاڵەت لەسەر مانایەکی تایبەت دەکەن؛ ئینجا جیاوازی نییە ماناکە لە خودی وشەکان وەربگیرێت، وەکوو نموونەی یەکەم و دووەم، یاخود بە هۆی لێکدان و ئاوێتەبوون لەگەڵ وشەیەکیتر ماناکە وەربگیرێت، وەکوو نموونەی سێیەم.

**(أَقُولُ:)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(قَبْلَ الشُّرُوعِ فِي الْمَقْصُودِ)** پێش دەستکردن بە شیکردنەوەی نیاز و مەبەستی وانەکان و شەڕحکردنی بابەتەکان **(لابُدَّ مِنْ تَقْدِيمِ مُقَدِّمَةٍ)** پێویستە وەکوو ئامۆژگاری و بەرچاوڕوونییەك بۆ قوتابییانی زانستە شەرعییەکان پێشەکییەك باس بکەین و تێیدا ئاماژە بە چەند خاڵێك بدەین، کە پێویستە هەموو خوێندکارێك لەبەرچاویان بگرێت **(وَهِيَ هذِهِ)**[2] خاڵەکانیش بریتین لەم چەند ڕێنمایی و ئامۆژگارییەی کە باسیان دەکەین:

---

١. هەرچەند وشەی «مُفْرَد» بەم جۆرە وشانە دەگوترێت کە بەشێك لە «لَفظ»ـەکەی دەلاڵەت نەکات لەسەر بەشێك لە ماناکەی (لا يَدُلُّ جُزءُ لَفظِهِ عَلَى جُزءِ مَعْناهُ)؛ بەڵام من بۆیە لێرەدا بەم شێوەیە مانام کرد، چونکە لەم قۆناغەدا بۆ تێگەیشتن ئاسانترە و باشتریش مانا و مەبەستەکە دەگەیێنێت.

٢. هەرچەندە لە ڕووی ماناوە وشەی «هذِهِ» گوزارشت لە شتێك دەکات کە لە پێشدا باس کرابێت، بەڵام لێرەدا پێدەچێت مامۆستا کتێبەکە و ڕێنماییەکانی تەواو کردبن ئینجا ئەم دەستەواژەیەی بەکار هێنابێت.

**اعْلَمْ أَنَّ طَالِبَ كُلِّ شَيْءٍ يَنْبَغِي أَنْ يَتَصَوَّرَ ذٰلِكَ الشَّيْءَ بِوَجْهٍ مَا، لِأَنَّ الْمَجْهُولَ مِنْ جَمِيعِ الْوُجُوهِ لَا يُمْكِنُ طَلَبُهُ، وَيَنْبَغِي أَيْضاً أَنْ يَتَصَوَّرَ الْغَرَضَ مِنْ مَطْلُوبِهِ؛ لِأَنَّهُ إِنْ لَمْ يَتَصَوَّرْهُ يَكُونُ سَعْيُهُ عَبَثاً،**

(**اعْلَمْ**) بزانە، ئەی قوتابی بەڕێز و فەقێی خۆشەویست:

**یەکەم:(أَنَّ طالِبَ كُلِّ شَيْءٍ)** هەرکەسێك بیەوێت کارێك ئەنجام بدات و شتێك بەدەست بێنێت ـ جیاوازی نییە شتەکە زانست و زانیاری بێت یاخود هەرکارێکی‌تری ڕۆژانە بێت ـ (**يَنْبَغِي أَنْ يَتَصَوَّرَ أَوَّلاً ذٰلِكَ الشَّيْءَ**) پێویستە سەرەتا بە باشی بیر لە خودی شتەکە بکاتەوە و هەڵسەنگاندنێکی وردی بۆ بکات(**بِوَجْهٍ ما**) بە ڕێگایەك لە ڕێگاکان و بە جۆرێك لە جۆرەکان، چونکە هەر شتە و ڕێگایەکی تایبەتی خۆی هەیە بۆ سەرنجدان و بیرلێکردنەوە، بۆیە دەبێت ئەم ڕێگا تایبەتە هەڵبژێرێت کە گونجاوە لەگەڵ شتەکە،(**لأَنَّ المَجْهُولَ مِنْ جَمِيعِ الْوُجُوهِ لا يُمْكِنُ طَلَبُهُ**) چونکە شتی نادیار و بیرلێ‌نەکراوە (مجهول) لە هەموو ڕوویەکەوە ناکرێت و ناگونجێت هیچ کەسێك داوای بکات و بەدەستی بێنێت، وەکوو کەسێك سەردانی شوێنێکی کردبێت و هیچ بیری لە شوێنەکە و مەبەستی سەردانەکە نەکردبێتەوە، ئەو کەسە ناتوانێت لە گەشتەکەیدا هیچ شتێك بەدەست بهێنێت، بەڵکوو سەرگەردان و مایەپووچ دەبێت.

**دووەم: (وَيَنْبَغِي أَيْضاً)** هەروەها پێویستە لەسەر ئەو کەسەی داوای شتێك دەکات و دەیەوێت بەدەستی بێنێت(**أَنْ يَتَصَوَّرَ الْغَرَضَ مِنْ مَطْلُوبِهِ**) بیر لە ئامانج و مەبەستی ئەو شتە بکاتەوە کە دەیەوێت دەستی بخات و هەوڵی بۆ دەدات و کاتی خۆی لە پێناودا سەرف دەکات،(**لأَنَّهُ إِنْ لَمْ يَتَصَوَّرْهُ يَكُونُ سَعْيُهُ عَبَثاً**) چونکە ئەگەر بێت و زۆر بە باشی بیری لێ نەکاتەوە و ئامانجێکی ڕۆشن و مەبەستێکی دیاریکراوی نەبێت، ئەو کاتە هەموو هەوڵ و کۆششی بە خەسار دەچێت و مایەپووچ دەبێت، وەکوو ئەو کەسەی شتێك دەکڕێت و نازانێت چۆن و بۆچی بەکار دێت، ئەو کاتە بیر دەکاتەوە کە هەم پارە و هەم کاتی بە فیڕۆ چووە، بەڵام پاش چی؟

ئینجا پاش ئەم دوو پێشنیار و ئامۆژگارییە بەسوودە، مامۆستا دەفەرموێت:

**فَطَالِبُ النَّحْوِ بِتَعَلُّمِهِ يَنْبَغِي أَنْ يَتَصَوَّرَهُ أَوَّلاً، وَيَتَصَوَّرَ الْغَرَضَ مِنْهُ قَبْلَ تَعَلُّمِهِ، حَتَّىٰ يَكُونَ فِي طَلَبِهِ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ.**

## [ تَعْرِيفُ النَّحْوِ في اللُّغَةِ ]

**فَنَقُولُ: النَّحْوُ فِي اللُّغَةِ:**

---

**(فَطالِبُ النَّحْوِ بِتَعَلُّمِهِ)** کەواتە ئەو قوتابییەی کە دەیەوێت فێری زانستی ڕێزمانی عەرەبی (نحو) بێت و شارەزایی لەم زانستەدا پەیدا بکات، **(يَنْبَغِي أَنْ يَتَصَوَّرَهُ أَوَّلاً)**[1] پێویستە سەرەتا و یەکەم جار بە وردی بیر بکاتەوە کە زانستی ڕێزمانی عەرەبی (نحو) چییە؟ پاشان بیر لە ڕێگاکانی فێربوونی ئەم زانستە بکاتەوە و بزانێت کامە کتێب بەسوود و قازانجە لە سەرەتا بخوێندرێت و کامە مامۆستا لەم بوارەدا شارەزاییەکی باشی هەیە بۆ ئەوەی لە خزمەتی دەست بە فێربوونی ئەم زانستە بکات، **(وَيَتَصَوَّرَ الْغَرَضَ مِنْهُ)** ئینجا دووەم جار بیر لە ئامانج و مەبەستی فێربوونی ئەم زانستە بکاتەوە، دەبێت بزانێت فێربوونی ئەم زانستە چ سوود و قازانجێکی هەیە **(قَبْلَ تَعَلُّمِهِ)** پێش ئەوەی خۆی فێری ئەم زانستە بکات **(حَتَّى يَكُونَ فِي طَلَبِهِ على بَصِيرَةٍ)**[2] بۆ ئەوەی لە کاتی داواکردن و سەرقاڵبوون بە فێربوونی ئەم زانستە بەرچاوی ڕوون و ڕۆشن بێت و بزانێت چی دەخوێنێت و چۆن دەخوێنێت و لەلای کێ دەخوێنێت.

## پێناسەی زانستی «نَحْو» لە ڕووی زمانەوانییەوە

**(فَنَقُولُ:)** ئینجا پاش ئەوەی کە زانیت هەر کارێك مرۆڤ ئەنجامی دەدات دەبێت هەم بیر لە کارەکە و هەم بیر لە ئامانجەکەی بکاتەوە، ئێمە لە پێناسەی زانستی ڕێزمانی عەرەبیدا دەڵێین:

**(النَّحْوُ فِي اللُّغَةِ:)** وشەی «نَحْو» لە ڕووی زمانەوانییەوە بە چەند مانایەکی جیاواز

---

١. پێناسەی وشەی «تَصَوُّر» بریتییە لە «قُوَّةٌ لِلنَّفْسِ تُدْرَكُ بِها اَلْمَعْقُولاتُ». بەڵام وشەی «اَلْبَصَرُ» بریتییە لە «قُوَّةٌ لِلْعَيْنِ تُدْرَكُ بِهَا الْمَحْسُوساتُ» هەر بۆیە زانایان گوتوویانە: «اَلْبَصِيرةُ لِلْقَلْبِ بِمَنْزِلَةِ الْبَصَرِ لِلْعَيْنِ». بڕوانە: شرح الأنموذج: في النّحو: دراسة و تحقيق، عدنان جاسم محمد، ل، ٢٥،

٢. بڕوانە: شرح ابن عقيل ل (١٤) .

**الْقَصْدُ. وَفِي عُرْفِ النُّحَاةِ: عِلْمٌ بِأُصُولٍ تُعْرَفُ بِهَا أَحْوَالُ أَوَاخِرِ الْكَلِمِ إِعْرَاباً وَبِنَاءً.**

بەکار دێت بەم شێوەیەی خوارەوە:

**یەکەم:** وشـەی «النَّحْوُ» بە مانای ویسـت و مەبەسـت **(اَلْقَصْدُ)** بەکار دێت چونکە زۆرجـار کـە عـەرەب دەڵێـن «نَحَوْتُكَ» بـە مانـای «قَصَدْتُكَ» بـە کاردێـت، یاخـود کە دەڵێن «نَحَوْتُ فُلاناً، أَيْ: قَصَدْتُهُ» واتە: ویستم سەردانی فلانە کەس بکەم.

**دووەم:** وشـەی «النَّحْوُ» بـە مانـای ڕووەو لا (الجِهَةُ) بەکار دێـت، چونکە زۆر جار کـە عـەرەب دەڵێـن «ذَهَبْتُ نَحْوَ فُلانٍ»[1] واتە: من ڕۆیشـتم بـەرەو ڕووی فلانە کەس، مەبەست لە وشەی «نحْوُ» لەم ڕستەیەدا بریتییە لە ڕووەو لا (الجِهَة).

**سێیەم:** هەروەهـا وشـەی «النَّحْوُ» لـە زمانـی عەرەبیـدا بـە مانـای هاوونـە و هاوشـێوەش (الشِّبْهُ وَالْمِثْلُ) دێـت، چونکـە کاتێـك عـەرەب دەڵێـن: «مُحَمَّدٌ نَحْوُ الأَسَدِ» مەبەستیان ئەوەیە «أَيْ شِبْهُهُ وَمِثْلُهُ»[2] واتە: موحەممەد وەکوو شێر وایە لە چاونەترسیدا.

پاش ئەوەی لە ڕووی زمانەوانییەوە پێناسەی وشەی «نحو»ت زانی، ئینجا مامۆستا دێتە سەر ڕوونکردنەوەی پێناسەی «نَحْو» لە ڕووی زاراوەییەوە و دەفەرموێت: **(وَفِي عُرْفِ النُّحاةِ:)**[3] پێناسەی وشەی «نَحْو» لە زاراوەی زانایانی ڕێزمانی عەرەبیدا بریتییە لە **(عِلْمٌ بِأُصُولٍ)** هەبوونی زانست و زانیاری بە کۆمەڵێك بنچینە (أُصُول)ی سەرەکی و بنەمـا (قاعِـدَة)ی گشـتی، کـە **(تُعْرَفُ بِها)** بە هۆی ئەم بنچینـە و بنەمایانە زانیاری و شارەزاییت پەیدا دەبێت لەسەر **(أَحْوالُ أَواخِرِ الْكَلِمِ)** شێوازی خوێندەنەوەی کۆتایی وشەکانی زمانی عەرەبی **(إِعْراباً)** هەم لە ڕووی «إِعْراب»ـەوە **(وَبِناءً)** هەم لە ڕووی «مَبْنِي»ـیایەتییەوە، واتە: بە هۆی ئەو یاسـا و ڕێسـایانەوە شـارەزا دەبیت لە شێوازی

---

١. بڕوانە: الموسوعة الشّاملة في النحو والصّرف: ل، ٢٠. ٢. بڕوانە: لسان العرب: ٨/ ١٢٦.

٣. وشەی «النُّحاةِ» کۆ (جَمْع)ی وشەی «ناحٍ»ـە هەر وەکو چۆن وشـەی «غُزاةُ» و «دُعاة» کۆی وشـەی «غازٍ» و «داعٍ»ن هەروەها ئەصلی وشـەی «نحاة» بریتییە لە «نُحَوَةٌ» هەر وەکو چۆن وشـەی «غُزاةُ» بریتـی بـووە لـە «غُزَوَةٌ» لە هەردوو وشـەکان قەلبـی واوەکە کراوە بە ئەلـف چونکە حەرفی پێش خۆی «مَفْتُوح»ـە. بڕوانە: شرح الأنموج فی النّحوِ، ل، ٢٥.

## [ فائِدَةُ مَعْرِفَةِ عِلْمِ النَّحْوِ ]

**وَالْغَرَضُ مِنْهُ: مَعْرِفَةُ الْإِعْرَابِ. وَالْإِعْرَابُ لَا يُوجَدُ إِلَّا فِيمَا يَقَعُ فِي التَّرْكِيبِ الْإِسْنَادِيِّ الَّذِي لَا يُوجَدُ إِلَّا فِي الْكَلَامِ. وَالْكَلَامُ إِنَّمَا يَتَرَكَّبُ مِنْ كَلِمَتَيْنِ، فَلِذٰلِكَ**

---

خوێندنەوەی کۆتایی وشـەکانی زمانی عەرەبی و هەم دەزانیت کامە وشـە «مُعْرَب» و کامە وشە «مَبْنِي»ـیە.

### سوود و قازانجی فێربوونی زانستی «نَحو»

**(وَالْغَرَضُ مِنْهُ)** سـوود و قازانجـی فێربوونـی زانسـتی «نحـو» بریتییـە لـە **(مَعْرِفَةُ الإِعْرابِ)** فێربوون و شارەزابوونی شێوازی خوێندنەوەی زمانی عەرەبی بە شێوازێکی ڕاست و ڕەوان، کـە پێـی دەگوترێـت «إعـراب»، هەروەهـا پاراسـتنی زمانـە لـە هەڵـە و کەموکووڕی لـە کاتـی خوێندنـەوەی عەرەبـی و شـارەزابوونە لـە قورئـان و سـوننەتی پێغەمبەرﷺ هـەروەك بەشـێك لـە زانایـان ئـاوا دەفەرمـوون: «**وَفائِدَتُـهُ: صِيانَـةُ اللِّسانِ عَنِ الْخَطَأِ في الكَلامِ الْعَرَبِيِّ وَفَهْمُ الْقُرْآنِ وَالْحَديثِ النَّبَوِيِّ فَهْماً صَحِيحاً**»[1].

ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: **(وَالإِعْرابُ لا يُوجَدُ)** ناسینی «إعـراب» دەست ناکەوێت **(إِلّا فِيما يَقَعُ فِي التَّرْكِيبِ الإِسْنادِيِّ)** تەنها لە ڕستـەیەك نەبێت کە لێکدراو بێت لە دوو وشە یاخود زیاتر، بەم مەرجەی کە پاڵدان (إِسْناد) لە نێوان ئەم دوو وشەیە هەبێـت، واتـە: ئیعـراب تەنها لە «المُرَكَّب الإِسْـنادِي» دەسـت دەکەوێت؛ هەریەکە لە «المُرَكَّبُ الإِضافِيُّ» و «المُرَكَّبُ المَزْجِيّ» ...هتـد، ئیعرابیـان تێدا دەسـت ناکەوێ، بۆیـە «کلام»ـیان لـێ دروسـت نابێـت **(اَلَّذِي لا يُوجَدُ إِلّا فِي الكَلامِ)** ئـەو «التّركيب الإسنادي»ـیەش دەست ناکەوێت تەنها لە کەلامدا نەبێت **(وَالكَلامُ إِنَّما يَتَرَكَّبُ مِنَ الْكَلِمَتَيْنِ)** وە کەلامیش پێک نایێت مەگەر لە دوو کەلیمە نەبێ.

جـا بۆچـی لە سـەرەتای هەمـوو کتێبە نەحوییەکان باسـی «كَلِمَـة» و «كَلام» پێش خـراون؟ **(فَلِذلِكَ)** ئینجـا لـە بەر ئەوەی ئامانج لە خوێندنی زانسـتی «نحو» بریتییە لە

---

١. بڕوانە: التّحفة السّنيّة: ل (٦)

**جَرَتْ عَادَتُهُمْ فِي تَرْتِيبِ الْكُتُبِ النَّحْوِيَّةِ بِتَقْدِيمِ الْكَلِمَةِ وَالْكَلَامِ عَلَىٰ سَائِرِ الْأَشْيَاءِ، وَبِتَقْدِيمِ الْكَلِمَةِ عَلَى الْكَلَامِ، لِأَنَّهَا جُزْؤُهُ كَمَا عَرَفْتَ، وَالشَّيْءُ إِنَّمَا يُعْرَفُ بَعْدَ مَعْرِفَةِ أَجْزَائِهِ.**

**فَقَوْلُهُ: «الْكَلِمَةُ مُفْرَدٌ»،**

---

فێربوونی «إِعْراب»، وە ئیعرابیش دەست ناکەوێت تەنها لە «المُرَكَّب الإِسْنادِي»ی نەبێت، وە هەروەها «المُرَكَّب الإِسْنادِي»ـیش دەست ناکەوێت تەنها لە «کلام» نەبێت، هەر بۆیە **(جَرَتْ عادَتُهُمْ)** لەلای زانایانی زانستی «نحو» بۆتە نەریت **(فِي تَرْتِيبِ الْكُتُبِ النَّحْوِيَّةِ)** لە کاتی دانان و شەرحکردن و ڕێکخستنی پەرتووکەکان لە زانستی «نحو»دا **(بِتَقْدِيمِ الْكَلِمَةِ وَالكَلامِ عَلى سائِرِ الأَشْياءِ)** بە پێشخستنی بابەتەکانی تایبەت بە «كَلِمَة» و «كَلام» لەسەر گشت بابەتەکانی تری پەیوەست بەم زانستە، **(وَبِتَقْدِيمِ الْكَلِمَةِ عَلى الْكَلامِ)** هەروەها بە پێشخستنی پێناسە و بابەتەکانی تایبەت بە «كَلِمَة» و جۆرەکانی لەسەر پێناسە و بابەتەکانی تایبەت بە «کلام»، لەبەر چی؟ **(لأَنَهُ جُزْؤُهُ)** چونکە «كَلِمَة» بەشێکە لە «کلام» و پێکهاتەی سەرەکی هەموو کەلامێك بریتییە لە چەند کەلیمەیەك **(كَما عَرَفْتَ)** هەروەکوو کەمێك لەمەوپێش زانیت کە گوتمان: **(وَالشَّيْءُ)** سروشتی هەموو شتێکیش وایە کە لە چەند بەشێك پێك هاتبێت **(إِنَّما يُعْرَفُ)** تەنها ئەو کاتە بە شێوەیەکی ڕاست و دروست باش دەناسرێت و دەزاندرێت **(بَعْدَ مَعْرِفَةِ أَجْزائِهِ)** پاش ئەوەی هەموو بەشەکانت بە شێوەیەکی باش ناسین و شارەزایت لە بارەیانەوە پەیدا کرد، کەواتە تۆ ئەوکاتە شارەزاییت لە کەلامدا دەست دەکەوێت کە بە باشی هەموو بەشەکانی «كَلِمَة» کە بریتین لە «اسْم، فِعْل، حَرْف» بزانیت، هەم لە ڕووی پێناسە هەم لە ڕووی تایبەتمەندییەکانیانەوە.

ئینجا پاش ئەوەی مامۆستا باسی پێناسەی زانستی «نحو»ی کرد و هەروەها باسی سوود و قازانجی فێربوونی ئەم زانستەی ڕوون کردەوە، ئینجا دێتە سەر شەرحکردنی وانەی «قال»ی یەکەم و ڕوونکردنەوەی مەبەستی «مُصَنِّف»، وە دەفەرموێت: **(فَقَوْلُهُ:)** مەبەستی مامۆستا کە لە «قال»ی یەکەم دەفەرمووێت: **(اَلْكَلِمَةُ مُفْرَدٌ)** واتە: وشەی

**تَقْدِيرُهُ: «الْكَلِمَةُ لَفظٌ مَوْضُوعٌ مُفْرَدٌ»؛ فَيَخْرُجُ بِـ «اللَّفظِ» غَيْرُهُ،**

«كَلِمَةَ» بريتييه له دەربڕينێك كه گوزارشت له مانايەكی تاك بكات، **(تَقْدِيرُهُ:)** ئەم ڕستەيە له «تَقْدِير»دا ئاوای لێ دێتەوە «الْكَلِمَةُ» واتە: وشەی «كَلِمَة» له لای زانايانی «نحو» بريتييه له **(لَفظٌ)**[1] وشەيەك و دەربڕينێك كه له دەم دەربچێت، **(مَوْضُوعٌ)** دەبێت ئەم وشەيە داندرابێت له سەرەتادا بەرامبەر بە مانايەك **(مُفْرَدٌ)** هەروەها دەبێت ئەم مانايە تاك بێت و تەنها به يەك شت بگوترێت، كەواتە وشەی «كَلِمَة» له لای زانايانی «نحو» به دەربڕينێك ياخود به وشەيەك دەگوترێت كه ئەم سێ مەرجەی تێدا بێت:

**يەكەم:** «لَفْظٌ» [2] دەبێت بريتی بێت له وشەيەک و دەربڕينێک كه له دەم دەردەچێت.

**دووەم:** «مَوْضُوعٌ» دەبێت ئەم وشەيە داندرابێت بەرامبەر بە مانايەک، هەركاتێک بەكار هات دەبێت دەلالەت لەسەر ئەو مانايە بكات.

**سێيەم:** «مُفْرَدٌ» هەروەها دەبێت ئەم وشەيە تاک بێت و تەنها بە يەک شت بگوترێت و بەرامبەر بەو شتە بەكار بێت كه بۆی داندراوە، وەكوو وشەی «زيد».

**سەرنج بدە:** ئێستا ئەم وشەيە پێی دەگوترێت «كَلِمَة» چونكە ئەم وشەيە بريتييه له دەربڕينێک كه له دەم دەرچووە، هەروەها داندراوە بەرامبەر بە مانايەک، چونكە ئەم وشەيە لە ڕووی ماناوە دەلالەت لەسەر كەسێكی دياريكراو دەكات و ماناكەشی تاكە (مُفْرَد)، كەواتە: هەر وشەيەک ئەم سێ مەرجەی تێدا بوو و بەم جۆرە بوو كه باسمان كرد، ئەوە پێی دەگوترێت «كَلِمَة»؛ بەڵام ئەگەر بێت و يەكێک لەم سێ مەرجەی تێدا نەبوو، ئەو كاتە پێی ناگوترێت «كَلِمَة»، هەرچەندە ماناش ببەخشێت و له دەمی مرۆڤيشەوە دەرچوو بێت. بۆيە مامۆستا دەفەرموێت: **(فَيَخْرُجُ بِاللَّفظِ)** كەواتە: بەم بڕگەيەی كه گوتمان ـ «كَلِمَة» به وشەيەک دەگوترێت كه له دەم دەرچوو بێت ـ له ژێر پێناسەی «كَلِمَة» دەردەچن **(غَيْرُهُ)** هەموو ئەم وشە و هێمايانەی كه دەلالەت لەسەر مانايەک دەكەن، بەڵام له دەم دەرنەچوون، كه بريتين لەم چوار شتە:

---

١.بڕوانە: البهجة المرضيّة: ل (٧) .

٢.بڕوانە: شرح ابن عقيل ل (١٤).

**كَالْخَطِّ وَالْعُقَدِ وَالنُّصَبِ وَالْإِشَارَةِ. وَبِـ «الْمَوْضُوعِ»**

**یەکەم: (كَالْخَطِّ)** وەکوو ڕاکێشانی هێڵێک لە نێوان دوو نووسین کە ئەم خەتە دەلالەت دەکات لەسەر ئەوەی کە ئەمەی لە ژێر خەتەکە نووسراوە، پێی دەگوترێت «حاشیة»، ئێستا هەرچەندە ئەم هێڵە دەلالەت لەسەر ئەم مانایە دەکات، بەلام پێی ناگوترێت «كَلِمَة»، چونکە لە دەم دەرنەچووە، هەروەها هەموو ئەم هێڵ و نووسینانەی کە پۆلیسی هاتوچۆ لەسەر شەقامەکان دایانناون و دروستیان دەکات، هێما و نووسینی مانادار و واتابەخشن، بەلام چونکە لە دەم دەرنەچوون پێیان ناگوترێت «كَلِمَة».

**دووەم: (وَالْعُقَدِ)**[1] هەروەها وەکوو ئاماژەدان بە لکاندنی پەنجەی شەهادە بە پەنجەی گەورەوە بە شێوەی بازنەیی، وەکوو ئاماژەیەک کە ئەم شتە نرخی پەنجاوسێ دینارە، یاخود ئاماژەکانی ئەو کەسەی کە توانای قسەکردنی نییە، بێگومان هەموو ئاماژەکانی مانای تایبەت و جیاواز دەبەخشن، بەلام پێیان ناگوترێت «كَلِمَة» چونکە لە دەم دەرنەچوون.

**سێیەم: (وَالنُّصَبِ)** هەروەها وەکوو دانانی قوجەکە لە نێو زەوی و باخەکاندا، یاخود دانانی هێماکان لەم شوێنانەی کە بە مین چێندراون، وەیا خود هێماکانی ئاماژەدان لەسەر تابلۆی هەڵواسراوی نێو شەقامەکان کە ئاراستەی شوێنەکان و ئەندازەی دووریی نێوان شارەکان بۆ شوفێران دیاری دەکات، هیچکام لەمانە لە لای زانایانی «نحو» پێیان ناگوترێت «كَلِمَة»، ئەگەرچی ماناش دەبەخشن؛ لەبەر چی؟ چونکە لە دەم دەرنەچوون.

**چوارەم: (وَالإِشارَةِ)** هەروەها وەکوو ئاماژەدان بۆ کەسی بەرامبەر بە ئەندامەکانی جەستە، وەکوو ئاماژەی هاتن و ڕۆویشتن و ترساندن و ئاگادارکردنەوە و خۆشویستن و...هتد؛ هیچکام لەم ئاماژانە پێیان ناگوترێت «كَلِمَة» چونکە لە دەم دەرنەچوون، هەرچەندە لە وشە بەهێزترن.

**(وَبِالْمَوْضُوعِ:)** هەروەها بەم بڕگەیەی کە گوتمان «كَلِمَة» لەلای زانایانی «نحو»

---

١. وشەی «اَلْعُقَدُ» کۆی «جَمْع»ی وشەی «عُقْدَة»یە. بڕوانە: ملا جامي ل(٥) و البهجة المرضية: ل(٧)

**الْمُهْمَلُ، كَـ «دَيْزٍ» وَ«بَيْزٍ»؛ وَبِـ «الْمُفْرَدِ» الْمُرَكَّبُ،كَـ «خَمْسَةَ عَشَرَ».**

بە وشەیەک دەگوترێت کە بۆ مانا و مەبەستێک داندرابێت و هەرکاتێک باس کرا گوزارشتی لێ بکات؛ بەم بڕگەیە لە ژێر پێناسەی «کَلِمَة» دەردەچێت **(اَلْمُهْمَلُ)** هەموو ئەم وشانەی کە گوزارشت (دِلالَة) لە هیچ مانا و مەبەستێک ناکەن **(كَدَيْزٍ وَ بَيْزٍ)** وەکوو وشەی «دَيْزٍ» و وشەی «بَيْزٍ».

**سەرنج بدە:** ئەی خوێنەری بەڕێز، ئێستا ئەم دوو وشەیە بەرامبەر بە هیچ مانایەک دانەندراون و گوزارشت لە هیچ مانا و مەبەستێک ناکەن، بۆیە پێیان ناگوترێت «كَلِمَة»[1].

**ئینجا بزانە:** نەک هەر ئەم دوو وشەیە، بەڵکوو هەر وشەیەک بەرامبەر بە مانایەک دانەندرابێت ئەوە لەلای زانایانی زانستی «نحو» پێی ناگوترێت «كَلِمَة» هەرچەندە لە چەند پیتێکیش پێک هاتبێت، وەکوو «هەلەلە» و «بەلەلە» و...

**(وَبِالْمُفْرَدِ:)** هەروەها بەم بڕگەیەی کە گوتمان، «كَلِمَة» لەلای زانایانی «نحو» بە وشەیەک دەگوترێت کە تاک (مُفْرَد) بێت و دەلالەت لەسەر یەک مانا و یەک شت بکات، لە یەک بڕگە پێک هاتبێت؛ بەم بڕگەیە لە ژێر پێناسەی «كَلِمَة» دەردەچێت **(اَلْمُرَكَّبُ)**[2] هەموو ئەو وشانەی لە بڕگەیەک زیاتر پێک هاتوون و دەلالەت لەسەر دوو شت یاخود دوو مانا دەکەن، **(كَـ)** وەکوو ئەو ڕستەیەی کە لێکدراوە لە دوو وشەی مانادار **(خَمْسَةَ عَشَرَ)** واتە: پانزە یاخود «سَبْعَةَ عَشَرَ» ...هتد.

**سەرنج بدە:** ئێستا ئەم دوو دەستەواژەیە کە لە دوو بڕگە لێک دراون، هەرچەندە ئەوەی یەکەم دەلالەت لەسەر ژمارەی پانزە و ئەوەی دووەم دەلالەت لەسەر ژمارەی حەڤدە دەکات، بەڵام پێیان ناگوترێت «كَلِمَة»، چونکە لە بڕگەیەک زیاتر پێک هاتوون کە بریتین لە وشەی «خَمْسَةَ، وَسَبْعَةَ» لەگەڵ وشەی «عَشَرَ».

**ئینجا بزانە:** جیاوازی نییە ئەم دەستەواژەیەی کە لە دوو بڕگە پێک هاتووە نیسبەت

---

١. وشەی «النُّصَبُ» کۆی وشەی «اَلنَّصْب، وَهِيَ: كُلُ ما نُصِبَ، فَجُعِلَ عَلَماً، وَهِيَ عَلامَةٌ تُنْصَبُ لِلْقَوْمِ». بڕوانە: شرح الأنموذج في النَّحْو، تعليق الشيخ سيد مسلم ل ٢٥.

٢. بڕوانە: ملا جامي (٥)

**وَ إِنَّمَا قُلْنَا: أَنَّ الْمُهْمَلَ يَخْرُجُ بِقَيْدِ «الْمَوْضُوعِ»، لِأَنَّ الْمَوْضُوعَ لَا يَكُونُ إِلَّا لِمَعْنًى، وَالْمُهْمَلَ لَا مَعْنَى لَهُ.**

**وَ إِنَّمَا حُذِفَ قَوْلُنَا: «لَفْظٌ مَوْضُوعٌ»، لِدَلَالَةِ قَوْلِهِ: «مُفْرَدٌ» عَلَيْهِ،**

و ئیسنادیان لە نێواندا هەبێت، وەکوو «زَيْدٌ قائِمٌ» یاخود نیسبەت و «إِسْناد»یان لە نێواندا نەبێت وەکوو «خَمْسَةَ عَشَرَ» لە هەردوو کاتدا هەر پێیان ناگوترێت «کَلِمَة» چونکە «مُفْرَد» نین.

ئینجا مامۆستا دوو پرسیار دەکات و وەڵامیان دەداتەوە، لە **پرسیاری یەکەم** دەفەرموێت: **(وَ إِنَّما قُلْنا: أَنَّ الْمُهْمَلَ)**[1] ئێمە بۆچی گوتمان هەموو ئەم وشانەی کە بێ‌مانان «مُهْمَل»ـن و گوزارشت لە هیچ مەبەستێک ناکەن **(يَخْرُجُ بِقَيْدِ الْمَوْضُوعِ)**[2] لە ژێر پێناسە «کَلِمَة» دەردەچن بە باسکردن و گوتنی بڕگەی «مَوْضُوعٌ»؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: **(لأَنَّ الْمَوْضُوعَ لا يَكُونُ إِلّا لِمَعْنى)** چونکە هەرکاتێک وشەی «مَوْضُوعٌ» گوترا، ئەوە حەتمەن دەلالەت لەسەر مانایەک دەکات **(وَالْمُهْمَلُ لا مَعْنى لَهُ)**[3] لە کاتێکدا ئەم وشانەی کە «مُهْمَل»ـن دەلالەت لەسەر هیچ مانایەک ناکەن و بەرامبەر بە هیچ مانایەک دانەندراون، هەر بۆیە لە ژێر پێناسەی «کَلِمَة» دەردەچن، بە گوتنی وشەی «مَوْضُوعٌ».

**پرسیاری دووەم**، دەفەرموێت: **(وَ إِنَّما حُذِفَ قَوْلُنا:)** لەبەر چی ئەم ڕستەیەی کە دەفەرموێت: **(لَفْظٌ مَوْضُوعٌ)** لەناو «قال»ی یەکەم لابردراون و «حَذْف» کراون واتە: باسیان نەکراوە؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: **(لِدَلالَةِ قَوْلِهِ:)** چونکە ئەم وشەیەی کە مامۆستا فەرمووی: لە نێو «قال»ی یەکەم: «اَلْکَلِمَةُ **(مُفْرَدٌ)**» لەوێدا وشەی «مُفْرَدٌ» دەلالەت دەکات **(عَلَيْهِ)** لەسەر بڕگەی «لَفْظٌ مَوْضُوعٌ»، لەبەر چی

١. زانایانی زمانەوانی لە پێناسەی وشەی «اَلْمُهْمَلُ» دەفەرموون «وَهُوَ مَا لَمْ يُوضَعْ لِمَعْنىً» واتە «مُهْمَل» بە هەموو ئەم وشانە دەگوترێت کە بەرامبەر بە هیچ مانایەک دانەندراون، (وَهِيَ الأَلْفاظ الْغَيْرُ الدّالةُ عَلَى مَعْنىً بِالْوَضْعِ) بڕوانە: التعريفات للجرجاني: دار الكتب العلمية، ل، ٣٠٤.

٢. بڕوانە: شرح ابن عقيل ل (١٤).

٣. بڕوانە: البهجة المرضية: ل (٧).

**لِأَنَّ «الْمُفْرَدَ» لَا يُوصَفُ بِهِ فِي اصْطِلَاحِ النَّحْوِيِّينَ إِلَّا اللَّفْظُ الْمَوْضُوعُ.**

دەلالەتی لەسەر دەکات؟ (**لأَنَّ الْمُفْرَدَ لا يُوصَفُ بِهِ فِي اصْطِلاحِ النَّحْوِيِّينَ**) چونکە وشەی «مُفْرَدٌ» هیچ شتێکی پێ وەسف ناکرێت و نابێت بە سیفەت لەبۆ وشەی «اَلْكَلِمَةُ» لەلای زانایانی زانستی «نحو»، (**إِلّا اللَّفْظُ الْمَوْضُوعُ**)[1] مەگەر ئەو کاتە نەبێت کە دەلالەت بکات لەسەر وشەیەک کە لە دەم دەرچووبێت و دەلالەت بکات لەسەر مانایەک، کە ئەم دوو بڕگەیەی «اللَّفْظَ الْمَوْضُوعَ» دەگرێتەوە واتە: پێناسەی وشەی «مُفْرَدٌ» لە لای زانایانی «نحو» جیاوازە لە پێناسەی زانایانی زمانەوانی (اللّغة) چونکە لەلای زانایانی «نحو» وشەی «مُفْرَدٌ» ئەو کاتە پێی دەگوترێت «مُفْرَدٌ»، کە لە دەم دەرچووبێت و هەروەها دەلالەت لەسەر مانایەک بکات و داندراو بێت بەرامبەر ئەو مانایە... هەر بۆیە کە مامۆستا لە «قال»ی یەکەم گوتی «اَلْكَلِمَةُ مُفْرَدٌ»[2] هەردوو وشەی «اللّفْظُ الْمَوْضُوعُ» دەگرێتەوە، بەلام ئەگەر بەم شێوەیە نەبوو، واتە: وشەی «مُفْرَدٌ» دەلالەتی نەکرد لەسەر«اللّفْظُ الْمَوْضُوعُ» ئەو کاتە پێی ناگوترێت «مُفْرَدٌ» لەلای زانایانی «نحو»، هەرچەندە لەلای خەلکیتریش بە «مُفْرَدٌ» حیساب بکرێت.

* ◌ *

---

١. بڕوانە: البهجة المرضية: ل (٧)

٢. بڕوانە: بڕوانە: هەمان سەرچاوە (١٣).

# أَقْسَامُ الْكَلِمَةِ

**قَالَ: وَهِيَ إِمَّا اسْمٌ، كَـ «رَجُلٍ»، وَإِمَّا فِعْلٌ، كَـ «ضَرَبَ»، وَإِمَّا حَرْفٌ، كَـ «قَدْ».**
**أَقُولُ: يَعْنِي أَنَّ أَقْسَامَ الْكَلِمَةِ مُنْحَصِرَةٌ فِي هٰذِهِ الثَّلَاثَةِ؛**

## وانەی دووهەم: بەشەکانی «كَلِمَة»

ئینجا پاش ئەوەی مامۆستا باسی پێناسەی «كَلِمَة»ی بە درێژی ڕوون کردەوە، ئینجا دێتە سەر باسی ڕوونکردنەوەی بەشەکانی «كَلِمَة» لەلای زانایانی زانستی «نحو»، **(قال:)** مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: **(وَهِيَ)** واتە: ئەم وشەیەی کە لە دەم دەردەچێت و دەلاڵەت لەسەر مانایەک دەکات ـ کە پێی دەگوێرێت «كَلِمَة»ـ سێ جۆری هەیە: **(إِمَّا اِسْمٌ)** یاخود پێی دەگوترێت «اِسْم» **(كَرَجُلٍ)** وەکوو وشەی «رَجُل» کە ناوە بۆ ڕەگەزی نێر لە نەوەکانی ئادەمعَلَيْهِ السَّلَامُ **(وَ إِمَّا فِعْلٌ)** یاخود پێی دەگوترێت «فِعْل» **(كَضَرَبَ)** وەکوو وشەی «ضَرَبَ» کە فیعلی «ماضي»ـیە، بە مانای «لێدان» دێت لە زەمانی ڕابوردوودا؛ **(وَ إِمَّا حَرْفٌ)** یاخود پێی دەگوترێت «حَرْف» **(كَقَدْ)**[1] وەکوو وشەی «قَدْ» کە بۆ پێنج مانای جیاواز بەکار دێت، دواتر بە نموونەوە ڕوونیان دەکەینەوە.

**(أَقُولُ:)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(يَعْنِي أَنَّ أَقْسامَ الكَلِمَةِ مُنْحَصِرَةٌ فِي هذِهِ الثَّلاثَةِ)** ئەم قسەیەی مامۆستا ئەوە دەگەیەنێت کە

---

١. بزانە وشەی «قَدْ» لە زمانی عەرەبیدا پێنج مانا دەبەخشێت، بەپێی سیاقی ڕستەکە، ئەگەر وشەی «قَدْ» بچێتە سەر «الفِعْلُ الْمَاضِي» دوو مانا دەبەخشێت، **یەکەم:** «التَّحْقِيقُ» واتە: تەئکید و دڵنیایی، وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا﴾ [الشمس: ٩] یاخود وەکوو ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ﴾ [مجادلة: ١] **دووەم:** «التَّقْرِيبُ» واتە: نزیکبوونەوە، وەکوو «قَدْ قَامَتِ الصَّلاةُ». هەروەها ئەگەر وشەی «قَدْ» بچێتە سەر «الفِعْلُ الْمُضارِع» سێ مانا دەبەخشێت، **یەکەم:** «التَّقْلِيلُ»: واتە بە ڕێژەیەکی کەم، وەکوو: «قَدْ يَصْدُقُ الكَذُوبُ» یاخود وەکوو: «قَدْ يُنْفِقُ الْبَخِيلُ». **دووەم:** «التَّكْثِيرُ»: واتە: بە ڕێژەیەکی زۆر، وەکوو: «قَدْ يَجُودُ الْكَرِيمُ». **سێیەم:** «التَّوَقُّعُ»: واتە: پێشبینی دەکرێت، وەکوو: «قَدْ يَنْزِلُ الْمَطَرُ». بڕوانە: الكافيە: لابن الحاجب الكوردي ل (٢) والمعجم المعاني: (٣٢٥/١) وشرح التسهيل: لابن مالك: ٢٩/١.

**لِأَنَّهَا إِنْ دَلَّتْ بِنَفْسِهَا عَلَىٰ مَعْنًى غَيْرِ مُقْتَرِنٍ بِأَحَدِ الْأَزْمِنَةِ الثَّلَاثَةِ ـأَعْنِي: الْمَاضِيَ وَالْحَالَ وَالِاسْتِقْبَالَ- فَهِيَ الِاسْمُ، كَرَجُلٍ؛ فَإِنَّهُ يَدُلُّ بِنَفْسِهِ عَلَىٰ ذَاتٍ غَيْرِ مُقْتَرِنٍ بِأَحَدِ الْأَزْمِنَةِ الثَّلَاثَةِ.**

بەشەکانی «کَلِمَة» لەلای زانایانی زانستی «نحو» لەم سێ بەشانە کورت کراونەتەوە، واتە: «کَلِمَة» جگە لەم سێ بەشانە هیچ بەشیتری نییە، لەبەر چی تەنها ئەم سێ بەشەی هەن؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە دەفەرموێت: **(لأَنَّها)** چونکە «کَلِمَة» لەلای زانایانی «نَحو» **(إِنْ دَلّتْ بِنَفْسِها عَلى مَعْنًى)** ئەگەر بە خودی خۆی دەلالەت بکات لەسەر مانایەک و هەرکاتێک باس کرا ئەم مانایەی لێوەردەگیرا، لە هەمان کاتدا ئەم مانایە **(غَيْرِ مُقْتَرِنٍ بِأَحَدِ الأَزْمِنَةِ الثَّلاثَةِ)**[1] پەیوەست و بەرامبەر نەبوو بە یەکێک لە سێ زەمانەکە **(أَعْنِي الماضِيَ وَالحالَ وَالاسْتِقْبالَ)** مەبەستم زەمەنی ڕابوردوو، زەمەنی ئێستا و زەمەنی داهاتووە، **(فَهِيَ الِاسْمُ)**[2] ئەوە لەم کاتەدا وشە (کَلِمَة)کە پێی دەگوترێت «اِسم» لەلای زانایانی نەحو، **(كَرَجُلٍ)** وەکوو وشەی «رَجُل» یاخود «زید» یاخود «بکر»، **(فَإِنَّهُ يَدُلُّ بِنَفْسِهِ على ذاتٍ)** سەرنج بدە: ئێستا وشەی «رَجُل» بە خودی خۆی دەلالەت دەکات لەسەر زات و ڕەگەزێکی دیاریکراو کە ڕەگەزی نێرینەیە، لە نەوەکانی ئادەم کە پیاوی پێدەگوترێت **(غَيْرِ مُقْتَرِنٍ بِأَحَدِ الأَزْمِنَةِ الثَّلاثَةِ)**[3] لە هەمان کاتدا ئەم دەلالەتکردنەی بەرامبەر نییە بە یەکێک لەم سێ زەمەنەی کە باسمان کرد، چونکە وشەی پیاو (رَجُل) ـکە دەلالەت لەسەر مانای خۆی دەکات- هیچ پەیوەندییەکی بە زەمەنی ڕابوردوو و ئێستا و داهاتوو نییە، بەڵکوو لە هەر سێ

١. ئینجا بزانە ئەگەر دەلالەتکردنی «اِسْم»ی لەسەر مانای خۆی، بە هۆی بەکارهێنانەوە، بەرامبەر بوو بە یەکێک لە سێ زەمەنەکە، وەکوو «زَيْدٌ الآكِلُ طَعامَهُ الآنَ، أَوْ غَداً» واتە: زەید خواردنەکەی خۆی دەخوات ئێستا یاخود بەیانی، ئەوە هیچ کاریگەری لەسەر پێناسەکەی ناکات، چونکە ئێمە دەڵێین نابێت دەلالەتکردنی «اِسْم» لەسەر مانای خۆی لە کاتی دانانی (بِحَسَبِ أَصْل الْوَضْع) بەرامبەر بێت بە یەکێک لە سێ زەمەنەکە، نەک لە کاتی بەکارهێنانی. بڕوانە شرح ملا جامي، ل ٣٥.

٢. بڕوانە: الكافية: لابن الحاجب الكوردي، ل (١).

٣. بڕوانە: شرح ابن عقيل ل (١٤).

**وَ إِنْ دَلَّتْ بِنَفْسِهَا عَلَىٰ مَعْنًى مُقْتَرِنٍ بِهِ، فَهِيَ الْفِعْلُ، مِثْلُ: «ضَرَبَ»، فَإِنَّهُ يَدُلُّ بِنَفْسِهِ عَلَىٰ ضَرْبٍ مُقْتَرِنٍ بِالزَّمَانِ الْمَاضِي.**

زەمەنەكە دەلالەتی هەر وەک خۆیەتی و نەبەستراوەتەوە بە کات و بە شوێنەوە.

**(و إِنْ دَلَّتْ بِنَفْسِهاعَلى مَعْنىً)**[1] بەلام ئەگەر وشە (كَلِمَة)كە بە خودی خۆی دەلالەت بكات لەسەر مانايەک و هەر كاتێک كە باس كرا ئەم مانايەی لێ وەردەگیرا، لە هەمان كاتدا ئەم مانايە **(مُقْتَرِنٍ بِهِ)** پەيوەست و بەرامبەر بوو بە يەكێک لەم سێ زەمانەكە ـ مەبەستم زەمەنی ڕابوردوو و زەمەنی ئێستا و زەمەنی داهاتووە ـ **(فَهِيَ الْفِعْلُ)**[2] ئەوە لەم كاتەدا وشە (كَلِمَة)كە پێی دەگوترێت: «فِعْل»، **(مِثْلُ ضَرَبَ)** وەكوو وشەی «ضَرَبَ» ياخود وشەی «يَضْرِبُ»، **(فَإِنَّهُ يَدُلُّ بِنَفْسِهِ عَلى ضَرْبٍ)** سەرنج بدە: ئێستا وشەی «ضَرَبَ» بە خودی خۆی دەلالەت دەكات لەسەر «لێدانێك» كە ئەم لێدانە **(مُقْتَرِنٍ بِزَمانِ الْماضِي)** بەرامبەرە بە يەكێک لەم سێ زەمەنەی كە باسمان كرد.

چونكە وشەی «ضَرَبَ» واتە: پياوێک لێی دا، دەلالەت دەكات لەسەر لێدانێک كە لە زەمەنی ڕابوردوو واقیع بووە، هەروەها وشەی «يَضْرِبُ» دەلالەت دەكات لەسەر لێدانێک كە لە زەمەنی ئێستا ياخود داهاتوو واقیع دەبێت، هەروەها وشەی «اِضْرِبْ» دەلالەت دەكات لەسەر لێدانێک كە لە زەمەنی داهاتوو واقیع دەبێت، بۆيە ئەم سێ وشەيە پێيان دەگوترێت: «فِعْل»[3]، چونكە دەلالەتكردنيان پەيوەستە بە كات و بە زەمەن و هەر وشەيەكيش دەلالەتكردنی پەيوەست بوو بە كات و زەمەن، ئەوە پێی دەگوترێت «فِعْل».

---

١. بڕوانە: الكافية: لابن الحاجب الكوردي ل (١).

٢. ئەگەر كەسێک پرسيار بكات و بڵێت: بۆچی «اِسْم» پێشی «فِعْل» و «حَرْف» باس كراوە؟ لە وەلامدا دەڵێين: چونكە «اِسْم» دەبێتە «مُسْنَدْ» و «مُسْنَدُ إِلَيْهِ»، بەلام «فِعْل» تەنها دەبێت بە «مُسْنَدُ» و نابێت بە «مُسْنَدُ إِلَيْهِ»، هەروەها «حَرْف» نە دەبێتە «مُسْنَدُ» و نە دەبێت بە «مُسْنَدُ إِلَيْهِ»، هەر بۆيە لەدوای «فِعْل» باس كراوە.

٣. بڕوانە: شرح قطر النّدى و بلّ الصّدى ل (٢٣)

**وَإِنْ لَمْ تَدُلَّ بِنَفْسِهَا عَلَىٰ مَعْنًى، فَهِيَ الْحَرْفُ، كَـ «قَدْ»، فَإِنَّهُ لَا يَدُلُّ عَلَىٰ مَعْنًى بِنَفْسِهِ، بَلْ يَدُلُّ بِوَاسِطَةِ غَيْرِهِ، نَحْوُ: «قَدْ قَامَ».**

**(وَإِنْ لَمْ تَدُلَّ بِنَفْسِها عَلى مَعْنًى)** بەڵام ئەگەر وشە (كَلِمَة)كە بە خودی خۆی دەلالەتی نەدەکرد لەسەر هیچ مانایەک و هیچ مەبەستێک **(فَهِيَ الْحَرْفُ)** ئەوە لەم کاتەدا وشەکە (كَلِمَة) پێی دەگوترێت: «حَرْف» **(كَقَدْ)** وەکوو وشەی «قَدْ» **(فَإِنَّهُ لا يَدُلُّ عَلى مَعْنًى بِنَفْسِهِ)** سەرنج بدە: ئێستا وشەی «قَدْ» بە خودی خۆی دەلالەت ناکات لەسەر هیچ مانا و مەبەستێک **(بَلْ بِواسِطَةِ غَيْرِهِ)**[1] بەڵکوو بەهۆی لێکدانی لەگەڵ غەیری خۆی ئەوکات دەلالەت دەکات لەسەر مانا و مەبەستێک **(نَحْوُ:)** وەکوو **(قَدْ قامَ)** **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «قَدْ» کە لەگەڵ وشەی «قامَ» لێک دراوە و دەلالەت لەسەر مانایەک دەکات، لێرەدا مانای بەڕاستی و بەدڵنیایی (تَحْقِيق) دەبەخشێت.

**ئینجا بزانە** ئەی خوێنەری بەڕێز، کە بەشێک لە زانایانی زانستی «نحو» دەفەرموون: وشەی «حَرْف» لە زاتی خۆیدا دەلالەت لەسەر هیچ مانایەک ناکات (الحَرْفُ لا يَدُلُّ عَلى مَعْنًى بِنَفْسِهِ) بەڵکوو بەهۆی لێکدان و تێکهەڵکردنی لەگەڵ غەیری خۆی مانای لێ وەردەگیرێت.. بەڵام بەشێکی‌تر لە زانایان دەفەرموون: «حَرْف» دەلالەت دەکات لەسەر مانایەک، بەڵام ماناکە لە غەیری خۆی وەردەگیرێت (الحَرْفُ يَدُلُّ عَلى مَعْنًى في غَيْرِها)، لە ڕاستیدا هەردوو پێناسەکە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە وەکوو یەک وان، بەڵام لە دەربڕین (اللّفْظ) لە یەکتری جیاوازن، چونکە هەردوو لایان یەکدەنگن کە «حَرْف» بەهۆی لێکدانی لەگەڵ غەیری خۆی مانای لێ وەردەگیرێت و واتا دەبەخشێت.




* ◌ *

١. بڕوانە: شرح ابن عقيل ل (١٥).

# الْكَلَامُ وَأَقْسَامُهُ

**قَالَ: الْكَلَامُ مُؤَلَّفٌ إِمَّا مِنِ اسْمَيْنِ، أُسْنِدَ أَحَدُهُمَا إِلَى الْآخَرِ، نَحْوُ: «زَيْدٌ قَائِمٌ»؛ وَإِمَّا مِنْ فِعْلٍ وَاسْمٍ، نَحْوُ: «ضَرَبَ زَيْدٌ»؛ وَيُسَمَّىٰ كَلَاماً وَجُمْلَةً.**

## وانەی سێهەم: باسی پێناسە و چۆنیەتی دروستکردنی «کلام»

پاش ئەوەی مامۆستا باسی پێناسە و جۆرەکانی«کَلِمَة»ی کرد کە بریتی بوون لە «اِسْمُ» و لە «فِعل» و لە «حَرْف» ئینجا دێتە سەر باسکردنی پێناسە و چۆنیەتی دروستکردنی «کلام» لەلای زانایانی زانستی «نَحو» و **(قال:)** مامۆستا «جار اللّٰه» زەمەخشەری لە بارەی دروستکردن و پێناسەکردنی «کَلام»دا دەفەرموێت: **(اَلْكَلامُ: مُؤَلَّفٌ)** واتە: «کَلام» پێکدێت و دروست دەکرێت تەنها لە دوو شت:

**یەکەم: (إمّا مِنْ اِسْمَيْنِ)** یاخود لە دوو «اسم» کە **(أُسْنِدَ أَحَدُهُما إِلى الآخَرِ)** دەبێت نیسبەتی و ئیسنادی یەکێکیان بدرێت بۆلای ئەویتر، واتە: نیسبەتی ئیسمی دووەم بدرێت بۆ لای ئیسمی یەکەم **(نَحْو:)** وەکوو ئەم نموونەیە کە دەڵێت: **(زَيْدٌ قائِمٌ)** واتە: زەید ڕاوەستاوە. سەرنج بدە: ئێستا ئەم ڕستەیە پێکهاتووە لە دوو «اسم»، کە بریتین لە «زَيْدٌ» و لە «قائِمٌ»، وە نیسبەتی وشەی «قائِمٌ» دراوە بۆ لای وشەی «زَيْدٌ».

**دووەم: (وَ إِمّا مِنْ فِعْلٍ وَ إِسْمٍ)**[1] یاخود «کَلام» پێکدێت و دروست دەکرێت لە فیعل و لە ئیسمێک کە نیسبەتی فیعلەکە بدرێت بۆ لای ئیسمەکە **(نَحْو:)** وەکوو ئەم نموونەیە کە دەڵێت: **(ضَرَبَ زَيْدٌ)** واتە: زەید لێی دا، ئێستا ئەم ڕستەیە پێکهاتووە لە فیعل و لە ئیسمێک کە نیسبەتی فیعلەکە دراوە بۆ لای ئیسمەکە، **(وَيُسَمّى كَلاماً وَ جُمْلَةً)** ئەم دوو ڕستەیە هەم پێیان دەگوترێت «کَلامُ» و هەم پێیان دەگوترێت «جُمْلَة».

---

١. بڕوانە: الكافية: لابن الحاجب الكوردي ل (١).

**أَقُولُ: لَمَّا بَيَّنَ الْكَلِمَةَ، أَرَادَ أَنْ يُبَيِّنَ الْكَلَامَ. فَقَوْلُهُ: «مُؤَلَّفٌ» احْتِرَازٌ عَنِ الْمُفْرَدِ، نَحْوُ: «زَيْدٍ». وَقَوْلُهُ: «إِمَّا مِنِ اسْمَيْنِ، وَ إِمَّا مِنْ فِعْلٍ وَاسْمٍ» احْتِرَازٌ عَنِ الْمُؤَلَّفِ مِنْ فِعْلَيْنِ، نَحْوُ: «ضَرَبَ ضَرَبَ»؛**

(**أَقُولُ:**) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرمویت: منیش دەڵێم: (**لَمّا بَيَّنَ الْكَلِمَةَ**) پاش ئەوەی مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری باسی پێناسە و جۆرەکانی کەلیمەی کرد ـ کە بریتی بوون لە «اِسْمُ» و «فِعْل» و «حَرْف» و هەموویانی ڕوون کردەوە ـ (**أَرادَ أَنْ يُبَيِّنَ الْكَلامَ**) ویستی لەم وانەیەدا باسی پێناسە و چۆنیەتی دروستکردنی «کلام» لەلای زانایانی زانستی «نَحْو» ڕوون بکاتەوە، ئینجا مامۆستا دەفەرمویت: (**فَقَوْلُهُ**) ئەم بڕگەیەی کە مامۆستا گوتی، دەبێت هەموو کەلامێک (**مُؤَلَّفٌ**) پێکهاتبێت و لێکدراو بێت لە دوو وشە یاخود زیاتر، باسکردنی ئەم بڕگەیە (**اِحْتِرازٌ عَنِ الْمُفْرَدِ**) بۆ خۆپاراستن بوو لەوەی کە وشەیەکی موفرەد (تاک) هەرگیز کەلامی لێ دروست ناکرێت و پێی ناگوترێت «کَلام»؛ کەواتە: دەبێت هەموو کەلامێک لێکدراو بێت لە دوو وشە یاخود زیاتر، وە وشەی موفرەد ـ هەرچەندە زۆریش بن ـ بەڵام تاوەکوو لێک نەدرێن نابن بە کەلام، (**نَحْوُ**) وەکوو وشەی (**زَيْدٍ**) یاخود وشەی «مُحمّد» یاخود وشەی «أَحْمَد»، ئێستا هیچکام لەم وشانە پێی ناگوترێت «کَلام»، چونکە لێکنەدراون لەگەڵ هیچ وشەیەکی‌تر.

(**وَقَوْلُهُ: إِمَا مِنْ اِسْمَيْنِ، أَوْ مِنْ فِعْلٍ وَاِسْمٍ**) ئەمەی کە مامۆستا گوتی: دەبێت هەموو کەلامێک پێکهاتبێت و لێکدراو بێت لە دوو ئیسم یاخود لە ئیسم و لە فیعلێک، باسکردنی ئەم بڕگەیە: (**اِحْتِرازٌ**) بۆ خۆپاراستن بوو لەوەی کە ئەم لێکدراوانەی خوارەوە کەلامیان لێ دروست نابێت.

**یەکەم:** خۆی پاراست (**عَنِ الْمُؤَلَفِ مِنْ فِعْلَيْنِ**) لە هەر لێکدراوێک کە لە دوو «فِعْل» پێک هاتبێت، یاخود زیاتر، ئەوە پێی ناگوترێت «کلام»، چونکە پێکهێنان و دروستکردنی کەلام پێویستی بە «اِسْم» هەیە، ئەگەر ئیسمێکی لەگەڵدا نەبێت ڕستەکە نابێت بە «کلام»، (**نَحْوُ:**) وەکوو نموونەی (**ضَرَبَ ضَرَبَ**) یاخود «أَكْرَمَ،

**أَوْ مِنْ فِعْلٍ وَحَرْفٍ، نَحْوُ: «قَدْ ضَرَبَ»؛ أَوْ مِنْ حَرْفَيْنِ، نَحْوُ: «قَدْ قَدْ»؛ أَوْ مِنْ حَرْفٍ وَاسْمٍ نَحْوُ: «مَا زَيْدٌ».**

---

أَكْرَمَ» ئێستا هەریەکە لەم دوو نموونەیە پێیان ناگوترێت کەلام، چونکە لەلای زانایانی «نحو» ڕستە لە دوو فیعل دروست نابێت.

**دووەم: (أَوْ)** یاخود خۆی پاراست **(مِنْ فِعْلٍ وَحَرْفٍ)** لە هەر ڕستەیەک کە لە فیعلێک و لە حەرفێک پێک هاتبێت یاخود لە زیاتر، ئەوە پێی ناگوترێت کەلام، چونکە پێکهێنان و دروستکردنی کەلام پێویستی بە ئیسم هەیە، ئەگەر ڕستەکە ئیسمێکی لەگەڵدا نەبێت پێی ناگوترێت «کَلام»، **(نَحْوُ:)** وەکوو نموونەی **(قَدْ ضَرَبَ)** یاخود «قَدْ أَفْلَحَ»، ئێستا هەریەکە لەم دوو نموونەیە پێیان ناگوترێت کەلام، چونکە لەلای زانایانی «نَحو» ڕستە لە فیعلێک و لە حەرفێک دروست نابێت.

**سێیەم: (أَوْ)** یاخود خۆی پاراست **(مِنْ حَرْفَيْنِ)** لە هەر لێکدراوێک کە لە دوو حەرف پێک هاتبێت یاخود زیاتر، ئەوە پێی ناگوترێت کەلام، چونکە پێکهێنان و دروستکردنی کەلام پێویستی بە دوو ئیسم یاخود بە ئیسمێک و بە فیعلێک هەیە، ئەگەر بەم شێوەیە نەبێت ڕستەکە نابێت بە کەلام، **(نَحْوُ:)** وەکوو نموونەی **(قَدْ قَدْ)** یاخود «مِنْ مِنْ»، ئێستا هەریەکە لەم دوو نموونەیە پێیان ناگوترێت کەلام، چونکە لەلای زانایانی نەحوو ڕستە لە دوو حەرف یاخود زیاتر دروست نابێت.

**چوارەم: (أَوْ)** یاخود خۆی پاراست **(مِنْ حَرْفٍ وَاسْمٍ)** لە هەر ڕستەیەک کە لە حەرفێک و لە ئیسمێک پێک هاتبێت، ئەوە پێی ناگوترێت کەلام، چونکە پێکهێنان و دروستکردنی «کَلَام» پێویستی بە دوو «اِسْم» یاخود بە ئیسمێک و بە فیعلێک هەیە، ئەگەر بەم شێوەیە نەبێت ڕستەکە نابێت بە کەلام، **(نَحْوُ:)** وەکوو نموونەی **(ما زَيْدٌ)** یاخود «إِنَّ زَيْداً» ئێستا هەریەکە لەم دوو نموونەیە پێیان ناگوترێت کەلام، چونکە لەلای زانایان ڕستە لە حەرفێک و لە ئیسمێک پێک ناهێت[1].

---

١. بەڵام ئەگەر حەرفەکە مانای وشەیەکی‌تری لە خۆ گرتبوو ئەو کاتە پێی دەگوترێت کەلام، وەکوو «یا زَيْدُ»، یاخود «أَ سِرْبَ الْقَطا» ئێستا لێرەدا ئەم دوو حەرفانە مانای وشەی «أَدْعُو» دەبەخشن، بۆیە ڕستەکە پێی دەگوترێت کەلام.

**وَقَوْلُهُ: «أُسْنِدَ أَحَدُهُمَا إِلَى الْآخَرِ» احْتِرَازٌ عَنِ الْمُؤَلَّفِ مِنِ اسْمَيْنِ لَمْ يُسْنَدْ أَحَدُهُمَا إِلَى الْآخَرِ، نَحْوُ: «غُلَامُ زَيْدٍ» وَ «خَمْسَةَ عَشَرَ»؛ فَإِنَّ كُلَّ ذَلِكَ لَا يَكُونُ كَلَاماً.**

**وَقَوْلُهُ: «إِمَّا مِنْ فِعْلٍ وَاسْمٍ» تَقْدِيرُهُ: وَ إِمَّا مِنْ فِعْلٍ وَاسْمٍ أُسْنِدَ ذَلِكَ الْفِعْلُ إِلَىٰ ذَلِكَ الِاسْمِ. وَ إِنَّمَا لَمْ يَذْكُرْهُ صَرِيحاً؟**

---

(**وَقَوْلُهُ:**) ئەم بڕگەیەی کە مامۆستا گوتی: دەبێت هەموو کەلامێک پێک هاتبێت و لێکدراو بێت لە دوو «اِسْم» یاخود لە ئیسم و لە فیعلێک، لە هەمان کاتدا (**أُسْنِدَ أَحَدُهُما إِلى الآخَرِ**) دەبێت نیسبەت و ئیسنادی یەکێک لەم دوو وشەیە درابێت بۆ لای ئەوی‌تر، ئەم بڕگەیەی کە مامۆستا باسی کرد بۆ (**اِحْتِرازٌ عَنْ الْمُؤَلَّفِ مِنْ اِسْمَيْنِ**) خۆپاراستن بوو لە ڕستەیەک کە لە دوو ئیسم پێک هاتبێت، بەڵام (**لَمْ يُسْنَدْ أَحَدُهُما إِلى الآخَرِ**) نیسبەت و ئیسنادی یەکێک لەم دوو وشەیە نەدرابێت بۆلای ئەوەی‌تر، چونکە لە ڕووی ماناوە کەموکورتی دروست دەبێت، (**نَحْو:**) وەکوو ئەم دوو نموونەیە، یەکەم: (**غُلامُ زَيْدٍ**) کە لە «مُضافُ» لە «مُضافُ إِلَيْهِ» لێک دراوە. دووەم: (**وَخَمْسَةَ عَشَرَ**) کە وشەی «خَمْسَةَ» لەگەڵ وشەی «عَشَرَ» پێک هاتووە، بەڵام نیسبەت و ئیسنادیان لە نێواندا نییە، بۆیە مامۆستا دەفەرموێت: (**فَإِنَّ كُلَّ ذَلكَ لا يَكُونُ كَلاماً**) هەموو ئەم نموونانە کە باسمان‌کردن هیچیان پێیان ناگوترێت «كَلام».

(**وَقَوْلُهُ:**) ئەم بڕگەیەی کە مامۆستا گوتی لە بارەی دروستکردنی کەلام (**إِمّا مِنْ فِعْلٍ وَ إِسْمٍ**) یاخود «كَلام» پێک‌دێت و دروست دەکرێت لە فیعلێک و لە ئیسمێک کە نیسبەتی فیعلەکە بدرێت بۆ لای ئیسمەکە (**تَقْدِيرُهُ:**) ئەم قسەیەی مامۆستا وای لێ‌دێتەوە کە: (**وَ إِمّا مِنْ فِعْلٍ وَ إِسْمٍ أُسْنِدَ ذَلِكَ الْفِعْلُ إِلى ذَلِكَ الاسْمِ**) یاخود کەلام پێک‌دێت و دروست دەکرێت لە فیعلێک و لە ئیسمێک کە نیسبەت و ئیسنادی فیعلەکە بدرێت بۆ لای ئیسمەکە، چونکە هیچ کەلامێک دروست نابێت ئەگەر «نِسبة» و «إِسْناد» لە نێوان وشەکانیدا نەبێت.

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: (**وَ إِنّما لَمْ يَذْكُرْهُ صَرِيحاً؟**) ئەی بۆچی مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری باسی ئەم بڕگەیەی نەکرد و ئاماژەی پێ‌نەدا؟

**لِأَنَّ قَوْلَهُ: «أُسْنِدَ أَحَدُهُمَا إِلَى الْآخَرِ» يَدُلُّ عَلَىٰ وُجُوبِ الْإِسْنَادِ بَيْنَهُمَا.**

**وَ «الْإِسْنَادُ» نِسْبَةُ أَحَدِ الْجُزْئَيْنِ إِلَى الْآخَرِ، لِيُفِيدَ الْمُخَاطَبَ فَائِدَةً تَامَّةً يَصِحُّ السُّكُوتُ عَلَيْهَا.**

مامۆستا وەڵام دەداتەوە دەفەرموێت: (لأَنّ قَوْلَهُ:) چونکە ئەم قسەیەی کە مامۆستا گوتی کەلام دروست دەکرێت لە دوو ئیسم کە (أُسْنِدَ أَحَدُهُما إِلى الآخَرِ) کە نیسبەت و ئیسنادی یەکێک لەم دوو ئیسمە بدرێت بۆ لای ئەویتر، ئەم قسەیە (يَدُلُّ عَلى وُجوبِ الإِسْنادِ بَيْنَهُما)[1] دەلالەت دەکات لەسەر پێویستی هەبوونی نیسبەت و ئیسناد لە نێوان «اِسْم» و «فِعْل»، چونکە مادام بۆ دروستکردنی «کَلام» لە نێوان دوو ئیسمدا پێویستیمان بە نیسبەت و ئیسناد هەبێت، ئەوە لە کاتی دروستکردنی کەلام لە نێوان ئیسم و فیعلێک، زیاتر پێویستیمان بە نیسبەت و ئیسناد دەبێت.

## پێناسەی «إِسْناد»

ئینجا مامۆستا دێتە سەر پێناسەی «إِسْناد» و دەفەرموێت: (وَالإِسْنادُ نِسْبَةُ أَحَدِ الْجُزْئَيْنِ إِلى الآخَرِ) ئیسناد بریتییە لە پاڵدانی یەکێک لەم دوو وشەیەی کە کەلامیان لێ دروست دەکرێت، بۆ لای ئەویتر (لِيُفيدَ الْمُخاطَبَ فائِدَةً تامَّةً) بۆ ئەوەی ئەو کەسەی قسە دەکات سوودێکی تەواو بدات بەم کەسەی کە گوێی لێ ڕاگرتووە، تا بە تەواوی لە نیاز و مەبەستی کەسی بەرامبەری خۆی حاڵی ببێت، بە جۆرێک (يَصِحُّ السُّكُوتُ عَلَيْها) کە دڵی ئاو بخواتەوە و پرسیاری لە دڵدا نەمێنێت و خۆی بێدەنگ بکات، بۆ نموونە: ئەگەر تۆ بڵێیت «قامَ زَيْدٌ» واتە: زەید ڕاوەستا، یاخود بڵێیت: «نَصَرَ مُحَمَّدٌ زَيْداً» واتە: موحەممەد یارمەتی زەیدی دا، لەم دوو نموونەیەدا کەسی بەرامبەر سوودێکی تەواو دەبینێت و بە تەواوی لە مەبەستەکە حاڵی دەبێت، بەڵام ئەگەر بڵێیت «إِنْ قامَ زَيْدٌ» واتە: ئەگەر زەید ڕاوەستا، ئەم قسەیە هیچ سوود ناگەیەنێت بە کەسی بەرامبەر و چاوەڕێی قسەیتر و ڕوونکردنەوەی زیاتر دەکات.

---

١. بڕوانە: شرح ملا جامی ٢٥/١، وشرح قطر النّدى: ٢٥، وأوضح المسالك: ٢/ ١٠

**وَقَوْلُهُ بُعَيْدَ هٰذَا: «الِاسْمُ هُوَ مَا صَحَّ الْحَدِيثُ عَنْهُ» يَدُلُّ عَلَىٰ أَنَّ الْإِسْنَادَ إِنَّمَا يَكُونُ مِنَ الْفِعْلِ إِلَى الِاسْمِ. فَقَوْلُهُ: «زَيْدٌ قَائِمٌ» مُؤَلَّفٌ مِنِ اسْمَيْنِ، أُسْنِدَ أَحَدُهُمَا: وَهُوَ «قَائِمٌ» إِلَى الْآخَرِ: وَهُوَ «زَيْدٌ». وَقَوْلُهُ: «ضَرَبَ زَيْدٌ» مُؤَلَّفٌ مِنْ فِعْلٍ وَاسْمٍ، أُسْنِدَ الْفِعْلُ إِلَى الِاسْمِ؛ وَكُلٌّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا يُسَمَّىٰ كَلَاماً وَجُمْلَةً.**

---

(**وَقَوْلُهُ: بُعَيْدَ هذا**) ئەم قسەیەی مامۆستا کە پاش کەمێکیتر دێت و لە سەرەتای «قالَ»ی چوارەم لە باسی پێناسەی «اِسْم» و نیشانەکانی دەفەرموێت: (**اَلاسْمُ: هُوَ ما صَحَّ الْحَدِيثُ عَنْهُ**)[1] واتە: «اِسْم» بریتییە لە وشەیەک کە دروستە خەبەری لە بارەوە بدرێت و نیسبەتی شتێکیتری بدرێتە پاڵ، ئەم بڕگەیە (**يَدُلُّ عَلى أَنَّ الإِسْنادَ إِنَّما يَكُونُ مِنَ الْفِعْلِ إِلى الاسْمِ**) دەلالەت دەکات کە ئەگەر کەلام لە ئیسمێک و لە فیعلێک دروست بکرێت، دەبێت حەتمەن نیسبەت و ئیسنادی فیعلەکە بدرێت بۆ لای ئیسمەکە، هەروەکوو ڕوونی دەکەینەوە.

ئینجا مامۆستا دێتە سەر شیکردنەوەی ئەم دوو نموونەیەی کە لە «قالَ»کەدا باس کران، دەفەرموێت: (**فَقَوْلُهُ:**) ئەم نموونەیە کە مامۆستا باسی کرد و فەرمووی: (**زَيْدٌ قائِمٌ**) ئەم نموونەیە (**مُؤَلَّفٌ مِنْ اِسْمَيْنِ**) لە دوو ئیسم پێک هاتووە کە بریتین لە وشەی «زَيْدٌ» و لە وشەی «قائِمٌ»، (**أُسْنِدَ أَحَدُهُما**) نیسبەت و ئیسنادی وشەیەکیان دراوە (**وَهُوَ قائِمٌ**) کە بریتییە لە وشەی «قائِمٌ» (**إِلى الآخَرِ**) بۆلای وشەکەیتر (**وَهُوَ زَيْدٌ**) کە بریتییە لە وشەی «زَيْدٌ».

(**وقَوْلُهُ:**) وە ئەم نموونەیە کە مامۆستا باسی کرد و فەرمووی: (**ضَرَبَ زَيْدٌ**) ئەم نموونەیە (**مُؤَلَّفٌ مِنْ فِعْلٍ وَاِسْمٍ**) لە فیعلێک و لە ئیسمێک پێک هاتووە بەڵام ئەمجارەیان (**أُسْنِدَ الْفِعْلُ إِلى الاسْمِ**) نیسبەت و ئیسنادی فیعلەکە دراوە ـ کە بریتییە لە وشەی «ضَرَبَ»ـ بۆ لای ئیسمەکە ـ کە بریتییە لە وشەی «زید»ـ، ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: (**وَكُلٌّ وَاحِدٍ مِنْهُما**) هەریەکە لەم دوو نموونەیە کە باسمانکرد (**يُسَمّى كَلاماً وَجُمْلَةً**) هەم پێیان دەگوترێت: «کَلام» و هەم پێیان دەگوترێت «جُمْلَةً».

---

١. بڕوانە: سەرەتای وانەی داهاتوو.

..............................................................................................

**ئینجا بزانە ئەی قوتابی بەڕێز و فەقێی خۆشەویست:**

**یەکەم:** لە هەر شوێنێک «کلام» لە دوو «اِسْم» دروست بێت، ئەوە بە زۆری وایە کە نیسبەت و ئیسنادی وشەی ئیسمی دووەم دەدرێت بۆ لای ئیسمی یەکەم، بەڵام ئەگەر کەلامەکە، لە فیعلێک و لە ئیسمێک پێک هاتبوو، ئەوە حەتمەن نیسبەت و ئیسنادی فیعلەکە دەدرێت بۆ لای ئیسمەکە[1].

**دووەم:** بەشێک لە زانایان دەفەرموون: هیچ جیاوازی نییە لە نێوان «کَلام» و«جُمْلَة»دا و دوو وشەی هاومانان (مُرادِف)، بەڵام بەشێکیتر لە زانایان دەفەرموون: ئەم دوو وشەیە لە یەکتری جیاوازن، چونکە هەموو کەلامێک پێی دەگوترێت «جُمْلَة» بەڵام هەموو جوملەیەک پێی ناگوترێت «کَلام»، چونکە بە مەرج داندراوە کە دەبێت «کلام» نیسبەتی تێدا بێت.

**سێیەم:** چوار جۆر «مُرَکّب» هەن نە پێیان دەگوترێت «کَلام»، نە پێیان دەگوترێت «کَلِمَة»؛ **یەکەم:** «اَلْمُرَکَّبُ الإِضافِيّ» وەکوو «غُلامُ زَيْدٍ». **دووەم:** «اَلْمُرَکَّبُ التِّعْدادِيُّ» وەکوو «سِتَّة عَشَرَ». **سێیەم:** «اَلْمُرَکَّبُ الْمَزْجِيُّ» وەکوو «بَعْلَبَكّ». **چوارەم:** «اَلْمَرَکَّبُ الْوَصْفِيُّ» وەکوو «حَيْوانٌ نَاطِقٌ»[2].

* ◌ *

---

١. شرح ملا جامی: ل، ١٨.

٢. بڕوانە: شرح الأنموذج: بتعلیق: أنور بن أبی بکر، ل، ٥٢، وشرح ملا جامی: ل، ١٨.

# بَابُ الِاسْمِ

## تَعْرِيفُ الِاسْمِ

**قَالَ: بَابُ الِاسْمِ؛ هُوَ مَا صَحَّ الْحَدِيثُ عَنْهُ، وَدَخَلَهُ حَرْفُ الْجَرِّ، وَأُضِيفَ، وَعُرِّفَ، وَنُوِّنَ.**

**أَقُولُ: لَمَّا فَرَغَ مِنْ تَقْسِيمِ الْكَلِمَةِ، شَرَعَ فِي مَبَاحِثِ أَقْسَامِهَا،**

---

## وانەی چوارەم: پێناسەی «اِسْم» و نیشانەکانی

پاش تەواوبوونی پێناسەی «كَلِمَة» و «كَلام» و بەیانکردنی ئەو شتانەی کە کەلامیان لێ دروست دەکرێت، ئینجا مامۆستا دێتە سەر باسی ڕوونکردنەوە و پێناسەکردنی بەشەکانی کەلیمە و ئەو شتانەی کە کەلامیان لێ دروست دەبێت، وە دەفەرموێت: **(قال: بَابُ الاسْمِ)** واتە: ئەم وانەیە تایبەتە بە باسکردنی پێناسەی «اِسْم» و ئەو شتانەی کە تایبەتن بە ئیسم، بۆیە مامۆستا لە پێناسەکەیدا دەفەرموێت:

**(هُوَ: ماصَحَّ الْحَديثُ عَنْهُ)** واتە: «اِسْم» بە وشەیەک دەگوترێت کە دروست بێت نیسبەت و ئیسنادی شتێکی‌تری بدرێتە پاڵ و خەبەری لە بارەوە بدرێت **(وَدَخَلَهُ حَرْفُ الْجَرِّ)** هەروەها دروست بێت کە «حُرُوفُ الْجَرّ»ی بچنە سەر **(وَأُضِيفَ)** هەروەها دروست بێت کە «إضافة» بکرێت بۆ لای غەیری خۆی **(وَعُرِّفَ)** هەروەها دروست بێت کە وشەی «أَلْ»ـی تەعریفی بچێتە سەر **(وَنُوِّنَ)** وە هەروەها دروست بێت کە «تَنْوِين»ـی بچێتە سەر.. هەر وشەیەک ئەم پێنج شتەی قەبووڵ کرد، ئەوە پێی دەگوترێت «اِسْم»، بەڵام ئەگەر ئەم پێنج نیشانەی قەبووڵ نەکرد، ئەوە پێی ناگوترێت «اِسْم».

**(أَقُولُ:)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(لَمّا فَرَغَ مِنْ تَقْسِيمِ الْكَلِمَةِ شَرَعَ فِي مَباحِثِ أَقْسامِها)**[1] پاش ئەوەی مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری باسی پێناسە و جۆرەکانی کەلیمەی کرد ـ کە بریتی بوون لە «اِسْم» و «فِعْل» و «حَرْف»و هەموویانی ڕوون کردەوە ـ، ئینجا مامۆستا دەستی کرد بە باسی

---

١. بڕوانە: ملا جامي (١٨).

**وَقَدَّمَ الِاسْمَ عَلَى الْفِعْلِ وَالْحَرْفِ، لِأَنَّهُ أَصْلٌ، وَهُمَا فَرْعَانِ؛ إِذْ هُوَ لَا يَحْتَاجُ إِلَيْهِمَا فِي تَأْلِيفِ الْكَلَامِ، وَهُمَا يَحْتَاجَانِ إِلَيْهِ.**

**وَقَوْلُهُ: «بَابُ الِاسْمِ» تَقْدِيرُهُ: هٰذَا بَابُ الِاسْمِ.**

ڕوونکردنەوە و پێناسەکردنی یەک‌بەیەکی ئەم بەشانەی کە باسی کردن و بە درێژی ڕوونیان دەکاتەوە.

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: بۆچی مامۆستا باسی «اِسْم»ـی پێش‌خستووە لەسەر باسکردنی «فِعْل» و «حَرْف»؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: (**وَقَدَّمَ الاسْمَ عَلَى الْفِعْلِ وَالْحَرْفِ**) مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری باسی ئیسمی پێش‌خستووە لەسەر باسکردنی «فِعْل» و «حَرْف» لەبەر چی؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت:

(**لأَنَّهُ أَصْلٌ**)[1] چونکە ئیسم بە «أصل» دادەندرێت لەلای زانایانی «نحو» (**وَهُما فَرْعانِ**) فیعل و حەرف بە «فَرع» حیساب دەکرێن (**إذ هُوَ لا يَحْتاجُ إِلَيْهِما فِي تَأْلِيفِ الْكَلامِ**) چونکە «اِسْم» پێویستی بە «فِعْل» و بە «حَرْف» نییە لە کاتی دروستکردنی کەلامدا، بەڵکوو بەبێ ئەوان کەلامی لێ دروست دەبێت، وەکوو «زَيْدٌ قائِمٌ»، هەروەها سەرچاوەی هەموو فیعلەکان دەگەڕێتەوە سەر «مَصْدَر» و «مَصدَر»یش ئیسمە، هەر بۆیە «اِسْم» بە ئەسڵ دادەندرێت.

(**وَهُما يَحْتاجانِ إِلَيْهِ**) بەڵام «فِعْل» و «حَرْف» پێویستیان بە ئیسم هەیە لە دروستکردنی کەلامدا، چونکە ئەگەر دوو «فِعل» یاخود زیاتریش بە یەکەوە بن، ناتوانن کەلام دروست بکەن، تاوەکوو لەگەڵ ئیسم لێک‌نەدرێن؛ هەروەها حەرفیش هەر کەلامی لێ دروست نابێت، چونکە دەلالەت لەسەر هیچ مانایەک ناکات لە خودی خۆیدا، بەڵکوو بە هۆی غەیری خۆی دەلالەت لەسەر مانا دەکات.

(**وَقَوْلُهُ: بابُ الاسْمِ:**) بڕگەی سەرەتای ئەم وانەیە کە مامۆستا گوتی (بابُ الاسْمِ) ئەم ڕستەیە (**تَقْدِيرُهُ:**) وای لێ‌دێتەوە: (**هذا بابُ الاسْمِ**) واتە: ئەم بابەتە و ئەم وانەیە تایبەتە بە باسکردنی پێناسە و ئەو شتانەی کە تایبەتن بە «اِسْم».

---

١. ئەم بابەتە ڕاجیایی لە سەرە لە نێوان زانایانی (نحو)..

**وَالِاسْمُ فِي اللُّغَةِ: ظَاهِرٌ. وَفِي الِاصْطِلَاحِ: «هُوَ مَا صَحَّ الْحَدِيثُ عَنْهُ»؛ يَعْنِي: يَجُوزُ أَنْ يُخْبَرَ عَنْهُ،**

## پێناسەی «اِسْم» لە ڕووی زمانەوانییەوە

ئینجا پێش هەر شتێک مامۆستا دێتە سەر باسکردنی پێناسەی «اِسْم» هەم لە ڕووی زمانەوانییەوە، هەم لە ڕووی زاراوەییەوە و دەفەرموێت: **(وَالِاسْمُ فِي اللُّغَةِ)** وشەی «اِسْم» لە ڕووی زمانەوانییەوە **(ظَاهِرٌ)** دیار و ئاشکرایە، کە هەم بە مانای «بەرزیی» دێت ـ ئەگەر بڵێین لە وشەی «السُّمُوُّ»[1] وەرگیراوە کە ماناکەی دەبێتە «اَلْعُلُوُّ وَالرِّفْعَةُ»[2]ـ، ئەوکاتە بۆیە پێی دەگوترێت «اِسْم» چونکە پلە و پایەی لە «فِعْل» لە «حَرْف» بەرزترە، بەهۆی ئەوەی کە بە تەنها کەلامی لێ دروست دەکرێت؛ وە هەم بە مانای «نیشانە» دێت ـ ئەگەر بڵێین: وشەی «اِسْم» لە وشەی «الوَسْمِ»[3] وەرگیراوە کە ماناکەی دەبێ بە «اَلْعَلامَة»، ئەوکاتە بۆیە پێی دەگوترێت «اِسْم» چونکە دەبێتە نیشانە لەسەر ئەم مانایەی کە دەلالەتی لەسەر دەکات «لأَنَّهُ عَلامَةٌ عَلَى مُسَمَّاهُ».

## پێناسەی «اِسْم» لە ڕووی زاراوەییەوە

ئینجا مامۆستا دێتە سەر پێناسەی «اِسْم» و تایبەتمەندییەکانی و دەفەرموێت: **(وَفِي الِاصْطِلاحِ)** پێناسەی «اِسْم» لەلای زانایانی زانستی «نَحو» **(هُوَ: ماصَحَّ الْحَديثُ عَنْهُ)** بریتییە لە وشەیەک کە دروست بێت نیسبەت و ئیسنادی شتێکیتری بدرێتە پاڵ **(يَعْنِي: يَجوز أَنْ يُخْبَرَ عَنْهُ)**[4] واتە: دروستە خەبەری لە بارەوە بدرێت، و نیسبەت

---

**١.** ئەو کاتە: دەبێت بڵێین: وشەی «اِسْم» لە «سَمَا، يَسْمُو، سَمُواً» وەرگیراوە. بڕوانە: شرح ملا جامی ل (٣٤).

**٢.** «قَالَ الزَّجَاجُ: مَعْنَى قَوْلِنا اِسْمٌ: هُوَ مُشْتَقٌّ مِنَ السُّمُوِ، وَهُوَ الرِّفْعَةُ». لسان العرب: ٤/ ٧٠٣.

**٣.** ئەو کاتە: دەبێت بڵێین: وشەی «اِسْم» لە «وَسِمَ، يَسِمُ، سِمَةً»، وەرگیراوە. بڕوانە: شرح ملا جامی ل (٣٥).

**٤.** هەڵبەتە دیارە مامۆستای زەمەخشەری ویستوویەتی بە شێوەیەکی گشتی «اِسْم» بە قوتابیان بناسێنێت و هەموو تایبەتمەندییەکانیباس بکات و بیانخاتە نێو پێناسەکەوە بۆ ئەوەی قوتابی ☜

**نَحْوُ: «خَرَجَ مُوسَىٰ» فَإِنَّ «مُوسَىٰ» اسْمٌ، قَدْ أُخْبِرَ عَنْهُ بِالْخُرُوجِ.**
**«وَدَخَلَهُ حَرْفُ الْجَرِّ»، يَعْنِي: يَجُوزُ أَنْ يَدْخُلَهُ حَرْفُ الْجَرِ، نَحْوُ: «مَرَرْتُ بِعِيسَىٰ»،**

و ئیسنادی شتێکی‌تری بدرێتە پاڵ، هەروەکوو چۆن دروستیشە کە خەبەری پێ بدرێت بۆ لای وشەیەکی‌تر، بەم برگەیە «اِسْم» جیا دەبێتەوە لە «فِعْل» و «حَرْف»، چونکە حەرف نە دەبێت بە خەبەر و نە خەبەریشی لە بارەوە دەدرێت، هەروەها «فِعْل» دەبێت بە خەبەر، بەڵام خەبەری لە بارەوە نادرێت؛ ئینجا بزانە جیاوازی نییە ئەم وشەیەی کە خەبەر لە بری ئیسمەکە دەدات، «فِعْل» بێت یاخود «اِسْم» بێت.
**ئەمە تایبەتمەندی یەکەمە.**

نموونەی یەکەم **(نَحْوُ:)** وەکوو ئەم نموونەیە کە دەفەرموێت: **(خَرَجَ مُوسَى)** یا خود «ضَرَبَ زَيْدٌ» ئێستا مامۆستا خۆی دەفەرموێت: **(فَإِنَّ مُوسَى اِسْمٌ)** وشەی «مُوسىٰ» یا خود «زَيْد» هەردووکیان بە ئیسم دادەندرێن، **(قَدْ أُخْبِرَ عَنْهُ بِالْخُروجِ)** چونکە وشەی «مُوسَى» بە چوونە دەر و وشەی «زَيْد»یش بە لێدانێ، خەبەری لە بارەوە دراوە. نموونەی دووەم: وەکوو «زَيْدٌ قائِمٌ» ئێستا لەم نموونەیە وشەی «زَيْدٌ» ـکە دەبێتە «مُبْتَدأ»ـ بە وشەی «قائِم» خەبەری لە بارەوە دراوە ـکە ئیسمەـ.

**تایبەتمەندی دووەم: (وَدَخَلَهُ حَرْفُ الْجَرِّ)** یەکێکی‌تر لە تایبەتمەندییەکانی «اِسْم» بریتییە لەوەی کە دروستە یەکێک لەم حەرفانەی بچێتە سەر کە ئیسمێک لە دوای خۆیان «مَجْرور» دەکەن و پێیان دەگوترێت «حُرُوفُ الْجَرّ» و ژمارەیان بیست حەرفە، **(يَعْنِي: يَجُوزُ أَنْ يَدْخُلَهُ حَرْفُ الْجَرِّ)** واتە: دروستە ئیسم «حَرْفُ الْجَرّ»ی بچێتە سەر و کاری تێ بکات، هەرچەندە ئێستاش ئەم حەرفەی لەسەر نەبێت، بەڵام مادام دروستە ئەم حەرفەی بچێتە سەر، ئەوە هەر بە «اِسْم» حیساب دەکرێت، **(نَحْوُ)** وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: **(مَرَرْتُ بِعِيسَى)** واتە: من بەلای

---

☞ لە هەر شوێنێک چاوی کەوت بە ئیسمێک لە ڕێی ئەم نیشانانەوە بیناسێتەوە و جیای بکاتەوە لە «فِعْل» و لە «حَرْف»، ئەگینا ئەو پێنج شتانەی کە مامۆستا باسیان دەکات، ئەمانە پێیان دەگوترێت «خَواصُ الاِسْمِ» پێناسەکە ئەوە بوو کە لە وانەی دووەم باسی کرد.

**فَإِنَّ «عِيسَىٰ» اسْمٌ، قَدْ دَخَلَهُ الْبَاءُ، وَهُوَ حَرْفُ الْجَرِّ.**

**«وَأُضِيفَ»، يَعْنِي: يَجُوزُ أَنْ يُضَافَ إِلَىٰ غَيْرِهِ، نَحْوُ: «غُلَامُكَ»، فَإِنَّ الْغُلَامَ اسْمٌ، أُضِيفَ إِلَى الْكَافِ.**

**«وَعُرِّفَ»، يَعْنِي: يَجُوزُ أَنْ يَدْخُلَهُ الْأَلِفُ وَاللَّامُ،**

---

عیسیادا ڕۆیشتم، سەرنج بدە: **(فَإِنَّ عِيسَى اِسْمٌ)** ئێستا وشەی «عِیسی» بە ئیسم حیساب دەکرێت، لەبەر ئەوەی **(قَدْ دَخَلَهُ الباءُ)** حەرفی «الباء»ی چۆتە سەر **(وَهُوَ حَرْفُ الْجَرِّ)** کە یەکێکە لەم حەرفانەی ئیسمێک لە دوای خۆی مەجروور دەکات. لەم نموونەیەدا وشەی «عِیسی» لە تەقدیردا مەجروور بووە، چونکە هەر ئیسمێک کە «أَلِفُ الْمَقْصُورَة»ی لە کۆتاییدا هاتبوو، لە هەرسێ حاڵەتی «رَفْع»ـە و «نَصْب»ـە و جەڕەدا ئیعرابی «تَقْدیري» دەبێت.

**تایبەتمەندی سێیەم:** **(وَأُضیفَ)** یەکێکی تر لە تایبەتمەندییەکانی «اِسْم» بریتییە لەوەی کە دروستە «إضافَة» بکرێت **(يَعْني: يَجُوزُ أَنْ يُضافَ إِلى غَيْرِهِ)**[1] واتە: دروستە کە ئیسم پاڵبدرێت و «إضافة» بکرێت بۆ لای غەیری خۆی **(نَحْو:)** وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: **(غُلامُكَ)**، سەرنج بدە: **(فَإِنَّ الْغُلامَ: اِسْمٌ أُضِيفَ إِلى الْكاف)** ئێستا وشەی «غُلام» بە ئیسم حیساب دەکرێت، لەبەر ئەوەی «إِضافَة» کراوە بۆلای وشەی «كافُ الْخِطابِ».

**تایبەتمەندی چوارەم:** **(وَعُرِّفَ)** یەکێکی تر لە تایبەتمەندییەکانی «اِسْم» بریتییە لەوەی کە دروستە ئیسم بناسێندرێت و «تَعْرِيف» بکرێت **(يَعْنِي: يَجُوزُ أَنْ يَدْخُلَهُ الأَلِفُ وَاللّامُ)** واتە: دروستە «اِسْم»، ئەلیف و لامی تەعریفی (أَلْ) بچێتە سەر،

---

١. بۆیە مامۆستا ئاوا مانای کرد، چونکە لەسەر ڕا و بۆچوونی «مَشْهُور» لە نێو زانایاندا تەنها بوون بە «مُضَاف» تایبەتە بە ئیسمان، لەبەر ئەوەی بوون بە «مُضَاف إِلَيْهِ» تایبەت نییە بە ئیسمان، چونکە هێندێک جار فیعل و هەروەها حەرفیش دەبن بە «مُضَاف إِلَیْهِ»؛ نموونەی یەکەم: وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هَٰذَا يَوْمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدْقُهُمْ﴾ «أَيْ: يَوْمَ نَفْعِ الصَّادِقِينَ». نموونەی دووەم: وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ﴾ «أَيْ: يَوْمَ عَدَمِ نُطْقِهِمْ». بڕوانە: شرح الأنموذج: ل ٥٩.

**نَحْوُ: «الرَّجُلِ». «وَنُوِّنَ»، يَعْنِي: يَجُوزُ أَنْ يَدْخُلَهُ التَّنْوِينُ، نَحْوُ: «زَيْدٌ».**

**(نَحْو:)** وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: **(اَلرَّجُلُ)** یاخود وەکوو وشەی «اَلْغُلامُ» و «اَلطَّالِبُ»؛ **سەرنج بدە:** ئێستا ئەم وشانە بە «اِسْم» هەژمار دەکرێن، چونکە ئەلیف و لامی تەعریفێیان چۆتە سەر (أَلْ التَّعْريف)، کەواتە هەر وشەیەک دروست بێت ئەلیف و لامی تەعریفی بچێتە سەر، یاخود ئەلیف و لامی تەعریفی لەسەر بوون ئەوە پێی دەگوترێت «اِسْم»، جیاوازی نییە ئەم ئەلیف و لامە (أَلْ) لە ڕووی ماناوە بۆ «اِسْتِغْراق» بن یاخود بۆ «جِنْس» بن یاخود بۆ «العَهْد الذِّهني» بن یاخود بۆ «العَهْد الخارجي»[1] بن، هەموویان تایبەتن بە «اِسْم» و بە هیچ جۆرێک ناچنە سەر «فِعْل» و ناچنە سەر «حَرْف».

**تایبەتمەندی پێنجەم: (وَ نُوِّنَ)** یەکێکی‌تر لە تایبەتمەندییەکانی «اِسْم» بریتییە لەوەی کە دروستە «اِسْم»، تەنویندار بکرێت، **(يَعْنِي: يَجُوزُ أَنْ يَدْخُلَهُ التَّنْوِينُ)** واتە: دروستە ئیسم «تَنْوِين»ـی بچێتە سەر، کەواتە: هەر وشەیەکت بینی تەنوینیی لەسەر بوو، یاخود دروست بوو تەنوین بچێتە سەر، ئەوە بە «اِسْم» هەژمار دەکرێت، **(نَحْوُ)** وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: **(زَيْدٌ)** یاخود «غُلامٌ» یاخود «مُسْلِماتٌ». **سەرنج بدە:** ئێستا هەموو ئەم وشانە بە «اِسْم» هەژمار دەکرێن، چونکە «تَنْوِين»ـیان چۆتە سەر، ئینجا جیاوازی نییە ئەم تەنوینە لەبۆ «تَمَكُّن»[2] بێت وەکوو «زَيْدٌ» یاخود بۆ «تَنْكِير»[3] بێت وەکوو «صَهٍ» واتە: هەر جارەکێ خۆ کڕ بکە، یاخود بۆ

---

١. بۆیە پێناسەی ئەم چوار جۆرە ئەلیف و لامە «أَلْ»م نەنوسی چونکە «إن شاء الله» لە وانەکانی داهاتوو بە درێژی باسیان دەکەین و ڕوونیان دەکەینەوە.

٢. ئەم جۆرە «تَنْوِين»ە دەچێتە سەر ئەو ئیسمانەی کە «مُعْرَب»ن وەکوو «زَيْدٌ، بَكْرٌ، رَجُل..» نیشانەی تەواوی ئیسمەکەیە.

٣. ئەم جۆرە «تَنْوِين»ە دەچێتە سەر ئەو ئیسمانەی کە «مَبْنِي»ن بۆ جیاکردنەوەی ئەو ئیسمانەی کە «نَكِرَة»ەنە لەم ئیسمانەی کە «مَعْرِفَة»ەنە بۆ نموونە ئەگەر بڵێی «مَرَرْتُ بِسِيبَوَيْهِ» ئەوە ئەم ناوە «مَعْرِفَةَ»یە ئەگەر بڵێی «مَرَرْتُ بِسِيبَوَيْهٍ آخر» ئەوە ئەم ناوە دەبێتە «نَكِرَةَ» چونکە «تَنْوِين»ی «تَنْكِير»ی چۆتە سەر بۆیە ناوەکە بۆتە «نَكِرَةَ»ە . بڕوانە: شرح ابن عقيل ل (١/١٧).

**فَجَمِيعُ هٰذِهِ مِنْ خَوَاصِّ الِاسْمِ لَا يُوجَدُ شَيْءٌ مِنْهَا فِي الْفِعْلِ وَلَا فِي الْحَرْفِ.**

**أَمَّا الْإِخْبَارُ عَنْهُ: فَلِأَنَّ الْفِعْلَ خَبَرٌ، فَلَا يُخْبَرُ عَنْهُ؛ وَالْحَرْفَ لَا يَكُونُ خَبَراً وَلَا مُخْبَراً عَنْهُ.**

---

«عِوَض»[1] بێت وەکوو «حِينَئِذٍ، جَوارٍ» یاخود بۆ «مُقابَلَة»[2] بێت وەکوو «مُسْلِماتٌ»، ئـەم تەنوینانـە هەموویان تایبەتـن بە «اِسْم» و بـە هیچ جۆرێک ناچنە سـەر «فِعْل» و ناچنە سەر «حَرْف»[3].

**(فَجَمِيعُ هٰذِهِ)** هەموو ئـەم تایبەتمەندییانـەی کە باسمان‌کردن ـو بریتی بوون لە پێنج شت ـ **(مِنْ خَواصِّ الِاسْمِ)** تایبەتن بە «اِسْم»، بە جۆرێک **(لا يُوجَدُ شَيْءٌ مِنْها)** هیچ‌کام لەم پێنج تایبەتمەندییەی کە باسمان‌کردن دەست ناکەون و ناچنە سەر **(فِي الْفِعْلِ وَلا فِي الْحَرْفِ)** «فِعْل» و سەر «حَرْف»، کەواتـە: هـەر وشـەیەک یەکێـک لـەم پێنج نیشانانەی لەسەر بوو، یاخود دروست بوو یەکێک لەم پێنج نیشانانەی بچێتە سەر، ئەوە بە «اِسْم» هەژمار دەکرێت. ئینجا مامۆستا هۆکارەکەی ڕوون دەکاتەوە کە بۆچی ئەم پێنج شتە تایبەتن بە «اِسْم» و ناچنە سەر «فِعْل» و «حَرْف»؟ دەفەرموێت:

**(أَمّا الإِخْبارُ عَنْهُ)** سەبارەت بە تایبەتمەندی یەکەم ـکە دروستە ئیسم خەبەری لە بارەوە بدرێت و نیسبەت و ئیسنادی شتێکی‌تری بدرێتە پاڵ ـ، هۆکارەکەی چییە کە تایبەتە بە ئیسم؟ **(فَلأَنَّ الْفِعْلَ خَبَرٌ دائِماً فَلا يُخْبَرُ عَنْهُ)** چونکە «فِعْل» بە بەردەوامی دەبێت بە خەبەر و نیسبەت و ئیسنادی دەدرێت بۆ لای «اِسْم»، بۆیە «فعل» خەبەری لە بارەوە نادرێت. **(وَالْحَرْفَ لا يَكُونُ خَبَراً وَلا مُخْبَراً عَنْهُ)** هەروەها «حَرْف»ـیش نە

---

١. ئەم جۆرە «تَنْوِين»نەیە کە دەچێتە سەر ئەو ئیسمانەی کە پیتێک یا خود وشەیەک یاخود ڕستەیەکیان لێ «حذف»کراوە، وەکوو وشەی«غَوازٍ»و وشەی «كُلٌّ»و وشەی «حِينَئِذٍ». بڕوانە: البهجة المرضية. ل (٦).

٢. ئەم جۆرە «تَنْوِين»نەیە دەچێتە سەر «جَمْعُ الْمُؤَنَّثِ السَّالِم» ئەم «تَنْوِين»ـە بەرامبەر بە «نُونُ جَمْعِ الْمُذَكَّرِ السَّالِم» داندراوە، وەکوو وشەی «مُؤْمِناتٌ» وشەی «مُسْلِماتٌ» بڕوانە: شرح ابن عقيل ل (١٧/١).

٣. جگـە لـەم جوار جۆرە چەند جۆرێکی‌تری (تنوين) هەن کە هێندێک لە زانایانی (نحو) دە جۆریان باس کردوون، بەڵام ئەم چوارەیان لە هەموان (مشهور)ترن. بڕوانە أطلي: ل، ٨.

**وَأَمَّا حَرْفُ الْجَرِّ: فَلِأَنَّ الْجَرَّ عَلَامَةُ الْمُخْبَرِ عَنْهُ، وَقَدْ قُلْنَا: أَنَّ الْفِعْلَ وَالْحَرْفَ لَا يُخْبَرُ عَنْهُمَا.**

**وَأَمَّا الْإِضَافَةُ: فَلِأَنَّ الْغَرَضَ مِنْهَا إِمَّا التَّعْرِيفُ أَوِ التَّخْصِيصُ**

دەبێت بە خەبەر و نە خەبەریشی لە بارەوە دەدرێت، چونکە هەر لە ئەساسدا حەرف «مَعْمُول» نییە بۆیە خەبەری لەبارەوە نادرێت.

(**وَأَمَّا حَرْفُ الْجَرِّ**) سەبارەت بە تایبەتمەندی دووەم ـ کە دروستە ئیسم حەرفی جەڕڕی بچێتە سەر ـ، هۆکارەکەی چییە کە تایبەتە بە ئیسم؟ (**فَلأَنَّ الْجَرَّ عَلامَةُ الْمُخْبَرِ عَنْهُ**) چونکە هەر ئیسمێک کە حەرفی جەڕڕی بچێتە سەر، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە ئەو ئیسمە خەبەری لە بارەوە دراوە و نیسبەت و ئیسنادی شتێکیتری دراوەتە پاڵ (**وَقَدْ قُلْنا: أَنَّ الْفِعْلَ وَالْحَرْفَ لا يُخْبَرُ عَنْهُما**) ئێمەش بەر لە ئێستا گوتمان کە «فِعْل» و «حَرْف» بە هیچ جۆرێک خەبەریان لە بارەوە نادرێت و هۆکارەکەمان ڕوون کردەوە.

(**وَأَمَّا الإِضافَةُ**) سەبارەت بە تایبەتمەندی سێیەم ـ کە دروستە ئیسم پاڵبدرێت و «إضافة» بکرێت بۆ لای غەیری خۆی، بەڵام دروست نییە کە فیعل و حەرف بە هیچ جۆرێک «إضافة» بکرێن ـ، هۆکارەکەی چییە کە تایبەتە بە ئیسم؟ (**فَلأَنَّ الْغَرَضَ مِنْها**) چونکە ئامانج و مەبەست لە پاڵدان و «إضافة»کردنی ئیسمێک بۆ لای ئیسمێکیتر، بریتییە لە سێ شت، کە هیچیان لەگەڵ فیعل و لەگەڵ حەرف ناگونجێن، **یەکەم:** (**إِمّا التَّعْرِيفُ**) یا مەبەستەکە بریتییە لە ناساندن و «تَعْرِيف»ـی ئیسمێکی نەناسراو و «نَكِرَة» لە چ کاتێک مەبەست لە «إضافة»کردن تەعریفە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: کاتێ کە ئیسمێکی «نَكِرَةَ» پاڵبدرێت و «إِضافَةَ» بکرێت بۆ لای ئیسمێکی «مَعْرِفَة» وەکوو «غُلامُ زَيْدٍ»[1].

**دووەم:** (**أَوِ التَّخْصِيصُ**) یاخود مەبەستەکە بریتییە لە تایبەتکردن و «تَخْصيص»ـی ئیسمێکی نەناسراو (نَكِرَةَ)، بە شتێکی دیاریکراو لە چ کاتێک مەبەست لە «إضافة»کردن

١. ئێستا لەم نموونەیەدا مەبەست لە «إِضافَةَ»کردن ناساندنی ئەو ئیسمەیە کە «إضافة» کراوە، چونکە وشەی «غُلام» پێش ئەوەی کە «إضافة» بکرێت، بە هەموو خزمەتکارێک دەگوترا، بەڵام پاش ئەوەی کە «إضافة» کرا، ئێستا تەنها بە خزمەتکاری زەید دەگوترێت. بڕوانە: شَرْحُ قَطْرِ النَّدَى: ل، ١٨٩.

**أَوِ التَّخْفِيفُ كَمَا سَيَجِيءُ، وَالْفِعْلَ وَالْحَرْفَ لَا يَصْلُحَانِ شَيْئاً مِنْ ذَلِكَ.**
**وَأَمَّا الْأَلِفُ وَاللَّامُ: فَلِأَنَّ الْغَرَضَ مِنْ دُخُولِهِمَا تَعْرِيفُ الْمُخْبَرِ عَنْهُ، وَقَدْ ذَكَرْنَا أَنَّهُمَا لَا يُخْبَرُ عَنْهُمَا.**

---

«تَخصيص»ـە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: کاتێ کە ئیسمێکی «نَكِرَة» پاڵبدرێت و «إضافة» بکرێت بۆ لای ئیسمێکی‌تری نەکیرە وەکوو «غُلامُ رَجُلٍ».

سێیەم: **(أَوِ التَّخْفِيفُ)** یاخود بریتییە لە سوککردن و «تَخفیف»ـی ئەو ئیسمەی کە «إضافَة» کراوە. لە چ کاتێک مەبەست لە «إضافة»کردن «تَخْفِيف»ـە؟ کاتێ ئەو ئیسمەی کە «إضافة» کراوە «صِفَة» بێت، وەکوو «اِسْمُ الْفاعِل» و «اِسْمُ الْمَفْعُول» **(كَما سَيَجِيئُ)** هەروەکوو لە داهاتوودا باسی دەکەین **(وَالْفِعْلُ وَالْحَرْفُ لا يَصْلُحانِ شَيْئاً مِنْ ذلِكَ)** ئەم سێ شتەی کە باسمان‌کردن، بە هیچ جۆرێک لەگەڵ «فِعْل» و لەگەڵ «حَرْف» ناگونجێن.

**(وَأَمَّا الأَلِفُ وَالّلامُ)**[1] سەبارەت بە تایبەتمەندی چوارەم ـکە دروستە «اِسْم» ئەلیف و لامی بچێتە سەر، بەڵام دروست نییە بچنە سەر «فِعْل» و «حَرْف»ـ، هۆکارەکەی چییە کە تایبەتە بە ئیسم؟ **(فَلأَنَّ الْغَرَضَ مِنْ دُخُولِهِما)** چونکە ئامانج و مەبەست لەم ئیسمەی ئەلیف و لامی چوونەتە سەر، بریتییە لە **(تَعْرِيفُ الْمُخْبَرِعَنْهُ)** ناساندنی ئەو ئیسمە کە خەبەری لە بارەوە دراوە **(وَقَدْ ذَكَرْنا أَنَّهُما لا يُخْبَرُ عَنْهُما)** ئێمەش کەمێک پێش ئێستا ڕوونمان کردەوە کە «فِعْل» و «حَرْف»، بە هیچ جۆرێک خەبەریان لە بارەوە نادرێت و دروست نییە «نِسبة» و «إِسْناد»ی هیچ وشەیەکی‌تریان

---

١. ئینجا بزانە ئەی قوتابی بەڕێز: مەبەست بەم «الأَلِفُ وَاللّامُ»ـە ئەلیف و لامی «التَّعْريف»ـە، چونکە ئەگەر «الأَلِفُ وَاللّام»ـەکە بۆ «مَوْصُولْ» بوون واتە: بە مانای «اَلَّذِي» یاخود «اَلَّتي» بوون، ئەو کاتە تایبەت نین بە «اِسْم»، بەڵکوو دەچنە سەر «فِعْل»ـیش، وەکوو ئەم شیعرەی فیرەزدەق کە دەڵێت:

«مَا أَنْتَ بِالْحَكَمِ الْذِي التُرْضَى حُكُوْمَتُهُ وَلَا الأَصِيـــلُ وَلَا ذِي الـــرَّأْيِ وَالْجَدَلِ»

سەرنج بدە: ئەم «الأَلِفُ وَاللّام»ـە چوونەتە سەر وشەی «التُرْضَى» مانای وشەی «اَلَّذِي» دەبەخشن. بڕوانە: أوضح المسالك: ٣٧/١.

**وَأَمَّا التَّنْوِينُ: فَلِأَنَّهَا عَلَامَةُ تَمَامِ مَدْخُولِهَا؛ وَالْفِعْلَ وَالْحَرْفَ لَا يَتِمَّانِ إِلَّا بِالْغَيْرِ، أَمَّا الْفِعْلُ فَبِالْفَاعِلِ، وَأَمَّا الْحَرْفُ فَبِمُتَعَلَّقِهِ.**

بدرێتە پاڵ.

**(وَأَمَّا التَّنْوِينُ)** سەبارەت بە تایبەتمەندی پێنجەم ـکە دروستە ئیسم تەنوینی بچێتە سەر، بەڵام دروست نییە بچێتە سەر «فِعْل» و سەر «حَرْف»ـ **(فَلأَنَّها[1] عَلامَةُ تَمامِ مَدْخُولِها)** چونکە «تَنْوِین» نیشانەی تەواوبوونی ئەو وشەیە کە چۆتە سەری لە ڕووی ماناوە **(وَالْفِعْلَ وَالْحَرْفَ لا يَتِمّانِ إِلّا بِالْغَيْرِ)** لە کاتێکدا کە «فِعْل» و «حَرْف» لە ڕووی ماناوە تەواو نابن تەنها بە وشەیەکی‌تری غەیری خۆیان نەبێت.

**(أَمّا الْفِعْلُ فَبِالْفاعِلِ)** سەبارەت بە «فِعْل» تەنها بە هۆی هاتنی «فاعِل» مانای تەواو دەبێت، بۆ نموونە ئەگەر بڵێی: «جَلَسَ» یاخود «حَسُنَ»، ئەم دوو فیعلە مانایان تەواو نابێت تاوەکوو وشەیەکی‌تر باس نەکرێت کە فاعیلە.

**(وَأَمّا الْحَرْفُ فَبِمُتَعَلَّقِهِ)** هەروەها «حَرْف» ماناکەی تەواو نابێت تەنها بەهۆی باسکردنی ئەو وشەیە نەبێت کە پەیوەندی و «تَعَلُّق»ـی لەگەڵ دەبەستێت، بۆ نموونە: ئەگەر باسی وشەی «مِنْ» یاخود وشەی «إِلى» بکەیت، ئەم دوو وشەیە مانایان تەواو نابێت تاوەکوو لەگەڵ وشەیەکی‌تر لێک نەدرێت.

## علامات الاسم



| دخول التنوين | دخول الألف واللام | الإضافة | دخول حرف الجر | الإخبار عنه |
|---|---|---|---|---|
| (زيدٌ) | (الرجل) | (غلام زيدٍ) | (ذهبت بزيدٍ) | (خرج موسىٰ) |

---

١. حەقیقەتەن وشەی «تَنْوِین» «مُذَكَّر»ە، بەڵام بۆچی لێرەدا مامۆستا دەفەرموێت: «لأَنَّهَا»؟ زانایان دوو وەڵامیان داوەتەوە، یەکەم: دەفەرموون: «إِمَّا بِاعْتِبَارِ الأَنْوَاعِ» چونکە تەنوین چەندین جۆری هەیە؛ دووەم: دەفەرموون: «وَإِمَّا بِاعْتِبارِ الْمُسَمَّى» .

# أَصْنَافُ الِاسْمِ

**قَالَ: وَأَصْنَافُهُ: اِسْمُ الْجِنْسِ، وَالْعَلَمُ، وَالْمُعْرَبُ وَتَوَابِعُهُ، وَالْمَبْنِيُّ، وَالْمُثَنَّىٰ، وَالْمَجْمُوعُ، وَالْمَعْرِفَةُ،**

---

## وانەی پێنجەم: بەشەکانی «اِسْم»

پاش باسکردنی پێناسە و نیشانەکانی «اِسْم» ئینجا مامۆستا دێتە سەر باسکردنی بەشەکانی «اِسْم»، **(قَالَ)** مامۆستا «جار اللّٰه» زەمەخشەری دەفەرموێت: **(وَأَصْنَافُهُ)** بەشەکانی«اِسْم» بریتین لەم پازدە بەشانەی خوارەوە:

**یەکەم: (اِسْمُ الْجِنْسِ)** بەو وشەیە دەگوترێت کە دەلاڵەت لەسەر ناوی ڕەگەزێک دەکات، وەکوو وشەی «أَسَد» و «فَرَس».

**دووەم: (وَالْعَلَمُ)** بەو وشەیە دەگوترێت کە دەلاڵەت لەسەر ناوی کەسێکی دیاریکراو، یاخود شارێکی دیاریکراو دەکات... وەکوو «مُحَمّد» و «زَید» و «هەولێر»...

**سێیەم: (وَالْمُعْرَبُ)** بەو وشەیە دەگوترێت کە گۆڕانکاری لە کۆتاییدا دروست دەبێت بە هۆی گۆڕانی «عَوامِل»ـەکان.

**چوارەم: (وَتَوابِعُهُ)** بەو وشانە دەگوترێت کە ئیعرابیان وەکوو ئیعرابی «اِسْمِ»ـی پێش خۆیان وایە.

**پێنجەم: (وَالْمَبْنِيُّ)** بەو وشەیە دەگوترێت کە گۆڕانکاری لە کۆتاییدا دروست نابێت بە هۆی گۆڕانی ئەو «عَامِل»ـانەی کە دەچنە سەری.

**شەشەم: (وَالْمُثَنَّى)** بەو وشەیە دەگوترێت کە لە ڕووی ماناوە دەلاڵەت لەسەر دوو شت دەکات.

**حەوتەم: (وَالْمَجْمُوعُ)** بەو وشەیە دەگوترێت کە دەلاڵەت لەسەر سێ شت یاخود زیاتر دەکات.

**هەشتەم: (وَالْمَعْرِفَةُ)** بەو وشەیە دەگوترێت کە دەلاڵەت لەسەر کەسێکی ناسراو یاخود شوێنێکی دیاریکراو دەکات.

**وَالنَّكِرَةُ، وَالْمُذَكَّرُ، وَالْمُؤَنَّثُ، وَالْمُصَغَّرُ، وَالْمَنْسُوبُ، وَأَسْمَاءُ الْعَدَدِ، وَالْأَسْمَاءُ الْمُتَّصِلَةُ بِالْأَفْعَالِ.**

**أَقُولُ: الْأَصْنَافُ بِمَعْنَى الْأَقْسَامِ؛ يَعْنِي: أَنَّ أَقْسَامَ الِاسْمِ الْمَذْكُورَةَ فِي هٰذَا الْكِتَابِ مُنْحَصِرَةٌ فِي خَمْسَةَ عَشَرَ قِسْماً:**

---

**نۆیەم: (وَالنَّكِرَةُ)** بەو وشەیە دەگوترێت کە دەلالەت لەسەر کەسێکی نەناسراو یاخود شوێنێکی نادیار دەکات.

**دەیەم: (وَالْمُذَكَّرُ)** بەو وشەیە دەگوترێت کە دەلالەت لەسەر ڕەگەزی نێر دەکات.

**یازدەیەم: (وَالْمُؤَنَّثُ)** بەو وشەیە دەگوترێت کە دەلالەت لەسەر ڕەگەزی مێ دەکات.

**دوازدەیەم: (وَالْمُصَغَّرُ)** بەو وشەیە دەگوترێت کە دەلالەت لەسەر ناوێکی بچووککراوە دەکات.

**سێزدەیەم: (وَالْمَنْسُوبُ)** بەو وشەیە دەگوترێت کە دەلالەت و گوزارشت لەسەر ناوێک دەکات کە پاڵدرابێت بۆ لای شارێک یا شوێنێک یاخود شتێکیتر.

**چواردەیەم: (وَأَسْماءُ الْعَدَد)** بەو وشانە دەگوترێت کە دەلالەت لەسەر ژماردن دەکەن.

**پازدەیەم: (وَالأَسْماءُ الْمُتَّصِلَة بِالأَفْعالِ)** بەو وشانە دەگوترێت کە مانای «فِعْل»ـیان لەناو خۆدا هەڵگرتووە.

**(أَقُولُ:)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(الأَصْنافُ بِمَعْنى الأَقْسامِ)** وشەی «أَصْناف» کە مامۆستا باسی کرد لە سەرەتای وانەکەدا بە مانای وشەی «أَقْسام» دێت **(يَعْنِي: أَنَّ أَقْسامَ الاسْمِ الْمَذْكُورَةَ فِي هذا الْكِتابِ)**[1] واتە: مەبەستی مامۆستا ئەوەیە کە بەشەکانی «اِسْم» کە لەم کتێبەدا باس کراون و بە وردی ڕوون کراونەتەوە **(مُنْحَصِرَةٌ فِي خَمْسَةَ عَشَرَ قِسْماً)** کورتکراونەتەوە لە پازدە

---

١. بۆیە مامۆستا دەفەرموێت لەم کتێبەدا چونکە بەشەکانی «اِسْم» لە «شرح الكافية» هەروەها لە هێندێک سەرچاوەیتر بریتین لە (١١) بەش نەک پازدە. بڕوانە: شرح الكافية: ل، ٨٨، وشرح الأنموذج: ل، ٦٣.

**الْأَوَّلُ: «اسْمُ الْجِنْسِ» وَهُوَ مَا يَدُلُّ عَلَىٰ شَيْءٍ غَيْرِ مُعَيَّنٍ، وَمَا أَشْبَهَهُ، كَـ «رَجُلٍ». وَالثَّانِي: «الْعَلَمُ» وَهُوَ مَا يَدُلُّ عَلَىٰ شَيْءٍ مُعَيَّنٍ، وَلَا يَتَنَاوَلُ غَيْرَهُ بِوَضْعٍ وَاحِدٍ، كَـ «زَيْدٍ».**

بەشی سەرەکیدا و جگە لەم بەشانە هیچ بەشێکیتر باس نەکراون.

**(اَلأَوَّلُ:)** **بەشی یەکەم** بریتییە لە **(اسْمُ الْجِنسِ:)** کە: **(وَهُوَ ما يَدُلُّ عَلى شَيْءٍ غَيْرِ مُعَيَّنٍ)** بەو وشەیە دەگوترێت کە دەلالەت لەسەر شتێک دەکات بەڵام شتەکە دیاریکراو نییە، وەکوو وشەی «أَسَد» (شێر) و وشەی «فَرَس» (ئەسپ)، ئێستا ئەم دوو وشەیە هەریەکەیان ناون لەبۆ ڕەگەزێک و دەلالەتی لەسەر دەکەن، بەڵام هەردووکیان دەلالەتەکەیان دیاریکراو (مُعَيَّن) نییە، چونکە وشەی «أَسَد» بە هەموو شێرێک دەگوترێت، هەروەها وشەی «فَرَس» بە هەموو ئەسپێک دەگوترێت، **(وَما أَشْبَهَهُ)** وە هەروەها هەر وشەیەک وەکوو ئەم وشەیە بێت ـ کە دەلالەت بکات لەسەر شتێک بەڵام شتەکە دیاریکراو نەبێت ـ ئەویش هەر بە «اِسْمُ الْجِنْسِ» هەژمار دەکرێت. **(كَرَجُلٍ)** وەکوو وشەی «رَجُل»، ئێستا ئەم وشەیە دەلالەت دەکات لەسەر مانایەک کە پیاوە، بەڵام ئەم پیاوە دیار نییە، چونکە وشەی «رَجُل» بە هەموو پیاوێک دەگوترێت، تایبەت نییە بە کەسێکی دیاریکراو.

**(وَالثَّانِي:)** **بەشی دووەمی** «اسْم» بریتییە لە ناو **(اَلْعَلَمُ:)** کە بەو وشەیە دەگوترێت **(وَهُوَ ما يَدُلُّ عَلى شَيْءٍ مُعَيَّنٍ)** کە دەلالەت لەسەر شتێکی دیاریکراو، یاخود ناوی کەسێکی دیاریکراو، یاخود ناوی شارێکی دیاریکراو بکات... وەکوو «مُحمّد» و «زَيد» و «هەولێر».. **(وَلا يَتَناوَلُ غَيْرَهُ بِوَضْعٍ وَاحِدٍ)** لە هەمان کاتدا ئەم ناوە شموولی کەسێکیتر یا خود شتێکیتر ناکات بەهۆی دانانی بەرامبەر بەم مانایە بە تەنها، چونکە ناو (عَلَم) سروشتی وایە کە تەنها دەلالەت لەسەر ئەو شتە دەکات کە یەکەمجار بەرامبەر ئەو داندراوە، **(كَزَيْدٍ)** وەکوو وشەی «زَيد» یاخود هەر ناوێکیتر، ئێستا ئەم وشەیە تەنها دەلالەت و گوزارشت لەم کەسە دەکات کە لە ئەساسدا بۆی داندراوە، بۆ غەیری ئەو کەسە بەکار نایەت و دەلالەتی لەسەر ناکات.

**وَالثَّالِثُ: «الْمُعْرَبُ» وَهُوَ مَا اخْتَلَفَ آخِرُهُ بِاخْتِلَافِ الْعَوَامِلِ لَفْظاً، كَـ «زَيْدٍ»؛ أَوْ تَقْدِيراً، كَـ «سُعْدَىٰ».**

(وَالثَّالِثُ:) **بەشی سێیەمی** «اسْم» بریتییە لە (اَلْمُعْرَبُ) کە بەو وشەیە دەگوترێت (وَهُوَ ما اخْتَلَفَ آخِرُهُ بِاخْتِلافِ الْعَوامِلِ)[١] کە گۆڕانکاری لە شێوازی خوێندنەوەی پیتی کۆتاییدا دروست دەبێت بە هۆی گۆڕانی ئەم «عَامِل»ـانەی کە دەچنە سەری، ئینجا جیاوازی نییە: ئەم گۆڕانکارییەی ـ کە لە شێوازی خوێندنەوەدا دروست دەبێت ـ گۆڕانکارییەکی (لَفْظاً) لەفزی بێت واتە: لە کاتی خوێندنەوەدا هەستی پێ بکرێت (كَزَيْدٍ) وەکوو وشەی «زَيْد»؛ **سەرنج بدە:** ئێستا ئەم وشەیە ئەگەر عامیلێکی بچێتە سەر و پێویست بە «فاعِل» بێت، وشەی زەید «مَرْفُوع» دەبێت وەکوو «ذَهَبَ زَيْدٌ»؛ وە ئەگەر عامیلێکیتری بچێتە سەر پێویستی بە «مَفْعُولُ بِهِ» هەبێت، ئەوە وشەی زەید «مَنْصُوب» دەبێت، وەکوو «رَأَيْتُ زَيْداً»؛ وە ئەگەر وشەی زەید عامیلێکیتری بچێتە سەر کە پێویستی بە ئیسمێکی مەجروور هەبێت، ئەوە وشەی زەید «مَجْرُور» دەبێت وەکوو «ذَهَبْتُ بِزَيْدٍ»؛ (أَوْ تَقْدِيراً) یاخود ئەم گۆڕانکارییەی لە شێوازی خوێندنەوەدا دروست دەبێت گۆڕانکارییەکی تەقدیری بێت، واتە: لە کاتی خوێندنەوە و نووسین هەستی پێ نەکرێت، بەڵام لە تەقدیردا وشەکە گۆڕانی بەسەردا بێت، (كَسُعْدى) وەکوو وشەی «سُعْدَى» یاخود وشەی «مُوسَى» یاخود وشەی «غُلامِي»، ئێستا ئەم سێ وشانە ئەگەر عامیلێکیان بچێتە سەر پێوستی بە «فاعِل» بێت، ئەوە لە تەقدیردا «مَرْفُوع» دەبن، بەڵام ڕەفعەکەیان بەدیار ناکەوێت، وەکوو «ذَهَبَتْ سُعْدَى، خَرَجَ مُوسَى وَغُلامِي»؛ وە ئەگەر عامیلێکیتریان بچێتە سەر پێویستی بە «مَفْعُولُ بِهِ» هەبێت، ئەوە ئەم وشانە لە تەقدیردا «مَنْصُوب» دەبن، وەکوو «رَأَيْتُ سُعْدَى وَ مُوسَى وَغُلامِي»[٢]؛ وە ئەگەر ئەم وشانە عامیلێکیتریان بچێتە سەر پێویستی بە ئیسمێکی

---

١. بڕوانە: جامع الدروس العربية: ٧١.

٢. چونکە هەر وشەیەک کە ئەلیفی لە کۆتایدا بێت وەکوو وشەی «مُوسَى و سُعْدَى» یاخود «إِضافَة» کرابێت بۆ لای «ياء المتكلم» ئەوە لە حاڵەتی «رَفْع» و لە حاڵەتی «نَصْب» لە حاڵەتی «جَرّ» ئیعڕابەکەی تەقدیری دەبێت.

**وَالرَّابِعُ: تَوَابِعَ الْمُعْرَبِ، وَهِيَ كُلُّ اسْمٍ ثَانٍ مُعْرَبٍ بِإِعْرَابِ سَابِقِهِ مِنْ جِهَةٍ وَاحِدَةٍ، كَـ «الْعَالِمِ» فِي: «زَيْدٌ الْعَالِمُ قَائِمٌ».**

---

مەجروور هەبێت، ئەوە ئەم وشانە «مَجْرُور» دەبن، وەکوو «ذَهَبْتُ بِسُعْدَى وَ بِمُوسى وَ بِغُلامِي»، بەڵام «جَرَّ»کەیان لەبەرچاو نییە و لە کاتی گوتندا دەرناکەوێت.

ئێستا هەریەکە لە وشەی «زَيْد» و لە وشەی «سُعْدَى» پێیان دەگوترێت «مُعْرَب»، چونکە گۆڕانکارییان بەسەر شێوازی خوێندنەوەی حەرفی کۆتاییدا هاتووە بە هۆی گۆڕانی ئەو عاملانەی کە چوونەتە سەریان، بەڵام گۆڕانی وشەی «زَيْد» دیار و بەرچاوە و گۆڕانکاری وشەی «سُعْدَى» دیار و بەرچاو نییە، بەڵکوو گۆڕانکارییەکە لە تەقدیردایە.

(وَالرّابِعُ:) بەشی چوارەمی «اسْم» بریتییە لە «صِفَة» و «تَأْكِيد» و «بَدَل» و «عَطْف بِالْحُرُوف» و «عَطْفُ الْبَيانِ»، کە پێیان دەگوترێت (تَوابِعُ الْمُعْرَبِ) و پێناسەکەی بریتییە (وَهِيَ كُلُّ اِسْمٍ ثانٍ) هەموو ئەو ئیسمانەی لەدوای وشەیەکی‌تر دێت و لە ڕوتبەی دووەمە، (مُعْرَبٍ بِإِعْرابِ سابِقِهِ) شێوازی خوێندنەوەی ئیعڕابی وەکوو شێوازی خوێندنەوەی ئیسمی پێش خۆیەتی، واتە: ئەگەر ئەم ئیسمەی لە پێشدا هاتووە «مَرْفُوع» بوو ئەوە ئیسمی دووەمیش مەڕفووع دەبێت (مِنْ جِهَةٍ واحِدَةٍ)[1] لە یەک ڕووەوە، واتە: دەبێت سەرچاوەی هەردوو ئیعڕابەکە لە یەک «جِهَة»ـەوە بێت کە «فَاعِلِيَّة»ـە یاخود «مَفْعُولِيَّة»ـە یا «إِضَافِيَّة»ـە، نابێت جیهەتی ئیعڕابەکە لە یەکتری جیاواز بێت، وەکوو ئەوەی یەکیان «آخِذ» و ئەوی‌تریان «مَأْخُوذ» بێت. (كَالعَالِمِ فِي) وەکوو وشەی «العالِمُ» ـکە «صِفَة»ـە لەم نموونەیەـ کاتێ دەڵێیت: (زَيْدٌ العَالِمُ قائِمٌ) واتە: زەیدی زانا ڕاوەستاوە؛ سەرنج بدە: لەم نموونەیە وشەی «العالِمُ» لە پلەی دووەم هاتووە و بۆتە «صِفَة» لەبۆ وشەی «زَيْدٌ»، وەکوو ئەویش «مَرْفُوع» بووە؛ بەڵام ئەگەر

---

١. «وَبِهذا الْقَيْدِ احْتَرَزَ عَنْ الْمَفْعُولِ الثَّانِي فِي بَابِ "عَلِمْتُ" فَإِنَّهُ مُعْرَبُ بِإِعْرابِ سَابِقِهِ، وَلَكِنْ لَا مِنْ جِهَةٍ وَاحِدَةٍ بَلْ مِنْ جِهَتَيْنِ مُخْتَلِفَتَيْنِ لأَنَّ الْفِعْلَ يَنْصِبُ الْمَفْعُولَ الأَوَّلَ مِنْ جِهَةِ أَنَّهُ مُسْنَدٌ إِلَيْهِ، وَالثَّانِي مِنْ جِهَةِ أَنَّهُ مُسْنَدٌ بِهِ». شرح ملا جامي:ل، ٢٥٥.

**وَالْخَامِسُ: «الْمَبْنِيُّ» وَهُوَ الَّذِي سُكُونُ آخِرِهِ، وَحَرَكَتُهُ لَا بِعَامِلٍ، كَـ «مَنْ، وَأَيْنَ، وَحَيْثُ، وَهٰؤُلَاءِ».**

**وَالسَّادِسُ: «الْمُثَنَّىٰ» وَهُوَ مَا زِيدَ فِي آخِرِهِ أَلِفٌ،**

---

ئەم ئیسمەی لە پێشدا هاتووە «مَنْصُوب» بوو، ئەوە ئیسمی دووەمیش بە هەمان شێوە «مَنْصُوب» دەبێت، وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: «رَأَيْتُ زَيْداً الْعالِمَ»؛ هەروەها ئەگەر ئەم ئیسمەی لە پێشدا هاتبوو «مَجْرُور» بوو، ئەوە ئەم ئیسمی دووەمەیش بە هەمان شێوە «مَجْرُور» دەبێت، وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: «مَرَرْتُ بزَيْدٍ الْعالِمِ».

**(وَالْخامِسُ)** بەشی پێنجەمی «اِسْم» بریتییە لە **(اَلْمَبْنِيُّ:)** ئەو ئیسمەیە کە پێی دەگوترێت «مَبْنِي» **(وَهُوَ الّذِي سُكُونُ آخِرِهِ)** «مَبْني» بەو ئیسمە دەگوترێت کە ئەو «سُكُون»ـەی لە کۆتاییەکەیدا هاتووە **(وَحَرَكَتُهُ)** لەگەڵ ئەو حەرەکانەی لە کۆتاییدا هاتوون ـکە بریتین لە «رَفْع»ـە و «نَصْب»ـە و «جَرّ»ە- **(لا بِعامِلٍ)**[1] بەهۆی هیچ عامیلێک پەیدا نەبوون و بەهۆی گۆڕانی عامِلەکانەوە ناگۆڕێن، **(کَـ)** وەکوو ئەو «سُكُون»ـەی لە کۆتایی وشەی **(مَنْ)**ـدا هاتووە، بە هۆی «عامِل»ـەوە پەیدا نەبووە و بە گۆڕانی عامیلیش ناگۆڕێت؛ هەروەها وەکوو ئەو «فَتْحَة»ی لە کۆتایی وشەی **(أَيْنَ)** دا هاتووە، بە هۆی عامیلەوە پەیدا نەبووە و بە گۆڕانی«عامِل»ـیش ناگۆڕێت؛ هەروەها وەکوو ئەو «ضَمَّة»ی لە کۆتایی وشەی **(حَيْثُ)** دا هاتووە، بە هۆی عامیلەوە پەیدا نەبووە و بە گۆڕانی عامیلیش ناگۆڕێت؛ هەروەها وەکوو ئەو «كَسْرَة»ی لە کۆتایی وشەی **(هؤُلاءِ)**ـدا هاتووە، بە هۆی عامیلەوە پەیدا نەبووە و بە هۆی گۆڕانی عامیلیش ناگۆڕێت.

**(وَالسّادِسُ:)** بەشی شەشەمی «اِسْم» بریتییە لە **(اَلْمُثَنَى)** کە بریتییە لەو ئیسمەی لە ڕووی ماناوە بۆ دەلالەتکردن لەسەر دوو شت یاخود دوو کەس بەکار دێت، لە ڕووی «لَفْظ»ـیشەوە **(وَهُوَ ما زِيدَ فِي آخِرِهِ أَلِفٌ)** بریتییە لەو ئیسمەی کە لە کۆتاییەکەیدا

---

١. بڕوانە: شرح المفصل: ١/٩٣.

**أَوْ يَاءٌ مَفْتُوحٌ مَا قَبْلَهَا، وَنُونٌ مَكْسُورَةٌ عِوَضاً عَنِ الْحَرَكَةِ وَالتَّنْوِينِ، نَحْوُ: «جَاءَنِي مُسْلِمَانِ، وَرَأَيْتُ مُسْلِمَيْنِ، وَمَرَرْتُ بِمُسْلِمَيْنِ».**

---

«ألف»ـێک زیاد دەکرێت لە حاڵەتی مەرفووعبووندا **(أَوْ ياءٌ مَفْتُوحُ ما قَبْلَها)** یاخود «یاء»ـێک زیاد دەکرێت کە حەرفی پێشی «مَفْتُوح» بێت لە حاڵەتی «نَصْبَ»ـە و لە حاڵەتی جەڕەدا **(وَنُونُ مَكْسُورَةٌ عِوَضاً عَنِ الْحَرَكَةِ وَالتَّنْوِينِ)**[1] لەگەڵ زیادکردنی «نُون»ـێکی «مَكْسُورَة» لەدوای «ألف» و لە دوای «یاء»ـەکە، کە ئەم نوونە لەجیاتی ئەو «حَرَكَة» و «تَنْوِين»ـەیە کە دەچێتە سەر ئیسمی «مُفْرَد» وەکوو «زَيْد»، کەواتە: «مُثَنّی» بریتییە لەو ئیسمەی کە ئەلیف و نوونێکی مەکسووره لە کۆتاییدا بۆ زیاد دەکرێت، یاخود یائێک و نوونێکی مەکسوورەی بۆ زیاد دەکرێت **(نَحْوُ:)** وەکوو وشەی «مُسْلِم»، ئێستا ئەم وشەیە موفرەدە، بەڵام بە زیادکردنی ئەلیف و نوونێکی مەکسووره بۆتە «مُثَنَّی»، بۆیە لە حاڵەتی ڕەفعەدا دەڵێین **(جَاءَنِي مُسْلِمانِ)** واتە: دوو کەسی موسوڵمان هاتنە لای من، وە لە حاڵەتی «نَصْب»ـە و لە حاڵەتی «جَرّ»ەدا یائێک و نوونێکی مەکسوورەی بۆ زیاد دەکرێت **(وَ)** لە حاڵەتی نەسبەدا دەڵێین: **(رَأَيْتُ مُسْلِمَيْنِ، وَ)** لە حاڵەتی جەڕەدا دەڵێین: **(مَرَرْتُ بِمُسْلِمَيْنِ)**.

بەڵام ئەگەر بێت و «ألف» و «نُون»ـەکە زیادە نەبوون وەکوو وشەی «إِثْنانِ» یاخود وشەی «ثِنْتانِ»، یاخود وشەکە «یاء»ـێک و «نُون»ـێکی مەسکوورەی لە کۆتایدا هاتبوون، بەڵام ئەسڵی وشەکە بوون و زیادە نەبوون وەکوو وشەی «اِثْنَيْنِ، ثِنْتَيْنِ»، هەروەها ماناشیان مانای «مُثَنَّی» بوو، ئەوە لەم دوو حاڵەتەدا وشەکە پێی ناگوترێت «مُثَنّی»، بەڵکوو پێی دەگوترێت «مُلْحَق» بە «مُثَنَّی» و ئیعرابیشیان وەکوو ئیعرابی «مُثَنَّی» وایە؛ هەروەها ئەگەر وشەکە «أَلِف» و «نُون»ـەکەی زیادە بوون، بەڵام دەلالەتیان لەسەر «تَثْنِيَة» نەدەکرد وەکوو وشەی «صِنْوان، قِنْوان»[2] ئەو کاتەش پێی ناگوترێت «مُثَنَّی»، بەڵکوو بە «مُفْرَد» دادەندرێن و ئیعرابیشیان وەکوو ئیعرابی «مُفْرَد»ە.

---

١. بڕوانە: شرح ابن عقيل: ٦٧/١.
٢. شرح ملا جامي: ل، ٢٥٥.

**وَالسَّابِعُ: «الْمَجْمُوعُ» وَهُوَ مَا دَلَّ عَلَىٰ آحَادٍ يَدُلُّ عَلَىٰ أَحَدِهَا وَاحِدُهُ، كَـ «زَيْدِينَ، وَرِجَالٍ وَهِنْدَاتٍ».**

**وَالثَّامِنُ: «الْمَعْرِفَةُ» وَهِيَ مَا دَلَّ عَلَىٰ شَيْءٍ مُعَيَّنٍ، نَحْوُ: «أَنَا، وَأَنْتَ».**

---

**(وَالسّابِعُ:)** بەشی حەوتەمی «اِسْم» **(اَلْمَجْمُوعُ)** بریتییە لە «جَمْعُ الْمُذَكّرِ السّالِم» و «جَمْعُ التَّكْسِير» و «جَمْعُ الْمُؤَنّثِ السّالِم»، ئینجا مامۆستا بە شێوەیەکی گشتی پێناسەی «الجَمْع» دەکات و دەفەرموێت: **(وَهُوَ ما دَلَّ عَلى آحادٍ)** جەمع بریتییە لەو وشەیەی کە دەلالەت لەسەر کۆمەڵە شتێک دەکات **(يَدُلُّ عَلى أَحَدِها واحِدُهُ)** لە کاتێکدا کە تاکێکی ئەم جەمعە دەلالەت دەکات لەسەر یەکێکی خودی جەمعەکە و تاکەکانی، وەکوو وشەی «مُسْلِمُونَ» ئێستا ئەم وشەیە دەلالەت لەسەر کۆمەڵە موسوڵمانێک دەکات، لە کاتێکا کە وشەی «مُسْلِم» ـکە تاک و «مُفْرَد»ێکی وشەی «مُسْلِمُونَ»یەـ دەلالەت دەکات لەسەر تەواوی تاکەکانی جەمعەکە، **(كَـ)** نموونەی «جَمْعُ الْمُذَكّرِ السّالِم» وەکوو **(زَيْدِيْنَ)** ئێستا ئەم وشەیە دەلالەت دەکات لەسەر کۆمەڵە زەیدێک، **(وَ رِجالٍ)** هەروەها نموونەی «جَمْعُ التَّكْسِير» وەکوو وشەی «رِجال» کە جەمعی وشەی «رَجُل»ە، **(وَ هِنْداتٍ)** هەروەها نموونەی «جَمْعُ الْمُؤَنّثِ السّالِم» وەکوو وشەی «هِنْدات»، کە جەمعی وشەی «هِنْد»ە.

**(وَالثّامِنُ:) بەشی هەشتەمی** «اِسْم» بریتییە لە **(اَلْمَعْرِفَةُ:)** کە بریتییە لەو ئیسمەی کە دەلالەت لەسەر ناوێکی ناسراو دەکات، جیاوازی نییە ناوی کەسێک بێت یاخود ناوی شوێنێک بێت یاخود ئاماژە بێت بۆ شتێکی دیاریکراو، بۆیە مامۆستا لە پێناسەکەیدا دەفەرموێت: **(وَهِيَ ما دَلَّ عَلى شَيْءٍ مُعَيَّنٍ)** مەعریفە بریتییە لەو وشەیە کە دەلالەت دەکات لەسەر شتێکی دیاریکراو **(نَحْوُ)** وەکوو وشەی **(أَنا)** واتە: من، **(وَ)** هەروەها وەکوو وشەی **(أَنْتَ)** واتە: تۆ، ئێستا ئەم دوو وشەیە دەلالەت دەکەن لەسەر شتێکی دیاریکراو و «مَعلوم»، بۆیە بە مەعریفە حیسابن.

ه ه

**وَالتَّاسِعُ: «النَّكِرَةُ» وَهِيَ مَا يَدُلُّ عَلَىٰ شَيْءٍ غَيْرِ مُعَيَّنٍ، كَـ «غُلَامٍ».**

## جیاوازی چییه له نێوان «اِسْمُ الْعَلَم» و «الْمَعْرِفَة»؟

ئینجا بزانە ئەی قوتابی بەڕێز و فەقێی خۆشەویست: کە هەردوو وشەی «اَلْمَعْرِفَة» و «اَلْعَلَم» لـە ڕووی پێناسـە و ڕواڵەتـەوە زۆر لـە یەکتری نزیکـن، چونکە هەردووکیان دەلالەت دەکەن لەسـەر شتێکی دیاریکراو (ما يَدُلُّ عَلَى شَيْءٍ غَيْرِ مُعَيَّنٍ)، بەڵام لە ڕووی مانـا و ناوەڕۆکـەوە لـە یەکتـری جیـاوازن، چونکـە «عُمُـوم» و «خُصُـوص» هەیە لـە نێوانیانـدا، لەبەرئـەوە هەموو «عَلَم»ـێک بـە «مَعْرِفَة»ە دادەندرێت، بەڵام هەموو «مَعْرِفَة»یەک بە «عَلَم» دانانرێت، سـەرنج بدە: هەرسێ وشـەی «أَنْتَ، الَّذِي، هَذَا» پێیـان دەگوترێـت «مَعْرِفَـةَ»، بـەڵام پێیـان ناگوترێت «عَلَم»، چونکە مەعریفە شـەش بەشی سەرەکی هەیە، یەکێک لە بەشەکان پێی دەگوترێت: «عَلَم»[1].

**(وَالتّاسِعُ) بـەشی نۆیـەمی** «اِسْـم» بریتییـە لـە **(اَلنَّكِرَةُ)** کـە ئەو ئیسـمەیە دەلالەت لەسـەر ناوێکـی نەناسـراو دەکات، جیـاوازی نییـە نـاوی کەسێک بێـت یاخـود نـاوی شـوێنێک بێـت، بۆیە مامۆسـتا لـە پێناسـەکەیدا دەفەرموێـت: **(وَهِيَ مَا يَدُلُّ عَلَى شَيْءٍ غَيْرِ مُعَيَنٍ)** واتە: نەکیرە بریتییە لە وشەیەک کە دەلالەت دەکات لەسەر شتێکی نادیار **(كَغُلامٍ)** وەکوو وشەی «غُلام»، یاخود وەکوو وشەی «رَجُل»؛ **سەرنج بدە:** ئێستا ئەم دوو وشـەیە پێیان دەگوترێت «نَكِرَة»، چونکە وشـەی «غُلام» دەلالەت لەسەر هەموو خزمەتکارێـک و هەروەهـا وشـەی «رَجُـل» دەلالـەت لەسـەر هەموو پیاوێـک دەکات، دەلالەتی هەردوو وشەکان لەسەر ماناکانیان دیاریکراو نییە.

## جیاوازی چییه له نێوان «اِسْمُ الْجِنْسُ» و «النَّكِرَةَ»؟

**ئینجـا بزانـە:** کـە پێناسـەی «اِسْـمُ الْجِنْـس» و «النّكـرة» لـە ڕووی ماناوە زۆر لـە یەکتـری نزیکـن، هەردووکیـان ئاوا پێناسـە دەکرێـن: «ما يدلّ على شيْء غير معيّن» بـەڵام «اسـم الجنـس» ئـەم بڕگـەی «وَمـا أَشْـبَهَهُ»ی زیاترە، ئەمـەش واتـای ئەوەیە کە

---

١. بڕوانە: شرح ملا جامی ١٢٥/٢، وشرح الأنموذج: ٦٦.

## وَالْعَاشِرُ: «الْمُذَكَّرُ» وَهُوَ مَا خَلَا آخِرُهُ مِنْ تَاءِ التَّأْنِيث،

«النَّكِرَة» دەلالەت لەسەر یەک شت دەکات، بەلام شتەکە نادیارە، بۆ نموونە کە دەڵێین «غُلام» واتە: یەک خزمەتکار، وە ئەم خزمەتکارەش دیار نییە، بەلام «اِسْمُ الْجِنْس»[١] دەلالەت دەکات لەسەر شتێکی نادیار و هەموو ئەوانەی وەکوو ئەون بۆ نموونە کە دەڵێین «رَجُل» واتە: پیاوێک و هەموو ئەوانەی وەکوو ئەو پیاون، کەواتە: «اِسْمُ الْجِنْس» گشتگیری و «شُمُولِيَّة»ـی تێدایە و بۆ هەمووان بەکار دێت، بەلام «النَّكِرَة» بۆ یەک کەس بەکار دێت، وە کەسەکەش دیار نییە، واتە: «عَدَم التَّعْيِين»ـی تێدایە[٢]. «وَما أَشْبَهَهُ» واتە: «وَمَا أَشْبَهَ ذَلِكَ الشَّيْءَ فِي أَنَّ كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا أَيْ: مِنَ الْمُشَبَّهِ وَالْمُشَبَّهِ بِهِ فَرْدٌ لِحَقِيقَةٍ وَاحِدَةٍ مُعَبَّرٌ عَنْهَا بِذَلِكَ الإِسْمِ»[٣].

**(وَالْعاشِرُ) بەشی دەیەمی** «اسْم» بریتییە لە **(اَلْمُذَكَّرُ)** کە بەو ئیسمە دەگوترێت دەلالەت لەسەر ڕەگەزی نێر دەکات لە مرۆڤ و لە هەموو گیانلەبەرانیتردا. ئینجا بزانە کە «مُذَكَّر» دوو جۆری هەیە، **جۆری یەکەم:** «اَلْمُذَكَّرُ الْحَقِيقِيّ» کە لە ڕووی ماناوە بەم شتانە دەگوترێت کە لە بەرامبەریان مێیینەیەک وجوودی هەبێت. **جۆری دووەم:** «اَلْمُذَكَّرُ الغَيْرُ الحَقِيقِيّ» کە لە ڕووی «لَفْظ»ـەوە بەم وشەیە دەگوترێت کە مامۆستا دەفەرموێت: **(وَهُوَ ما خَلا آخِرُهُ مِنْ تاءِ التَّأْنِيث)** کۆتای وشەکە خاڵی بێت لەم سێ شتانە:

---

١. واتە: ئەگەر مەبەستت «عَدَمُ التَّعْيِين» بوو، ئەوە پێی دەگوترێت «النَّكِرَة»، «**أَيْ: إِذا أُرِيدَ بِهِ عَدَمُ التَّعْيِينِ فَهُوَ النَّكِرَةُ، وَإِذا أُرِيدَ بِهِ الشُّمُولُ فَهُوَ اِسْمُ الْجِنْسِ وَهَذَا أَظْهَرُ الْفَرْقِ بَيْنَ اِسْمِ الْجِنْسِ وَالنَّكِرَةِ**» بڕوانە: شرح الأنموذج تەعلیقی سید مسلم: ٢٥.

٢. بەلام بەشێکیتر لە زانایان دەفەرموون: «**اَلْفَرْقُ بَيْنَ اِسْمِ الْجِنْسِ وَالنَّكِرَةِ هُوَ: أَنَّ اِسْمَ الْجِنْسِ مَا وُضِعَ لِمُطْلَقِ الْحَقِيقَةِ بِلَا اِعْتِبارِ قَيْدٍ مَعَهَا أَصْلاً، كَ «أَسَدٍ، وَبَقَرٍ» أَوْ تَقْدِيراً، كَ «شَمْسٍ وَ قَمَرٍ» وَأَمَّا النَّكِرَةُ فَهِيَ: مَا وُضِعَتْ لِكُلِ فَرْدٍ مِنْ أَفْرادِ الْحَقِيقَةِ عَلَى طَرِيقَةِ الْبَدَلِ، فَإِنْ أُرِيدَ مِنْ لَفْظِ «رَجُلٍ» مَثَلاً، اَلْحَقِيقَةُ الْمُطْلَقَةُ مِنْ غَيْرِ قَيْدٍ، فَهُوَ اِسْمُ الْجِنْسِ، وَإِنْ أُرِيدَ بِهِ فَرْدٌ غَيْرُ مُعَيَّنٍ مِنْ أَفْرادِ الْحَقِيقَةِ، فَهُوَ النَّكِرَةُ**» بڕوانە: التعليقات على شرح ابن عقيل: ١/ ١٢٣.

٣. بڕوانە: شرح الأنموذج: ل، ٦٣.

**وَأَلِفَيِ الْمَقْصُورَةِ وَالْمَمْدُودَةِ، كَ «رَجُلٍ».**
**وَالْحَادِيَ عَشَرَ: «الْمُؤَنَّثُ» وَهُوَ مَا فِي آخِرِهِ إِحْدَاهُنَّ، كَ «مَرْأَةٍ،**

---

**یەکەم:** «تاءُ التَّأْنِيث» واتە نابێت ئەم «تاء»ـەی پێوە بێت ـ کە نیشانەی ئەوەیە وشەکە بۆ ڕەگەزی مێینە بەکار دێت ـ، چونکە ئەگەر ئەم «تاء»ـەی پێوە بێت ئەوە وشەکە بە «مُؤَنَّث» حیساب دەکرێت، هەرچەندە لە حەقیقەتدا «مُذَكَّر»یش بێت وەکوو وشەی «طَلْحَة».

**دووەم:** (وَ) هەروەها دەبێت کۆتایی وشەکە خاڵی بێت لە **(أَلِفَيِ الْمَقْصُورَةِ)** لە «أَلِفُ الْمَقْصُورَة» ـ کە بۆ ڕەگەزی مێینە بەکاردێت ـ، ئەم جۆرە ئەلیفە لە هەر وشەیەکدا هەبوو، ئەوە نیشانەی ئەوەیەکە وشەکە «مُؤَنَّث»ـە.

**سێیەم:** (وَ) هەروەها دەبێت کۆتایی وشەکە خاڵی بێت لە **(الْمَمْدُودَةِ)** لە «أَلِفُ الْمَمْدُودَة» ـ کە بۆ ڕەگەزی مێینە بە کاردێت ـ، ئەم جۆرە ئەلیفە لە هەر وشەیەکدا هەبوو، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە وشەکە «مُؤَنَّث»ـە؛ هەر وشەیەک لەم سێ نیشانەیە خاڵی بێت ئەوە پێی دەگوترێت «مُذَكَّر» **(كَرَجُلٍ)** وەکوو وشەی «رَجُل»، ئێستا ئەم وشەیە لەم سێ نیشانەیە خاڵییە بۆیە پێی دەگوترێت «مُذَكَّر».

**(وَالْحادِي عَشَرَ:)** **بەشی یازدەهەمی** «اسْم» بریتییە لە **(اَلْمُؤَنَّثُ:)** کە بەو ئیسمە دەگوترێت دەلالەت لەسەر ڕەگەزی مێینە دەکات لە مرۆڤ و لە هەموو گیانلەبەرانی تردا. ئینجا بزانە کە «اَلْمُؤَنَّث» دوو جۆری هەیە، **جۆری یەکەم:** «اَلْمُؤَنَّثُ الْحَقِيقِيّ» کە لە ڕووی ماناوە بەو شتانە دەگوترێت کە لە بەرامبەریان نێرینەیەک وجوودی هەبێت، **جۆری دووەم:** «اَلْمُؤَنَّثُ الغَيْرُ الحَقِيقِيّ» کە لە ڕووی «لَفْظ»ـەوە بەو وشەیە دەگوترێت کە مامۆستا دەفەرموێت: **(وَهُوَ ما فِي آخِرِهِ إِحْداهُنَّ)** لە کۆتایی وشەکە یەکێک لەم سێ شتانە هەبێت:

**یەکەم:** «تاءُ التَّأْنِيث» واتە: ئەم «تاء»ـەی پێوە بێت کە نیشانەی ئەوەیە وشەکە بۆ ڕەگەزی مێینە بەکار دێت، جیاوازی نییە ئەم وشەیە لە حەقیقەتدا «مُؤَنَّث» بێت **(كَمَرْأَةٍ)** وەکوو وشەی «امْرَأَة» کە پێی دەگوترێت «الْمُؤَنَّثُ الْحَقِيقِيّ»، یاخود «مُذَكَّر» بێت وەکوو وشەی «طَلْحَة»، کە پێی دەگوترێت «الْمُؤَنَّثُ اللَّفْظِيُّ»، چونکە ئەگەر

**وَحُبْلَى، وَحَمْرَاءَ».**

**وَالثَّانِيَ عَشَرَ: «الْمُصَغَّرُ» وَهُوَ مَا ضُمَّ أَوَّلُهُ وَفُتِحَ ثَانِيهِ وَزِيدَ قَبْلَ ثَالِثِهِ ياءٌ سَاكِنَةٌ، كَـ «رُجَيْلٍ».**

**وَالثَّالِثَ عَشَرَ: «الْمَنْسُوبُ» وَهُوَ مَا لَحِقَ آخِرَهُ يَاءٌ مُشَدَّدَةٌ تَدُلُّ عَلَىٰ نِسْبَةِ شَيْءٍ إِلَيْهِ،**

---

ئەم «تاء»ـەی پێوە بێت، ئەوە وشەکە بە «مُؤَنَّث» حیساب دەکرێت، هەرچەندە لە حەقیقەتدا «مُذَکّر»یش بێت.

**دووەم:** (وَ) هەروەها ئەگەر کۆتایی وشەکە «أَلِفُ الْمَقْصُورَة»ی پێوە بوو، وەکوو وشەی (حُبْلَى) ـ کە سیفەتێکە بۆ ڕەگەزی مێینە بەکاردێت ـ، وەکوو دەگوترێت: «اِمْرَأَةٌ حُبْلَى»؛ ئینجا بزانە ئەم «أَلِفُ الْمَقْصُورَة»یە لە هەر وشەیەکدا هەبوو ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە وشەکە «مُؤَنَّث»ـە.

**سێیەم:** (وَ) هەروەها ئەگەر کۆتایی وشەکە (أَلِفُ الْمَمْدُودَة)ی پێوە بوو، وەکوو وشەی (حَمْراءَ) ـ کە بۆ ڕەگەزی مێینە بە کاردێت ـ، ئینجا ئەم «أَلِفُ الْمَمْدُودَةِ» لە هەر وشەیەکدا هەبوو ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە وشەکە «مُؤَنَّث»ـە، هەر وشەیەک ئەم سێ نیشانەیەی پێوە بێت ئەوە پێی دەگوترێت «مُؤَنَّث».

**(وَالثَّانِي عَشَرَ) بەشی دوازدەمی** «اسْم» بریتییە لە **(اَلْمُصَغَّرُ)** کە **(وَهُوَ مَا)** ئەو ئیسمەیە **(ضُمَّ أَوَّلُهُ)** حەرفی سەرەتای «مَضْمُوم» دەکرێت **(وَفُتِحَ ثانِيهِ)** هەروەها حەرفی دووەمی «مَفْتُوح» دەکرێت **(وَزِيدَ قَبْلَ ثالِثِهِ ياءٌ ساكِنَةٌ)** هەروەها لە پێش حەرفی سێیەمی «یاء»ـێکی «ساكِنَة» زیاد دەکرێت، **(کَـ)** وەکوو وشەی **(رُجَيْلٍ)** کە لە ئەسڵدا «رَجُل» بووە، ئەم گۆڕانکارییانەی تێدا کراوە و بووە بە «رُجَيْل».

**(وَالثَّالِثَ عَشَرَ) بەشی سێزدەمی** «اِسْم» بریتییە لە **(اَلْمَنْسُوبُ، وَهُوَ)** کە ئەو ئیسمەیە **(مالَحِقَ آخِرَهُ ياءٌ مُشَدَّدَةٌ)** «یاء»ـێکی «مُشَدَّدَة» لە کۆتاییدا زیاد دەکرێت و بە وشەکەوە دەنووسێت **(تَدُلُّ عَلى نِسْبَةِ شَيْءٍ إِلَيْهِ)** کە لە ڕووی ماناوە دەلالەت دەکات لەسەر ئەوەی کە شتێکیتر پاڵ دراوە بۆ لای ئەو ئیسمەی کە ئەم «یاء»ـە

**كَ «بَغْدَادِيٍّ».**

**وَالرَّابِعَ عَشَرَ: «أَسْمَاءُ الْعَدَدِ» وَهِيَ أَسْمَاءٌ تُعَدُّ بِهَا الْأَشْيَاءُ، كَ «وَاحِدٍ، وَاثْنَيْنِ، وَثَلَاثَةٍ».**

**وَالْخَامِسَ عَشَرَ: «الْأَسْمَاءُ الْمُتَّصِلَةُ بِالْأَفْعَالِ» وَهِيَ أَسْمَاءٌ فِيهَا مَعْنَى الْفِعْلِ، كَ «عَلِيمٍ، وَعِلْمٍ، وَعَالِمٍ، وَمَعْلُومٍ، وَأَعْلَمَ».**

---

«مُشَدَّدَة»ی پێوە نووساوە، (**كَ**) وەکوو تۆ دەڵێیت: (**زَيْدٌ بَغْدادِيٌّ**) واتە: زەید خەڵکی بەغدایە؛ **سەرنج بدە:** ئێستا وشەی (**بَغْدادِيٌّ**) پێی دەگوترێت «اِسْم مَنْسُوب»، چونکە «ياء»ـێکی «مُشَدَّدَة»ی پێوە نووساوە و نیسبەتی وشەی زەیدی داوە بۆ لای شاری بەغداد و دەلالەت دەکات کە «زيد» خەڵکی شاری بەغدایە.

(**وَالرّابِعَ عَشَرَ:**) **بەشی چواردەمی** «اِسْم» بریتییە لە (**أَسْماءُ الْعَدَدِ**) کە بەو ئیسمانە دەگوترێت لە ڕووی ماناوە دەلالەت لەسەر ژمارە و «عَدَد»ێک دەکەن (**وَهِيَ أَسْماءٌ تُعَدُّ بِها الأَشْياءُ**) کە بریتین لەو ئیسمانەی کە شتیان پێ دەژمێردرێت (**كواحِدٍ**) وەکوو وشەی «واحد» کە مانای یەک دەبەخشێت، شتی پێ دەژمێردرێت و ڕۆژانە بۆ هەژماردنی شت بەکار دێن. (**وَاثْنَيْنِ**) هەروەها وەکوو وشەی «اِثْنَيْن» و «اثْنان» کە مانای ژمارەی دوو دەبەخشن، (**وَثَلاثَةَ**) هەروەها وەکوو وشەی «ثَلاثَة» کە مانای سێ دەبەخشێت.

(**وَالْخامِسَ عَشَرَ**) **بەشی پازدەمی** «اسْم» بریتییە لە (**اَلأَسْماءُ الْمُتَّصِلَةُ بِالأَفْعالِ**) لەو ئیسمانەی کە لە ڕووی ماناوە بە فیعلەوە لکاون و مانای فیعلیان لە نێو خۆدا گرتووە، (**كَ**) وەکوو «الصِّفَة الْمُشَبَّهَة» کە نموونەکەی بریتییە لە وشەی (**عَليمٍ**) (**وَ**) یاخود وەکوو «اَلْمَصْدَر» کە نموونەکەی بریتییە لە وشەی (**عِلْمٍ**)، (**وَ**) یاخود وەکوو «اِسْمُ الْفاعِل» و «اسْمُ الْمَفْعُول» کە نموونەکەیان بریتییە لە وشەی (**عالِمٍ وَمَعْلُومٍ**)، (**وَ**) یاخود وەکوو «اِسْمُ التَّفْضِيل» کە نموونەکەی بریتییە لە وشەی (**أَعْلَمَ**) ئەم پێنج جۆرە ئیسمانە بەردەوام مانای فیعلیان لەناو خۆدا گرتووە، هەریەکەو بە جۆرێک کە دواتر باسی دەکەین.

**فَهٰذِهِ الْخَمْسَةَ عَشَرَ أَصْنَافُ الِاسْمِ الَّتِي يُذْكَرُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهَا مَعَ مَا يَتَعَلَّقُ بِهِ فِي هٰذَا الْكِتَابِ بِالتَّرْتِيبِ فِي مَوْضِعِهِ.**

ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: (**فَهذِهِ الْخَمْسَةَ عَشَرَ أَصْنافُ الِاسْمِ**) ئەم پازدە بەشەی کەباسمانکردن پێیان دەگوترێت: بەشەکانی ئیسم، (**الَّتي يُذْكَرُ كُلُّ واحِدٍ مِنْ هَذِهِ الْمَذْكُورَةِ**) کە مامۆستا بە درێژی باسی یەکە بە یەکەی ئەم بەشانە دەکات کە ئاماژەمان پێ کردن (**مَعَ مَا يَتَعَلَّقُ بِهِ فِي هَذا الْكِتابِ**) لەگەڵ هەر شتێک کە پەیوەندی هەبێت لەگەڵ ئەم بەشانە بە تەواوی بۆ قوتابیان ڕوونیان دەکاتەوە لەناو ئەم کتێبەدا (**بِالتَّرْتِيبِ فِي مَوْضِعِهِ**) بەم ڕیزبەندییەی کە ئاماژەمان پێ دا هەریەکە لە شوێنی خۆی شی دەکاتەوە.

* ◌ *

# اسْمُ الْجِنْسِ

**قَالَ: اسْمُ الجِنْسِ، وَهُوَ عَلَىٰ ضَرْبَيْنِ: اسمِ عَيْنٍ، كَـ «رَجُلٍ» و «رَاكِبٍ»، وَاسْمِ مَعْنًى، كَـ «عِلْمٍ» وَ «مَفْهُومٍ».**

**أَقُولُ: لَمَّا فَرَغَ مِنْ تَعْدَادِ أَصْنَافِ الاِسْمِ مُجْمَلَةً،**

---

## وانەی شەشەم: باسی «اِسْمُ الْجِنْسِ»

پاش باسکردنی پێناسەی بەشەکانی «اِسْم» بە کورتی، ئینجا مامۆستا دێتە سەر باسکردنی بەشەکانی ئیسم بە درێژی: **(قَالَ)** مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: **(اِسْمُ الْجِنْسِ)**[1] ئەو ناوەی کە دەلالەت لەسەر ڕەگەزێکی تایبەت دەکات و پێی دەگوترێت «اِسْمُ الْجِنْسِ» **(وَهُوَ)** ئەم ناوە **(عَلَى ضَرْبَيْنِ)** دوو جۆری هەیە لە ڕووی ناوەڕۆک و ماناوە. **جۆری یەکەم:** پێی دەگوترێت: **(اِسْمِ عَيْنٍ)** ـکە پاش کەمێکی‌تر ڕوونی دەکەینەوە- **(كَرَجُلٍ)** وەکوو وشەی «رَجُلٍ» کە دەلالەت لەسەر ڕەگەزی نێر دەکات و بە هەموو پیاوێک دەگوترێت، **(وَ)** هەروەها وەکوو وشەی **(راكِبٍ)** کە دەلالەت لەسەر هەموو سوارێک دەکات. **جۆری دووەم:** پێی دەگوترێت: **(اِسْمُ الْمَعْنَى)** ـکە پاش کەمێکی‌تر پێناسەکەی باس دەکەین- **(كَعِلْمٍ)** وەکوو وشەی «عِلْم» کە دەلالەت لەسەر هەموو زانستێک دەکات، **(وَ)** هەروەها وەکوو وشەی **(مَفْهُومٍ)** کە دەلالەت لەسەر هەموو جۆرە تێگەیشتنێک دەکات.

**(أَقُولُ:)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(لَمّا فَرَغَ مِنْ تَعْدادِ أَصْنافِ الإِسْمِ مُجْمَلَةً)** پاش ئەوەی مامۆستا لێبوویەوە لە باسکردنی

---

١. جیاوازی نێوان «جِنْس» و «اِسْمُ الْجِنْسِ» بریتییە لەوەی کە وشەی «جِنْس» بۆ زۆر و بۆ کەم بەکار دێت، وەکوو وشەی «ماء» و «لبن» ئاو و شیر. **سەرنج بدە:** ئاو، چ یەک دڵۆپ بێت چ یەک دەریا هەر پێی دەگوترێت «ماء»، شیریش بە هەمان شێوە بە زۆر و بە کەم هەر دەگوترێت «لَبَن»، بەڵام «اِسْمُ الْجِنْس» تەنها بۆ کەسێک بەکار دێت لەسەر شێوازی بەدەل وەکوو وشەی «رجل». **سەرنج بدە:** ئێستا ئەم وشەیە ڕاستە ناوە بۆ ڕەگەزێک، بەڵام لە کاتی بەکارهێنان بە یەک پیاو دەگوترێت. شرح الأنموذج: ل، ٣٦.

**شَرَعَ فِي تَعْدَادِهَا مُفَصَّلَةً، وَرَاعَىٰ فِي التَّفْصِيلِ تَرْتِيبَهُ فِي الْإِجْمَالِ، فَلَا جَرَمَ ابْتَدَأَ هٰهُنَا بِمَا ابْتَدَأَ بِهِ هُنَاكَ، أَعْنِي: اسْمَ الْجِنْسِ الَّذِي هُوَ أَوَّلُ الْأَصْنَافِ الْخَمْسَةَ عَشَرَ؛ وَقَسَّمَهُ عَلَىٰ قِسْمَيْنِ: اسْمِ عَيْنٍ، كَـ «رَجُلٍ»، وَهُوَ مَا يَقُومُ بِنَفْسِهِ، وَاسْمِ مَعْنًى، كَـ «عِلْمٍ»، وَهُوَ مَا يَقُومُ بِغَيْرِهِ.**

---

بەشەکانی ئیسم بە کورتی (**شَرَعَ فِي تَعْدادِها مُفَصَّلَةً**) دەستی‌کرد بە ژماردن و ڕوونکردنەوەی بەشەکانی ئیسم بە درێژی، (**وَرَاعَى فِي التَّفْصِيلِ تَرْتِيبَهُ**) ئینجا مامۆستا لە کاتی ڕوونکردنەوەی بەشەکانی ئیسم، بە درێژی ڕەچاوی ئەم ڕیزبەندییە دەکات کە دایناوە (**كَما رَعَى فِي الإِجْمالِ**) هەروەکوو هەمان ئەم تەرتیبەی ڕەچاو کرد لە کاتی ڕوونکردنەوەی بەشەکانی ئیسم بە کورتی. (**فَلا جَرَمَ ابْتَدَأَ هَهُنا بِما ابْتَدَأَ بِهِ هُناكَ**) کەواتە: گومانی تێدا نییە کە مامۆستا لێرەدا دەستی کرد بە باسکردنی بەشەکانی ئیسم بە هەمان ئەو شتەی کە لەوێدا دەستی پێ‌کرد، (**أَعْنِي: اِسْمَ الْجِنْسِ**) مەبەستم ئەوەیە لەوێدا سەرەتا باسی «اِسْمُ الْجِنْس»ـی کرد، کەواتە: لێرەشدا سەرەتا هەر بە ئەو دەست پـێ‌دەکات، (**اَلَّذِي هُوَ أَوَّلُ الأَصْنافِ اَلْخَمْسَةَ عَشَرَ**) کە یەکەمین بەش بوو لە پازدە بەشەکانی ئیسم کە باسمان‌کردن. (**وَقَسَّمَهُ عَلى قِسْمَيْنِ**) ئینجا مامۆستا «اِسْمُ الْجِنْس»ـی دابەشی دوو جۆر کرد، **جۆری یەکەم**: پێی دەگوترێت (**اِسْمُ عَيْنٍ، كَـ**) وەکوو وشەی (**رَجُلٍ**)، کە دەلالەت لەسەر ڕەگەزی نێر دەکات و بە هەموو پیاوێک دەگوترێت (**وَهُوَ ما يَقُومُ بِنَفْسِه**) پێناسەی «اِسْمُ الْعَيْن» بریتییە لەو وشەیەی کە بە زاتی خۆیەوە ڕاوەستاو بێت و پێویستی بە شتێکی‌تر نەبێت. (**وَ**) **جۆری دووەم**: پێی دەگوترێت (**اِسْم مَعْنَى، كَـ**) وەکوو وشەی (**عِلْمٍ**) کە دەلالەت لەسەر هەموو زانستێک دەکات، (**وَهُوَ مايَقُومُ بِغَيْرِهِ**) پێناسەی «اِسْم الْمَعْنَى» بریتییە لەو وشەیەی کە بە زاتی خۆیەوە ڕاوەستاو نەبێت، بەڵکوو پێویستی بە شتێکی‌تر هەبێ، وەکوو عیلم کە پێویستە کەسێک هەبێت ئینجا «عِلْم» دەبێت و «مروءت» و «مَفهوم» و «فرَح» و «حُزن»ـیش بە هەمان شێوە ...هتد، یا هەر ناوێکی‌تری وەکوو ئەوان.

**ثُمَّ مَثَّلَ لِكُلِّ قِسْمٍ بِمِثَالَيْنِ: مُشْتَقٍ، وَغَيْرِ مُشْتَقٍّ. فَحَصَلَ لَكَ أَرْبَعَةُ أَقْسَامٍ:**
**الْأَوَّلُ: اسْمُ عَيْنٍ غَيْرُ مُشْتَقٍ، كَـ «رَجُلٍ».**
**وَالثَّانِي: اسْمُ عَيْنٍ مُشْتَقٌّ، كَـ «رَاكِبٍ».**
**وَالثَّالِثُ: اسْمُ مَعْنًى غَيْرُ مُشْتَقٍ، كَـ «عِلْمٍ».**
**وَالرَّابعُ: اسْمُ مَعْنًى مُشْتَقٌّ،**

## باسی جۆرەكانی «اِسْمُ الْجنس»

(**ثُمَّ مَثَّلَ لِكُلِ قِسْمٍ بِمِثالَيْنِ**) پاشان مامۆستا بۆ هەر بەشێک دوو نموونەی هێنانەوە: (**مُشْتَقٌّ**) نموونەیەک بۆ «اِسْمُ الْعَيْن»ـی وەرگیراو لە وشەیەکی‌تر (**مُشْتَق**) (**وغَيْرُ مُشْتَقٍ**) هەروەها نموونەیەکیش بۆ «اِسْمُ الْعَيْن»ی وەرنەگیراو لە وشەیەکی‌تر (غَيْرُ مُشْتَق)، هەروەها نموونەیەک بۆ «اِسْم الْمَعْنَى»ی وەرگیراو لە وشەیەکی‌تر، هەروەها نموونەیەکیش بۆ «اِسْم الْمَعْنَى»ی وەرنەگیراو لە وشەیەکی‌تر (**فَحَصَلَ لَكَ أَرْبَعَةُ أَقْسامٍ**) کەواتە بۆ تۆ چوار بەش پەیدا بوون.

(**اَلأَوَّلُ: اِسْمُ عَيْنٍ غَيْرُ مُشْتَقٍ**) **نموونەی یەکەم**: بریتییە لە «اِسْمُ الْعَيْن»ـێکی وەرنەگیراو (غَيْرُ مُشْتَق) لە وشەیەکی‌تر (**كَرَجُلٍ**) وەکوو وشەی «رَجُل»، ئێستا ئەم وشەیە «اِسْمُ الْعَيْن»ـە و لە هیچ وشەیەکی‌تر وەرنەگیراوە.

(**وَالثَّانِي: اِسْمُ عَيْنٍ مُشْتَقٍ**) **نموونەی دووەم**: بریتییە لە «اِسْمُ الْعَيْن»ـێکی وەرگیراو (مُشْتَق) لە وشەیەکی‌تر (**كَراكِبٍ**) وەکوو وشەی «راكِب»، ئێستا ئەم وشەیە «اِسْمُ الْعَيْن»ـە و لە وشەی «يَرْكَبُ» وەرگیراوە.

(**وَالثَّالِثُ: اِسْمُ مَعْنَى غَيْرُ مُشْتَقٍ**)، **نموونەی سێیەم**: بریتییە لە «اِسْمُ الْمَعْنَى»یێکی وەرنەگیراو (غَيْرُ مُشْتَق) لە وشەیەکی‌تر (**كَعِلْمٍ**) وەکوو وشەی «عِلْم»، ئێستا ئەم وشەیە «اِسْمُ الْمَعْنَى»یە و لە هیچ وشەیەکی‌تر وەرنەگیراوە، چونکە «مَصْدَر»ە.

(**وَالرَّابِعُ: اِسْمُ مَعْنَى مُشْتَقٍ**) **نموونەی چوارەم**: بریتییە لە «اِسْمُ الْمَعْنَى»یێکی

**كَـ «مَفْهُومٍ».**

وەرگیراو (مُشْتَق) لە وشەیەکی‌تر (**كَمَفْهُومٍ**) وەکوو وشەی «مَفْهُوم»، ئێستا ئەم وشەیە «اِسْمُ الْمَعْنَى»یە و لە وشەی «يُفْهَمُ» وەرگیراوە.




* ◌ *

# الْعَلَمُ

**قَالَ: الْعَلَمُ الْغَالِبُ عَلَيْهِ أَنْ يُنْقَلَ عَنِ اسْمِ جِنسٍ، كَ «جَعفَرٍ»، وَقَدْ يُنْقَلُ عَنْ فِعْلٍ، كَ «يَزِيدَ»، وَقَدْ يُرْتَجَلُ، كَ «غَطَفَانَ».**

**أَقُولُ: لَمَّا فَرَغَ مِنَ الصِّنْفِ الْأَوَّلِ، شَرَعَ فِي الصِّنْفِ الثَّانِي، أَعْنِي: الْعَلَمَ، فَقَالَ: الْغَالِبُ عَلَى الْعَلَمِ أَنْ يُنْقَلَ عَنِ اسْمِ جِنْسٍ، كَ «جَعْفَرٍ»:**

---

## وانەی حەوتەم: باسی «اَلْعَلَم»

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری لە باسی «ناو» دەفەرموێت: **(اَلْعَلَمُ)** یەکێکی تر لە بەشەکانی «اِسْم» بریتییە لە ناو (عَلَم)، ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: **(اَلْغالِبُ عَلَيْهِ)** بە زۆری وایە کە «عَلَم» **(أَنْ يُنْقَلَ عَنْ اِسْمِ جِنْسٍ)** کە لە ناوێکی گشتی (اِسْمِ جِنْس) وەردەگیرێت و ئینجا دەکرێت بە ناو **(كَجَعْفَرٍ)** وەکوو وشەی «جَعْفَرَ». **(وَقَدْ يُنْقَلُ عَنْ فِعْلٍ)** هێندێک جاریش ناو، لە «فِعْل» وەردەگیرێت **(كَ)** وەکوو وشەی **(يَزِيدَ)** کە لە ئەسڵدا «الفِعْلُ الْمُضارِعَ» بووە و ئێستا بووە بە ناو بۆ کەسێکی دیاریکراو. **(وَقَدْ يُرْتَجَلُ)** هێندێک جاریش «عَلَم» لە هیچ شتێک وەرناگیرێت، بەڵکوو هەر لە سەرەتادا وەکوو ناو بەکار هاتووە و بەکار دێت **(كَغَطَفانَ)**[1] وەکوو وشەی «غَطَفانَ» کە ناوە بۆ هۆز و عەشیرەتێکی عەرەبی.

**(أَقُولُ)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم **(: لَمَّا فَرَغَ مِنَ الصِّنْفِ الأَوَّلِ)** پاش ئەوەی مامۆستا لێبوویەوە لە باسکردنی بەشی یەکەم کە «اِسْم الجنس» بوو **(شَرَعَ فِي الصِّنْفِ الثَّانِي)** دەستی کرد بە باسکردن و ڕوونکردنەوەی بەشی دووەمی «اِسْم» **(أَعْنِي: اَلْعَلَمَ)** مەبەستم پێ «عَلَم»ـە **(فَقالَ: اَلْغالِبُ عَلَى الْعَلَمِ أَنْ يُنْقَلَ عَنْ اِسْمِ جِنْسٍ)** ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: بە زۆری وایە کە «عَلَم» لە ناوێکی گشتیی (اِسْمُ جِنْس) وەردەگیرێت، پاشان دەکرێت بە ناو **(كَجَعْفَرٍ)** وەکوو

---

١. بڕوانە: شَرْحُ الْمُفَصَّل: ١/ ٩٥، و جامع الدروس العربية: ٧٣.

**فَإِنَّهُ وُضِعَ أَوَّلاً لِلنَّهْرِ الصَّغِيرِ، ثُمَّ نُقِلَ مِنْهُ، وَجُعِلَ عَلَماً لِرَجُلٍ.**

**وَقَدْ يُنْقَلُ الْعَلَمُ عَنْ فِعْلٍ، كَـ «يَزِيدَ»: فَإِنَّهُ فِي الْأَصْلِ مُضَارِعُ «زَادَ»، فَنُقِلَ مِنْهُ، وَجُعِلَ عَلَماً لِرَجُلٍ.**

**وَقَدْ يُرْتَجَلُ الْعَلَمُ، أَيْ: يُجْعَلُ فِي أَوَّلِ وَضْعِهِ عَلَماً مِنْ غَيْرِ أَنْ يُنْقَلَ عَنْ شَيْءٍ، كَـ «غَطَفَانَ»: فَإِنَّهُ وُضِعَ أَوَّلاً عَلَماً لِقَبِيلَةٍ.**

---

وشەی «جَعْفَرَ»، (فَإِنَّهُ وُضِعَ أَوَّلاً لِلنَّهْرِ الصَّغِيرِ) ئەم وشەیە سەرەتا داندرابوو وەکوو ناو بۆ هەموو ڕووبارێکی بچووک (ثُمَّ نُقِلَ مِنْهُ) پاشان ئەو ناوە گواسترایەوە لە ڕووباری بچووک، (وَجُعِلَ عَلَماً لِرَجُلٍ) وە کرا بە ناو بۆ پیاوێکی کە ناو نرابێت «جَعْفَر».

(وَقَدْ يُنْقَلُ الْعَلَمُ عَنْ فِعْلٍ) هێندێک جاریش «عَلَم» لە فیعلێک وەردەگیرێت، جیاوازی نییە «فِعْل»ـەکە «ماضِي» بێت یاخود «مُضارِع» یاخود «أَمْر» بێت، هەروەکوو جیاوازی نییە «فِعْل»ـەکە «بناء مَعْلُوم» بێت یاخود «بِناءُ مَجْهُول»، (كَـ) وەکوو وشەی (يَزِيدَ)[1] کە «فِعْلُ الْمُضارِع»ـە و لە «زَادَ يَزِيدُ» وەرگیراوە، ئێستا بووە بە ناو بۆ کەسێکی دیاریکراو. هەروەها وشەی «فاتِح» لە «اِسْمُ الْفاعِل» وەرگیراوە و بووە بە ناو بۆ کەسێکی دیاریکراو. هەروەها وشەی «مَنْصُور» لە «اِسْمُ الْمَفْعُول» وەرگیراوە و بووە بە ناو بۆ کەسێکی دیاریکراو.

(وَقَدْ يُرْتَجَلُ الْعَلَمُ) هێندێک جاریش «عَلَم» لە هیچ شتێک وەرناگیرێت (أَيْ: يُجْعَلُ فِي أَوَّلِ وَضْعِهِ عَلَماً) بەڵکوو هەر لە سەرەتادا وەکوو ناو بەکار هاتووە و بەکار دێت (مِنْ غَيْرِ أَنْ يُنْقَلَ عَنْ شَيْءٍ) بەبێ ئەوەی لە هیچ شتێک گواسترابێتەوە ئینجا کرابێت بە ناو (عَلَم)، (كَغَطَفانَ)[2] وەکوو وشەی «غَطَفانَ» (فَإِنَّهُ وُضِعَ أَوَّلَا عَلَماً لِقَبِيلَةٍ) کە ئەم وشەیە هەر لە سەرەتادا داندراوە بە ناو (عَلَم) لەبۆ هۆز و عەشیرەتێکی

---

١. وشەی «يَزِيد»، «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـە لەبەر «وَزْنُ الْفِعْل» و «عَلَمِيَّة»، بەڵام وشەی «جَعْفَر» «مُنْصَرِف»ـە هەرچەندە ئەویش «وَزْنُ الْفِعْل» و «عَلَمِيَّة»ی تێدایە، بەڵام وەزنەکەی تایبەت نییە بە «فِعْل»ـان. بڕوانە: شرح الأنموذج: بتعليق الشيخ الداغستاني: ٧٢.

٢. بڕوانە: توضيح المقاصد: ١/ ٣٨٥، شَرْحُ الْمُفَصَّل: ١/ ٩٥، و جامع الدروس العربية: ٧٣.

**فَالْعَلَمُ إِمَّا مَنْقُولٌ، كَـ «جَعْفَرٍ، وَيَزِيدَ»؛ وَ إِمَّا مُرْتَجَلٌ، كَـ «غَطَفَانَ». وَالْمَنْقُولُ: إِمَّا مِنْ مُفْرَدٍ، أَوْ مِنْ مُرَكَّبٍ.**

**وَالْمُفْرَدُ: إِمَّا مِنِ اسْمِ جِنْسٍ وَهُوَ الْغَالِبُ، كَـ «جَعْفَرٍ»، وَ إِمَّا مِنْ فِعْلٍ مَاضٍ، كَـ «شَمَّرَ»: فَإِنَّهُ فِي الأَصْلِ**

---

عەرەبی، بەبێ ئەوەی لە هیچ شتێک گواسترابێتەوە ئینجا کرابێت بە ناو (عَلَم).

(**فَالْعَلَمُ إِمَّاَ مَنْقُولٌ**) کەواتە: «عَلَم» یا لە شتێکەوە «نَقْل» کراوە ئینجا بووە بە ناو (کَـ) وەکوو وشەی (جَعْفَرَ، وَ) هەروەها وەکوو وشەی (یَزِیدَ)، (**وَ إِمَّا مَرْتَجَلٌ**) وە یاخود ناوەکە لە هیچ شتێکەوە نەقڵ نەکراوە (کَـ) وەکوو وشەی (غَطَفَانَ) ئینجا بزانە چونکە عەلەمی «مُرْتَجَل»[1] هیچ لق و بەشێکی لێ نابێتەوە، بۆیە مامۆستا دێتە سەر باسی عەلەمی «مَنْقُول» و دەفەرموێت: (**وَالْمَنْقُولُ**) ئەم ناوەی کە گواستراوەتەوە لە شتێکیتر پاشان کراوە بە «عَلَم»، دوو جۆری هەیە، **یەکەم**: (**إِمَّا مِنْ مُفْرَدٍ**) یا «عَلَم»ـەکە لە وشەیەکی تاک (مُفْرَد) وەرگیراوە و گوازراوەتەوە، **دووەم**: (**أَوْ مِنْ مُرَكَّبٍ**) یاخود «عَلَم»ـەکە لە وشەیەکی لێکدراو (مُرَکَّب) گوازراوەتەوە.

(**وَالْمُفْرَدُ**) ئینجا ئەم ناوەی لە وشەیەکی تاک (مُفْرَد) گوازراوەتەوە و وەرگیراوە چەند جۆرێکی هەیە:

**جۆری یەکەم**: (**إِمَّا مِنْ اِسْمِ جِنْسٍ**)[2] یاخود «عَلَم»ـەکە لە ناوێکی گشتیی (اِسْمُ الْجِنْس) وەرگیراوە (**وَهُوَ الْغالِبُ**) کە بە زۆری وایە «عَلَم» لە «اِسْمُ الْجِنْس» وەردەگیرێت (**کَجَعْفَرٍ**) وەکوو وشەی «جَعْفَرَ» کە ئەم وشەیە سەرەتا ناو بوو بۆ هەموو ڕووبارێکی بچووک، پاشان ناوەکە گواستراوەتەوە و کراوە بە ناو بۆ پیاوێک. **جۆری دووەم** (**وَ إِمّا مِنْ فِعْلٍ ماضٍ**) یاخود ناوەکە لە فیعلێکی «ماضِي» وەرگیراوە (کَـ) وەکوو وشەی (شَمَّرَ) فیعلی «ماضِي»ـیە و لە بابی «تَفْعِیل»ـە (**فَإِنَّهُ فِي الأَصْلِ**) کە

---

١. واتای «عَلَم»ی «مُرْتَجَلْ» ئەوەیە (أنّه ابتدئ بالتّسمية من غير سبق استعماله من غير علم). شرح كافيه ابن الحاجب: ٣٤١/٣.

٢. بڕوانە: الصحاح ٢/ ٦١٥، وَالْمُفَصَّل: فی صنعه الإعراب: ٢٥.

**بِمَعْنَى: «جَدَّ»، ثُمَّ جُعِلَ عَلَماً لِفَرَسٍ. أَوْ مِنْ مُضَارِعٍ، كَـ «يَزِيدَ»، أَوْ مِنْ أَمْرٍ، كَـ «إِصْمِتَ»، بِكَسْرِ الْهَمْزَةِ، فَإِنَّهُ فِي الْأَصْلِ أَمْرٌ مِنْ «تَصْمُتُ» عَلَىٰ وَزْنِ «تَنْصُرُ»، بِمَعْنَى: «تَسْكُتُ»، فَجُعِلَ عَلَماً لِبَرِّيَّةٍ،**

---

ئەم وشـەیە لە ئەسـڵدا (**بِمَعْنَى جَدَّ**) بە مانای چوسـت و چالاک دێت (**ثُمَّ جُعِلَ عَلَماً لِفَرَسٍ**) پاشـان گوازرایەوە و کـرا بـە ناو بۆ ئەسـپێکی دیاریکراو، چونکە ئەسـب دائیم چوست و چالاکە.

**جۆری سێیەم:** (**أَوْ مِنْ مُضارِعٍ**) یاخود ناوەکە لە فیعلێکی «مُضارِعٍ» وەردەگیرێت (**كَـ**) وەکوو وشەی (**يَزِيدُ**)، وە هەروەها وەکوو وشەی «يَشْكُر» کە هەردووکیان «فِعْل الْمُضارِعِ» و لە بابی دووەم و یەکەمن و لە ئەسڵدا «زَادَ يَزِيدُ» و «شَكَرَ يَشْكُرُ» بوون، پاشان کراون بە ناو لەبۆ کەسێکی دیاریکراو.

**جۆری چوارەم:** (**أَوْ مِنْ فِعْلِ أَمْرٍ**) یاخـود ناوەکە لە فیعلێکی «أَمْر» وەردەگیرێت (**كَـ**) وەکـوو وشـەی (**إِصْمِتْ**) کـە «فِعْلُ الأَمْرَ»ە (**بِكَسْرِ الْهَمْزَةِ**) بـە کەسـرەی هەمزە دەخوێندرێتەوە؛ ئەم بڕگەیە ئاماژەیە بۆ ئەوەی: ئەگەر ناوێک لە وشەیەک وەرگیرا کە «هَمْزَةُ الْوَصْلِ»ـی لـە سـەرەتادا هاتبـوو، پـاش ئەوەی دەبێـت بە «عَلَـم»، هەمزەکەی دەبـێ بـە «هَمْزَةُ الْقَطْع»، دەبێـت لە سـەرەتا و لـە ناوەڕاسـتی وشـەدا بخوێندرێتەوە؛ چونکـە پـاش ئـەوەی وشـەکە دەبێـت بـە «عَلَم» حوکمەکـەی دەگۆڕێت لە «فِعْل»ـەوە بۆ «اِسْم» و حەرفی «جَرّ»ی دەچێتە سـەر و هەمزەکەشـی دەبێتە هەمزەی «قَطْع»[1]، (**فَإِنَّهُ فِي الأَصْلِ**) چونکـە ئـەم وشـەیە (**أَمْرٌ مِنْ تَصْمُتُ عَلى وَزْنِ تَنْصُرُ**) لـە ئەسـڵدا «فِعْلُ الأَمْرَ»ە و لە وشەی «تَصْمُتُ» وەرگیراوە، لە بابی یەکەمە لەسەر وەزنی وشەی «تَنْصُرُ»وە (**بِمَعْنَى تَسْكُتُ**) کـە بـە مانـای خۆکڕکـردن دێـت، (**فَجُعِلَ عَلَماً لِلْبَرِيَّةِ**) ئینجـا کـرا بـە ناو بۆ بیابانێک، حەق وابوو هەمزەکەی بە «مَضْمُوم»ـی بخوێندرێتەوە

---

١. هەروەها هێندێک جار ناو «عَلَم» لە «اِسْمُ الْفاعِل» وەردەگیرێت وەکوو «فاتح» هەروەها هێندێک جار لە «اِسْمُ الْمَفْعُول» وەردەگیرێت وەکوو «مَنْصُور» هێندێک جاریش لە «اِسْمُ الزَّمانِ وَاِسْمُ الْمَكانِ وَصِفَةُ الْمُشَبَّهَة، اِسْمُ الْمَنْسُوب» وەردەگیرێت.

**فَإِنَّ أَحَداً سَمِعَ صَوْتاً، فَقَالَ لِصَاحِبِهِ فِيهَا: «اِصْمِتْ»، فَغُيِّرَ ضَمَّتُهُ إِلَى الْكَسْرَةِ، كَمَا غُيِّرَ بِنَاءُهُ إِلَى الْإِعْرَابِ.**

---

**(فَإِنَّ أَحَدا سَمِعَ صَوْتاً)** بەڵام کەسێک گوێبیستی دەنگێک بوو **(فَقالَ لِصاحِبِهِ فِيها اصْمِتْ)** ئینجا لە وێدا بە هاوڕێکەی گوت «اِصْمِتْ» ـ دیارە تۆزێک ترساوە و شڵەژاوە ـ **(فَغُيِّرَ ضَمَّتُهُ إِلى الْكَسْرَةِ)** بۆیە «ضَمَّة»ی وشەکەی گۆڕدرا و بوو بە کەسرە **(كَما غُيِّرَ بِناؤُهُ إِلى الإِعْرابِ)**[1] هەروەکوو حوکمی وشەکە گۆڕدرا و لە «مَبْنِي»ـیەوە بوو بە «مُعْرَب»، چونکە وشەکە پێشتر «فِعْلُ الأَمْر» بوو و بە «مَبْنِي» حیساب دەکرا، بەڵام پاش ئەوەی کرا بە «عَلَم» و بوو بە ناو بۆ شوێنێك، دەبێتە ئیسم و حوکمەکی دەگۆڕێت و دەبێت بە «مَبْنِي».

«ئاگاداری» هەر وشەیەک لە فیعلەوە نەقڵ کرا و پاشان بوو بە «عَلَم»، ئەم گۆڕانکارییانەی بەسەردا دێت: **یەکەم:** ئەگەر ناوێک لە وشەیەک وەرگیرا کە «هَمْزَةُ الْوَصْلِ»ـی لە سەرەتادا هاتبوو، پاش ئەوەی دەبێت بە «عَلَم» هەمزەکەی دەبێت بە «هَمْزَةُ الْقَطْع» و دەبێ لە سەرەتا و لە ناوەڕاستی وشەدا بخوێندرێتەوە، چونکە پاش ئەوەی وشەکە دەبێت بە «عَلَم» حوکمەکەی دەگۆڕێت لە فیعلەوە دەبێت بە «اِسْم» و حەرفی «جَرّ»ی دەچێتە سەر و هەمزەکەشی دەبێتە هەمزەی «قَطْع».

**دووەم:** هەر ناوێک لە فیعلەوە وەربگیرێت، ئەگەر«مَبْنِي» بێت حوکمی وشەکە دەگۆڕدرێت بۆ «مُعْرَب»، چونکە وشەکە پاش ئەوەی کرا بە «عَلَم» و بوو بە ناو بۆ شوێنێک یاخود بۆ کەسێک، دەبێتە «اِسم» و حوکمەکەی دەگۆڕێت و دەبێت بە «مُعْرَب».

**سێیەم:** زۆربەی زانایان دەفەرموون: دروست نییە «عَلَمْ» لە حەرفێ نەقڵ بکرێت، تەنها «ابن مالك» و چەند زانایەکی تر نەبێت، وەکوو وشەی «قَدْ» کە بکرێت بە ناو بۆ کەسێک[2].

---

١. هەروەها بزانە «إِعْراب»ەکەی ئەم وشەیە دەبێتە «غَيْرَ مُنْصَرِف» چونکە هەم «عَدْل» هەم «عَلَمِيَّة» هەم «وَزْنُ الْفِعْلِ» تێدایە بۆیە بەم شێوەیە «إِعْراب»دەکرێت «هذِهِ إِصْمِتُ، وَ رَأَيْتُ إِصْمِتَ، وَ مَرَرْتُ بِإِصْمِتَ» بڕوانە: شرح ابن عقيل، (٣٥/١).

٢. بڕوانە: شرح الانموذج: بتعليق الشيخيّ الداغستانى: ٧٣.

**وَالْمُرَكَّبُ: إِمَّا إِسْنَادِيٌّ، كَـ «تَأَبَّطَ شَرّاً»، فَإِنَّ مَعْنَاهُ فِي الْأَصْلِ: «أَخَذَ تَحْتَ إِبْطِهِ شَرّاً»، فَجُعِلَ عَلَماً لِرَجُلٍ أَخَذَ تَحْتَ إِبْطِهِ حَيَّةً أَوْ سَيْفاً؛**

---

**چوارەم:** ئەگەر ناوێک لە فیعلەوە وەربگیرێت و بکرێت بە «عَلَم» و وەزنەکەی تایبەت بێت بە «فِعْل»، ئەوە لە ڕووی ئیعرابەوە دەبێتە «غَيْرَ مُنْصَرِف» لەبەر دوو هۆکار، یەکەم: «اَلْعَلَمِيَّة» دووەم: لەبەر «وَزْنُ الْفِعْل».

(**وَالْمُرَكَّبُ**) هەروەها ئەو ناوەی لە وشەیەکی لێکدراو «مُرَكَّب» گوازراوەتەوە و وەرگیراوە، چەند جۆرێکی هەیە، **جۆری یەکەم:** (**إِمَّا إِسْنادِيٌّ**) یا لە «مُرَكَّب»ـێکی «إِسْنادِي» وەرگیراوە (**كَ**) وەکوو ڕستەی (**تَأَبَّطَ شَراً**)، کە لە جوملەیەکی «فِعْلِي» وەرگیراوە و لە «فِعْل» و «فاعِل» و «مَفْعُول» پێک هاتووە، (**فَإِنَّ مَعْناهُ فِي الأَصْلِ أَخَذَ تَحْتَ إِبْطِهِ شَرّاً**) ئەم ڕستەیە لە ئەسڵدا بۆ هەرکەسێک بەکار هاتووە کە شەڕانگێز و بەدفەڕ بووە، (**فَجُعِلَ عَلَماً لِرَجُلٍ**) پاشان کرا بە ناو بۆ هەموو پیاوێک (**أَخَذَ تَحْتَ إِبْطِهِ حَيَّةً أَوْ سَيْفاً**) کە شیرێک یا سیلاحێکیتر یاخود مارێکی لە بن باڵی خۆی هەڵگرتبێت، ئێستا ئەم وشەیە بووە بە ناو (عَلَم) مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، بەڵام ئیعرابەکەی لەسەر حاڵی حیکایەتە، واتە: لە هەر سێ حاڵەت ئیعرابەکەی «تَقْدِيرِي» دەبێت، بۆیە دەگوترێت: «جاءَنِي تَأَبَّطَ شَراً، رَأَيْتُ تَأَبَّطَ شَراً، مَرَرْتُ بتَأَبَّطَ شَراً»[1].

هەروەها دەکرێت «عَلَم» لە جوملەیەکی «اِسْمِي» وەربگیرێت، وەکوو ئەوەی پیاوێک ناو بنێین «زَيْدٌ قائِمٌ»، ئەو کاتە ئەم ناوە حوکمی ئیسمێکی موفرەدی هەیە، بەڵام ئیعرابەکەی لەسەر حاڵی حیکایەتە، واتە: لە هەر سێ حاڵەت ئیعرابەکەی «تَقْدِيرِي» دەبێت، بۆیە دەگوترێت: «جاءَنِي زَيْدٌ قائِمٌ، رَأَيْتُ زَيْدٌ قائِمٌ، مَرَرْتُ بِزَيْدٌ قائِمٌ»[2].

---

١. لە نموونەی یەکەم وشەی «تَأَبَّطَ شَراً» بە یەکەوە دەبێت بە «فاعل» بەڵام «رَفع»ـەکەی «تَقْدِيرِي»ـیە و لە نموونەی دووەم دەبێتە «مَفْعُولُ بِهِ» بەڵام «نَصب»ـەکەی «تَقْدِيرِي»ـیە لە نموونەی سێیەم دەبێتە «اسم مجرور» بەڵام «جَرّ»ەکەی «تَقْدِيرِي»ـیە.

٢. لە نموونەی یەکەم وشەی «زَيْدٌ قائِمٌ» بەیەکەوە دەبێت بە «فاعل» بەڵام «رَفع»ـەکەی «تَقْدِيرِي»ـیە و لە نموونەی دووەم دەبێتە «مَفْعُولُ بِهِ» بەڵام «نَصب»ـەکەی «تَقْدِيرِي»ـیە لە نموونەی سێیەم دەبێتە «اسم مجرور» بەڵام «جَرّ»ەکەی «تَقْدِيرِي»ـیە. شرح ابن عقيل ١٢٥ وشرح المفصل: ٩٥/١.

**أَوْ إِضَافِيٌّ، كَـ «عَبْدِ اللَّهِ»؛ أَوْ غَيْرُهُمَا، كَـ «بَعْلَبَكَّ»، فَإِنَّ «بَعْلاً» اسْمٌ لِصَنَمٍ، وَ «الْبَكُّ» مَصْدَرٌ بِمَعْنَى: «الدُّقِّ»، فَجُعِلَ عَلَماً لِبَلْدَةٍ.**

**جۆری دووەم:** (أَوْ إِضافِيٌّ) یاخود لە «مرکّب»ـێکی «إِضافِي» وەرگیراوە (كَـ) وەکوو وشەی (عَبْدِاللَّهِ)، ئێستا ئەم ناوە وەرگیراوە لە دوو وشە ـکە بریتین لە وشەی «عبد» و «اللّه»ـ هەروەها وشەی «عبد» پاشان «إضافة» کراوە بۆ لای وشەی «اللّه»، بۆیە پێی دەگوترێت مورەککەبێکی «إِضافِي» و کراوە بە ناو بۆ کەسێك.

ئینجا بزانە هەر ناوێک لە «مرکّب»ـێکی «إِضافِي»[1] وەربگیرێت، لە ڕووی ئیعرابەوە تەنها وشەی یەکەم ـواتە «مُضاف»ـ «حَرَکَات»ـی دەگۆڕدرێن بە هۆی گۆڕانی «عامِل»ـەکانەوە، وشەی دووەم ـواتە «مُضاف إِلَيهِ»ـ هەموو کات «مَجْرُور» دەبێت، بۆیە دەڵێت «جاءَنِي عَبْدُاللَّهِ، رَأَيْتُ عَبْدَاللَّهِ، مَرَرْتُ بِعَبْدِاللَّهِ».

**جۆری سێیەم:** (أَوْ غَيْرِهِما) یاخود «عَلَم»ـەکە لە «مرکّب»ـێکی غەیری «إِضافِي» و غەیری «إِسْنادِي» وەردەگیرێت کە پێی دەگوترێت مورەککەبێکی «مَزْجِي»، ئەویش دوو جۆری هەیە، **یەکەم:** ئەگەر «مُرَكّب»ـەکە بە وشەی «وَيْه» کۆتایی نەهاتبوو (كَـ) وەکوو وشەی (بَعْلَبَكّ)[2] کە ناوی شارێکە لە وڵاتی یەمەن (فَإِنَّ بَعْلًا) وشەی «بَعْل» (اِسْمٌ لِصَنَمٍ)[3] ناوە لە بۆ بتێک (وَالْبَكُّ مَصْدَرٌ بِمَعْنى الدُّقِ) هەروەها وشەی «بَكّ» لە ئەسڵدا «مَصْدَر»ە و بە مانای «لەدەرگادان» دێت، ئینجا ئەم دوو وشەیە لێک دراون و (فَجُعِلَ عَلَماً لِبَلْدَةٍ) کراون بە ناو لەبۆ شارێک لە وڵاتی شام؛ هەروەها لە ڕووی ئیعرابەوە ئەم جۆرە وەکوو «غَيْرَ مُنْصَرِف» حیساب دەکرێت لەبەر «عَلَمِيَّة» و «تَرْكِيب» بۆیە دەگوترێت: «هذا بَعْلَبَكُّ، رَأَيْتُ بَعْلَبَكَّ، مَرَرْتُ بِبَعْلَبَكَّ»[4]، لە نموونەی یەکەم وشەی «بَعْلَبَكّ» بەیەکەوە دەبێت بە «خَبَر» لە نموونەی دووەم دەبێتە «مَفْعُولُ

---

١. بڕوانە: همع الهوامع: ١/ ٢٣٤.

٢. وشەی «بَعْلَبَكّ» شارێکە لە وڵاتی شام، زانای پایەدار «ئەزهەری» دەفەرموێت: «وَهُما اِسْمانِ جُعِلا اِسْماً واحِداً فَأُعْطِيا إِعْراباً واحِداً» بڕوانە: معجم البلدان: ٤٥٣/١.

٣. وشەی «بَعْل» ناوی بتەکەی گەلی «إِلْياس» پێغەمبەرە عليه‌السلام کە لە زێڕ دروست کراوە، گوتراویشە کە وشەی «بَكّ» ناوی خاوەنی ئەم شارەیە. بڕوانە: تاج العروس: ٩٣ـ ٩٥.

٤. بڕوانە: شرح ابن عقیل: ١١٤/١، وحاشية الصبان: ١/ ١٩٤.

**وَلِلْعَلَمِ قِسْمَةٌ أُخْرَىٰ، وَهِيَ: أَنَّهُ إِنْ كَانَ فِيهِ مَدْحٌ أَوْ ذَمٌّ، فَهُوَ اللَّقَبُ، كَـ «مَحْمُودٍ» وَ «بِطَّةَ»؛ وَ إِلَّا فَإِنْ كَانَ أَوَّلُهُ أَباً أَوْ أُمّاً،**

---

بِهِ»، لە نموونەی سێیەم دەبێتە ئیسمی «مَجْرُور»، بەڵام «جَرّ»ەکەی بە فەتحەیە، چونکە هەر وشەیەک «غَيْرَ مُنْصَرِف» بوو «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی ناچێتە سەر.

**دووەم:** بەڵام ئەگەر ناوە لێکدراوەکە (العَلَم الْمُرَكَّب) بە وشەی «وَيـه» کۆتایی هاتبوو وەکوو وشەی «سِيبَوَيْهِ» و وشەی «نَفْطَوَيْهِ» ئەوە لە ڕووی ئیعرابەوە لە هەر سێ حاڵەت ئیعرابەکەی «مَحَلّي» دەبێت، بۆیە دەڵێت: «جاءَنِي سِيبَوَيْهِ، رَأَيْتُ سِيبَوَيْهِ، مَرَرْتُ بِسِيبَوَيْهِ»[١]، چونکە لەم حاڵەتەدا ئیسمەکە دەبێتە «مَبْنِي». **ئینجا بزانە:** وشەی «شَمَّرَ» جگە لە مانای ڕابوردوو، بە مانای هەڵکردنی جلوبەرگیش دێت بۆ غاردان و هەڵاتن «وَقِيلَ بِمَعْنى: رَفَعَ ثَوْبَهُ لِلْعَدْوِ ، أَوْ رَفَعَ ثَوْبَهُ خَوْفاً مِنَ الْعَدُوِّ»[٢].

پاش باسکردنی «عَلَمُ الْمَنْقُول»، ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: **(وَلِلْعَلَمِ قِسْمَةٌ أُخْرَى)** بابەتی ناو (عَلَم) جگە لەم بەشانەی باسمانکرد، جۆرە دابەشکردنێکی تریشی هەیە **(وَهِيَ)** کە بەم شێوەیە: **(أَنَّهُ إِنْ كانَ فِيهِ مَدْحٌ أَوْ ذَمٌّ)** ئەگەر «عَلَمْ» لە ناوەڕۆکیدا مانای مەدح و ستایش، وەیاخود بە کەمسەیرکردن و لەکەدارکردنی هەبوو **(فَهُوَ اللَّقَبُ)** ئەو کاتە عەلەمەکە پێی دەگوترێت لەقەب و نازناو **(كَمَحْمُودٍ)** وەکوو وشەی «محمود» واتە: «سوپاسکراو»، هەروەها وشەی «مصطفى» واتە: هەڵبژێدراو، هەروەها وشەی «فخرالدّين» واتە: شانازی دین ئەم سێ وشەیە بۆ مەدح و ستایش بەکار دێن **(وَبِطَّةَ)**[٣] هەروەها وەکوو وشەی «بِطَّة» واتە: «زگ گەورە»، هەروەها وشەی «قَفَّة» واتە: «پشتکووڕ» بۆ زەم و لەکەدارکردن بەکار دێن **(وَ إِلَّا)** بەڵام ئەگەر ناوەکە لە ناوەڕۆکیدا مانای مەدح و ستایش، وەیاخود بە کەمسەیرکردن و لەکەدارکردنی تێدا نەبوو، ئەوکات سەیر دەکەین: **(فَإِنْ كانَ أَوَّلُهُ أَباً أَوْ أُمًّا)** ئەگەر

---

١. بڕوانە: شرح التصريح: ١٣٠/١، وشرح ابن عقيل: ١١٤/١، وحاشية الصبان: ١/ ١٩٤.

٢. بڕوانە: شرح الأنموذج: بتعليق أنور بن أبي بكر الشيخيّ الداغستانيّ، ل،٧٢.

٣. «بِكَسْرِ الْباءِ، وَتَشْدِيدِ الطّاءِ، وَمَعْناهَا: عَظِيمُ الْبَطْنِ، مِثالٌ لِمَا قُصِدَ بِهِ الذَّمُّ». بڕوانە: شرح الأنموذج: بتعليق الشيخيّ الداغستانيّ،٧٢.

**فَهُوَ الْكُنْيَةُ، كَـ «أَبِي عَمْرٍو» وَ «أُمِّ كُلْثُومَ»؛ وَ إِلَّا فَهُوَ الِاسْمُ، كَـ «جَعْفَرٍ».**

سەرەتای ناوەکە بە وشەی «أَبْ» یاخود بە وشەی «أُمّ» دەستی پێکردبوو، **(فَهُوَ الْكُنْيَةُ)**(١) ئەوە «عَلَم»ـەکە پێی دەگوترێت کونیە، کە لە نێو عەرەباندا بەمەبەستی رێزلێنان و بەگەورە سەیرکردن بەکار دێت **(كَأَبِي عَمْرٍو)** وەکو وشەی «أَبُو عَمْرو» و وشەی «أَبُوبَكْر» و وشەی «أَبُوعَلِي» بۆ پیاوان **(وَأُمِّ كَلْثُومَ)** هەروەها وەکوو وشەی «أُمّ كَلْثُوم» و «أُمّ لَيْلَى» و «أُمّ الشُّهَداءِ» بۆ ئافرەتان؛ **(وَ إِلَّا)** بەڵام ئەگەر عەلەمەکە لە ناوەڕۆکیدا مانای مەدح و ستایش، یاخود بەکەمسەیرکردنی تێدا نەبوو، هەروەها لە سەرەتای ناوەکەوە وشەی «أَبْ» یاخود وشەی «أُمّ» نەبوو **(فَهُوَ الِاسْمُ)** ئەوە پێی دەگوترێت «اِسْم» **(كَجَعْفَرٍ)** وەکوو وشەی «جَعْفَرَ» یاخود وشەی «زید».




١. بڕوانە: شرح الكافيه: ابن الحاجب ٣/٣٤٢.

# الْمُعْرَبُ

**قَالَ: الْمُعْرَبُ وَهُوَ عَلَىٰ ضَرْبَيْنِ: مُنْصَرِفٍ: وَهُوَ مَا يَدْخُلُهُ الرَّفْعُ وَالنَّصْبُ وَالْجَرُّ وَالتَّنْوِينُ، كَـ «زَيْدٍ»؛ وَغَيْرِ مُنْصَرِفٍ: وَهُوَ الَّذِي مُنِعَ مِنْهُ الْجَرُّ، وَالتَّنْوِينُ، وَيُفْتَحُ فِي مَوْضِعِ الْجَرِّ، نَحْوُ: «مَرَرْتُ بِأَحْمَدَ»؛ إِلَّا إِذَا أُضِيفَ، أَوْ عُرِّفَ بِاللَّامِ، نَحْوُ: «مَرَرْتُ بِأَحْمَدِكُمْ**

## وانەی هەشتەم: باسی «اَلْمُعْرَبُ»

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری لە باسی «مُعْرَب» دەفەرموێت: (اَلْمُعْرَبُ:) واتە: یەکێکی تر لە بەشەکانی «اِسْم» بریتییە لەو ئیسمەی کە ئیعراِبی دەچێتە سەر کە پێی دەگوترێت: «مُعْرَب»، (وَهُوَ عَلى ضَرْبَيْنِ) ئەو ئیسمەی کە ئیعرابی دەچێتە سەر دوو جۆری هەیە، **جۆری یەکەم:** پێی دەگوترێت: (مُنْصَرِفٌ) کە (وَهُوَ: ما يَدْخُلُهُ الرَّفْعُ وَالنَّصْبُ وَالْجَرُّ وَالتَّنْوِينُ) بریتییە لەو ئیسمەی کە «رَفْع»ـە و «نَصْب»ـە و «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی دەچنە سەر (كَزَيْدٍ) وەکوو وشەی «زَيْد»، کە هەرسێ «حَرَكَة» و «تَنْوِين»ـی دەچنە سەر؛ (وَ) **جۆری دووەم:** پێی دەگوترێت: (غَيْرُ مُنْصَرِفٍ) کە (وَهُوَ الَّذِي مُنِعَ مِنْهُ الْجَرُّ وَالتَّنْوِينُ) بریتییە لەو ئیسمەی کە «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی لێ قەدەغە کراون و ناچنە سەری (وَ يُفْتَحُ فِي مَوْضِعِ الْجَرِ) لە شوێنی جەڕەکە «مَفْتُوح» دەبێت، (نَحْوُ) وەکوو ئەو نموونەیەی دەڵێت (مَرَرْتُ بِأَحْمَدَ)؛ **سەرنج بدە:** ئێستا وشەی «أَحْمَدَ» لەجیاتی جەڕەی بچێتە سەر، «مَفْتُوح» بووە، چونکە «غَيْرَ مُنْصَرِف»ـە و لە هەموو کاتێک «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی لێ قەدەغە کراون و ناچنە سەری، (إِلَّا إذا أُضِيفَ) تەنها مەگەر ئەو وشەیەی کە «غَيْرَ مُنْصَرِف»ـە «إِضافَة» بکرێت (أَوْ عُرِّفَ بِاللامِ)[1] یاخود ئەلیف و لامی بچێتە سەر، (نَحْوُ) وەکوو (مَرَرْتُ بِأَحْمَدِكُمْ)، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «أَحْمَد» ئەگەرچی «غَيْرَ مُنْصَرِف»ـە بەڵام جەڕەی چۆتە سەر، چونکە وشەی «أَحْمَد» «إضافة» کراوە بۆ لای وشەی «كُمْ»

١. بڕوانە: شرح جمل الزجاجي: ٣٢٧/٢.

**وَبِالْأَحْمَرِ».**

**أَقُولُ: لَمَّا فَرَغَ مِنَ الصِّنْفِ الثَّانِي، شَرَعَ فِي الصِّنْفِ الثَّالِثِ، أَعْنِي: الْمُعْرَبَ؛ فَنَوَّعَهُ عَلَىٰ نَوْعَيْنِ: مُنْصَرِفٍ، وَغَيْرِ مُنْصَرِفٍ.**

**وَالْمُنْصَرِفُ: مَا يَدْخُلُهُ الرَّفْعُ وَالنَّصْبُ وَالْجَرُّ وَالتَّنْوِينُ، كَـ «زَيْدٍ»، فِي قَوْلِنَا: «جَاءَنِي زَيْدٌ» وَ «رَأَيْتُ زَيْداً» وَ «مَرَرْتُ بِزَيْدٍ».**

**وَغَيْرُ الْمُنْصَرِفِ: وَهُوَ الَّذِي مُنِعَ مِنْهُ الْجَرُّ، وَالتَّنْوِينُ،**

---

بۆیە جەڕڕەی وەرگرتووە، (وَ) هەروەها وەکوو «مَرَرْتُ (بِالأَحْمَرِ»)، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «أَحْمَر» ئەگەرچی «غَيْرَ مُنْصَرِف»ـە بەڵام جەڕڕەی چۆتە سەر، چونکە وشەی «أَحْمَر» ئەلیف و لامی چۆتە سەر بۆیە جەڕڕەی وەرگرتووە.

(**أَقُولُ:**) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم (**لَمَّا فَرَغَ مِنَ الصِّنْفِ الثَّانِي**) پاش ئەوەی مامۆستا لێبوویەوە لە باسکردنی بەشی دووەمی «اِسم» (**شَرَعَ فِي الصِّنْفِ الثَّالِثِ**) دەستی کرد بە باسکردنی بەشی سێیەمی «اِسْم» کە (**أَعْنِي الْمُعْرَبَ**)[1] مەبەستم پێی باس و بابەتەکانی ئیسمی «مُعْرَب»ـە، (**فَنَوَّعَهُ عَلَى نَوْعَيْنِ**) ئینجا مامۆستا «مُعْرَب»ی دابەش کرد بۆ دوو جۆری سەرەکی:

**جۆری یەکەم:** پێی دەگوترێت: (**مُنْصَرِفٌ**) کە بریتییە (**وَهُوَ: ما يَدْخُلُهُ الرَّفْعُ وَالنَّصْبُ وَالْجَرُّ وَالتَّنْوِينُ**) لەو ئیسمەی کە «رَفْع»ـە و «نَصْب»ـە و «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ی دەچنە سەر (**كَزَيْدٍ**) وەکوو وشەی «زَيْد»، کە هەرسێ حەرەکە و تەنوینی دەچێتە سەر (**فِي قَوْلِنا**) لەم نموونەیەی کە دەڵێت: (**جَاءَنِي زَيْدٌ، وَرَأَيْتُ زَيْداً، وَمَرَرْتُ بِزَيْدٍ**).

**جۆری دووەم:** (**وَغَيْرُ مُنْصَرِفٍ**) پێی دەگوترێت: «غَيْر مُنْصَرِف» کە بریتییە (**وَهُوَ الَّذِي مُنِعَ مِنْهُ الْجَرُّ وَالتَّنْوِينُ**)[2] لەو ئیسمەی کە «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی لێ قەدەغە کراون و ناچنە سەری.

---

١. ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات: بۆچی بابەتی «مُعْرَبْ» لەسەر بابەتی «مَبْنِي» وەپێش کەوتووە؟ ئەمە وەڵامەکەیەتی «لأَنَّ الْمُعْرَب أَمْرٌ وُجُودِيّ، وَالْمَبْنِيُّ أَمْرٌ عَدَمِيٌّ وَالْوُجُودِيَّاتُ تُقَدَّمُ عَلَى الْعَدَمِيَّاتِ» شرح الأنموذج: بتعليق الشيخيّ الداغستانيّ، ٧٢.

٢. بڕوانە: كشف المشكل، ٣٦، شرح الكافيه: ابن الحاجب ٣٤٢/٣.

**وَيُفْتَحُ فِي مَوْضِعِ الْجَرِّ؛ لِأَنَّ الْجَرَّ وَالْفَتْحَ أَخَوَانِ، كَـ «أَحْمَدَ»، فِي قَوْلِهِ: «مَرَرْتُ بِأَحْمَدَ»، بِفَتْحِ الدَّالِ. وَ إِنَّمَا يُمْنَعُ مِنَ الْجَرِّ وَالتَّنْوِينِ لِمَا سَيَجِيءُ مِنْ بَعْدُ، وَهُوَ أَنَّ غَيْرَ الْمُنْصَرِف مَا فِيهِ سَبَبَانِ أَوْ سَبَبٌ وَاحِدٌ مُتَكَرِّرٌ مِنَ الْأَسْبَابِ التِّسْعَةِ الْآتِيَةِ،**

(وَ يُفْتَحُ فِي مَوْضِعِ الْجَرِّ) لە شوێنی «جَرّ»ە ئیسمەکە «مَفْتوُح» دەبێت (لأَنَّ الْجَرَّ وَالْفَتْحَ أَخَوانٍ) چونکە جەڕڕە لەگەڵ فەتحە برای یەکترن و تەنها جیاوازییان ئەوەیە یەکیان لە سەرەوە و ئەوی‌تریان لە خوارەوەیە، هەردووکیشیان زیادن (كَأَحْمَدَ) وەکوو وشەی «أَحْمَدَ»، لەم نموونەیەی کە دەڵێیت: (مَرَرْتُ بِأَحْمَدَ بِفَتْحِ الدّالِ)، سەرنج بدە: ئێستا وشەی «أَحْمَدَ» لەجیاتی جەڕڕەی بچێتە سەر بە «مَفْتوُح»ـی دەخوێندرێتەوە، چونکە وشەی «أَحْمَد» «غیرالمنصرف»ـە و لە هەموو کاتێک جەڕڕە و تەنوینی لێ قەدەغە کراون و ناچنە سەری.

## بۆچی «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» جەڕڕە و تەنوینی لێ قەدەغە کراون؟

(وَ إِنَّما يُمْنَعُ مِنَ الْجَرِّ وَالتَّنْوِينِ) ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: بۆچی «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» جەڕڕە و تەنوینی لێ قەدەغە کراون؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: (لِما سَيَجِيءُ مِنْ بَعْدُ) لەبەر ئەو هۆکارانەی کە پاش کەمێکی‌تر باسیان دەکەین، (وَهُوَ أَنَّ غَيْرَ الْمُنْصَرِف مَا) ئەم هۆکارەش بریتییە لەوەی کە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» بە وشەیەک دەگوترێت (فِيهِ سَبَبانِ) کە دوو هۆکار (سَبَب)ی «مَنْعُ الصَّرْف»ـی تێدا بن (أَوْ سَبَبٌ وَاحِدٌ مُكَرَّرٌ)[1] یاخود یەک هۆکاری «مَنْعُ الصَّرْف»ی تێدا بێت، بەڵام دوو جار ئەم هۆکاری «مَنْعُ الصَّرْف»ـەی تێدا دووبارە ببێتەوە (مِنْ الأَسْبابِ التِّسْعَةِ الآتِيَةِ) لەو نۆ هۆکارەی «مَنْعُ الصَّرْف» کە لە داهاتوو باسیان

---

١. ئینجا جیاوازی نییە «سَبَب»ـەکە حەقیقەتەن دووجار دووبارە ببێتەوە وەکوو وشەی «أَكَالِب» کە جەمعی وشەی «أَكْلُب»ـە و ئەویش جەمعی وشەی «كَلْب»ـە، هەروەها وەکوو وشەی «أَناعِيم» کە جەمعی وشەی «أَنْعُم»ـە و ئەویش جەمعی وشەی «نَعَم»ـە، یاخود لە حەقیقەتدا «جَمْع»ـەکە دوو جار دووبارە نەبووبێتەوە، بەڵکوو تەنها لەسەر وەزنی ئەم «جَمْع»ـە بێت، وەکوو وشەی «مَساجِد» و وشەی «مَصَابِيح». بڕوانە: أسرار العربيه: ٢٧٣، شرح الأنموذج: بتعليق الشيخيّ الداغستانيّ، ٧٨.

**وَكُلُّ وَاحِدٍ مِنْ تِلْكَ الْأَسْبَابِ فَرْعٌ لِأَصْلٍ كَمَا سَيَتَحَقَّقُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى. فَيَكُونُ فِي كُلِّ غَيْرِ مُنْصَرِفٍ فَرْعِيَّتَانِ، وَيُشْبِهُ الْفِعْلَ مِنْ حَيْثُ إِنَّ فِيهِ أَيْضاً فَرْعِيَّتَيْنِ:**

**إِحْدَاهُمَا: احْتِيَاجُهُ فِي تَأْلِيفِ الْكَلَامِ إِلَى الِاسْمِ، كَمَا عَرَفْتَ.**

**وَالثَّانِيَةُ: أَنَّهُ مُشْتَقٌّ مِنَ الِاسْمِ، وَالْمُشْتَقُّ فَرْعُ الْمُشْتَقِّ مِنْهُ.**

---

دەکەین و بە درێژی ڕوونیان دەکەینەوە «إن شاء الله».

(**وَكُلُّ واحِدٍ مِنْ تِلْكَ الأَسْبابِ**) وە هەریەکە لەم نۆ هۆکارانەی «مَنْعُ الصَّرْف» ئەسڵ نین، بەڵکوو (**فَرْعٌ لأَصْلٍ**) فەرعن لەبۆ ئەسڵێکیتر (**كَما سَيَتَحَقَّقُ إِنْ شاءَ اللّٰهُ تَعالَى**) هەروەکوو لە وانەکانی داهاتوو بە وردی ڕوونی دەکەینەوە ـ پشتیوان بە خوای پەروەردگار ـ (**فَيَكُونُ فِي كُلِّ غَيْرَ مُنْصَرِفٍ فَرْعِيَّتانِ**) کەواتە: لە هەموو ئیسمێکی «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» دوو فەرعییەت هەن کە بە هۆی ئەم دوو فەرعییەتەوە (**وَيُشْبِهُ الْفِعْلَ**) دەشوبهێتە «فِعْل» (**مِنْ حَيْثُ أَنَّ فِيهِ أَيْضاً فَرْعِيَتَيْنِ**) لەم ڕووەی کە فیعلیش وەکوو «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» دوو فەرعییەتی تێدا هەن (**إِحْداهُما**) **فەرعییەتی یەکەم:** (**اِحْتِياجُهُ فِي تَأْلِيفِ الْكَلامِ إِلَى الاسْمِ**) بریتییە لە پێویستیی هەبوونی «فِعْل» بۆ لای «اِسْم» لە کاتی دروستکردنی «كَلام»ـدا، چونکە «فِعْل» بە تەنها «كَلام»ـی پێ دروست نابێت، تاوەکوو لەگەڵ ئیسم لێک نەدرێت، کەواتە: «فِعْل» بوو بە «فَرْع» بۆ «اسْم» (**كَماعَرَفْتَ**) هەروەکوو ئەم بابەتە ت زانی لە وانەی سێیەم و چوارەمدا. (**وَالثّانِيَةُ**) **فەرعییەتی دووەم:** (**أَنَّهُ مُشْتَقٌّ مِنَ الِاسْمِ**) بریتییە لەوەی کە هەموو فیعلێک لە ئیسم وەرگیراوە لە ڕووی دروستبوونییەوە، هەروەکوو زانایانی زانستی «صَرْف» باسیان کردووە، (**وَالْمُشْتَقُّ**) دەی هەر وشەیەکی وەرگیراویش (**فَرْعُ**)[1] دەبێتە فەرع بۆ ئەو وشەیەی (**الْمُشْتَقِ مِنْهُ**) کە لێی وەرگیراوە، بۆیە «اسْم» بە ئەسڵ هەژمار دەکرێت و «فِعْل»ـیش بە فەرع دادەندرێت، چونکە فیعل لە ئیسم وەردەگیرێت.

---

١. ئەمە لە ڕووی «لَفْظ»ەوە بوو هەروەها «فِعْل» لە ڕووی ماناشەوە پێویستی بە «اِسْم» هەیە چونکە هەموو فیعلێک بۆ بەخشینی مانا پێویستی بە «فاعِل» هەیە «فاعِل» یش «اِسْم»ە کەواتە: «فِعْل» هەم لە ڕووی ماناوە و هەم لە ڕووی «لفظ»ەوە پێویستی بە «اِسْم» هەیە: بڕوانە: حاشية الصَّبّان: (٣/ ٣٤٦)

**فَلَمَّا شَابَهَ الْفِعْلَ مِنْ هَاتَيْنِ الْجِهَتَيْنِ، نَاسَبَ أَنْ يُمْنَعَ مِنْهُ أَقْوَىٰ خَوَاصِّ الِاسْمِ، وَهُوَ الْجَرُّ وَالتَّنْوِينُ؛ إِلَّا إِذَا أُضِيفَ غَيْرُ الْمُنْصَرِفِ إِلَىٰ شَيْءٍ أَوْ عُرِّفَ بِاللَّامِ، فَإِنَّ الْجَرَّ لَا يُمْنَعُ مِنْهُ حِينَئِذٍ؛**

---

ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: (**فَلَمّا شَابَهَ الْفِعْلَ مِنْ هاتَيْنِ الْجِهَتَيْنِ**) جا کاتێک «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» لێکچوونی پەیدا بوو لەگەڵ «فِعْل» لەم دوو ڕووەوە (**ناسَبَ أَنْ يُمْنَعَ مِنْهُ**) شتێکی گونجاو و «مَعْقُول» بوو کە قەدەغە بکرێت لەم ئیسمەی کە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـە (**أَقْوَى خَواصِّ الِاسْمِ**) بەهێزترین تایبەتمەندییەکانی ئیسم (**وَهُوَ الْجَرُّ وَالتَّنْوِينُ**) کە بریتین لە «جَرّ»ە و «تَنْوِين»، چونکە قەدەغەیە جەڕڕە و تەنوین بچنە سەر «فِعْل» هەر بۆیە ئەم ئیسمەی کە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـە ئەم دوو تایبەتمەندییەی ئیسمی لێ قەدەغە دەکرێت و بە هیچ جۆرێک ناچنە سەری وەکوو «جَاءَنِي أَحْمَدُ، رَأَيْتُ أَحْمَدَ، مَرَرْتُ بِأَحْمَدَ».

(**إِلّا**) تەنها لە دوو حاڵەتدا نەبێت، **حاڵەتی یەکەم**: (**إذا أُضِيفَ غَيْرُ الْمُنْصَرِف إِلى شَيْءٍ**) ئەگەر ئەم ئیسمەی کە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـە «إِضافَة» بکرێت بۆ لای وشە و ئیسمێکی تر؛ **حاڵەتی دووەم**: (**أَوْ عُرِّفَ بِاللّامِ**)[1] یاخود ئەم ئیسمەی کە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـە ئەلیف و لامی چووە سەر لەم دوو حاڵەتەدا، (**فَإِنَّ الْجَرَّ لا يُمْنَعُ مِنْهُ حِينَئِذٍ**) لەم کاتەدا ئەم وشەیەی کە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـە جەڕڕەی لێ قەدەغە ناکرێت و بەڵکوو پێی دەدرێتەوە، بەڵام «تَنْوِين»ـی[2] هەر ناچێتە سەر، چونکە دروست نییە «تَنْوِين» و ئەلیف و لام (أَلْ) یاخود «تَنْوِين» و «إِضافَة» بەیەکەوە لەسەر یەک وشە کۆ ببنەوە.

---

١. بڕوانە: شرح المفصل: ٩٥/١، حاشية الصبان: ١٩١/١.

٢. هەر وشەیەک بوو بە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» بە هیچ جۆرێک «تَنْوِين» ناچێتەوە سەر تەنها لە دوو حاڵەت نەبێت، یەکەم: لەبەر «وَزْنُ الشِّعْرِ، وَرِعَايَةِ الْقَافِيَةِ» وەکوو «صُبَّتْ عَلَيَّ مَصائِبٌ..» دووەم: لەبەر «تَناسُب» وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿سَلَٰسِلَاْ وَأَغْلَٰلًا﴾ سەرنج بدەن: هەردوو وشەی «مَصَائِبٌ» و وشەی «سَلاسِلاً» «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـن کەچی تەنوینیان چۆتە سەر. ملا جامی: ١٠٥.

**لِأَنَّ الْإِضَافَةَ وَاللَّامَ مِنْ خَوَاصِّ الاِسْمِ، فَيَقْوَىٰ بِسَبَبِهِمَا الاِسْمِيَّةُ فِيهِ، وَيَضْعُفُ بِهِمَا مُشَابَهَتُهُ الْفِعْلَ، فَيَدْخُلُهُ مَا مُنِعَ مِنْهُ بِسَبَبِ قُوَّةِ تِلْكَ الْمُشَابَهَةِ، نَحْوُ: «مَرَرْتُ بِأَحْمَدِكُمْ»، فَإِنَّ «أَحْمَدَ» لَمَّا أُضِيفَ إِلَىٰ «كُمْ» كُسِرَ دَالُهُ، وَنَحْوُ: «مَرَرْتُ بِالْأَحْمَرِ»؛ فَإِنَّ «أَحْمَرَ» لَمَّا دَخَلَ عَلَيهِ «اللَّامُ» كُسِرَ رَاؤُهُ.**

---

ئینجا، لەبەر چی لەم کاتەدا ئەم وشەیەی کە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـە جەرِرەی لێ قەدەغە ناکرێت و بەڵکوو پێی دەدرێتەوە؟ مامۆستا دەفەموێت: **(لأَنَّ الإضافَةَ وَاللّامَ مِنْ خَواصِّ الاِسْمِ)** چونکە «إِضافَة»کردن و ئەلیف و لام (أَلْ) لە تایبەتمەندییەکانی ئیسمن **(فَيُقَوِّي بِسَبَبِها الاِسْمِيَّةُ فِيهِ)** بە هۆی «إضافة»کردن و ئەم ئەلیف و لامەوە ئەم وشەیەی کە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـە لایەنی «اِسْمِيَّة»ی بەهێز دەبێت **(وَتَضْعُفُ بِهِما مُشابَهَةُ الْفِعْلِ فِيهِ)** وە هەر بەم بۆنەیشەوە ئەم وشەیەی کە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـە لایەنی «فِعْلِيَّة»ی بێ‌هێز دەبێت، **(فَيَدْخُلُهُ ما مُنِعَ مِنْهُ)** ئینجا ئەو شتانەی کە لێی قەدەغە کرابوون دەچنەوە سەری کە بریتی بوون لە «جَرّ»ە و «تَنْوِين»، بەڵام تەنوینی هەر ناچێتە سەر، چونکە دروست نییە «تَنْوِين» و ئەلیف و لام (أَلْ) یاخود «تَنْوِين» و «إِضافَة» بەیەکەوە لەسەر یەک وشە کۆ ببنەوە **(بِسَبَبِ قُوَّةِ تِلْكَ الْمُشابَهَةِ)** بە هۆی بەهێزبوونی پەیوەندی و «مُشابَهَة»ی لەگەڵ «اِسْم» بێ‌هێزبوونی لەگەڵ «فِعْل».

**(نَحْوُ:)** وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: **(مَرَرْتُ بِأَحْمَدِكُمْ)**، سەرنج بدە: **(فَإِنَّ أَحْمَدَ)** ئێستا ئەم وشەی «أَحْمَد»ە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـە بەڵام **(لَمّا أُضِيفَ إِلى «كُمْ» كُسِرَ دالُهُ)**[1] لەم کاتەی کە «إِضافَة» کرا بۆ لای وشەی «كُمْ»، حەرفی کۆتایی -کە بریتییە لە «دال»- مەکسوور کرا، **(وَنَحْوُ:)** وە هەروەها وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: **(مَرَرْتُ بِالأَحْمَرِ)** سەرنج بدە: **(فَإِنَّ أَحْمَرَ)** ئێستا ئەم وشەی «أَحْمَر»ە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـە بەڵام **(لَمّا دَخَلَ عَلَيْهِ اللّامُ)** لەم کاتەی کە ئەلیف و لام چوونە سەری، **(كُسِرَ راؤُهُ)** حەرفی کۆتایی -کە بریتییە لە «راء»- مەکسوور کرا.

---

١. بڕوانە: النحو الوافي: ١/ ٥٧، شرح المفصل: ١/٩٥،

# الْإِعْرَابُ

**قَالَ: وَالْإِعْرَابُ هُوَ اخْتِلَافُ آخِرِ الْكَلِمَةِ بِاخْتِلَافِ الْعَوَامِلِ [لَفْظاً أَوْ تَقْدِيراً].**

## وانەی نۆهەم: باسی «الإعْراب»

پاش باسکردن و ڕوونکردنەوەی بابەتی «مُعْرَب» بە درێژی، ئینجا مامۆستا دێتە سەر باسکردنی بابەتی «إِعْراب» (قالَ:) مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری لە پێناسەی «إِعْراب» دەفەرموێت: (وَالإِعْرابُ هُوَ) واتە: ئیعراب بریتییە (اِخْتِلافُ آخِرِ الْكَلِمَةِ) لەو گۆڕانەی کە بەسەر شێوازی خوێندنەوەی[1] کۆتایی وشەدا دێت (بِاخْتِلافِ الْعَوامِلِ) بە هۆی گۆڕانی ئەو «عامل»ـانەی کە دەچنە سەر وشەکە، ئینجا یەکسانە ئەم گۆڕانکارییە (لَفْظاً) لە کاتی خوێندنەوە هەستی پێ بکرێت و بە چاو ببیندرێت ـ وەکوو «جَاءَنِي بَكْرٌ، رَأَيْتُ بَكْراً، مَرَرْتُ بِبَكْرٍ» سەرنج بدە: ئێستا شێوازی خوێندنەوەی وشەی «بَكْر» لە هەرسێ نموونەکان گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە. (أَوْ تَقْدِيراً) یاخود لە کاتی خوێندنەوە هەستی پێ نەکرێت و بە چاو نەبیندرێت وەکوو «جَاءَنِي مُوسَى، رَأَيْتُ مُوسَى، مَرَرْتُ بِمُوسَى» سەرنج بدە: ئێستا شێوازی خوێندنەوەی وشەی «مُوسَى» لە هەرسێ نموونەکان گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتووە، بەڵکوو لە «تَقْدِير»دا گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، لە نموونەی یەکەم: لە «تَقْدِير»دا «مَرْفُوع» بووە، بۆتە «فاعِل»، لە نموونەی دووەمدا: لە «تَقْدِير»دا «مَنْصُوب» بووە بۆتە «مَفْعُول بِهِ»، لە نموونەی سێیەم: لە «تَقْدِير»دا «مَجْرُور» بووە بۆتە «اِسْم مَجْرُور».

---

١. بۆیە ئەم بڕگەیەم بەم شێوەیە مانا کردووە، چونکە ئەوەی گۆڕانکاری بەسەردا دێت بریتییە لە شێوازی خوێندنەوەی کۆتایی وشەکە نەک خودی کۆتایی وشەکە؛ سەرنجی وشەی «بکر» بدە لە هەر سێ نموونەکە پیتی «راء» هەروەکوو خۆیەتی، تەنها شێوازی خوێندنەوەی گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە لە «رَفْع»وە بووە بە «نَصْب» و دواتر بووە بە «جرّ»، کەواتە: «إِعْراب» بریتییە لە «هُوَ تَغْيِيرُ أَحْوالِ أَواخِرِ الْكَلِمِ».

**وَاخْتِلَافُ آخِرِ الْكَلِمَةِ إِمَّا بِالْحَرَكَاتِ، نَحْوُ: «جَاءَنِي زَيْدٌ» وَ «رَأَيْتُ زَيْداً» وَ «مَرَرْتُ بِزَيْدٍ»؛ وَإِمَّا بِالْحُرُوفِ، وَذٰلِكَ فِي الأَسْماءِ السِّتَّة مُضَافَةً إِلىٰ غَيْرِ يَاءِ الْمُتَكَلِّمِ، وَهِيَ: «أَبُوهُ وَأَخُوهُ وَحَمُوهَا وَهَنُوهُ وَفُوهُ وَذُو مَالٍ»؛ تَقُولُ: «جَاءَنِي أَبُوهُ»، وَ «رَأَيْتُ أَبَاهُ»، وَ «مَرَرْتُ بِأَبِيهِ». وَكَذٰلِكَ الْبَوَاقِي.**

**أَقُولُ: لَمَّا بَيَّنَ الْمُعْرَبَ، أَرَادَ أَنْ يُبَيِّنَ**

---

ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: **(وَاخْتِلافُ آخِرِ الْكَلِمَةِ)** ئەم گۆڕانکارییەی کە بەسەر شێوازی خوێندنەوەی کۆتایی وشەدا دێت، دوو جۆری هەیە، **جۆری یەکەم: (إِمّا بِالْحَرَكاتِ)** یاخود بەهۆی گۆڕانی «حَرَكات»ی کۆتایی وشەکەیە ـکە بریتین لە «رَفْعَ» و «نَصْبَ» و «جرَّ»، **(نَحْوُ)** وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: **(جَاءَنِي زَيْدٌ)** لە حاڵەتی ڕەفعەدا **(وَرَأَيْتُ زَيْداً)** لە حاڵەتی نەسبەدا **(وَ مَرَرْتُ بِزَيْدٍ)** لە حاڵەتی جەڕڕەدا؛ **سەرنج بدە:** ئێستا کۆتایی وشەی «زید» بە هۆی حەرەکەوە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە.

**جۆری دووەم: (وَ إِمّا بِالْحُرُوفِ)**[1] یاخود بە هۆی گۆڕانی «حَروف»ـەکانی کۆتایی وشەکەیە کە برتیین لە «الواو» و «الأليف» و «الياء»، **(وَذَلِكَ فِي الأَسْماءِ السِّتَّة)** ئەمەش لە «أسماء السِتَّة» و چەند شوێنێکیتره، بەو مەرجەی کە دەبێت ئەم شەش ئیسمە (أسماء السِتَّة) **(مُضافَةً)** پاڵبدرێن و «إِضافَة» بکرێن بۆ لای ئیسمێکیتر **(إِلى غَيْرِ ياءِ الْمُتَكَلِّمِ)** کە نابێت ئەم شەش ئیسمە «إضافة» بکرێن بۆ لای «ياءُ الْمُتَكَلِّم»، **(وَهِيَ)** ئەم شەش ئیسمە بریتین لە **(أَبُوهُ، وَأَخُوهُ، وَهَنُوهُ، وَحَمُوها، وَفُوهُ، وَ ذُومالٍ، تَقُولُ)** وەکوو ئەم نموونەیەی کە تۆ دەڵێیت: **(جَاءَنِي أَبُوهُ)** لە حاڵەتی «رَفْعَ»دا **(وَرَأَيْتُ أَباهُ)** لە حاڵەتی «نَصْبَ»دا **(وَ مَرَرْتُ بِأَبِيهِ)** لە حاڵەتی«جَرَّ»دا، **سەرنج بدە:** ئێستا کۆتایی وشەی «أبو» بە هۆی «الواو» و «الألف» و «الياء»ـەوە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، **(وَكَذلِكَ الْبَواقِي)** هەروەها ئەو پێنج ئیسمەیتریش بە هەمان شێوە گۆڕانکارییان بەسەردا دێت و هیچ جیاوازییەکیان نییە.

**(أَقُولُ:)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(لَمّا بَيَّنَ الْمُعْرَبَ)** پاش باسکردن و ڕوونکردنەوەی بابەتی «مُعْرَب» بە درێژی **(أَرادَ أَنْ يُبَيِّنَ**

---

١. بڕوانە: كشف المشكل في النّحو: ٣٦.

**مَا بِسَبَبِهِ يَصِيرُ الْمُعْرَبُ مُعْرَباً، أَعْنِي: الْإِعْرَابَ، وَهُوَ اخْتِلَافُ آخِرِ الْكَلِمَةِ ـ اسْماً كَانَتْ أَوْ فِعْلاً ـ بِاخْتِلَافِ الْعَوَامِلِ فِي أَوَّلِهَا.**

**فَاحْتَرَزَ بِـ «الْآخِرِ» عَنِ الْأَوَّلِ وَالْوَسَطِ، فَإِنَّ اخْتِلَافَهُمَا لَا يُسَمَّىٰ إِعْرَاباً،**

---

ما) ئینجا مامۆستا دەیەوێت بابەتێک باس بکات (**بِسَبَبِهِ يَصِيرُ الْمُعْرَبُ مُعْرَباً**) کە بەهۆی ئەم بابەتە «اِسْمُ» و «فِعْل المضارِع» دەبن بە «مُعْرَب» (**أَعْنِي الإِعْرابَ**) مەبەستم ئەوەیە مامۆستا دەیەوێت باسی بابەتی «إِعْراب» بکات.

## پێناسەی «إِعْراب» لە ڕووی زمانەوانییەوە

وشەی «إِعْراب» لە ڕووی زمانەوانییەوە بە مانای ڕوونکردنەوە و ئاشکراکردن و دەرخستن دێت (الإبانة والإظهار والإفصاح، يُقالُ: أَعْرَبَ فُلانٌ عَنْ ضَمِيرِهِ: إذا أَبانَ وَ أَفْصَحَ عَمّا فِيهِ)[١].

## پێناسەی «إِعْراب» لە ڕووی زاراوەییەوە

(**وَهُوَ**) واتە: پێناسەی «إِعْراب» لە ڕووی «اصطِلاح»ـدا بریتییە لەو (**اِخْتِلافُ آخِرِ الْكَلِمَةِ**) گۆڕانکارییەی کە بەسەر شێوازی خوێندنەوەی کۆتایی وشەدا دێت، ئینجا جیاوازی نییە (**اِسْماً كانَتْ**) ئەو وشەیەی کە گۆڕانی بەسەردا دێت «اِسْم» بێت وەکوو وشەی «زيد، بكر» کە نموونەکەمان باس‌کردن، (**أَوْ فِعْلاً**) یاخود «فِعْل» بێت وەکوو «يَضْرِبُ، لَنْ يَضْرِبَ، وَلَمْ يَضْرِبْ»، (**بِاخْتِلافِ الْعَوامِلِ فِي أَوَّلِها**) ئەم گۆڕانەی کە دروست دەبێت بە هۆی گۆڕانی ئەو عامیلانەیە کە دەچنە سەر وشەکە و لە سەرەتای وشەکەدا دێن.

(**فَاحْتَرَزَ بِالآخِرِ**) ئینجا کە مامۆستا گوتی «إِعْراب» بریتییە لەو گۆڕانکارییەی کە بەسەر شێوازی خوێندنەوەی کۆتایی وشەدا دێت، بەم بڕگەیە خۆی پاراست (**عَنْ الأَوَّلِ وَالْوَسَطِ**) لەو گۆڕانکارییانەی کە بەسەر شێوازی خوێندنەوە و نووسینی سەرەتا و ناوەڕاستی وشەدا دێت، (**فَإِنَّ اِخْتِلافَهُما لا يُسَمَّى إِعْراباً**) چونکە ئەم گۆڕانکارییانەی

---

١. بڕوانە: تهذيب اللغة: (٢/٢١٩)

**كَـ «رَجُلٍ» وَ «رُجَيْلٍ» وَ «رِجَالٍ»؛ وَبِـ «اخْتِلَافِ الْعَوَامِلِ» احْتَرَزَ عَنِ اخْتِلَافِ الْآخِرِ لَا بِالْعَامِلِ، نَحْوُ: «مَنْ ضَرَبَ؟» وَ «مَنِ الضَّارِبُ؟» وَ «مَنُ ابْنُكَ؟».**

---

که بەسەر شێوازی خوێندنەوە و نووسینی سەرەتا و ناوەڕاستی وشەدا دێت، پێیان ناگوترێت «إِعْراب» (كَرَجُلٍ وَرُجَيْلٍ وَ رِجالٍ) وەکوو وشەی (رَجُل) ئەگەر «تَصْغِير» بکرێت دەبێتە (رُجَيْل)، هەروەها ئەگەر بکرێتە «جَمْعُ التَّكْسِير» دەبێتە (رِجالٍ)، ئێستا سەرنج بدە: وشەی «رُجَيْـل» و «رِجـال» هەردووکیان گۆڕانکارییان بەسەر سەرەتا و ناوەڕاستدا هاتووە، بەڵام ئەم گۆڕانکارییە پێی ناگوترێت «إِعْراب»، چونکە تەنها گۆڕانکاری کۆتایی وشەکە پێی دەگوترێت ئیعراب.

(وَبِاخْتِلافِ الْعَوامِلِ) هەروەها بەم بڕگەیەی کە مامۆستا گوتی ئیعراب بریتییە لەو گۆڕانەی کە بەسەر کۆتایی وشەکەدا دێت، بەهۆی گۆڕانی ئەو عاملانەی کە دەچنە سەر وشەکە و لە سەرەتای وشەکەدا دێن (اِحْتَرَزَ عَنْ اِخْتِلافِ الآخِرِ لا بِالعامِلِ) بەم بڕگەیە خۆی پاراست لەو گۆڕانکارییانەی کە لە کۆتایی وشەکەدا دروست دەبن، بەڵام بە هۆی عامیلەکانەوە نییە (نَحْوُ) وەکوو وشەی «مَنْ» لەم سێ نموونەیە؛ **یەکەم:** (مَنْ ضَرَبَ) ئێستا لەم نموونەیە وشەی «مَنْ» ساکن بووە بەڵام بە هۆی عامیلەوە نییە، بەڵکوو بە هۆی ئەوەیە کە وشەی «مَنْ» مەبنییە[1].

(وَمَنِ الضَّارِبُ) **دووەم:** ئێستا لەم نموونەیە وشەی«مَن» مەکسوور بووە، بەڵام بە هۆی عامیلەوە نییە، بەڵکوو بە هۆی «اِلْتِقاءُ السّاكِنَيْن»ـە[2]. (وَمَنُ ابْنُكَ) ئێستا لەم نموونەیەدا وشەی «مَنُ» «مَضْمُوم» بووە بەڵام بە هۆی عامیلەوە نییە، بەڵکوو بە هۆی «اِلْتِقاءُ السّاكِنَيْن»ـە، بەڵام لەبەر «مُناسَبَة»ی «اِبْنُكَ» «مَضْمُوم» بووە، ئەگینا ئەسڵ وابوو «مَكْسُور» بێت، ئێستا وشەی «مَنْ» گۆڕانکاری بەسەر کۆتاییدا هاتووە،

---

١. بڕوانە: شرح شذور الذهب: ل، ٥٢.

٢. چونکە بەپێی یاسای زانستی «صَرْف» هەرکاتێک دوو «سَاكِن» بەیەکەوە کۆ بوونەوە، دەبێت یەکێک بکرێتە «حَرَكَة» بۆ ئەوەی وشەکە بخوێندرێتەوە، هەروەها ئەسڵ وایە بکرێت بە «كَسْرَة»، «إذا حُرِّكَ السَّاكِنُ حُرِكَ بِالْكَسْرَةِ»؛ بەڵام هێندێک جار بە هۆی هەبوونی «مُناسَبَة» لەگەڵ وشەی دوای خۆی، دەکرێت بە «فَتْحَة» یاخود بە «ضَمَّة». بڕوانە: تصریف ملا علی، ل ٩٥.

**وَ إِنَّمَا اخْتُصَّ الْإِعْرَابُ بِاخْتِلَافِ آخِرِ الْكَلِمَةِ؛ لِأَنَّ اخْتِلَافَ الْأَوَّلِ وَالْوَسَطِ دَلِيلٌ عَلَىٰ وَزْنِ الْكَلِمَةِ، فَلَا يَصِيرُ دَلِيلاً لِشَيْءٍ آخَرَ.**

**وَاخْتِلَافُ آخِرِ الْكَلِمَةِ: إِمَّا بِالْحَرَكَاتِ، كَاخْتِلَافِ آخِرِ «زَيْدٍ» فِي نَحْوِ: «جَاءَنِي زَيْدٌ» وَ «رَأَيْتُ زَيْداً» وَ «مَرَرْتُ بِزَيْدٍ»؛**

---

بەڵام ئەم گۆڕنکارییە پێی ناگوترێت «إِعْراب»، چونکە گۆڕانکارییەکە بە هۆی عامیلانەوە دروست نەبووە، (**وَ إِنَّما أُخْتُصَّ الإعْرابُ بِاخْتِلافِ آخِرِ الْكَلِمَةِ؟**) ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات بڵێت: بۆچی «إِعْراب» تایبەت کراوە بە گۆڕانی کۆتایی «كَلِمَة»؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: (**لأَنَّ اِخْتِلافَ الأَوَّلِ وَالْوَسَطِ دَلِيلٌ عَلَى وَزْنِ الْكَلِمَةِ**) چونکە ئەم گۆڕانکارییەی لە سەرەتا و لە ناوەڕاستی وشەدا دروست دەبێت، بەڵگە و نیشانەی ئەوەیە کە ئەم وشەیە لەسەر چ وەزنێکە و میزانەکەی چۆنە، (**فَلا يَصِيرُ دَلِيلاً لِشَيْءٍ آخَرَ**) کەواتە: ئەم گۆڕانکارییەی لە سەرەتا و لە ناوەڕاستی وشەدا دروست دەبێت، نابێتە بەڵگە لەسەر شتێکی‌تر، هەروەها جگە لەمە ناکرێت «إِعْراب» لە سەرەتای وشەدا بێت، چونکە یەکێک لە حاڵەتەکان «سکون»ـە، ئەویش ناکرێت لە سەرەتادا بێت، هەروەها ناکرێت «إِعْراب» لە ناوەڕاستی وشەدا بێت چونکە هێندێک وشە ناوەڕاستی نییە، وەکوو وشەی «يد» یا «أَبٌ» یا «أُمٌ» یاخود «دَمٌ»، کەواتە بەس کۆتایی وشە مایەوە.

ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: (**وَاخْتِلافُ آخِرِ الْكَلِمَةِ**) ئەم گۆڕانکارییەی کە بەسەر شێوازی خوێندنەوەی کۆتایی وشەدا دێت، دوو جۆری هەیە، **جۆری یەکەم**: (**إِمَّا بِالْحَرَكاتِ**) یاخود بە هۆی گۆڕانی «حَرَكات»ی کۆتایی وشەکەیە کە برتیین لە «رَفْعَ» و «نَصْبَ» و «جرّ» (**كَاخْتِلافِ آخِرِ زَيْدٍ**) وەکوو ئەم گۆڕانەی کە بەسەر کۆتایی وشەی «زید»دا دێت (**فِي نَحْوِ**) لەم نموونەیە و هاووێنەکانی کە دەڵێت: (**جَاءَنِي زَيْدٌ**) لە حاڵەتی ڕەفعەدا (**وَرَأَيْتُ زَيْداً**) لە حاڵەتی نەسبەدا (**وَمَرَرْتُ بِزَيْدٍ**) لە حاڵەتی جەڕڕەدا، سەرنج بدە: ئێستا کۆتایی وشەی «زید» بە هۆی حەرەکاتەوە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە.

**وَ إِمَّا بِالْحُرُوفِ، وَذٰلِكَ فِي أَرْبَعَةِ مَوَاضِعَ:**

**الْأَوَّلِ: فِي سِتَّةِ أَسْمَاءٍ، سَمَّتْهَا الْعَرَبُ بِالأَسْمَاءِ السِّتَّة، إِذَا كَانَتْ مُضَافَةً إِلَىٰ غَيْرِ يَاءِ الْمُتَكَلِّمِ. وَتِلْكَ الْأَسْمَاءُ: «أَبُوهُ وَأَخُوهُ وَحَمُوهَا**

---

**جۆری دووەم:** (وَ إِمَّا بِالْحُرُوفِ) یاخود گۆڕانی کۆتایی «کَلِمَـة» بەهۆی گۆڕانی «حُروف»ـەکانی کۆتایی وشەکەیە، کە برتیین لە «الواو» و «الألف» و «الیاء»، (وَذَلِكَ فِي أَرْبَعَةِ مَواضِعَ)[1] وە ئەم گۆڕانەی کە بە هۆی گۆڕانی حرووفەکانی کۆتایی وشەکە دروست دەبێت، واتە: «الإِعْراب بالحروف» لەم چوار شوێنانەیە:

**یەکەم:** (**ألأَوَّلُ:**) شوێنی یەکەم لەم چوار شوێن و جێگایەی کە ئیعرابی بە حەرفانە (بالحروف) (فِي سِتَّةِ أَسْماءَ) لەم شەش ئیسمانەیە کە (**سَمَّتْها الْعَرَبُ بِالأَسْماءِ السِّتَّة**) کە عەرەب ناوزەدیان کردوون بە «الأَسْماءِ السِّتَّة» و هەر بەم ناوە مەشهوورن لە هەموو کتێبە نەحوییەیەکان باسیان کراوە.

بەڵام ئەو کاتە ئەم شەش ئیسمە (الأَسْماءِ السِّتَّة) ئیعرابیان بە حەرفان دەبێت کە ئەم چوار مەرجانەیان تێدا بێت، ئەگەر بێت و یەکێک لەم چوار مەرجانەیان تێدا نەبێت، ئەوە ئیعرابیان بە حرووفان نابێت:

**مەرجی یەکەم:** دەبێت ئەم شەش ئیسمانە (مُضافَةً) پاڵبدرێن و «إِضافَة» بکرێن بۆ لای ئیسمێکی‌تر وەکوو «أَبُوهُ» و «أَخُوهُ» یاخود وەکوو «أَبُوكَ» و «أَخُوك» یاخود وەکوو «أَبُوبَكْرٍ».

**مەرجی دووەم:** هەروەها بەم مەرجەی نابێت «إضافة» کە (إِلى غَيْرِ ياءِ الْمُتَكَلِّمِ) بۆ لای «یاءُ الْمُتَكَلِّم» بێت، چونکە هەر ئیسمێک «إِضافَة» بکرێت بۆ لای «یاءُ الْمُتَكَلِّم»، لە هەرسێ حاڵەتدا ئیعرابەکەی تەقدیری دەبێت.

(**وَتِلْكَ الأَسْماءُ**) ئەم ئیسمانەش بریتین لەم شەش ئیسمە: یەکەم وشەی (أَبُوهُ، وَ) دووەم وشەی (أَخُوهُ، وَ) سێیەم وشەی (هَنُوهُ[2]، وَ) چوارەم وشەی (حَمُوها)،

---

١. بڕوان: علل النحو: ٢١٣.

٢. وشەی «أَبـوه» هەروەها وشەی «أَخُوه» ماناکانیان دیارە، بەڵام وشەی «هَنُوهُ» چەند زانایەک ☜

**وَهَنُوهُ وَفُوهُ وَذُو مَالٍ». فَتَقُولُ فِي بَيَانِ اخْتِلَافِهَا بِالْحُرُوفِ، نَحْوُ: «جَاءَنِي أَبُوهُ» وَ «رَأَيْتُ أَبَاهُ» وَ «مَرَرْتُ بِأَبِيهِ»؛ فَآخِرُ «الْأَبِ» يَخْتَلِفُ،**

(وَ) پێنجەم وشەی (فُوهُ)[١]، وَ) شەشەم وشەی (ذُومالٍ)[٢]؛ ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: (فَتَقُولُ:) کەواتە تۆ دەڵێیت (فِي بَيانِ اِخْتِلافِها بِالْحُروفِ) لە کاتی ڕوونکردنەوەی ئەم ئیسمانە کە گۆڕانکارییان بەسەر کۆتاییدا دێت بە هۆی «واو» و «ألف» و «ياء»: (جَاءَنِي أَبُوهُ) لە حاڵەتی ڕەفعەدا (وَ) هەروەها وەکوو (رَأَيْتُ أَباهُ) لە حاڵەتی نەسبەدا (وَ) هەروەها وەکوو (مَرَرْتُ بِأَبِيهِ) لە حاڵەتی جەڕڕەدا، (فَآخِرُ الأَبِ يَخْتَلِفُ) سەرنج بدە: کۆتایی وشەی «أب» گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە

☜ دەفەرموون: وشەی«اَلْهَنُ» گوزارشت لە «أَسْماءُ الأَجْناسِ» دەکات، هێندێک زانایتر دەفەرموون: وشەی«اَلْهَنُ» بە شتێک دەگوترێت کە شەرم بێت ناوی بگوترێت، هەروەها هێندێک زانایتر دەفەرموون: وشەی«اَلْهَنُ» بە عەورەتی پیاوان دەگوترێت، هەروەها لە باری ئیعرابی وشەی «اَلْهَنُ» زانایانی زانستی «نحو» ڕا جیاییان هەیە، هەر یەکە لە «الفَرّاء» لە «الزَّجاجُ» دەفەرموون وشەی«اَلْهَنُ» بە «أَسْماء السِّتَّة» هەژمار ناکرێت بەڵکوو«إِعْرابِ» ی بە حەرەکانە بۆیە دەگوترێت«هَذا هَنُكَ وَرَأَيْتُ هَنَكَ وَ نَظَرْتُ إِلَى هَنِكَ» بۆیە ئەوان دەڵێن«أَسْماءُ الْخَمْسَة» بەڵام زانای پایەدار«سیبويه» دەفەرموێت: وشەی«اَلْهَنُ» بە «أَسْماءُ السِّتَّة» هەژمار دەکرێت «إِعْراب»ی بە «حروف»انە بۆیە دەگوترێت: «هذا هَنُوه وَرَأَيْتُ هَناهُ وَ نَظَرْتُ إَلَى هَنِيهِ» بەڵام ئەمە ڕایەکی زۆر بە هێز نییە بۆیە: ابن مالک دەفەرموێت «أَبٌ أَخٌ، حَمٌ، كَذاكَ وَهَنُ ... وَالنَّقْصُ فِي هذا الأَخِيرِ أَحْسَنُ» يَعْنِي أَنَّ الإِتْمامَ جائِزٌ لَكِنَّهُ قَلِيلٌ جِداً بڕوانە: ابن عقيل (٤٩/١) و همع الهوامع: (١٢٥/١) و (الإيضاح في علل النحو). (٧٥/١). هەروەها وشەی (حَمُوها) بە خزمی خێزان لە تەرەفی مێردی دەگوترێت وەک باوک یاخود برای مێردی. بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١. وشەی «فُوه» لە ئەسڵدا لە «فَم» وەرگیراوە، بەڵام ئەو کاتە بە «أَسْماء السِّتَّة» هەژمار دەکرێت و ئیعرابی بە حرووفانە ئەگەر بێت و پیتی «میم»ـی لێ بێتەوە و ببێ بە «فُوهُ»، بەڵام ئەگەر بێت و پیتی میمی هەر پێوە بێت، ئەو کاتە ئیعرابی بە حەرەکان دەبێت وەکوو «هذا فَمٌ، رَأَيْتُ فَماً، نَظَرْتُ إَلَى فَمٍ». بڕوانە: ابن عقيل (٤٩/١) و همع الهوامع: (١٢٥/١).

٢. وشەی «ذُو» لە ئەسڵدا «ذُوَوٌ» بووە لەلای جمهووری زانایان، بەڵام چونکە کۆبوونەوەی دوو «واو» لە کۆتایی ئیسمێکی «ثُلاثِي» بە ناپەسند داندراوە لەلای زانایانی زمانەوانییەوە، بۆیە واوێکیان «حذف» کرد بوو بە «ذُو». شرح الأنموذج: ٨٢.

**لٰكِنْ لَا بِالْحَرَكَاتِ بَلْ بِالْحُرُوفِ، أَعْنِي: الْوَاوَ فِي الرَّفْعِ، وَالْأَلِفَ فِي النَّصْبِ، وَالْيَاءَ فِي الْجَرِّ. وَكَذٰلِكَ تَقُولُ فِي الْبَوَاقِي، نَحْوُ: «أَخُوهُ وَأَخَاهُ وَأَخِيهِ»، وَ «حَمُوهَا وَحَمَاهَا وَحَمِيهَا»، وَ «هَنُوهُ وَهَنَاهُ وَهَنِيهِ»، وَ «فُوهُ وَفَاهُ وَفِيهِ»، وَ «ذُو مَالٍ وَذَا مَالٍ وَذِي مَالٍ».**

---

(لَكِنْ لا بِالْحَرَكاتِ بَلْ بِالْحُروفِ) بەڵام گۆڕانەکە بەهۆی حەرەکانەوە نییە، بەڵکوو بە هۆی «واو» و «ألف» و «ياء»ـە (أَعْنِي: الواوَ فِي الرَّفْعِ) مەبەستم ئەوەیە ئەم شەش ئیسمانە حاڵەتی ڕەفعەیان بە واوە (وَالأَلِفَ فِي النَّصْبِ) هەروەها نەسبەیان بە ئەلیفە (وَالْياءَ فِي الْجَرِّ) هەروەها حاڵەتی جەڕڕەیان بە «ياء»ـە، (وَكَذَلِكَ تَقُولُ فِي الْبَواقِي) هەروەها پێنج ئیسمەکەیتریش لە ڕووی ئیعڕابەوە بە هەمان شێوەن.

**ئینجا بزانە:** هێندێک لە سەرچاوەکان و ناوەندەکانی خوێندن دەڵێن: «الأَسْماءُ الْخَمْسَةُ» چونکە ئەوان وشەی «هَنُوهُ»یان هەژمار نەکردووە، لەبەر دوو شت، یەکەم: ئەم وشەیە زیاتر ئیعڕابی بە حەرەکاتە، دووەم: ئەم وشەیە زۆر کەم بەکار دێت، هەروەها لە ڕووی ماناشەوە زۆر گونجاو نییە بۆ ناوەندەکانی خوێندنی تێکەڵاو.

(نَحْو:) وەکوو «جَاءَنِي (أَخُوهُ)» لە حاڵەتی ڕەفعەدا، (وَ) هەروەها وەکوو «رَأَيْتُ (أَخَاه)» لە حاڵەتی نەسبەدا، (وَ) هەروەها وەکوو «مَرَرْتُ بِـ (أَخِيهِ)» لە حاڵەتی جەڕڕەدا. (وَ) هەروەها وەکوو «جَاءَنِي (حَمُوها)» لە حاڵەتی ڕەفعەدا، (وَ) هەروەها وەکوو «رَأَيْتُ (حَمَاها)» لە حاڵەتی نەسبەدا، (وَ) هەروەها وەکوو «مَرَرْتُ (بِحَمِيها)» لە حاڵەتی جەڕڕەدا. (وَ) هەروەها وەکوو «هذا (هَنُوهُ)» لە حاڵەتی ڕەفعەدا، (وَ) هەروەها وەکوو «رَأَيْتُ (هَنَاهُ)» لە حاڵەتی نەسبەدا، (وَ) هەروەها وەکوو «نَظَرْتُ إِلَى (هَنِيهِ)» لە حاڵەتی جەڕڕەدا. (وَ) هەروەها وەکوو «هذا (فُوهُ)» لە حاڵەتی ڕەفعەدا، (وَ) هەروەها وەکوو «رَأَيْتُ (فَاهُ)» لە حاڵەتی نەسبەدا، (وَ) هەروەها وەکوو «نَظَرْتُ إِلَى (فِيهِ)» لە حاڵەتی جەڕڕەدا. (وَ) هەروەها وەکوو «جَاءَنِي (ذُومالٍ)» لە حاڵەتی ڕەفعەدا، (وَ) هەروەها وەکوو «رَأَيْتُ (ذا مالٍ)» لە حاڵەتی نەسبەدا، (وَ) هەروەها وەکوو «مَرَرْتُ بِـ (ذِي مالٍ)» لە حاڵەتی جەڕڕەدا.

**وَ إِنَّمَا أُعْرِبَتْ هٰذِهِ الْأَسْمَاءُ بِالْحُرُوفِ؟ لِأَنَّهَا ثَقِيلَةٌ بِسَبَبِ تَعَدُّدٍ يَقْتَضِيهِ تَحَقُّقُ مَعَانِيهَا؛ إِذِ الْأَبُ مَثَلاً إِنَّمَا يُتَصَوَّرُ بَعْدَ تَصَوُّرِ مَنْ لَهُ الِابْنُ، مَعَ أَنَّ أَوَاخِرَهَا حُرُوفٌ تَصْلُحُ أَنْ تَكُونَ عَلَامَةَ الْإِعْرَابِ، فَلَمْ يَزِيدُوا عَلَيْهَا الْحَرَكَةَ لِئَلَّا يَزْدَادَ الثِّقَلُ عَلَى الثِّقَلِ.**

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: **(وَ إِنَّما أُعْرِبَتْ هذِهِ الأَسْماءُ بِالْحُرُوفِ)** بۆچی ئەم شەش ئیسمانە ئیعرابیان بە حەرفانە و بۆچی بە حەرەکات نەبوو؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: **(لأَنَّها ثَقِيلَةٌ)** چونکە ئەم شەش ئیسمانە قورس و گرانن **(بِسَبَبِ تَعَدُّدٍ)** بە هۆی چەندیەتی و ژمارە **(يَقْتَضِيهِ تَحَقُّقُ مَعانِيها)** کە لە ناوەڕۆکی ماناکانیاندا هەیە لە قەزای دەخوازێت **(إِذِ الأَبُ مَثَلاً)** بۆ نموونە ئەگەر سەرنجی وشەی «أَبُوهُ» (باوکی ئەو) بدەین وەکوو نموونە **(إِنَّما يُتَصَوَّرُ بَعْدَ تَصَوُّرِ مَنْ لَهُ اِبْنُ)** ئەو کاتە بیری لێدەکرێتەوە و پێی دەگوترێت باوک، کە بیر لە کەسێک بکەیتەوە کە کوڕێکی هەبێت، ئەوکات دەبێت بە باوک، هەروەها وشەی «أَخُوهُ» بە هەمان شێوەیە، چونکە ئەگەر کەسەکە برایەک یاخود خوشکێکی نەبێت پێی ناگوترێت: «أَخُوهُ».

**(مَعَ أَنَّ أَوَاخِرَها حُرُوفٌ)** لەگەڵ ئەوەی لە کۆتایی ئەم شەش ئیسمە چەند حەرفێک هەن وەکوو «أَلِف» و «وَاو» و «يَاء» کە **(تَصْلُحُ أَنْ تَكُونَ عَلامَةَ الإِعْرابِ)** دەگونجێن ببن بە نیشانەی «إِعْراب»، وەکوو «رَفْع» و «نَصْب» و «جَرّ» بەکار بێن **(فَلَمْ يَزِيدُوا عَلَيْها الْحَرَكَةَ)** کەواتە: ئەم شەش ئیسمە لە کاتی ئیعرابدا هیچ حەرەکەتێکیان بۆ زیاد نەکراوە، بەڵکوو ئیعرابیان بە «أَلِف» و «وَاو» و «يَاء» دەبێت، لەبەر چی؟ **(لِئَلَّا يَزْدادَ الثِّقْلُ عَلَى الثِّقْلِ)**[1] بۆ ئەوەی قوڕساییەکی تر کە «إِعْراب بالحركة»ـە بۆ سەر قورسایی

---

١. هەروەها دەکرێت لە وەڵامی ئەم پرسیارە بگوترێت: بۆیە ئەم شەش ئیسمانە ئیعرابیان بە حرووفانە، چونکە ئەم شەش ئیسمانە هەم لە ڕووی «لَفظ» و هەم لە ڕووی ماناوە دەشوبهێنە «مُثَنَّى»، یەکەم: لە ڕووی «لفظ»ـەوە، چونکە ئەم شەش ئیسمە ئەگەر ئیعرابیان بە حرووفان بێت، بەردەوام «إِضَافَة» دەکرێن بۆ لای غەیری خۆیان و «مُضاف» و «مُضافُ إِلَيْه»ـیش بە دوو شتی جیا حیساب دەکرێت. دووەم: لە ڕووی ماناوە (مَعْنى)، چونکە هەر یەکە لەم شەش ئیسمانە ناوێکی‌تر لە قەزا دەخوازێت، بۆ نموونە وشەی «أَبُوه» کوڕ لە قەزا دەخوازێت، هەروەها وشەی «أَخُوه» برایەکی‌تر لە قەزا دەخوازێت و وشەکانی‌تریش بە هەمان شێوەیە، سەرنجیان بدە. بڕوانە: شرح الكافية. (١/٧٥) و حاشية الصّبان (١/١٠٨).

**وَإِنَّمَا قَالَ: «مُضَافَةً»: لِأَنَّهَا إِنْ كَانَتْ غَيْرَ مُضَافَةٍ، يَكُونُ إِعْرَابُهَا بِالْحَرَكَاتِ لَفْظاً، نَحْوُ: «جَاءَنِي أَبٌ» وَ «رَأَيْتُ أَباً» وَ «مَرَرْتُ بِأَبٍ».**

**وَإِنَّمَا قَالَ: «إِلَىٰ غَيْرِ يَاءِ الْمُتَكَلِّمِ»: لِأَنَّهَا إِذَا أُضِيفَتْ إِلَىٰ يَاءِ الْمُتَكَلِّمِ يَكُونُ إِعْرَابُهَا بِالْحَرَكَاتِ تَقْدِيراً، نَحْوُ:**

---

ئەم شەش ئیسمە زیاد نەبێت، کە بە هۆی ماناکەیانەوە بۆیان دروست بووە.

ئینجا ئەگەر کەسێک سەبارەت بە مەرجی یەکەم پرسیار بکات و بڵێت: **(وَإِنَّما قَالَ مُضافَةً)** بۆچی مامۆستا گوتی: ئەم شەش ئیسمانە بەم مەرجە ئیعڕابیان بە حرووفان دەبێت، ئەگەر بێت و «إِضافَة» بکرێن، **(لأَنَّها إِنْ كانَتْ غَيْرَ مُضافَةٍ)** چونکە ئەگەر بێت و «إِضافَة» نەکرێن بۆ لای ئیسمێکیتر **(يَكُونُ إِعْرابُها بِالْحَرَكاتِ لَفْظاً)** ئەوکاتە ئیعڕابیان بە «حَرَكَة»ی «لَفْظ»ـی دەبێت **(نَحْوُ:)** وەکوو ئەم نموونەیە **(جَاءَنِي أَبٌ)** لە حاڵەتی ڕەفعەدا، **(وَ)** هەروەها وەکوو **(رَأَيْتُ أَباً)** لە حاڵەتی نەسبەدا، **(وَ)** هەروەها وەکوو **(مَرَرْتُ بِأَبٍ)** لە حاڵەتی جەڕڕەدا. هەروەها سەرنجی ئەم نموونانە بدە: لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ لَهُۥٓ أَبًا شَيْخًا كَبِيرًا﴾ [یوسف:٧٨]، یاخود ﴿وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ﴾ [النساء١٢]، یاخود ﴿فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَّهُۥ مِن قَبْلُ﴾ [یوسف:٧٨]، لەم نموونە چونکە وشەی «أب» و «أخ» چونکە «إضافة» نەکراون، ئیعڕابیان بە حەرفانە.

هەروەها سەبارەت بە مەرجی دووەم ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: **(وَإِنَّما قَالَ)** بۆچی مامۆستا گوتی ئەم شەش ئیسمانە بەم مەرجە ئیعڕابیان بە حرووفان دەبێت کە نابێت «إضافة»کردنەکەیان **(إِلى غَيْرِ ياءِ الْمُتَكَلِّمِ)** بۆ لای «ياءُ الْمُتَكَلِّمِ» بێت؟ **(لأَنَّها إِذا أُضِيفَتْ إِلَى ياءِ الْمُتَكَلِّمِ يَكُونُ إِعْرابُهَا بِالْحَرَكاتِ تَقْدِيراً)** چونکە ئەگەر بێت و هەر ئیسمێک لەم شەش ئیسمانە یاخود هەر وشەیەکیتر «إِضافَة» بکرێت بۆ لای «ياءُ الْمُتَكَلِّمِ»، لە هەرسێ حاڵەتدا ئیعڕابەکەی[1] بە حەرەکاتی تەقدیری دەبێت، ئەوە یاسایەکی گشتییە **(نَحْوُ)** وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت:

---

١. بڕوانە: شرح المفصل: (١/١٥١) وشرح شذور الذهب: (٥٩) وابن عقيل (١/٤٩).

**«جَاءَنِي أَبِي» وَ «رَأَيْتُ أَبِي» وَ «مَرَرْتُ بِأَبِي».**

**وَفِيهَا قَيْدَانِ آخَرَانِ: الْأَوَّلُ: أَنْ تَكُونَ مُكَبَّرَةً؛ لِأَنَّهَا إِنْ كَانَتْ مُصَغَّرَةً يَكُونُ إِعْرَابُهَا بِالْحَرَكَاتِ لَفْظاً،**

---

(**جَاءَنِي أَبِي**) لە حاڵەتی ڕەفعەدا، سەرنج بدە: لێرەدا وشەی «أَبِي» «تَقْدِيراً مَرْفُوع» فاعیلە بۆ وشەی «جاء»، چونکە «إضافة» کراوە بۆ لای «ياءُ الْمُتَكَلِّم»، (**وَ**) هەروەها وەکوو (**رَأَيْتُ أَبِي**) لە حاڵەتی نەسبەدا، لێرەدا وشەی «أَبِي» لە تەقدیردا «مَنْصُوب» بووە و بووە بە «مَفْعُولُ بِهِ» بۆ «رَأَيْتُ»، چونکە «إضافة» کراوە بۆ لای «ياءُ الْمُتَكَلِّم»، (**وَ**) هەروەها وەکوو (**مَرَرْتُ بِأَبِي**) لە حاڵەتی جەڕەدا، لێرەدا وشەی «أَبِي» لە تەقدیردا «مَجْرُور» بووە، چونکە «إضافة» کراوە بۆلای «ياءُ الْمُتَكَلِّم»، کەواتە: هەر یەکە لەم شەش وشانە ئەگەر «إِضافَة» بکرێن بۆ لای «ياءُالْمُتَكَلِّم» لە هەرسێ حاڵەتدا ئیعرابەکەیان بە «حَرَكات»ی تەقدیری دەبێت، ئەمە یاسایەکی گشتییە.

سەرنجی ئەم نموونانە بدە: لە قورئانی پیرۆز خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ أَنَا۠ يُوسُفُ وَهَٰذَآ أَخِيۖ﴾ [يوسف:٩]، یاخود ﴿إِنَّ هَٰذَآ أَخِي﴾ [ص:٢٣]، یاخود ﴿فَأَلْقُوهُ عَلَىٰ وَجْهِ أَبِي﴾ [يوسف:٩]، لەم نموونانەدا وشەی «أَبِي» و «أَخِي» چونکە «إِضافَة» کراون بۆ لای «ياءُ المتكلّم» ئیعرابیان «تَقْدِيرِي»یە.

پاش باسکردنی ئەم دوو مەرجە، ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: (**وَفِيها قَيْدانِ آخَرَانِ**) بۆ ئەوەی ئەم شەش ئیسمە ئیعرابیان بە حرووفان بێت، دوو مەرجیتریش هەن:

**مەرجی سێیەم**: بۆ ئەوەی ئەم شەش ئیسمە ئیعرابیان بە حرووفان بێت ـ کە لێرەدا دەکاتە (**أَلأَوَّلُ:**) بڕگەی یەکەم لەم دوو بڕگەیە ـ بریتییە لەوەی کە (**أَنْ تَكُونَ مُكَبَّرَةً**) دەبێت ئەم شەش ئیسمانە هەروەکوو خۆیان بە «مُكَبَّر»ی بمێننەوە و نابێت «تَصْغِير» بکرێن (**لأَنَّها إِنْ كَانَتْ مُصَغَّرَةً**) چونکە ئەگەر ئەم شەش ئیسمە «تَصْغِير» بکرێن (**يَكُونُ إِعْرابُها بِالْحَرَكاتِ لَفْظاً**)[1] ئەو کاتە ئیعرابیان بە «حَرَكَة»ی «لَفْظِي»ی

---

١. بڕوانە: شرح قطر النّدى و بلّ الصّدى: ل، ٦٣، شرح شذور الذهب: (٥٩) بڕوانە: ابن عقيل (٤٩/١) والإنصاف في مسائل الخلاف: (٢٤/١).

**نَحْوُ: «جَاءَنِي أُبَيُّهُ» وَ «رَأَيْتُ أُبَيَّهُ» وَ «مَرَرْتُ بِأُبَيِّهِ».**

**وَالثَّانِي: أَنْ تَكُونَ مُفْرَدَةً؛ لِأَنَّهَا إِنْ كَانَتْ تَثْنِيَةً، يَكُونُ إِعْرَابُهَا بِالْحُرُوفِ، لٰكِنْ لَا بِجَمِيعِهَا بَلْ بِبَعْضِهَا، نَحْوُ: «جَاءَنِي أَبَوَانِ» وَ «رَأَيْتُ أَبَوَيْنِ» وَ «مَرَرْتُ بِأَبَوَيْنِ».**

---

دەبێت، (**نَحْوُ**) وەکوو ئەم نموونانەی خوارەوە: (**جَاءَنِي أُبَيُّهُ**) لە حاڵەتی ڕەفعەدا، (**وَ**) هەروەها وەکوو (**رَأَيْتُ أُبَيَّهُ**) لە حاڵەتی نەسبەدا، (**وَ**) هەروەها وەکوو (**مَرَرْتُ بِأُبَيِّهِ**) لە حاڵەتی جەڕڕەدا. **سەرنج بدە:** لێرەدا وشـەی «أُبَيُّهُ» لە هەرسێ حاڵەتدا ئیعڕابی بە حەرەکەی «لَفْظِي»ـیە، چونکە «تَصْغِير» کراوە؛ کەواتە: هەریەکە لەم شەش وشانە ئەگەر «تَصْغِير» بکرێن لە هەرسێ حاڵەتدا ئیعڕابەکەیان بە «حَرَكَات»ـی «لَفْظِي»ـی دەبێت، ئەمە یاسایەکی گشتییە.

**مـەرجی چـوارەم:** بۆ ئـەوەی ئـەم شـەش ئیسـمە ئیعڕابیان بـە حرووفـان بێت ـ کە لێرەدا دەکاتە (**وَالثَّانِي**) بڕگەی دووەم لەم دوو بڕگەیە ـ بریتییە لەوەی کە (**أَنْ تَكُونَ مُفْرَدَةً**) دەبێـت ئـەم شـەش ئیسـمانە تاک بن، نابێت بکرێنـە «تَثْنِيَة» و نابێت بکرێنە «جَمْع».

(**لِأَنَّها إِنْ كَانَتْ تَثْنِيَةً**) چونکە ئەگەر بێت و ئەم شەش ئیسمە بکرێن بە «تَثْنِيَة» (**يَكُونُ إِعْرابُها بِالْحُروفِ**) ئـەو کاتـە ئیعڕابیـان وەکـوو ئیعڕابـی «مُثَنَّى» بە حرووفان دەبێـت (**وَلَكِنْ لا بِجَمِيعِها**) بـەڵام ئیعڕابیـان بـە هەرسێ حەرفـان نابێـت کـە بریتین لـە «واو» و «ألـف» و «يـاء»، (**بَلْ بِبَعْضِها**) بەڵکـوو بەشـێک لـەم حەرفانـە دەبێت کە بریتین لە «أَلِف» لە حاڵەتی ڕەفعەدا، هەروەها «یاء» لە حاڵەتی نەسـبە و لە حاڵەتی جەڕڕەدا، (**نَحْوُ**) وەکوو ئەم نموونانەی خوارەوە: (**جَاءَنِي أَبَوانِ**) لە حاڵەتی ڕەفعەدا، (**وَ**) هەروەها وەکوو (**رَأَيْتُ أَبَوَيْنِ**) لە حاڵەتی نەسبەدا، (**وَ**) هەروەها وەکوو (**مَرَرْتُ بِأَبَوَيْنِ**) لە حاڵەتی جەڕڕەدا.

° °

**وَ إِذَاكَانَتْ جَمْعاً يَكُونُ إِعْرَابُهَا إِمَّا بِبَعْضِ الْحُرُوفِ؛ وَذٰلِكَ إِذَاكَانَتْ جَمْعَ مُصَحَّحٍ، نَحْوُ: «جَاءَنِي أَبُوْنَ» وَ «رَأَيْتُ أَبِيْنَ» وَ «مَرَرْتُ بِأَبِيْنَ»؛ وَ إِمَّا بِتَمَامِ الْحَرَكَاتِ؛ وَذٰلِكَ إِذَا كَانَتْ جَمْعَ مُكَسَّرٍ، نَحْوُ: «جَاءَنِي آبَاءٌ» وَ «رَأَيْتُ آبَاءً» وَ «مَرَرْتُ بِآبَاءٍ».**

---

**(وَ إِنْ كانَتْ جَمْعاً)** هەروەها ئەگەر بێت و ئەم شەش ئیسمە بکرێن بە «جَمْع» **(يَكُونُ إِعْرابُها)** ئەو کاتە ئیعرابەکەیان لە دوو حاڵەت بەدەر نییە:

**حاڵەتی یەکەم: (إمّا بِبَعْضِ الْحُروفِ)** یاخود ئیعرابەکەیان بە بەشێک لەم حەرفانە دەبێت، **(وَذَلِكَ إذا كَانَ جَمْعَ مُصَحَّحٍ)** ئەمەش لە کاتێکدایە ئەگەر بێت و ئەم شەش ئیسمە بکرێن بە «جمع المذکّر السّالم»، ئەوکاتە ئیعرابیان بە دوو حەرفان دەبێت، واتە: «واو» لە حاڵەتی ڕەفعەدا، هەروەها «یاء» لە حاڵەتی نەسبە و جەڕڕەدا.

**(نَحْوُ)** وەکوو ئەم نموونانەی خوارەوە: **(جَاءَنِي أَبُونَ)** لە حاڵەتی ڕەفعەدا، **(وَ)** هەروەها وەکوو **(رَأَيْتُ أَبِيْنَ)** لە حاڵەتی نەسبەدا، **(وَ)** هەروەها وەکوو **(مَرَرْتُ بِأَبِيْنَ)** لە حاڵەتی جەڕڕەدا.

**حاڵەتی دووەم: (وَ إمّا بِتَمَامِ الْحَرَكاتِ)** یاخود ئیعرابەکەیان بە تەواوی حەرەکاتە **(وَذَلِكَ إذا كانَتْ جَمْعَ مُكَسَّرٍ)** ئەمەش لە کاتێکدایە ئەگەر بێت ئەم شەش ئیسمانە «جَمْعُ التَّكْسِير» بن، واتە: حاڵەتی ڕەفعەیان بە «ضَمَّة»یە **(نَحْوُ:)** وەکوو **(جَاءَنِي آباءٌ، وَ)** هەروەها حاڵەتی «نَصْب»یان بە «فَتْحَة»یە وەکوو **(رَأَيْتُ أَباءً، وَ)** هەروەها حاڵەتی «جَرّ»یان بە «كَسْرَة»یە وەکوو **(مَرَرْتُ بِآباءٍ)**.

**ئینجا بزانە:** ئەو چوار مەرجەی کە باسمانکردن بۆ هەر شەش ئیسمەکە بوو بە شێوەیەکی گشتی بەڵام وشەی «ذو» ئەو کاتە ئیعرابی بە حەرفان دەبێت کە دەبێت ئەم دوو مەرجەی تێدا بێت:

**یەکەم:** دەبێت وشەی «ذو» بە مانای «صَاحِب»[1] بێت، چونکە ئەگەر وشەی

---

١. **ئینجا بزانە:** جیاوازی نێوان وشەی «ذُو» لەگەڵ وشەی «صَاحِب» بریتییە لەوەی کە لە وشەی «ذُو» دەبێت «مُضافُ إِلَيْهِ» ڕێزدارتر بێت لە وشەی «مُضاف»، بەڵام لە وشەی «صَاحِب» وانییە، بۆیە دەگوترێت: ﴿ذُو ٱلْعَرْشِ ٱلْمَجِيدُ﴾ بەڵام ناگوترێت: «صَاحِبُ الْعَرْشِ الْمَجِيد». بڕوانە: شرح ☜

..............................................................................................................

«ذو» به ماناى «اَلّذِي»[1] بێت، ئەوكاتە دەبێتە «مَبْنِي» و ئیعڕابى بە حەرفان نابێت.

**دووەم:** دەبێت وشەى «ذو» پاڵبدرێت «إِضَافَة» بكرێت بۆ لاى «اِسْمُ الْجِنْس»ـێكى ئاشكرا، وە هەروەها نابێت «صِفَة» بێت وەكوو «مُحَمَّدٌ ذُو فَضْلٍ» و «عُمَرُ ذُو عَدْلٍ» و «عَلِيٌّ ذُو جَاهٍ».

*◌*

☞ الأنموذج: بتعليق أنور بن أبى بكر الشيخيّ الداغستانيّ ٨٥.

١. بڕوانە: شرح قطر النّدى و بلّ الصّدى: ل، ٦٣، شرح ابن عقيل (٤٩/١) والإنصاف فى مسائل الخلاف: (٢٤/١).

**قَالَ: وَفِي «كِلَا» مُضَافاً إِلَىٰ مُضْمَرٍ، نَحْوُ: «جَاءَنِي كِلَاهُمَا» وَ «رَأَيْتُ كِلَيْهِمَا» وَ «مَرَرْتُ بِكِلَيْهِمَا».**

**أَقُولُ: لَمَّا ذَكَرَ الْمَوْضِعَ الْأَوَّلَ مِنَ الْمَوَاضِعِ الْأَرْبَعَةِ الَّتِي يَكُونُ الْإِعْرَابُ فِيهَا بِالْحُرُوفِ، أَرادَ أَنْ يَذْكُرَ الْمَوْضِعَ الثَّانِيَ، وَهُوَ: «كِلَا» لِلْمُذَكَّرِ، وَكَذٰلِكَ**

## وانەی دەهەم: باسی ئیعرابی «كِلا» و «كِلْتا»

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» دەفەرموێت: (وَفِي كِلا)[٢] یەکێکی تر لەم شوێنانەی کە ئیعرابیان بە حرووفانە بریتییە لە وشەی «كِلا» و وشەی «كِلْتا»، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی نا، بەڵکوو بەم مەرجەی کە ئەم دوو وشەیە (مُضافاً إِلَى مُضْمَرٍ) کە «إِضافَة» بکرێن بۆ لای ئیسمێکی «مُضْمَر» (نَحْوُ) وەکوو ئەم نموونانە: (جَاءَنِي كِلاهُما) لە حاڵەتی ڕەفعەدا، (وَ) هەروەها وەکوو (رَأَيْتُ كِلَيْهِما) لە حاڵەتی نەسبەدا، (وَ) هەروەها وەکوو (مَرَرْتُ بِكِلَيْهِما) لە حاڵەتی جەڕڕەدا.

(أَقُولُ:) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (لَمّا ذَكَرَ الْمَوْضِعَ الأَوَّلَ) لەپاش ئەوەی مامۆستا باسی شوێنی یەکەمی کرد (مِنَ الْمَواضِعِ الأَرْبَعَةِ الَّتِي يَكُونُ فِيها الإِعْرابُ بِالْحُروفِ) لەم شوێنانەی کە ئیعرابیان بە حرووفانە کە بریتی بوو لە «أَسْماءُ السِّتَّة» (أَرادَ أَنْ يَذْكُرَ الْمَوْضِعَ الثّانِيَ) ویستی باسی بابەتی دووەم بکات کە بریتین لە دوو وشە (وَهُوَ كِلا) وشەی یەکەم بریتییە لە وشەی «كِلا» (لِلْمُذَكَّرِ) کە بۆ دەلالەتکردنە لەسەر دوو شت، لە ڕەگەزی نێر بەکار دێت (وَكَذلِكَ

٢. ئینجا بزانە: ئەم «أَلِف»ـەی لە کۆتایی وشەی «كِلَا» هەیە نە «أَلِفُ التَثْنِيَة»یە نە «أَلِفُ التَّأْنِيث»ـە، بەڵکوو لە ئەسڵدا «وَاو» بووە، چونکە وشەی «كِلَا» لە ئەسڵدا «كِلَوِي» بووە، هەروەها وشەی «كِلْتَا» لە ئەسڵدا «كِلْو» بووە، «قَلْب»ی «واو»ەکە کراوە بە «تاء» هەروەکوو لە وشەی «وُكْلانٌ» و «وُخَمَةٌ» کراون بە «تُكْلان» و بە «تُخَمَة»، ئەمە بۆچوونی «بەسرییەکان»ـە بەڵام «کووفییەکان» دەفەرموون: وشەی «كِلَا» لە ئەسڵدا «كُلّ» بووە، پاشان «تَخْفِيف» کراوە و «أَلِفُ التَّثْنِيَة»ی بۆ زیاد کراوە، هەروەکوو لە وشەی «كِلْتَا» «تاء»ێک زیاد کراوە بۆ ئەوەی دەلالەت لەسەر «التَّأْنِيث» بکات.
بڕوانە: الإنصاف في مسائل الخلاف: ٣٥٩ وشرح الأنموذج: ٨٥.

**«كِلْتَا» لِلْمُؤَنَّثِ؛ فَإِنَّهُمَا إِذَا كَانَا مُضَافَيْنِ إِلَىٰ مُضْمَرٍ يَكُونُ إِعْرَابُهُمَا بِبَعْضِ الْحُرُوفِ، أَعْنِي: بِالْأَلِفِ فِي حَالَةِ الرَّفْعِ، وَبِالْيَاءِ فِي حَالَتَي النَّصْبِ وَالْجَرِّ، نَحْوُ: «جَاءَنِي الرَّجُلَانِ كِلَاهُمَا، وَالْمَرْأَتَانِ كِلْتَاهُمَا؛ وَرَأَيْتُ الرَّجُلَيْنِ كِلَيْهِمَا، وَالْمَرْأَتَيْنِ كِلْتَيْهِمَا؛ وَمَرَرْتُ بِالرَّجُلَيْنِ كِلَيْهِمَا، وَبِالْمَرْأَتَيْنِ كِلْتَيْهِمَا».**

كِلْتا) وە وشەی دووەم بریتییە لە وشەی «كِلْتا» (لِلْمُؤَنَّثِ) كە بۆ دەلالەتكردنە لەسەر دوو شت، لە ڕەگەزی مێ بەكاردێت. (فَإِنَّهما إذا كَانا مُضافَيْنِ) وشەی «كِلا» و «كِلْتا» ئەگەر بێت و «إِضافَة» بكرێن بەلام «إضافة»كردنەكە (إِلَى مُضْمَرٍ) بۆ لای ئیسمێكی «مُضْمَر» بوو (يَكُونُ إعْرابُهُما بِبَعْضِ الْحُروفِ) ئەو كاتە ئیعرابەكەیان بە هێندێك حرووفان دەبێت، نەك بە هەموو حەرفەكان (أَعْنِي بِالأَلِفِ فِي حالَةِ الرَّفْعِ) مەبەستم ئەوەیە كە وشەی «كِلا» و «كِلْتا» حاڵەتی ڕەفعەیان بە «ألف» دەبێت، (وَ) هەروەها (بالياء فِي حالَتَيْ النَّصْبِ وَالْجَرِّ) حاڵەتی نەسبە و جەڕڕەیان بە «یاء» دەبێت، وەكوو ئیسمی «مُثَنَّى»، (نَحْو:) وەكوو ئەم نموونەیە: (جَاءَنِي الرَّجُلانِ كِلاهُما) لە حاڵەتی ڕەفعەدا، (وَ) هەروەها وەكوو «جَاءَتْنِي (الْمَرْأَتانِ كِلْتاهُما)» لە حاڵەتی ڕەفعەدا، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «كِلا» و «كِلْتا» حاڵەتی ڕەفعەیان بە «أَلِف»ـە، (وَ) هەروەها وەكوو: (رَأَيْتُ الرَّجُلَيْنِ كِلَيْهِما) لە حاڵەتی نەسبەدا، (وَ) هەروەها وەكوو «رَأَيْتُ (الْمَرْأَتَيْنِ كِلْتَيْهِما)» لە حاڵەتی نەسبەدا، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «كِلا» و «كِلْتا» حاڵەتی نەسبەیان بە «یاء»ـە، (وَ) هەروەها وەكوو (مَرَرْتُ بِالرَّجُلَيْنِ كِلَيْهِما) لە حاڵەتی جەڕڕەدا، (وَ) هەروەها وەكوو «مَرَرْتُ بِـ (الْمَرْأَتَيْنِ كِلْتَيْهِما)[1]» لە حاڵەتی جەڕڕەدا، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «كِلا» و وشەی «كِلْتا» حاڵەتی جەڕڕەیان بە «یاء»ـە؛ **ئینجا بزانە:** وشەی «كِلا» و وشەی «كِلْتا» لە هەموو نموونەكانی ڕابوردوو دەبنە «تَأْكِيد» بۆ ئیسمی پێش خۆی، وە هەروەها ئیعرابیشی وەكوو ئیعرابی پێش خۆی دەبێت.

---

١. **ئینجا بزانە:** وشەی «كِلَا» و وشەی «كِلْتَا» تەنها بۆ لای ئیسمێكی «مَعْرِفَة» «إضافة» دەكرێن. بڕوانە: شرح الأنموذج:٨٧.

**وَ إِنَّمَا أُعْرِبَ «كِلَا وَكِلْتَا» بِالْحُرُوفِ: لِأَنَّهُمَا يُشَابِهَانِ التَّثْنِيَةَ مِنْ حَيْثُ الْمَعْنَىٰ وَاللَّفْظُ. أَمَّا الْمَعْنَىٰ: فَظَاهِرٌ؛ وَأَمَّا اللَّفْظُ: فَكَمَا أَنَّ فِي آخِرِ التَّثْنِيَةِ أَلِفاً وَنُوناً فِي حَالَةِ الرَّفْعِ، وَيَاءً وَنُوناً فِي حَالَتَي النَّصْبِ وَالْجَرِّ، فَكَذٰلِكَ «كِلَا وَكِلْتَا»؛ إِلَّا أَنَّهُمَا لَمَّا كَانَا دَائِمَي الْإِضَافَةِ لَمْ يَظْهَرْ نُونُهُمَا قَطُّ.**

**وَ إِنَّمَا قَالَ: «مُضَافاً إِلَىٰ مُضْمَرٍ»:**

## بۆچی ئیعرابی «كِلا» و «كِلْتا» بە حرووفانە؟

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بلێت: (**وَ إِنَّما أُعْرِبَ كِلا وَكِلْتا بِالْحُروفِ**) بۆچی ئیعرابی وشەی «كِلا» و وشەی «كِلْتا» بە حرووفانە؟، مامۆستا دەفەرموێت: (**لأَنَّهُمَا يُشابِهانِ التَّثْنِيَةَ**) چونکە هەردوو وشەی «كِلا» و «كِلْتا» دەشوبهێنە «تَثْنِيَة» (**مِنْ حَيْثُ الْمَعْنى وَاللَّفْظِ**) هەم لە ڕووی «اللّفظ» و هەم لە ڕووی «المَعْنَى»وە (**أَمّا الْمَعْنى فَظاهِرٌ**) ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: لە ڕووی مانا شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە هەردووکیان بۆ دوو شت بەکار دێن (**وَأَمّا اللَّفْظُ**) بەڵام سەبارەت بە لایەنی «اَللّفْظ»ـەوە (**فَكَما أَنَّ فِي آخِرِ التَّثْنِيَةِ أَلِفاً وَنُوناً**) چونکە چۆن لە کۆتایی «تَثْنِيَة» ئەلیف و نوونێک هەن (**فِي حَالَةِ الرَّفْعِ**) لە حاڵەتی ڕەفعەدا، (**وَياءً وَنُوناً**) هەروەها چۆن یاء و نوونێک هەن (**فِي حَالَتَيْ النَّصْبِ وَالْجَرّ**) لە حاڵەتی نەسبە و لە حاڵەتی جەڕڕەدا، (**فَكَذٰلِكَ كِلا وَكِلْتا**) بە هەمان شێوەش لە کۆتایی هەردوو وشەی «كِلا» و «كِلْتا»وە ئەلیف و نوونێک هەن لە حاڵەتی ڕەفعەدا، هەروەها یاء و نوونێک هەن لە حاڵەتی نەسبە و لە حاڵەتی جەڕڕەدا، (**إِلا أَنَّهُمَا لَمّا كَانا دائِمَيَ الإضافَةِ لَمْ يَظْهَرْ نُونهُما قَطُّ**)[1] بەڵام چونکە وشەی «كِلا» و «كِلْتا» بەردەوام «إِضافَة» دەکرێن بۆ لای ئیسمێکیتر، بۆیە ئەم «نُون»ـەی لە کۆتایی ئەم دوو وشەدا هەیە، هەرگیز دەرناکەوێ.

---

١. بڕوانە: شرح قطر النّدى و بلّ الصّدى: ل، ٦٥، شرح شذور الذهب: (٦٦) بڕوانە: شرح ابن عقيل (٥٥/١) والإنصاف في مسائل الخلاف: (٢٧/١).

**لِأَنَّهُمَا إِذَا أُضِيفَا إِلَى الْمُظْهَرِ، يَكُونُ إِعْرَابُهُمَا بِالْحَرَكَاتِ تَقْدِيراً، نَحْوُ: «جَاءَنِي كِلَا الرَّجُلَيْنِ، وَكِلْتَا الْمَرْأَتَيْنِ؛ وَرَأَيْتُ كِلَا الرَّجُلَيْنِ، وَكِلْتَا الْمَرْأَتَيْنِ؛ وَمَرَرْتُ بِكَلَا الرَّجُلَيْنِ، وَبِكِلْتَا الْمَرْأَتَيْنِ».**

---

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: **(وَ إِنَّما قَالَ: مُضافاً إِلَى مُضْمَرٍ)** بۆچی ماموستا لە «مَتْن»ـەکەدا گوتی: ئەو کاتە ئیعرابی وشەی «کِلا» و وشەی «کِلْتا» بە حرووفانە، ئەگەر بێت و «إضافة» بکرێن بۆ لای ئیسمێکی «مُضْمَر»؟ ماموستا دەفەرموێت: **(لأَنَّهُما إذا أُضِيفَا إِلَى مُظْهَرٍ)** چونکە ئەگەر بێت و وشەی «کِلا» و «کِلْتا» «إضافة» بکرێن بۆ لای ئیسمێکی «مُظْهَر» **(يَكُونُ إِعْرابُهُمَا بِالْحَرَكَاتِ تَقْدِيراً)**[1] ئەو کاتە ئیعرابی وشەی «کِلا» و وشەی «کِلْتا» بە «حَرَكَة»ی «تَقْدِيري» دەبێت لە هەرسێ حاڵەتدا **(نَحْو:)** وەکوو ئەم نموونەیە: **(جَاءَنِي كِلَا الرَّجُلين)** لە حاڵەتی ڕەفعەدا. **(وَ)** هەروەها وەکوو «جَاءَتْنِي **(كِلْتا الْمَرْأَتَيْنِ)**» لە حاڵەتی ڕەفعەدا، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «کِلا» و «کِلْتا» حاڵەتی ڕەفعەیان بە «ضَمَّة»ـیەکی «تَقْدِيري»ـیە، چونکە «إضافة» کراون بۆ لای ئیسمێکی «مُظْهَر»؛ **(وَ)** هەروەها وەکوو **(رَأَيْتُ كِلَا الرَّجُلَيْنِ)** لە حاڵەتی نەسبەدا، **(وَكِلْتَا الْمَرْأَتَيْنِ)** لە حاڵەتی نەسبەدا، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «کِلا» و وشەی «کِلْتا» حاڵەتی نەسبەیان بە «فَتْحَة»یەکی «تَقْدِيري»ـیە، چونکە «إضافة» کراون بۆ لای ئیسمێکی «مُظْهَر»، **(وَ)** هەروەها وەکوو **(مَرَرْتُ بِكِلا الرَجُلَيْنِ)** لە حاڵەتی جەڕڕەدا، **(وَ بِـ كِلْتَا الْمَرْأَتَيْنِ)** لە حاڵەتی جەڕڕەدا، **سەرنج بدە: لەم نموونەیەش** وشەی «کِلا» و «کِلْتا» حاڵەتی جەڕڕەیان بە «كَسْرَة»یەکی «تَقْدِيري»ـیە، چونکە «إضافة» کراون بۆ لای ئیسمێکی «مُظْهَر».

**«ئاگاداری» یەکەم:** هەردوو وشەی «کِلا» و «کِلْتا» بە «مُثَنّىٰ»ی حەقیقی حیساب ناکرێن بەڵکوو، «مُلْحَق»ـن بە «مُثَنَّى»، بۆیە وەکوو «مُثَنَّى» ئیعراب دەکرێن، چونکە «بَصْري»ـیەکان دەفەرموون: «کِلا» و «کِلْتا» لە «لَفْظ»ـدا «مُفْرَد»ن بەڵام لە ماناد

---

[1] بڕوانە: النحو الوافي: (١٠٥/١) و همع الهوامع: (١٣٥/١) وشرح شذور الذهب: (٦٦) بڕوانە: شرح ابن عقيل (٥٩/١) والإنصاف فى مسائل الخلاف: (٣٧/١).

................................................................................

«مُثَنّی»ن، بۆیە لە «لَفْظ»ـدا دەشوبهێنە «مُفْرَد» و لە ماناشدا دەشوبهێنە «مُثَنّی»؛ بۆیە ئەگەر «إِضَافَة» بکرێن بۆ لای ئیسمێکی «مُضْمَر»، وەکوو «مُثَنّی» ئیعراب دەکرێن، ئەگەر «إِضَافَة» بکرێن بۆ لای ئیسمێکی «مُظْهَر»، وەکوو «مُفْرَد» ئیعراب دەکرێن[١].

بەڵام زانایانی مەدرەسەی «کوفة»[٢] دەفەرموون هەردوو وشەی «کِلا» و «کِلْتا» بە «مُثَنّی»ی حەقیقی حیساب دەکرێن و هەردوو وشەکان «تَثْنِیَة»ی وشەی «کُلّ»ـن، ئەو «أَلِف»ـەی لە کۆتایی هەردوو وشەکەدا هاتووە، ئەلیفی «مُثَنّی»یە، بەڵام «نون»ـەکەی لە هەرسێ حاڵەتی «إِعْراب»ـدا لە بەر «إضافة» کردن «حَذْف» کراوە و بە دیار ناکەوێت.

**دووەم:** هەرکاتێک «ضَمیر»ێک بگەڕێتەوە و «راجِع» بێت بۆ لای وشەی «کِلا» و وشەی «کِلْتا»، دروستە «ضمیر»ەکە موفرەد بێت بە ئیعتیباری «لَفْظ»ـی وشەی «کِلا» و «کِلْتا»، وەکوو ﴿ كِلْتَا ٱلْجَنَّتَيْنِ ءَاتَتْ أُكُلَهَا﴾[٣]، هەروەها دروستە «ضَمیر»ەکە «مُثَنّی» بێت بە ئیعتیباری مانای «کِلا» و «کِلْتا»، چونکە ئەم دوو وشەیە لە مانادا «مُثَنّیٰ»ن[٤].

* ◌ *

---

١. بڕوانە: ، شرح کافیة ابن الحاجب (٧٩/١) و شرح قطر النّدی و بلّ الصّدی: ل، (٦٥)

٢. بڕوانە: شرح شذور الذهب: (٦٦) و شرح ابن عقیل (٥٩/١) والإنصاف فی مسائل الخلاف: (٣٧/١).

٣. الکهف: ٢٣

٤. لە ڕاستیدا بۆچوونی زانایانی «بَصري»ـیەکان بەهێزترە چونکە وشەی «کِلا» و «کِلْتا» ئەگەر «إضافة»ش نەکرێن تاوەکوو ئێستا کەس «نون»ـی لە کۆتاییدا نەبینیون. نووسەر.

**قَالَ: وَفِي التَّثْنِيَةِ وَالْجَمْعِ الْمُصَحَّحِ، نَحْوُ: «جَاءَنِي مُسْلِمَانِ وَمُسْلِمُونَ، وَرَأَيْتُ مُسْلِمَيْنِ وَمُسْلِمِينَ، وَمَرَرْتُ بِمُسْلِمَيْنِ وَمُسْلِمِينَ».**

**أَقُولُ: لَمَّا بَيَّنَ الْمَوْضِعَ الثَّانِيَ مِنَ الْمَوَاضِعِ الْأَرْبَعَةِ، شَرَعَ فِي بَيَانِ الْمَوْضِعِ الثَّالِثِ وَالرَّابِعِ،**

---

## وانەی یازدەهەم: باسی ئیعرابی «اَلْمُثَنّىٰ» و «جَمْعُ الْمُذكَّرِ السَّالِمِ»

(قالَ:) مامۆستا «جار اللّه» زەمەخشەری دەفەرموێت: (وَفِي التَّثْنِيَةِ) یەکێکی تر لەم شوێنانەی کە «إعراب»ـی بە حەرفانە بریتییە لە «مُثَنَّى»، (وَ) هەروەها بریتییە لە «جَمْعُ الْمُذكَّرِ السَّالِمِ» کە پێی دەگوترێت: (الْجَمْعُ الْمُصَحَّحُ)[1]، (نَحْوُ:) وەکوو ئەم نموونانە: (جَاءَنِي مُسْلِمانِ) لە حاڵەتی ڕەفعەدا، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «مُسْلِمانِ» «تَثْنِيَة»یە، حاڵەتی ڕەفعەی بە «ألف»ـە (وَ) هەروەها وەکوو وشەی (مُسْلِمُونَ) لە حاڵەتی ڕەفعەدا، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «مُسْلِمونَ» «جَمْع الْمُذكَّر السَّالِم»ـە و حاڵەتی ڕەفعەی بە «واو»ە، (وَ) هەروەها وەکوو وشەی (رَأَيْتُ مُسْلِمَيْنِ) لە حاڵەتی نەسبەدا، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «مُسْلِمَيْنِ» «تَثْنِيَة»یە و حاڵەتی نەسبەی بە «ياء»ـە، (وَ) هەروەها وەکوو وشەی (مُسْلِمِينَ) کە «جَمْعُ الْمُذكَّرُ السَّالِمُ»ـە، سەرنج بدە: ئەم وشەیە حاڵەتی نەسبەی بە «ياء»ـە. (وَ) هەروەها وەکوو وشەی (مَرَرْتُ بِمُسْلِمَيْنِ) لە حاڵەتی جەڕڕەدا، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «مُسْلِمَيْنِ»، «تَثْنِيَة»یە و حاڵەتی جەڕڕەی بە «ياء»ـە، (وَ) هەروەها وەکوو وشەی (بِمُسْلِمِينَ) کە «جَمْعُ الْمُذكَّرُ السَّالِم»ـە و حاڵەتی جەڕڕەی بە «ياء»ـە.

(أَقُولُ:) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (لَمَّا بَيَّنَ الْمَوْضِعَ الثَّانِيَ) لە پاش ئەوەی مامۆستا باسی شوێنی دووەمی ڕوون کردەوە (مِنَ الْمَواضِعِ الأَرْبَعَةِ) لەم چوار شوێنانەی کە ئیعرابیان بە حرووفانە کە بریتی‌بوو لە «كِلا» و «كِلْتا» (شَرَعَ فِي بَيانِ الْمَوْضِعِ الثَّالِثِ وَالرَّابِعِ) دەستی کرد بە ڕوونکردنەوەی

---

١. بڕوانە: ، شرح ابن عقيل،(١/ ٦١) وشرح كافية ابن الحاجب (٧٩/١) وأسرار العربية: ٦٥ و شرح قطر النّدى و بلّ الصّدى: ل، (٦٨)

**وَهُمَا: التَّثْنِيَةُ وَالْجَمْعُ الْمُصَحَّحُ، فَإِنَّ إِعْرَابَهُمَا أَيْضاً يَكُونُ بِالْحُرُوفِ، وَلٰكِنْ بِبَعْضِهَا، أَعْنِي: بِالأَلِفِ فِي رَفْعِ التَّثْنِيَةِ، وَبِالْوَاوِ فِي رَفْعِ الْجَمْعِ، وَبِالْيَاءِ فِي نَصْبِهِمَا وَجَرِّهِمَا، نَحْوُ: «جَاءَنِي مُسْلِمَانِ، وَمُسْلِمُونَ؛ وَرَأَيْتُ مُسْلِمَيْن، وَمُسْلِمِيْنَ؛ وَمَرَرْتُ بِمُسْلِمَيْنِ،**

بابەتی سێیەم و چوارەم **(وَهُما التَّثْنِيَةُ)** کە بریتین لە باسکردنی ئیعرابی «مُثَنَّى» و**(وَ)** هەروەها باسکردنی ئیعرابی «اَلْجَمْعُ الْمُذكَّرُ السَّالِمِ» کە پێی دەگوترێت: **(الْجَمْعُ الْمُصَحَّحُ)** چونکە **(فَإِنَّ إِعْرابَهُما)** ئیعرابی «مُثَنَّى» و ئیعرابی «جَمْعُ الْمُذكَّرِ السَّالِمِ» **(أَيْضاً)** وەکوو ئیعرابی «الأَسْماءِ السِّتَّة» و ئیعرابی «كِلا» و «كِلْتا» **(يَكُونُ بِالْحُروفِ)** بە حرووفانە، کە بریتین لە «واو» و «ألف» و «ياء»، **(وَلَكِنْ بِبَعْضِها)** بەڵام ئیعرابی«مُثَنَّى» و «جَمْعُ الْمُذكَّرُ السَّالِم» بە تەواوی حەرفان نییە، بەڵکوو بە هێندێک لە حرووفانە، **(أَعْنِي بِالأَلِفِ فِي رَفْعِ التَّثْنِيَةِ)**[1] مەبەستم ئەوەیە حاڵەتی ڕەفعەی «مُثَنَّى» بە «أَلِف»ـە، **(وَ)** هەروەها **(بِالوَاوِ فِي رَفْعِ الْجَمْعِ)** حاڵەتی ڕەفعەی «جَمْعُ الْمُذكَّرِ السَّالِمِ» بە «واو»ە، **(وَ)** هەروەها **(بِالياءِ فِي نَصْبِهِما وَجَرِّهِما)** حاڵەتی نەسبە و جەڕڕەی «مُثَنَّى» و «جَمْعُ الْمُذكَّرِ السَّالِمِ» بە «ياء»ـە.

**(نَحْو:)** وەکوو ئەم نموونەیە: **(جَاءَنِي مُسْلِمانِ)** لە حاڵەتی ڕەفعەدا، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «مُسْلِمانِ» «تَثْنِيَة»یە و حاڵەتی ڕەفعەی بە ئەلیفە، **(وَ)** هەروەها وەکوو وشەی **(مُسْلِمُونَ)** لە حاڵەتی ڕەفعەدا، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «مُسْلِمونَ» «جَمْعُ الْمُذكَّرِ السَّالِمِ»ـە و حاڵەتی ڕەفعەی بە واوە، **(وَ)** هەروەها وەکوو وشەی **(رَأَيْتُ مُسْلِمَيْنِ)** لە حاڵەتی نەسبەدا، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «مُسْلِمَيْنِ» «تَثْنِيَة»یە و حاڵەتی نەسبەیان بە یائە، **(وَ)** هەروەها وەکوو وشەی **(مُسْلِمِينَ)** کە «اَلْجَمْعُ الْمُذكَّرُ السَّالِمِ»ـە حاڵەتی نەسبەی بە یائە، **(وَ)** هەروەها وەکوو وشەی **(مَرَرْتُ بِمُسْلِمَيْنِ)** لە حاڵەتی جەڕڕەدا، **سەرنج بدە:** لەم

---

١. بڕوانە: ، شرح ملا جامي: (٧٧) شرح ابن عقيل،(١/ ٦١) وشرح كافية ابن الحاجب (٧٩/١) وأسرار العربية: ٦٥ و شرح قطر النّدى و بلّ الصّدى: ل، (٦٨)

**وَبِمُسْلِمِيْنَ».**

**وَ إِنَّمَا أُعْرِبَ التَّثْنِيَةُ وَالْجَمْعُ الْمُصَحَّحُ بِالْحُرُوفِ؟ لِأَنَّهُمَا فَرْعَانِ لِلْمُفْرَدِ. وَالْإِعْرَابُ بِالْحُرُوفِ فَرْعٌ لِلْإِعْرَابِ بِالْحَرَكَاتِ. وَقَدْ أُعْرِبَ بَعْضُ الْمُفْرَدَاتِ بِالْحُرُوفِ، كَـ «الأَسْماءِ السِّتَّة»، فَلَوْ لَمْ يُعْرَبَا بِهَا لَلَزِمَ لِلْفَرْعِ مَزِيَّةٌ عَلَى الْأَصْلِ.**

---

نموونەیەدا وشـەی «مُسْلِمَيْنِ» «تَثْـنِيَة»یە و حاڵەتی جەڕڕەی بە یائە، (وَ) هەروەها وەکوو وشەی (بِمُسْلِمِينَ) کە «اَلْجَمْعُ الْمُذكَرُ السَّالِم)»ـە و حاڵەتی جەڕڕەی بە یائە.

## بۆچی ئیعرابی «مُثَنَّى» و «جَمْعُ الْمُذكَّرِ السَّالِم» بە حرووفانە؟

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات بڵێت: (**وَ إِنَّمَا أُعْرِبَ التَّثْنِيَةُ وَالْجَمْعُ الْمُصَحَّحُ بِالْحُرُوفِ؟**) بۆچی ئیعرابی «مُثَنَّى» و «جَمْعُ الْمُذكَّرِ السَّالِم» بە حرووفانە؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە دەفەرموێت: (**لأَنَّهُما فَرْعانِ لِلْمُفْرَدِ**)[1] چونکە «مُثَنَّى» و «جَمْعُ الْمُذكَّرِ السَّـالِم» هەردووکیـان بـە فـەرع حیسـاب دەکرێـن لەبۆ «مُفْـرَد»، لەبەر ئـەوەی هەموو وشـەیەکی «مُثَنَّـى» و «جَمْـع» لـە موفـرەد وەردەگیرێـن و دروسـت دەکرێـن، کەواتـە: «مُفْـرَد» دەبێتـە ئەسـڵ و «مُثَنَّى» و «الْجَمْع» دەبنە فـەرع. (**وَالإِعْرابُ بِالْحُروفِ فَرْعٌ لِلإِعْرابِ بِالْحَرَكاتِ**) هەروەهـا ئیعرابـی بـە حەرفـان فەرعـە بـۆ ئیعرابـی بـە حـەرەکان (**وَقَدْ أُعْرِبَ بَعْضُ الْمُفْرَداتِ بِالْحُروفِ**) ئینجا هێندێک لەم ئیسـمانەی کە موفرەدن ئیعرابیـان بـە حرووفانـە (**كَالأَسْماءِ السِّتَّة**) وەکـوو «أَسْـماءُ السِّـتَّة» کە باسـمانکردن (**فَلَوْ لَمْ يُعْرِبا بِهَا**) ئەگـەر ئیعرابـی «مُثَنَّـى» و «جَمْـعُ الْمُذكَّـرِ السَّـالِم» بـە حرووفـان نەبوایە، بەڵکوو بە حەرەکان بوایە (**لَلَزِمَ لِلْفَرْعِ مَزِيَّةٌ عَلَى الأَصْلِ**) ئەو کاتە لازم دەهات «فَـرْع» ـکـە بریتیـن لـە «مُثَنَّـى» و «جَمْـعُ الْمُذكَّـرِ السَّـالِم»ـ لـە «أَصْل» ـکـە بریتییە لە «أَسْـماءُ السِّـتَّة»ـ خسووسـیەت و مەرتەبەی زیاتر و شـیاوتر بێت، چونکە ناکرێت شـتێک ئەسـڵ بێـت تـۆ ئیعرابێکـی فەرعـی بدەیتـێ، هەروەهـا شـتێک فـەرع بێـت تۆ

---

١. بڕوانە: ، شرح ملا جامي: (٧٩) شرح ابن عقيل،(١/ ٦٥) وشرح كافية ابن الحاجب (١/٨٠) وأسرار العربية: ٦٧ و شرح قطر الندى و بلّ الصّدى: ل، (٦٩).

**وَ إِنَّمَا جُعِلَ إِعْرَابُهُمَا بِبَعْضِ الْحُرُوفِ؟ لِأَنَّ حُرُوفَ الْإِعْرَابِ ثَلَاثَةٌ: الْأَلِفُ وَالْوَاوُ وَالْيَاءُ، وَمَوَاضِعَهَا فِي التَّثْنِيَةِ وَالْجَمْعِ سِتَّةٌ: رَفْعُهُمَا وَنَصْبُهُمَا وَجَرُّهُمَا، فَيَلْزَمُ التَّوْزِيعُ بِالضَّرُورَةِ.**

---

ئیعرابێکی ئەسڵی بدەیتێ، کەواتە: «فَأُعْطِيَ الْفَرْعُ لِلْفَرْعِ»[1].

## بۆچی ئیعرابی «مُثَنَّى» و «اَلْجَمْعُ الْمُذكَرُ السَّالِم» بە «بَعضُ الحُروف»ـە؟

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات بڵێت: (وَ إِنَّما جُعِلَ إِعْرابُهُما بِبَعْضِ الْحُروفِ؟) بۆچی ئیعرابی «مُثَنَّى» و «جَمْعُ الْمُذكَّرِ السَّالِم» بە بەشێک لە حرووفانە؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە دەفەرموێت: (لأَنَّ حُروفَ الإِعْرابِ ثَلاثَةٌ:) چونکە ئەو حەرفانەی دەبنە نیشانەی ئیعرابێ سێ دانەن، کە بریتین لە (اَلأَلِفُ وَالواوُ وَالْياءُ) ئەلیف و واو و یاء، (وَمَواضِعُهُما فِي التَّثْنِيَةِ وَالْجَمْعِ سِتَّةٌ) وە ئەو شوێنانەی کە بۆی دیاری کراون لە «مُثَنَّى» و «جَمْعُ الْمُذكَّرِ السَّالِم» شەش شوێنن کە بریتین لە (رَفْعُهُما) حاڵەتی ڕەفعەی «مُثَنَّى» و «جَمْعُ الْمُذكَّرِ السَّالِم»، (وَ) هەروەها لە (نَصْبُهُما) حاڵەتی نەسبەی هەردووکیان، (وَ) هەروەها بریتییە لە (جَرُّهُما) حاڵەتی جەڕڕەی هەردووکیان (فَيَلْزَمُ التَوْزِيعُ بِالضَّرُورَةِ) کەواتە: بە ناچاری پێویست بوو لە سەرمان کە ئەم سێ حەرفە (ئەلیف و واو و یاء) کە نیشانەی ئیعرابن، دابەش بکەین بەسەر هەردووکیاندا، چونکە ئەگەر حاڵەتی «رَفْع»ـەی «مُثَنَّى» و «جَمْعُ الْمُذكَّرِ السَّالِم» بە «واو» بێت و حاڵەتی نەسبەی هەردووکیان بە «ألف» بێت و حاڵەتی جەڕڕەی هەردووکیان بە «یاء» بێت، ئەو کاتە هیچ جیاوازییەک نامێنێت لە نێوان «مُثَنَّى» و «جَمْعُ الْمُذكَّرِ السَّالِم» لەگەڵ «أَسْماءُ السِّتَّة».

هەروەها ئەگەر بێت و حاڵەتی ڕەفعەی «مُثَنَّى» و «جَمْعُ الْمُذكَّرِ السَّالِم» بە «ئەلیف» بێت، وە یاخود حاڵەتی ڕەفعەی هەردووکیان بە «واو» بێت، ئەو کاتە

---

١. بڕوانە: علل النحو: (٢٣٤) وشرح ملا جامي: (٧٧) شرح ابن عقيل،(١/ ٦١) وشرح كافية ابن الحاجب (٧٥/١) وأسرار العربية: ٦٥ و شرح قطر النّدى و بلّ الصّدى: ل، (٦٨)

**وَ إِنَّمَا اخْتُصَّ الْأَلِف بِرَفْعِ التَّثْنِيَةِ، وَالْوَاوُ بِرَفْعِ الْجَمْعِ؟ لِأَنَّ الْأَلِفَ فِي تَثْنِيَةِ الْأَفْعَالِ، وَالْوَاوَ فِي جَمْعِهَا عَلَامَتَانِ لِلْمَرْفُوعِ، أَعْنِي: الْفَاعِلَ، نَحْوُ: «ضَرَبَا، وَيَضْرِبَانِ، وَاضْرِبَا؛ وَضَرَبُوا، وَيَضْرِبُونَ، وَاضْرِبُوا»، فَجُعِلَتَا فِي تَثْنِيَةِ الْأَسْمَاءِ وَجَمْعِهَا عَلَامَتَيْنِ لِلرَّفْعِ**

---

هیچ جیاوازییەک نامێنێت لە نێوان «مُثَنَّی» و «جَمْعُ الْمُذكَّرِ السَّالِم»ـدا، بۆیە ناچار بووین ئەم دابەشکارییە بکەین.

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: **(وَ إِنَّما أُخْتُصَّ الأَلِفُ بِرَفْعِ التَثْنِيَةِ)**[1] بۆچی «ئەلیف» تایبەت کرا بە حاڵەتی ڕەفعەی «مُثَنَّی» و **(وَالْوَاوَ بِرَفْعِ الْجَمْعِ)** هەروەها «واو» تایبەت کرا بە حاڵەتی ڕەفعەی «جَمْعُ الْمُذكَّرِ السَّالِم»؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: **(لأَنَّ الأَلِفَ فِي تَثْنِيَةِ الأَفْعالِ)** چونکە «ئەلیف» لە «تَثْنِيَة»ی فیعلاندا و **(وَالوَاوَ فِي جَمْعِها)** هەروەها «واو» لە «جَمْع»ـی فیعلاندا **(عَلامَتانِ لِلْمَرْفُوعِ)** نیشانەی ئەوەن کە فیعلەکە «مَرْفُوع» بووە **(أَعْنِي:)** مەبەستم ئەوەیە کە ئەلیفەکە لە «تَثْنِيَة»ی فیعلاندا و واوەکە لە «جَمْع»ی فیعلاندا **(الفاعِلَ)** دەبن بە «فاعل»، جیاوازی نییە فیعلەکە «ماضي» بێت، **(نَحْوُ)** نموونەی «أَلف» وەکوو **(ضَرَبَا)** واتە: دوو کەس لێیان دا، **(وَ)** یاخود فیعلەکە «مُضارِع» بێت وەکوو **(يَضْرِبانِ)** واتە: دوو کەس لێ‌دەدەن، **(وَ)** یاخود فیعلەکە «أَمْر» بێت وەکوو ئەوە کە تۆ فەرمان بە دوو کەس دەکەیت و دەڵێیت: **(اضْرِبا)** واتە: ئێوە لێ‌بدەن، **سەرنج بدە:** لەم سێ فیعلانە «أَلف» بۆتە «فاعل»، چونکە هەرسێکیان «تَثْنِيَة»ن. **(وَ)** هەروەها نموونەی ئەوەی کە واوەکە «فَاعِل»ـە وەکوو **(ضَرَبُوا)** واتە: چەند کەسێک لێیان دا، **(وَ)** یاخود فیعلەکە «مُضارِع» بێت وەکوو **(يَضْرِبُون)** واتە: چەند کەسێک لێ‌دەدەن، **(وَ)** یاخود فیعلەکە «أَمْر»بێت وەکوو **(اضْرِبُوا)** واتە: ئێوە لێ‌بدەن، **سەرنج بدە:** لەم سێ فیعلانەدا «واو» بۆتە «فاعل»، چونکە هەرسێکیان «جَمْع»ـن. **(فَجُعِلَتا)** لەبەر ئەوە «أَلِف» **(فِي تَثْنِيَةِ الأَسْماءِ)** لە «تَثْنِيَة»ی ئیسمان و هەروەها «واو» **(وَجَمْعِها)** لە «جَمْع»ـی ئیسمان کران **(عَلامَتَيْنِ لِلرَّفْعِ)** بە نیشانەی مەرفووع

---

١. بڕوانە: شرح ملا جامي: (٧٧) شرح ابن عقيل،(١/ ٦١)

**أَيْضاً، لِتَنَاسَبَ الْأَسْمَاءُ الْأَفْعَالَ. وَجُعِلَ الْجَرُّ بِالْيَاءِ فِيهِما: لِأَنَّهُمَا أُخْتَانِ، وَحُمِلَ النَّصْبُ عَلَى الْجَرِّ: لِأَنَّهُمَا أَخَوَانِ، ثُمَّ فُتِحَ مَا قَبْلَ الْيَاءِ وَكُسِرَ النُّونُ فِي التَّثْنِيَةِ وَعُكِسَ فِي الْجَمْعِ: لِلْفَرْقِ بَيْنَهُمَا.**

---

**(أَيْضاً)** وەکوو چۆن «أَلِف» لە «تَثْنِيَة»ی فیعلاندا نیشانەی مەرفووعبوون «فاعِل» بوو، لە «تَثْنِيَة»ی ئیسمانیش بوو بە نیشانە؛ هەروەها «واو» لە «جَمْع»ـی فیعلان نیشانەی «مرفوع»بوون بوو، لە «جَمْع»ـی ئیسمانیش بوو بە نیشانەی مەرفووعبوون؛ **(لِتَنَاسَبَ الْأَسْمَاءُ الْأَفْعَالَ)** تاوەکوو موناسەبەی ئیسمان لەگەڵ فیعلاندا دروست بێت و بەردەوام بێت.

**(وَجُعِلَ الْجَرُّ بِالياءِ فِيهِما)** هەروەها حاڵەتی جەڕڕەی «مُثَنَّى» لەگەڵ «جَمْعُ الْمُذكّرِ السَّالِم» بە «ياء»ـە **(لأَنَّهُما أُخْتانِ)**[1] چونکە «الجَرّ» و «الياء» هەردووکیان خوشکی یەکترن و وەکوو یەکن، تەنها یەکیان لەسەر پیتەکان دەنووسرێت و ئەویتریان لە ژێرەوە، **(وَحُمِلَ النَّصْبُ عَلى الْجَرِّ)** هەروەها حاڵەتی نەسبە لە «مُثَنَّى» و لە «جَمْعُ الْمُذكّرِ السَّالِم» حەمل کراوەتە سەر حاڵەتی جەڕڕە **(لأَنَّهُما أَخَوانِ)** چونکە «الجَرّ» و «النَّصب» هەردووکیان وەکوو یەکترن، زۆر جار زێدە «فُضْلَة»[2] دەبن لە ڕستەدا، کەواتە: وەکوو برا هەژمار دەکرێن. **(ثُمَّ فُتِحَ ما قَبْلَ الياءِ)** پاشان پێشی حەرفی «ياء»ـەکە مەفتووح کرا **(وَكُسِرَ النُّونُ فِي التَّثْنِيَةِ)** هەروەها حەرفی «نُون»ـیش لە کۆتایی «مُثَنَّى»دا مەکسوور کرا وەکوو «مُسْلِمَيْنِ» **(وَعُكِسَ فِي الْجَمْعِ)** بەڵام لە «جَمْعُ الْمُذكّرِ السَّالِم» شتەکە پێچەوانە کرایەوە، واتە: پێشی حەرفی «ياء»ـەکە مەکسوور کرا، هەروەها حەرفی «نُون»ـیش لە کۆتایی «جَمع»ـەکەدا مەفتووح کرا وەکوو «مُسْلِمِيْنَ» **(لِلْفَرْقِ بَيْنَهُما)** بۆ ئەوەی جیاوازی هەبێت لە نێوان «مُثَنَّى» و «جَمْعُ الْمُذكّرُ السَّالِم»ـدا لە حاڵەتی «النَّصب»ـە و لە حاڵەتی «الجَرّ»ەدا.

---

١. چونکە هەموو «ياء»ـێک لە نێوان دوو «كَسْرَة» لە دایک دەبێت، یاخود دەڵێن: هەموو «ياء»ـێک لە دوو «كَسْرَة» پێک هاتووە. بڕوانە: شرح الكافية: (٧٦/١).

٢. بڕوانە: شرح ملا جامي: (٧٩)

**وَإِنَّمَا قَيَّدَ الْجَمْعَ بِـ «الْمُصَحَّحِ»؟ احْتِرَازاً عَنِ الْجَمْعِ الْمُكَسَّرِ؛ فَإِنَّ إِعْرَابَهُ لَا يَكُونُ بِالْحُرُوفِ، وَسَنُبَيِّنُ مَعْنَى الْمُصَحَّحِ وَالْمُكَسَّرِ وَقْتَ بَيَانِهِمَا -إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَىٰ-.**

---

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات بڵێت: **(وَإِنَّمَا قَيَّدَ الْجَمْعَ بِالْمُصَحَّحِ)** بۆچی مامۆستای زەمەخشەری گوتی: دەبێت جەمعەکە سیغەی موفرەدی سەلامەت بێت، واتە: «مُصَحَّحْ» بێت، **(اِحْتِرازاً عَنِ الْمُكَسَّرِ)** بۆ ئەوەی خۆی بپارێزێت لە جەمعی «مُكَسَّر» واتە: ئەو جەمعەی کە سیغەی موفرەدی سەلامەت نییە و لە کاتی «جَمْع» گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە؟ **(فَإِنَّ إِعْرابَهُ لا يَكُونُ بِالْحُروفِ)** چونکە ئیعرابی «جَمْعُ الْمُكَسَّر» بە حەرفان نییە بەڵکوو بە حەرەکاتە.

**(وَسَنُبَيِّنُ مَعْنَى الْمُصَحَّحِ وَالْمُكَسَّرِ وَقْتَ بَيانِهِما)** لە وانەکانی داهاتوودا و لە کاتی خۆیدا بە درێژی مانای «جَمْعُ الْمُصَحَّح» و «جَمْعُ الْمُكَسَّر» ڕوون دەکەینەوە و بە درێژی باسی یاسا و مەرجەکانیان دەکەین **(إِنْ شاءَ اللَّهُ تَعالَى)** پشتیوان بە خوای پەروەردگار.




* ◌ *

## الْإِعْرَابُ اللَّفْظِيُّ وَالتَّقْدِيرِيُّ

**قَالَ: وَمَا لَا يَظْهَرُ الْإِعْرَابُ فِي لَفْظِهِ قُدِّرَ فِي مَحَلِّهِ، كَـ «عَصاً»، وَ «سُعْدَى» وَ «الْقَاضِي»، فِي حَالَتَيِ الرَّفْعِ وَالْجَرِّ.**

---

## وانەی دوازدەهەم: باسی ئیعڕابی «لَفْظِي» و «تَقْدِيرِي»

**(قالَ:)** مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: **(وَمَا لا يَظْهَرُ الإِعْرابُ فِي لَفْظِهِ)** هەر وشەیەک لە کاتی گوتندا (لَفظ) ئیعڕابەکەی دەرنەکەوێت و بە چاو نەبیندرێت **(قُدِّرَ فِي مَحَلِّهِ)** ئەو وشەیە ئیعڕابێکی «مَحَلّي» بۆ تەقدیر دەکرێت، واتە: لە حاڵەتی ڕەفعەدا دەگوترێت: وشەکە لە «تَقْدِير»دا «مَرْفُوع» بووە؛ هەروەها لە حاڵەتی نەسبەدا دەگوترێت: وشەکە لە «تَقْدِير»دا «مَنْصُوب» بووە؛ هەروەها لە حاڵەتی جەڕڕەدا دەگوترێت: وشەکە لە «تَقْدِير»دا «مَجرور» بووە؛ ئینجا جیاوازی نییە کە وشەکە بە هۆی ئەوەی «ألف»ـێکی لە کۆتاییدا هاتووە ئیعڕابەکەی «تَقْدِيري» بێت **(كَـ)** وەکوو وشەی **(عَصاً)**، **(وَ)** هەروەها وەکوو وشەی **(سُعْدَى)** کە ئەم دوو وشەیە لە هەرسێ حاڵەتدا ئیعڕابەکەیان «تَقْدِيري» دەبێت، **(وَ)** یاخود وشەکە بە هۆی ئەوەی «یاء»ـێکی لە کۆتاییدا هاتووە ـکە حەرفی پێشەوەی «مَكْسُور» بێتـ ئیعڕابەکەی «تَقْدِيري» بێت وەکو وشەی **(اَلْقاضِي)**، بەڵام ئەم وشەیە تەنها **(فِي حَالَتَيِ الرَّفْعِ وَالْجَرِّ)**[1] لە حاڵەتی ڕەفعە و لە حاڵەتی جەڕڕەدا ئیعڕابەکەی «تَقْدِيري» دەبێت، بەڵام لە حاڵەتی نەسبەدا ئیعڕابەکەی «لَفْظِي» دەبێت.

**ئینجا بزانە:** ئەی قوتابی خۆشەویست و مامۆستای بەڕێز، لە زمانی عەرەبیدا سێ جۆر «إعراب» هەیە، **یەکەم:** ئیعڕابی «لَفْظِي»، **دووەم:** ئیعڕابی «تَقْدِيرِي» ـکە ئەم دووانە تایبەتن بە «مُعْرَب»ـ، **سێیەم:** ئیعڕابی «مَحَلِّي» ـکە تایبەتە بە «مَبْنِي» و لێرەدا باسی ناکەین ـ.

---

١. ملا جامي: (٨٥) وشرح كافية ابن الحاجب (٥٥/١) وأسرار العربية: ٦٥ و شرح قطر النّدى و بلّ الصّدى: ل، (٦٦).

**أَقُولُ: الْمُعْرَبُ قِسْمَانِ: قِسْمٌ يَظْهَرُ الْإِعْرَابُ فِي اللَّفْظِ؛ وَقِسْمٌ لَا يَظْهَرُ.**
**وَالْمُصَنِّفُ لَمَّا ذَكَرَ الْقِسْمَ الْأَوَّلَ، أَرادَ أَنْ يَذْكُرَ الثَّانِيَ، فَقَالَ: «وَمَا لَا يَظْهَرُ... إِلَىٰ آخِرِهِ»؛ أَيْ: الْمُعْرَبُ الَّذِي لَا يَظْهَرُ الْإِعْرَابُ فِي لَفْظِهِ قُدِّرَ فِي مَحَلِّهِ، أَي: يُحْكَمُ بِأَنَّ فِيهِ إِعْرَاباً مُقَدَّراً، سَوَاءٌ كَانَ آخِرُهُ**

---

(**أَقُولُ:**) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (**اَلْمُعْرَبُ قِسْمانِ**) ئەم وشەیەی کە ئیعرابی دەچێتە سەر دوو بەشی هەیە: (**قِسْمٌ**) بەشی یەکەم: (**يَظْهَرُ الإِعْرابُ فِي اللَّفْظِ**) بریتییە لەو وشەیەی کە ئیعرابەکەی لە کاتی گوتن و «لَفْظ»ـدا دەردەکەوێت و بە چاو دەبیندرێت، وەکوو «جَاءَنِي زَيْدٌ، رَأَيتُ زَيْداً، مَرَرْتُ بِزَيْدٍ»؛ (**وَقِسْمٌ**) بەشی دووەم: (**لا يَظْهَرُ**) بریتییە لەو وشەیەی کە ئیعرابەکەی لە کاتی گوتن و «لَفْظ»ـدا دەرناکەوێت و بە چاو نابیندرێت، وەکوو «جَاءَنِي مُوسَى، رَأَيتُ مُوسَى، مَرَرْتُ مُوسَى».

(**وَالْمُصَنِّفُ لَمَّا ذَكَرَ الْقِسْمَ الأَوَّلَ**) ئینجا پاش ئەوەی مامۆستا لە وانەکانی ڕابوردوو بە درێژی باسی بەشی یەکەمی کرد، (**أَرادَ أَنْ يَذْكُرَ الثَّانِيَ**) ویستی باسی بەشی دووەمیش بکات و بە وردی ڕوونی بکاتەوە، (**فَقَالَ**) ئینجا دەفەرموێ: (**وَمَا لا يَظْهَرُ الإِعْرابُ فِي لَفْظِهِ**) هەر وشەیەک لە کاتی گوتن و «لَفْظ»ـدا ئیعرابەکەی دەرنەکەوێت و بە چاو نەبیندرێت (**إِلَى آخِرِهِ**) تا کۆتایی، (**أَيْ:**) واتە: (**اَلْمُعْرَبُ الَّذِي لا يَظْهَرُ الإِعْرابُ فِي لَفْظِهِ**) ئەو وشەیەکە لە کاتی گوتن و «لَفْظ»ـدا ئیعرابەکەی دەرنەکەوێت و بە چاو نەبیندرێت (**قُدِّرَ فِي مَحَلِّهِ**) ئەو وشەیە ئیعرابێکی «مَحَلِّي» بۆ تەقدیر دەکرێت (**أَيْ: يُحْكَمُ بِأَنَّ فِيهِ إِعْراباً مُقَدَّراً**) واتە: بڕیار دەدرێت ئەم وشەیە ئیعرابێکی «تَقْدِيري» تێدایە، واتە: لە حاڵەتی ڕەفعەدا دەگوترێت: وشەکە لە «تَقْدِير»دا «مَرْفُوع» بووە، هەروەها لە حاڵەتی نەسبەدا دەگوترێت: وشەکە لە «تَقْدِير»دا «مَنْصُوب» بووە، هەروەها لە حاڵەتی جەڕڕەدا دەگوترێت: وشەکە لە «تَقْدِير»دا «مَجرور» بووە.

(**سَواءٌ**) ئینجا جیاوازی نییە: ئەم وشەیەی کە ئیعرابەکەی تەقدیرییە (**كَانَ آخِرُهُ**

**أَلِفاً مُنْقَلِبَةً عَنْ لَامِ الْفِعْلِ، كَـ «عَصاً»، فَإِنَّ أَصْلَهُ «عَصَوٌ»، قُلِبَتِ الْوَاوُ أَلِفاً فَصَارَ عصاً. أَوْ أَلِفَ التَّأْنِيث، كَـ «سُعْدَىٰ؛ أَوْ يَاءً مَا قَبْلَهَا مَكْسُورٌ، كَـ «الْقَاضِي»، فَتَقُولُ: «هٰذِهِ عَصاً -بِالتَّنْوِينِ- وَسُعْدَىٰ وَالْقَاضِي» بِالسُّكُونِ، وَ «رَأَيْتُ عَصاً وَسُعْدَىٰ وَالْقَاضِيَ» بِالْفَتْحِ، وَ «مَرَرْتُ بِعَصاً وَسُعْدىٰ وَالْقَاضِي»، بِسُكُونِ الْيَاءِ. فَلا يَظْهَرُ**

---

(**أَلِفاً**) لە کۆتاییدا ئەلیفێک هاتبێت کە ئەم «أَلف»ـە لە ئەسڵدا (**مُنْقَلِبَةً عَنْ لامِ الْفِعْلِ**) «لامُ الْفِعْل»ـی وشەکە بێت، جیاوازی نییە «واو» بێت یاخود «یاء» بێت و ئینجا کرابێت بە «أَلف»، (**كَـ**) وەکوو وشەی (عَصا)، سەرنج بدە: (**فَإِنَّ أَصْلَهُ**) ئێستا وشەی «عَصا» لە ئەسڵدا (عَصَوٌ) بووە، بەڵام چونکە ئەم واوەی لە کۆتایی وشەی «عَصَوٌ»دا هاتووە «مُتَحَرِّك»ـە و حەرفی پێش خۆشی مەفتووحە، بۆیە (**قُلِبَتِ الْوَاوُ أَلِفاً**) قەلبی واوەکە کراوە بە «ألف» و (**فَصَارَ عصاً**) بۆتە «عَصا».

(**أَوْ**) یاخود ئەو وشەیەی کە ئیعرابەکەی «تَقْدِيري»یە دەبێت لە کۆتاییدا (**أَلِفُ التَّأْنِيث**) ئەلیفێك هاتبێت کە ئەم «أَلف»ـە نیشانەی «تَأْنِيث»ـی وشەکەیە (**كَـ**) وەکوو وشەی (**سُعْدَى**) کە ناوی ئافرەتێکە، (**أَوْ**) یاخود ئەم وشەیەی کە ئیعرابەکەی «تَقْدِيري»ـیە دەبێت لە کۆتاییدا (**ياءٌ مَكْسُورٌ مَا قَبْلَها**)[1] «یاء»ـێک هاتبێت کە حەرفی پێشەوەی مەکسوور بێت (**كَـ**) وەکوو وشەی (**اَلْقاضِي**)، سەرنج بدە: ئەم سێ وشانە ئیعرابیان «تَقْدِيرِي» دەبێت (**فَتَقُوْلُ**) کەواتە تۆ دەڵێیت لە حاڵەتی ڕەفعەدا: (**هذِهِ عَصاً بِالتَّنْوِينِ**)، (**وَ**) «ذَهَبَتْ (سُعْدَى)»، (**وَ جاءني الْقاضِيْ بِالسُّكُونِ**) وشەی (**اَلْقاضِي**) بە سکوونی «یاء» بخوێنەوە، ئێستا ئەم سێ وشانە لە «تَقْدِير»دا «مَرْفوُع» بوون.

(**وَ**) هەروەها وەکوو (**رأَيْتُ عَصاً وَ سُعْدَى وَ الْقاضِيَ**) کە لە حاڵەتی نەسبەدا بوون بە «مَفْعُولٌ بِهِ»، (**وَ**) هەروەها وەکوو (**مَرَرْتُ بِعَصاً، وَ**) هەروەها وەکوو «**مَرَرْتُ بـ(سُعْدَى)**»، (**وَ**) هەروەها وەکوو «**مَرَرْتُ بـ(الْقاضِيْ)» بِسُكُونِ الياءِ**) وشەی «اَلْقاضِي» بە سکونی «یاء» بخوێنەوە، سەرنجی هەرسێ نموونەکە بدە (**فَلا يَظْهَرُ**

---

١. بڕوانە: الأصول في النحو: ٢/١٩٣.

**الْإِعْرَابُ فِي لَفْظِ «عَصاً وَسُعْدَىٰ» فِي حَالَةِ النَّصْبِ وَالرَّفْعِ وَالْجَرِّ؛ لِأَنَّ آخِرَهُمَا أَلِفٌ، وَهِيَ لَا تَقْبَلُ الْحَرَكَةَ.**

**وَأَمَّا «الْقَاضِي» فَلَا يَظْهَرُ إِعْرَابُهُ لَفْظاً فِي الرَّفْعِ وَالْجَرِّ، لِثِقَلِ الضَّمَّةِ وَالْكَسْرَةِ عَلَى الْيَاءِ؛ وَأَمَّا النَّصْبُ فَيَظْهَرُ لِخِفَّتِهِ، وَلِذٰلِكَ قَالَ: «فِي حَالَتَيِ الرَّفْعِ وَالْجَرِّ».**

---

**الإِعْرابُ فِي لَفْظِ عَصاً وَسُعْدَى)** ئیعراب ئاشکرا نابێت و دەرناکەوێت لە هەردوو وشەی «عَصاً». (وَ) وشەی (سُعْدَى) لە هەرسێ حاڵەتدا (**فِي حَالةِ النَّصْبِ وَالْجَرِّ وَالْفَتْحِ**) لە حاڵەتی ڕەفعە و نەسبە و جەڕڕەدا، بەڵکوو لە هەرسێ حاڵەتدا ئیعڕابەکەی «تَقْدِيري» دەبێت، (**لأَنَّ آخِرَهُمَا أَلِفٌ وَهِيَ لا تَقْبَلُ الْحَرَكَةَ**) چونکە کۆتای ئەم دوو وشەیە بە «أَلْف» هاتووە، ئەلیفیش «حرکة»ی ناچێتە سەر، بۆیە: ئەمە یاسایەکی گشتییە: هەر وشەیەک «أَلْف»ـی لە کۆتایدا هات لە هەرسێ حاڵەتدا ئیعڕابەکەی «تَقْدِيري» دەبێت.

(**وَأَمَّا الْقاضِي**) بەڵام سەبارەت بە وشەی «الْقاضِي» (**فَلا يَظْهَرُ إِعْرابُهُ لَفْظاً**) ئیعڕابەکەی ئاشکرا نابێت (**فِي الرَّفْعِ وَالْجَرِّ**) لە حاڵەتی ڕەفعە و لە حاڵەتی جەڕڕەدا، بەڵکوو لەم دوو حاڵەتدا ئیعڕابەکەی «تَقْدِيري» دەبێت، چونکە کۆتای ئەم دوو وشەیە بە «یاء» هاتووە (**لِثِقْلِ الضَّمَةِ وَالْكَسْرَةِ عَلَى الياءِ**) چونکە کۆتای ئەم دوو وشەیە بە «یاء» هاتووە و هەریەکە لە «ضَمَّة» و لە «كَسْرَة» دوو حەرەکەی قورسن و ناچنە سەر «یاء»، (**وَأَمّا النَّصْبُ فَيَظْهَرُ لِخِفّتِهِ**) بەڵام لە حاڵەتی نەسبەدا وشەی «الْقاضِي» «فَتْحَة»ی دەچێتە سەر، چونکە «فَتْحَة» حەرەکەیەکی سووکە و هیچ جۆرە قورسییەک دروست ناکات، (**وَلِذلِكَ قَالَ فِي حَالَتَيْ الرَّفْعِ وَالْجَرِّ**) هەر بۆیەش مامۆستا دەفەرموێت: وشەی «الْقاضِي» تەنها لە حاڵەتی ڕەفعە و لە حاڵەتی جەڕڕەدا ئیعڕابەکەی «تَقْدِيري» دەبێت.

ە ە

**وَالْحَاصِلُ، أَنَّ الْمُعْرَبَ: إِمَّا أَنْ يَدْخُلَهُ الْحَرَكَاتُ الثَّلَاثُ لَفْظاً، كَـ «زَيْدٍ»، أَوْ تَقْدِيراً، كَـ «عَصاً».**

**وَ إِمَّا أَنْ يَدْخُلَهُ بَعْضُ الْحَرَكَاتِ الثَّلَاثِ لَفْظاً، كَـ «أَحْمَدَ»، أَوْ تَقْدِيراً، كَـ «سُعْدَىٰ».**

## باسی هەر دە بەشەکەی «مُعْرَب»

• پاش باسکردنی وانەکانی ڕابوردوو بە درێژی، مامۆستا دەیەوێت بە کورتی ناوەڕۆکی بابەتەکان بخاتە ڕوو، دەفەرموێت: **(وَالْحَاصِلُ)** پوختەی قسان ئەوەیە کە **(أَنّ الْمُعْرَبَ)** ئەو وشەیەی کە ئیعرابی دەچێتە سەر، دە بەشی سەرەکی هەیە کە بریتین لە:

**بەشی یەکەم: (إِمَّا أَنْ يَدْخُلَهُ الْحَرَكَاتُ الثَّلَاثُ لَفْظاً)** یاخود ئەو وشەیەی کە ئیعرابی دەچێتە سەر، هەرسێ «حَرَكَة»ی ئیعرابی دەچێتە سەر لە «لَفْظ»ـدا واتە: «حَرَكَة»ـەکان بە چاو دەبیندرێن و بە دەم دەگوترێن (كَـ) وەکوو وشەی **(زَيْدٍ)**، بۆ نموونە دەڵێین: «جَاءَنِي زَيْدٌ، رَأَيْتُ زَيْداً، مَرَرْتُ بِزَيْدٍ» **سەرنج بدە:** وشەی «زيد» لە هەرسێ حاڵەتدا ئیعرابی «لَفْظِيّ»یە.

**بەشی دووەم: (أَوْ تَقْدِيراً)** یاخود ئەو وشەیەی کە ئیعرابی دەچێتە سەر، هەرسێ «حَرَكَة»ـی ئیعرابی دەچنە سەر، بەڵام لە «تَقْدِير»دا واتە: «حَرَكَة»ـەکان بە چاو نابیندرێن و بە دەم ناگوترێن (كَـ) وەکوو وشەی **(عَصَا)**، بۆ نموونە دەڵێین: «هذِهِ عَصاً، رَأَيْتُ عَصاً، مَرَرْتُ بعَصاً» **سەرنج بدە:** وشەی «عَصاً» لە هەرسێ حاڵەتدا ئیعرابی «تَقْدِيري»یە.

**بەشی سێیەم: (وَ إِمَّا أَنْ يَدْخُلَهُ بَعْضُ الْحَرَكَاتِ الثَّلَاثِ لَفْظاً)** یاخود وشەکە بەشێک لە «حَرَكَة»ی ئیعرابی دەچێتە سەر لە «لَفْظ»ـدا (كَـ) وەکوو وشەی **(أَحْمَدَ)**، بۆ نموونە دەڵێین: «جَاءَنِي أَحْمَدُ، رَأَيْتُ أَحْمَدَ، مَرَرْتُ بأَحْمَدَ» **سەرنج بدە:** چونکە وشەی «أَحْمَدَ» «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـە هەریەکە لە «جَرّ»ە و «تَنْوِين» وەرناگرێت.

**بەشی چوارەم: (أَوْ تَقْدِيراً)** یاخود وشەکە بەشێک لە «حَرَكَة»ـی ئیعرابی دەچێتە سەر بەڵام لە «تَقْدِير»دا (كَـ) وەکوو وشەی **(سُعْدَى)**، بۆ نموونە دەڵێین: «جَاءَتْنِي

**وَ إِمَّا أَنْ يَدْخُلَهُ الْحَرَكَاتُ الثَّلَاثُ بَعْضُهَا لَفْظاً وَبَعْضُهَا تَقْدِيراً، كَـ «الْقَاضِي».**

**وَ إِمَّا أَنْ يَدْخُلَهُ الْحُرُوفُ الثَّلَاثَةُ لَفْظاً، كَالأَسْماءِ السِّتَّة، أَوْ تَقْدِيراً، وَهُوَ غَيْرُ مَوْجُودٍ.**

**وَ إِمَّا أَنْ يَدْخُلَهُ بَعْضُ الْحُرُوفِ الثَّلَاثَةِ لَفْظاً، كَـ «التَّثْنِيَةِ» وَ «الْجَمْعِ الْمُصَحَّحِ» وَ «كِلَا»،**

---

سُعْدَى، رَأَيْتُ سُعْدَى، مَرَرْتُ بِسُعْدَى» سەرنج بدە: چونکە وشەی «سُعْدَى» «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـە هەریەکە لە «جَرّ»ە و «تَنْوِين» وەرناگرێت.

**بەشی پێنجەم:** (**وَ إِمَّا أَنْ يَدْخُلَهُ الْحَرَكَاتُ الثَّلَاثُ**) یاخود وشەکە هەرسێ «حَرَكَة»ـی ئیعرابی دەچێتە سەر بەڵام (**بَعْضُها لَفْظاً**) بەشێکیان لە «لَفْظ»ـدا (**وَبَعْضُها تَقْدِيراً**) بەشێکیان لە «تَقْدِير»دا (**كَـ**) وەکوو وشەی ((**الْقاضِيْ**)، بۆ نموونە دەڵێن: «جَاءَنِي الْقاضِيْ، رَأَيْتُ الْقاضِيَ، مَرَرْتُ بِالْقاضِيْ». **سەرنج بدە:** وشەی «الْقاضِيْ» هەریەکە لە «ضَمَّة» و لە «كَسْرَة»ی «تَقْدِير»ینە، بەڵام لە حاڵەتی نەسبەدا «فَتْحَة»ی دەچێتە سەر، چونکە «فَتْحَة» حەرەکەیەکی سووکە و هیچ جۆرە قورسییەک دروست ناکات.

**بەشی شەشەم:** (**وَ إِمَّا أَنْ يَدْخُلَهُ الْحروف الثَّلاثُ لَفْظاً**) یاخود ئەو وشەیەی کە ئیعرابی دەچێتە سەر، هەرسێ حرووفی ئیعرابی دەچنە سەر لە «لَفْظ»ـدا واتە: حرووفەکان بە چاو دەبیندرێن و بە دەم دەگوترێن (**كَـ**) وەکوو (**أَسْماءِ السِّتَّة**) ئەو شەش ئیسمەی لە وانەکانی ڕابوردوودا باسمان‌کردن، بۆ نموونە دەڵێن: «جَاءَنِي أَبُوهُ، رَأَيْتُ أَباهُ، مَرَرْتُ بِأَبِيهِ».

**بەشی حەوتەم:** (**أَوْ تَقْدِيراً**) یاخود ئەو وشەیەی کە ئیعرابی دەچێتە سەر هەرسێ حرووفی ئیعرابی دەچنە سەر بەڵام لە «تَقْدِير»دا (**وَهُوَ غَيْرُ مَوْجُودٍ**) بەڵام ئەم جۆرە لە زمانی عەرەبیدا بوونی نییە.

**بەشی هەشتەم:** (**وَ إِمَا أَنْ يَدْخُلَهُ بَعْضُ الْحُرُوفِ الثَّلاثِ لَفْظاً**) یاخود وشەکە بەشێک لە حرووفی ئیعرابی دەچنە سەر لە «لَفْظ»ـدا (**كَـ**) وەکوو (**التَّثْنِيَةِ وَالْجَمْعِ الْمُصَحّحِ وَكِلَا**) بۆ نموونە دەڵێن: «جَاءَنِي زَيْدانِ، رَأَيْتُ زَيْدَيْنِ، مَرَرْتُ بِزَيْدَيْنِ»

**أَوْ تَقْدِيراً، وَهُوَ غَيْرُ مَوْجُودٍ أَيْضاً.**

**وَ إِمَّا أَنْ يَدْخُلَهُ بَعْضُ الْحُرُوفِ الثَّلَاثَةِ، بَعْضُهَا لَفْظاً وَبَعْضُهَا تَقْدِيراً، كَـ «الْجَمْعِ الْمُصَحَّحِ الْمُضَافِ إِلَىٰ يَاءِ الْمُتَكَلِّمِ»، نَحْوُ: «مُسْلِمِيَّ»، فَإِنَّ أَصْلَهُ «مُسْلِمُونَ»، ثُمَّ أُضِيفَ إِلَى يَاءِ الْمُتَكَلِّمِ، فَصَارَ مُسْلِمُويَ، وَاجْتَمَعَ الواوُ وَالْيَاءُ وَادُغِمَتِ الْوَاوُ فِي الياءِ**

---

یاخود وەکوو: «جَاءَنِي مُسْلِمُونَ، رَأَيْتُ مُسْلِمِينَ، مَرَرْتُ بِمُسْلِمِينَ» یاخود وەکوو «جَاءَنِي كِلاهُمَا ....»

**بەشی نۆیەم:** (**أَوْ تَقْدِيراً**) یاخود وشەکە بەشێک لە حرووفی ئیعڕابی دەچنە سەر لە «تَقْدِير»دا بەڵام (**وَهُوَ غَيْرُ مَوْجُودٍ**)[1] ئەم جۆرە «مُعْرَب»ـە لە زمانی عەرەبیدا بوونی نییە (**أيضاً**) وەکوو ئەوەی پێشتر.

**بەشی دەیەم:** (**وَ إِمَّا أَنْ يَدْخُلَهُ الْحُرُوفُ الثَّلاثُ**)[2] یاخود وشەکە هەرسێ حرووفی ئیعڕابی دەچنە سەر بەڵام (**بَعْضُها لَفْظاً**) بەشێکیان لە «لَفْظ»ـدا (**وَبَعْضُها تَقْدِيراً**) بەشێکیان لە «تَقْدِير»دا (**كَـ**) وەکوو وشەی (**الْجَمْعِ الْمُصَحَّحِ**) «جَمْعُ الْمُذَكَّرِ السَّالِم» (**الْمُضافِ إِلَى ياءِ الْمُتَكَلِّمِ**) کە «إضافَة» کرابێت بۆ لای «ياءُ الْمُتَكَلِّم» (**نَحْوُ:**) وەکوو وشەی (**مُسْلِمِيَّ، فَإِنَّ أَصْلَهُ مُسْلِمُونَ**) چونکە ئەسڵی وشەی «مُسْلِمِيَّ» بریتی بووە لە «مُسْلِمُونَ» (**ثُمَّ أُضِيفَ إِلَى ياءِالْمُتَكَلِّمِ**) پاشان ئەم وشەیە «إضافَة» کرا بۆ لای «ياءُ الْمُتَكَلِّم» بەم هۆیەوە «نون»ـەکەی ڕۆیشت و (**فَصَارَ مُسْلِمُويَ**) بوو بە «مُسْلِمُوي» (**وَاجْتَمَعَ الواوُ وَالْياءُ**) ئینجا حەرفی «واو» و حەرفی «ياء» بەیەکەوە لە یەک وشەدا کۆ بوونەوە و ئەوەی یەکەمیشیان «ساكن»ـە (**وَادُغِمَتِ الْواوُ فِي الياءِ**) بۆیە «قَلْب»ـی

---

١. بەڵام لە هێندێک لە سەرچاوەکان نموونەی ئەم بەشەی بەم شێوەیە هێناوەتەوە «جاءني أبو القاسم، رأيت أبا القاسم، مررت بأبي القاسم» پێشەوا بەرکەوی دەفەرموێت: «فَـإِعْرابُهُ فِي الأَحْوالِ الثَّـلاثِ تَقْدِيرِيٌّ». بڕوانە: الأظهار: ١٠٨.

٢. بڕوانە: اللباب: (٨١/١) ملا جامي: (٩٠) والنحو الوافي (١٣٦/١) والصرف (١٩٧)، وشرح كافية ابن الحاجب (٨٥/١) وأسرار العربية: ٦٥ و شرح قطر النّدى و بلّ الصّدى: ل، (٦٦).

**وَكُسِرَ مَا قَبْلَ الياءِ فَصَارَ مُسْلِمِيَّ.**

**فَهٰذِهِ عَشَرَةُ أَقْسَامٍ: قِسْمَانِ مِنْهَا مُنْتَفِيَانِ فِي كَلَامِ الْعَرَبِ، وَالْبَاقِيَةُ قَدْ عَرَفْتَ أَمْثِلَتَهَا.**

---

واوەکە کرا بە یاء، پاشان هەردوو «یاء»ـەکان لە یەکتری دەغم کران بوو بە «مُسْلِمُيَّ»، **(وَكُسِرَ مَا قَبْلَ الياءِ)** ئینجا حەرفی پێش «یاء»ـەکە «مَكْسُور» کرا **(فَصَارَ مُسْلِمِيَّ)** ئینجا بوو بە «مُسْلِمِيَّ»، **سەرنج بدە:** ئێستا ئەم وشەیە حاڵەتی ڕەفعەی بە واوێکی «مُقَدَّر»ە، بەڵام حاڵەتی «نَصْب»ـە و حاڵەتی «جَرّ»ەی «تَقْدِيرِي»[1] نیین، بەڵکوو «لَفْظِي»ـیە و هەردوو حاڵەتەکە بە «یاء»ـن.

ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: **(فَهٰذِهِ عَشَرَةُ أَقْسامٍ)** ئەمانەی باسمانکردن بریتی بوون لە دە بەش لە بەشەکانی «مُعْرَب» **(قِسْمانِ مِنْها مُنْتَفِيانِ فِي كَلامِ الْعَرَبِ)** دوو بەشیان وجوودیان نەبوو لە زمانی عەرەبی **(وَالْباقِيَةُ قَدْ عَرَفْتَ أَمْثِلَتَها)** هەشت بەشەکەیتریشت ناسین بە نموونەوە.

* ◌ *

---

١. بڕوانە: ملا جامي: (٩٠) والنحو الوافي (١٣٦/١) والصرف (١٩٧)، وشرح كافية ابن الحاجب (٨٥/١) وأسرار العربية: ٦٥ و شرح قطر النّدى و بلّ الصّدى: ل، (٦٦).

# أَسْبَابُ مَنْعِ الصَّرفِ

**قَالَ: وَأَسْبَابُ مَنْعِ الصَّرْفِ تِسْعَةٌ: الْعَلَمِيَّةُ وَالتَّأْنِيث وَوَزْنُ الْفِعْلِ وَالْوَصْفُ وَالْعَدْلُ وَالْجَمْعُ وَالتَّرْكِيبُ وَالْعُجْمَةُ وَالْأَلِفُ وَالنُّونُ الْمُضَارَعَتَان لِأَلِفَي التَّأْنِيث.**

---

## وانەی سێزدەهەم: باسی «أَسْبابُ غَيْرِ الْمُنْصَرِف»

**(قالَ:)** مامۆستا «جار الله» زەمەخشـەری دەفەرموێـت: **(وَأَسْبابُ مَنْعِ الصَّرْفِ)** ئـەم هۆکارانـەی کـە ئیـسمێکی «مُنْصَرِف» دەکـەن بـە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» و «جَرّ»ه و «تَنْوِين»ــی لێ قەدەغە دەکەن **(تِسْعَةٌ)** ژمارەیان بریتییە لە نۆ هۆکاری سەرەکی، کە بریتیـن لـە: **هـۆکاری یەکـەم: (اَلْعَلَمِيَّةُ)** واتە: هەر وشـەیەک ناو بێت بۆ کەسێک یا بۆ شوێنێک یاخود بۆ شتێک، ئەوە هۆکارێکە بۆ ئەوەی ئیسمەکە ببێتە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف». **(وَ) هـۆکاری دووەم: (التَّأْنِيث)** بریتییـە لـەوەی ئیـسمەکە «مُؤَنَّث» بێـت، ئینجـا جیـاوازی نییـە وشـەکە نـاو بێـت بۆ ڕەگەزی مێ یاخـود ناو بێت بۆ ڕەگـەزی نێر، بەڵام وشـەکە نیشـانەی «تَأْنِيث»ــی پێوە بێـت، وەکـوو وشـەی «طَلْحَة» و «نِعْمَة». **(وَ) هـۆکاری سێیـەم: (وَزْنُ الْفِعْلِ)** بریتییـە لـەوەی ئیسمەکە لەسـەر وەزنێکـی تایبـەت بێـت لـە وەزنـی «فِعْل»ان. **(وَ) هۆکاری چوارەم: (الْوَصْفُ)** بریتییە لەوەی ئیسـمەکە مانـای «صِفَة» ببەخشێت، وەکوو سوری (ڕەنگی سـوور) یاخود سپی. **(وَ) هۆکاری پێنجەم: (الْعَدْلُ)** بریتییە لەوەی ئیسمەکە لە وشەیەکی‌تر وەرگیرابێت وەکوو وشەی «عُمَر» کـە لـە «عامِر» وەرگیـراوە. **(وَ) هـۆکاری شەشـەم: (الْجَمْعُ)** بریتییـە لـەوەی ئیسمەکە «جَمْع» بێت و لەسەر وەزنی «مَفاعِلَ» یا خود «مَفاعِيلَ» بێت. **(وَ) هۆکاری حەوتـەم: (التَّرْكِيبُ)** بریتییـە لـەوەی ئیسمەکە لـە دوو بڕگـەی سـەرەکی یاخود زیاتر پێـک هاتبێـت وەکـوو «بَعْلَبَكّ» و «حَضْرَمَوْت». **(وَ) هـۆکاری هەشـتەم: (الْعُجْمَةُ)** بریتییە لەوەی ئیسمەکە ناوێکی غەیری عەرەبیی بێت. **(وَ) هۆکاری نۆیەم: (وَالأَلِفُ وَالنُّونُ الْمُضارِعَتانِ لأَلِفَيِ التَّأْنِيث)** بریتییـە لـەوەی ئیسـمەکە «أَلِف» و «نُون»ــێکی

**أَقُولُ: الْأَصْلُ فِي الْأَسْمَاءِ أَنْ تَكُونَ مُنْصَرِفَةً مُعْرَبَةً بِتَمَامِ الْحَرَكَاتِ اللَّفْظِيَّةِ حَتَّىٰ يَدُلَّ كُلُّ حَرَكَةٍ مِنْهَا عَلَىٰ مَا هِيَ دَلِيلٌ عَلَيْهِ، أَعْنِي: الرَّفْعَ عَلَى الْفَاعِلِيَّةِ، وَالنَّصْبَ عَلَى الْمَفْعُولِيَّةِ، وَالْجَرَّ عَلَى الْإِضَافَةِ.**

**وَالْمُصَنِّفُ لَمَّا ذَكَرَ مَا يَقْتَضِي الْعُدُولَ عَنِ الْإِعْرَابِ بِالْحَرَكَاتِ اللَّفْظِيَّةِ إِلَى الْإِعْرَابِ بِالْحَرَكَاتِ التَّقْدِيرِيَّةِ أَوْ بِالْحُرُوفِ وَذَلِكَ فِي الْأَسْمَاءِ السِّتَّة وَكِلا وَالتَّثْنِيَةِ وَالْجَمْعِ الْمُصَحَّحِ أَرادَ أَنْ يَذْكُرَ مَا يَقْتَضِي الْعُدُولَ عَنِ الِانْصِرَافِ إِلَىٰ**

---

زیادەی تێدا بێت کە دەشوبهێنە هەردوو ئەلیفی «تَأْنِيث»ـی.

(**أَقُولُ:**) ماموٚستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (**اَلأَصْلُ فِي الأَسْماءِ أَنْ تَكُونَ مُنْصَرِفَةً**) ئەسڵ وایە لە هەموو ئیسمان کە «مُنْصَرِف» بن واتە: هەر سێ حەرەکەتیان بچنە سەر و «جَرّ» و «تَنْوِين»ـی لێ قەدەغە نەبن (**مُعْرَبَةً بِتَمامِ الْحَرَكاتِ اللَّفظِيَّةِ**) هەروەها ئیعرابدار بکرێت بە تەواوی حەرەکاتی «لَفْظِي» واتە: «رَفْع»ـە و «نَصْب»ـە و «جَرّ»ە وەربگرێت وەکوو وشەی «زيدٌ» (**حَتَى يَدُلَّ كُلُّ حَرَكَةٍ مِنْها عَلَى ما هِيَ دَليلٌ عَلَيْهِ**) تاوەکو هەموو حەرەکەیەک دەلالەت و گوزارشت لەم مانایە بکات کە بەرامبەری دانراوە (**أَعْنِي: اَلرَّفْعَ عَلَى الفاعِلِيَّةِ**) مەبەستم ئەوەیە کە حاڵەتی «رَفْع» دەلالەت لەسەر «فاعِلِيَّة» بکات و (**وَالنَّصْبَ عَلَى الْمَفْعُولِيَّةِ**) حاڵەتی «نَصْب» دەلالەت لەسەر «مَفْعُولِيَّة» بکات و (**وَالْجَرَّ عَلَى الإضافَةِ**) حاڵەتی «جَرّ» دەلالەت لەسەر ئەوە بکات کە ئیسمەکە بۆتە «مُضافٌ إِلَيْه».

(**وَالْمُصَنِّفُ لَمّا ذَكَرَ مَا**) ماموٚستای دانەر لە کاتێکیدا باسی شتێکی کرد کە (**يَقْتَضِي الْعُدُولَ عَنِ الإعْرابِ بِالْحَرَكاتِ اللَّفْظِيَّةِ**) پێویستی دەکرد لابدەین لە باسی بابەتی «إِعْرابِ» بە حەرەکەی «لَفْظِي» (**إِلَى الإعْرابِ بِالْحَرَكاتِ التَّقْدِيرِيَّةِ**) بۆ باسکردنی ئیعرابی بە حەرەکەی «تَقْدِيرِيّ» (**أَوِ بِالْحُروفِ**) یاخود بۆ باسکردنی «إِعْرابِ» بە حرووفان (**وَذَلِكَ فِي الأَسْماءِ السِّتَّة وَكِلا وَالتَّثْنِيَةِ وَالْجَمْعِ الْمُصَحَّحِ**) کە ئەمانەش بریتی بوون لە بابەتی «أَسْماءُ السِّتَّة» و بابەتی «كِلا و كِلْتا» بابەتی «تَثْنِيَة» و بابەتی «جَمْعُ الْمُذَكَّرِ السَّالِم». ئینجا (**أَرادَ أَنْ يَذْكُرَ ما يَقْتَضِي الْعُدُولَ عَنِ الانْصِرافِ إِلَى**)

**عَدَمِ الاِنْصِرَافِ، أَعْنِي: أَسْبَابَ مَنْعِ الصَّرْفِ، وَهِيَ تِسْعَةٌ: الْعَلَمِيَّةُ، كَـ «زَيْنَبَ»؛ وَالتَّأْنِيث، كَـ «طَلْحَةَ»؛ وَوَزْنُ الْفِعْلِ، كَـ «أَحْمَدَ»؛**

**عَدَمِ الاِنْصِرافِ)** مامۆستا ویستی باسی شتێک بکات کە پێویست دەکات لابدەین لە باسکردن و ڕوونکردنەوەی ئەو ئیسمانەی کە «مُنْصَرِف»ـن، بۆ باسکردنی ئەو شتانەی کە «اِسْم» دەکەنە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» **(أَعْنِي أَسْبابَ مَنْعِ الصَّرْفِ)** مەبەستم باسکردنی هۆکارەکانی «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـە کە «جَرّ»ە و «تَنْوِين» لە ئیسم قەدەغە دەکەن. **(وَهِيَ تِسْعَةٌ)** کە ژمارەیان بریتییە لە نۆ هۆکاری سەرەکی:

**هۆکاری یەکەم: (اَلْعَلَمِيَّةُ)** واتە: هەر وشەیەک ناو بێت بۆ کەسێک یا بۆ شوێنێک یاخود بۆ شتێک، ئەوە هۆکارێکە بۆ ئەوەی ئیسمەکە ببێتە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» **(كَزَيْنَبَ)** وەکوو وشەی «زَيْنَب»، **سەرنج بدە:** ئێستا ئەم وشەیە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـە لەبەر «اَلْعَلَمِيَّة» و «التَّأْنِيث»، بۆیە «جَرّ»ە و«تَنْوِين»ـی لێ قەدەغە کراون، بۆیە دەگوترێت: «ذَهَبَتْ زَيْنَبُ، رَأَيْتُ زَيْنَبَ، مَرَرْتُ بِزَيْنَبَ».

**(وَ) هۆکاری دووەم: (التَّأْنِيث)** بریتییە لەوەی ئیسمەکە «مُؤَنَّث» بێت، ئینجا جیاوازی نییە وشەکە ناو بێت بۆ ڕەگەزی مێ[١] یاخود ناو بێت بۆ ڕەگەزی نێر، بەڵام وشەکە نیشانەی «تَأْنِيث»ـی پێوە بێت، وەکوو وشەی «طَلْحَة» و «نِعْمَة»[٢] بۆیە دەگوترێت: «جَاءَنِي طَلْحَةُ، رَأَيْتُ طَلْحَةَ، مَرَرْتُ بِطَلْحَةَ».

**(وَ) هۆکاری سێیەم: (وَزْنُ الْفِعْلِ)** بریتییە لە وەی ئیسمەکە لەسەر وەزنێکی تایبەت بێت لە ئەوزانی «فِعْل» **(كَـ)** وەکوو وشەی **(أَحْمَدَ)** **سەرنج بدە:** ئێستا ئەم وشەیە لەسەر وەزنی «أَفْعَلَ»یە، هەروەها «عَلَمِيَّة»ـیشی تێدایە، بۆیە «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی لێ قەدەغە کراون، بۆیە دەگوترێت: «جَاءَنِي أَحْمَدُ، رَأَيْتُ أَحْمَدَ، مَرَرْتُ بِأَحْمَدَ».

١. ئەگەر وشەکە ناو بێت بۆ ڕەگەزی مێ ئەوە پێی دەگوترێت: «مُؤَنَث»ـێکی حەقیقی. جُمل الزجاجي (٣٢٨/٢).

٢. بەڵام ئەگەر وشەکە ناو بێت بۆ ڕەگەزی نێر ئەوە پێی دەگوترێت: «مُؤَنَث»ـێکی «لَفظِي» یاخود «مَجازِي». شرح قطر النّدى و بلّ الصّدى: ل، (٤٢٠).

**وَالْوَصْفُ، كَـ «أَحْمَرَ»؛ وَالْعَدْلُ، كَـ «عُمَرَ»؛ وَالْجَمْعُ، كَـ «مَسَاجِدَ»؛ وَالتَّرْكِيبُ، كَـ «بَعْلَبَكَّ»؛ وَالْعُجْمَةُ كَـ «إِبْرَاهِيمَ»؛**

---

**(وَ) هۆكاری چوارەم: (الْوَصْفُ)** بریتییە لەوەی ئیسمەکە مانای «صِفَة» ببەخشێت وەکوو سوری یا سپی یاخود ڕەشی وەکوو وشەی **(أَحْمَرَ) سەرنج بدە:** ئێستا ئەم وشەیە «وَصْف»ـی تێدایە، هەروەها لەسەر وەزنی «أَفْعَلَ»یە بۆیە «جَرّ»ە و «تَنْوِین»ـی لێ قەدەغە کراون، بۆیە دەگوترێت: «هَذا أَحْمَرُ، رَأَیْتُ أَحْمَرَ، مَرَرْتُ بِأَحْمَرَ».

**(وَ) هۆکاری پێنجەم: (الْعَدْلُ)** بریتییە لەوەی ئیسمەکە لە وشەیەکی تر وەرگیرابێت وەکوو وشەی «عُمَر» کە لە «عامِر» وەرگیراوە (کَـ) وەکوو وشەی **(عُمَرَ)، سەرنج بدە:** ئێستا ئەم وشەیە «عَدْل»ـی تێدایە، هەروەها «عَلَمِیَّة»ـیشی تێدایە، بۆیە «جَرّ»ە و «تَنْوِین»ـی لێ قەدەغە کراون، دەگوترێت: «جَاءَنِي عُمَرُ، رَأَیْتُ عُمَرَ، مَرَرْتُ بِعُمَرَ».

**(وَ) هۆکاری شەشەم: (الْجَمْعُ)** بریتییە لەوەی ئیسمەکە «جَمْع» بێت و لەسەر وەزنی «مَفاعِلَ» یا خود «مَفاعِیلَ» بێت (کَـ) وەکوو وشەی **(مَساجِدَ) سەرنج بدە:** ئێستا ئەم وشەیە «جَمْع»ـە لەسەر سیغەی «مَفاعِلَ»یە، ئەم سەبەبەش بە تەنها بە دوو «سَبَب» هەژمار دەکرێت، بۆیە هەر وشەیەک بەم شێوەیە «جَمْع» بکرێت «جَرّ»ە و «تَنْوِین»ـی لێ قەدەغە دەکرێن، بۆیە دەگوترێت: «هَذِهِ مَساجِدُ، رَأَیْتُ مَساجِدَ، مَرَرْتُ بِمَساجِدَ».

**(وَ) هۆکاری حەوتەم: (التَّرْكِیبُ)** بریتییە لەوەی ئیسمەکە لە دوو بڕگەی سەرەکی یاخود زیاتر پێک هاتبێت وەکوو «بَعْلَبَكّ» و «حَضْرَمَوْتَ» (کَـ) وەکوو وشەی **(بَعْلَبَكّ) سەرنج بدە:** ئێستا ئەم وشەیە «تَرْكِیب»ـی تێدایە و لە دوو بڕگە پێک هاتووە بۆیە «جَرّ»ە و «تَنْوِین»ـی لێ قەدەغە کراون، بۆیە دەگوترێت: «هَذِهِ بَعْلَبَكُّ، رَأَیْتُ بَعْلَبَكَّ، مَرَرْتُ بِبَعْلَبَكَّ».

**(وَ) هۆکاری هەشتەم: (الْعُجْمَةُ)** بریتییە لەوەی ئیسمەکە ناوێکی غەیری عەرەبی بێت (کَـ) وەکوو وشەی **(إِبْراهِیم) سەرنج بدە:** ئێستا ئەم وشەیە ناوێکی غەیری

**وَالْأَلِفُ وَالنُّونُ الْمُضَارَعَتَانِ -أَي: الْمُشَابِهَتَانِ- لِأَلِفَي التَّأْنِيث، أَعْنِي: الْمَقْصُورَة وَالْمَمْدُودَةَ، مِثْلُ: «حُبْلَىٰ» وَ «حَمْرَاءَ»، كَـ «عِمْرَانَ».**

عەرەبییە (الْعُجْمَة)، هەروەها «عَلَمِيَّة»ـیشی تێدایە، بۆیە «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی لێ قەدەغە کراون، بۆیە دەگوترێت: «جَاءَنِي إِبْرَاهِيمُ، رَأَيْتُ إِبْرَاهِيمَ، مَرَرْتُ بِإِبْرَاهِيمَ».

**هۆکاری نۆیەم: (وَالأَلِفُ وَالنُّونُ الْمُضارِعَتانِ)** بریتییە لەوەی ئیسمەکە «أَلِف» و «نُون»ـێکی تێدا بێت **(أَيْ: اَلْمُشابِهَتانِ لأَلِفَيَ التَّأْنِيث)** کە دەشوبهێنە هەردوو «أَلِف»ـی «تَأْنِيث»ـێ **(أَعْنِي: اَلْمَقْصُورَةَ وَالْمَمْدُودَةَ)** کە یەکەم پێی دەگوترێت «الأَلِفُ الْمَقْصُورَة» و ئەوەی دووەمیش پێی دەگوترێت: «الأَلِفُ الْمَمْدُودَة» **(نَحْوُ)** نموونەی «الأَلِفُ الْمَقْصُورَة» وەکوو وشەی **(حُبْلَى، وَ)** نموونەی «الأَلِفُ الْمَمْدُودَة» وەکوو وشەی **(حَمْراءَ، كَـ)** نموونەی ئەو ئیسمەی کە «أَلِف» و «نُون»ـی زیادەی تێدایە وەکوو وشەی **(عِمْرانَ)** سەرنج بدە: ئێستا ئەم وشەیە «أَلِف» و «نُون»ـێکی زیادەی تێدایە بۆیە بووە بە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» و «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی لێ قەدەغە کراون، بۆیە دەگوترێت: «جَاءَنِي عِمْرانُ، رَأَيْتُ عِمْرانَ، مَرَرْتُ بِعِمْرانَ».[1]

## أسباب منع الصّرف تسعة

- العلميّة مثل: زينب
- التّأنيث مثل: طلحة
- وزن الفعل مثل: أحمد
- الوصف مثل: أحمر
- العدل مثل: عمر
- الجمع مثل: مساجد
- التّركيب مثل: بعلبك
- العجمة مثل: إبراهيم
- الألف والنون مثل: عمران

* ◌ *

١. بڕوانە: النحو الوافي: ١٩٧/١، وشرح كافية ابن الحاجب الكوردي: ٦٧/١.

**قَالَ: مَتَى اجْتَمَعَ فِي الِاسْمِ سَبَبَانِ مِنْهَا، أَوْ تَكَرَّرَ وَاحِدٌ، لَمْ يَنْصَرِفْ؛ إِلَّا مَا كَانَ عَلَىٰ ثَلَاثَةِ أَحْرُفٍ، سَاكِنَ الْوَسَطِ، كَ «نُوحٍ وَلُوطٍ»، فَإِنَّ فِيهِ مَذْهَبَيْنِ: الصَّرْفَ لِخِفَّتِهِ، وَعَدَمَ الصَّرْفِ لِحُصُولِ السَّبَبَيْنِ فِيْهِ.**

## وانەی چواردەهەم: چۆن «اِسْم» دەبێت بە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»؟

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: (مَتَى اِجْتَمَعَ فِي الِاسْمِ سَبَبانِ مِنْها) هەرکاتێک لە ناو ئیسمێکدا دوو هۆکار (سَبَب) کۆ بوونەوە لەم نۆ هۆکارانە لەوانەی ڕابووردوودا باسمان‌کردن (أَوْ تَكَرَّرَ واحِدٌ) یاخود یەک هۆکار (سَبَب) بەڵام دووجار دووبارە بوویەوە و لە جێگای دوو «سَبَب» هەژمار کرا (لَمْ يَنْصَرِفْ) ئەم ئیسمە نابێتە «مُنْصَرِف» بەڵکوو دەبێتە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» و «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی لێ قەدەغە دەکرێن، چونکە بە هۆی ئەم سەبەبانە ئەم ئیسمە قورس و گران دەبێت، بۆیە دەبێت تۆزێک باری سەر شانی سووک بکرێت، ئەم یاسایە هەموو جۆرە ئیسمێک دەگرێتەوە (إِلّا مَا كَانَ عَلَى ثَلاثَةِ أَحْرُفٍ سَاكِنِ الْوَسَطِ) تەنها ئیسمێک نەبێت کە لە سێ پیت (حرف) پێک هاتووە و حەرفی ناوەڕاستی «ساكن» بووە (كَ) وەکوو هەردوو وشەی (نُوحٍ وَ لُوطٍ) هەروەها وشەی «هِنْد» چونکە (فَإِنَّ فِيهِ أَيْ: فِي ذَلِكَ الِاسْمِ الَّذِي كَانَ عَلَى ثَلاثَةِ أَحْرُفٍ سَاكِنِ الْوَسَطِ) هەر وشەیەک بەم شێوەیە بێت کە لە سێ پیت (حَرْف) پێک هاتبێت حەرفی ناوەڕاستی ساکن بێت (مَذْهَبَيْنِ) دوو ڕا و بۆچوونی جیاواز هەن لەنێو زانایانی زانستی «نحو»، **بۆچوونی یەکەم:** بەشێک لە زانایان دەفەرموون: (اَلصَّرْفُ لِخِفَّتِهِ) ئەم جۆرە ئیسمە بە «مُنْصَرِف» دادەندرێت و «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی لێ قەدەغە ناکرێن، چونکە هیچ قورساییەکی تێدا نییە، (وَ) **بۆچوونی دووەم:** بەشێکی‌تر لە زانایان دەفەرموون: (عَدَمُ الصَّرْفِ) ئەم ئیسمە دەبێتە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» (لِحُصولِ السَّبَبَيْنِ فِيهِ) چونکە دوو هۆکاری «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـایەتی تێدا کۆ بوونەتەوە بۆیە «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی لێ قەدەغە دەکرێن.

٥ ٥

**أَقُولُ: لَمَّا عَدَّ أَسْبَابَ مَنْعِ الصَّرْفِ، أَرادَ أَنْ يَذْكُرَ شَرَائِطَهَا، فَقَالَ: مَتَى اجْتَمَعَ فِي الِاسْمِ سَبَبَانِ مِنْهَا، أَيْ: مِنَ الْأَسْبَابِ التِّسْعَةِ المَذكورَةِ أَوْ تَكَرَّرَ وَاحِدٌ مِنهَا، كَـ «الْجَمْعِ» وَ «أَلِفَي التَّأْنِيث»، فَإِنَّ كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مُكَرَّرٌ بِالْحَقِيقَةِ،**

(**أَقُولُ**) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرمویّت: منیش دەڵێم: (**لَمَّا عَدَّ أَسْبابَ مَنْعِ الصَّرْفِ**) لە کاتێکدا مامۆستا لە وانەی ڕابوردوو ئەو هۆکارانەی ژماردن کە «اسم» دەکەنە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» و «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی لێ قەدەغە دەکەن، (**أَرادَ أَنْ يَذْكُرَ شَرائِطَها**) ویستی لەم وانەیەدا باسی مەرجەکانی ئەو هۆکارانە بکات کە ئەو ئیسمە دەکەنە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» (**فَقالَ: مَتى اجْتَمَعَ فِي الِاسْمِ سَبَبانِ مِنْها**) هەرکاتێک لەناو ئیسمێکدا دوو هۆکار (سَبَب) لەو هۆکارانەی کە «اِسْم» دەکەنە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» کۆ بوونەوە (**أَيْ: مِنَ الأَسْبابِ التِّسْعَةِ الْمَذْكُورَةِ**) واتە: لەم نۆ هۆکارانەی کە لە وانەی ڕابووردوودا باسمان‌کردن (**أَوْ تَكَرَّرَ واحِدٌ مِنها**) یاخود یەک هۆکار (سَبَب) بێ، بەڵام دوو جار دووبارە بوویەوە و لە جێگای دوو «سَبَب» هەژمار کرابێت (**كَالْجَمْعِ**) وەکوو ئەو ئیسمەی کە «جَمْع» کرابێت و لەسەر وەزنی «مَفاعِلَ» یاخود «مَفاعِيلَ» بێت (**وَأَلِفَيْ التَّأْنِيث**) یاخود وەکوو «الأَلِفُ الْمَقْصُورَة» و «الأَلِفُ الْمَمْدُودَة» کە پێیان دەگوترێت «أَلِفَيْ التَّأْنِيث» (**فَإِنَّ كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مُكَرَّرٌ بِالْحَقِيقَةِ**)[1] چونکە هەریەکە لەم دوو وشەیە لە ڕاستیدا دوو جار دووبارە بۆتەوە، ئینجا هەرکاتێک ئیسمەکە دوو

١. سەبارەت بە «جَمْع» بۆیە بە دوو «سَبَب» هەژمار دەکرێت، چونکە ئەم «صیغة»یە پێی دەگوترێت «صیغة مُنْتَهى الْجموع»، واتا هەر وشەیەک لەسەر وەزنی ئەم «جَمْع»ـە بێت جارێکی‌تر «جَمْع» ناکرێتەوە، چونکە ئەم سیغەیە دوو جار «جَمْع» کراوەتەوە؛ سەرنج بدە: وشەی «كَلْب» جەمعەکەی وشەی «أَكْلُبْ» ئینجا ئەم وشەیە جارێکی‌تر لەسەر وەزنی «أَكالِبَ» جەمع دەکرێتەوە، کەواتە: هەر وشەیەکت بینی کە لەسەر وەزنی «مَفاعِلَ» بێت، وەکوو ئەوە وایە کە دووجار «جَمْع» کرابێت و دەبێتە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف».

سەبارەت بە «الأَلِفُ الْمَقْصُورَة» و «الأَلِفُ الْمَمْدُودَة» بۆیە بە دوو «سَبَبْ» حیساب دەکرێت، چونکە یەکەم: نیشانەی «تأنیث»ـە، دووەم: لەبەر ئەوەی «لازم الكلمة»یە واتە: بە هەر وشەیەکەوە نووسا ئەستەمە لێی جیا بێتەوە، وەکوو وشەی «حُبْلَى» و وشەی «حَمْراءَ» بڕوانە ئەم سەرچاوانە: الأصول في النحو (٩٠/٢) و شرح کافیة ابن حاجب(١٣٧/١) وشرح المفصل (١٥٠/١).

**لَمْ يَنْصَرِفْ ذٰلِكَ الِاسْمُ، أَي» يَكُونُ غَيْرَ مُنْصَرِفٍ، فَيُمْنَعُ مِنَ الْجَرِّ وَالتَّنْوِينِ؛ إِلَّا مَا كَانَ عَلَىٰ ثَلَاثَةِ أَحْرُفٍ سَاكِنَ الْوَسَطِ، كَـ «نُوحٍ» وَ«لُوطٍ»، فَإِنَّ فِي ذٰلِكَ الاسْمِ مَذْهَبَيْنِ:**

**أَحَدُهُمَا: الصَّرْفُ لِخِفَّتِهِ، فَإِنَّ الِاسْمَ إِنَّمَا يَصِيرُ غَيْرَ مُنْصَرِفٍ بِسَبَبِ الثِّقَلِ الْحَاصِلِ مِنَ السَّبَبَيْنِ، وَالثُّلَاثِيُّ السَّاكِنُ الْوَسَطِ فِي غَايَةِ الْخِفَّةِ، فَلَا يُؤَثِّرُ فِيهِ ثِقَلُ السَّبَبَيْنِ.**

---

سەبەبی تێدا بوون (**لَمْ يَنْصَرِفْ ذَلِكَ الِاسْمُ**) ئەم ئیسمە نابێتە «مُنْصَرِف» (**أَيْ: يَكُونُ غَيْرَ مُنْصَرِفٍ**) واتە: ئیسمەکە دەبێتە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» (**فَيُمْنَعُ مِنَ الْجَرِّ وَالتَّنْوِينِ**) کەواتە: «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی لێ قەدەغە دەکرێن و ناچنە سەری، چونکە بە هۆی ئەم سەبەبانە ئەم ئیسمە قورس و گران دەبێت، بۆیە دەبێت تۆزێک باری سەر شانی سووک بکرێت، ئەم یاسایە هەموو جۆرە ئیسمێک دەگرێتەوە (**إِلَّا مَا كَانَ عَلَى ثَلَاثَةِ أَحْرُفٍ سَاكِنِ الْوَسَطِ**) تەنها ئیسمێک نەبێت کە لە سێ پیت (حَرْف) پێک هاتبێت و حەرفی ناوەڕاستی «ساکن» بێت (**كَـ**) وەکوو هەردوو وشەی (**نُوحٍ وَ لُوطٍ**) هەروەها وشەی «هِنْد» (**فَإِنَّ فِي ذَلِكَ الِاسْمِ**) هەر وشەیەک بەم شێوەیە بێت کە لە سێ پیت «حَرْف» پێک هاتبێت حەرفی ناوەڕاستی «سَاكِن» بێت (**مَذْهَبَيْنِ:**) ئەوە دوو ڕاو بۆچوونی جیاواز هەن لە نێو زانایانی زانستی «نحو».

(**أَحَدُهُما: الصَّرْفُ لِخِفَّتِهِ**) بۆچوونی یەکەم: بەشێک لە زانایان دەفەرموون: ئەم جۆرە ئیسمە بە «مُنْصَرِف» دادەندرێت و «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی لێ قەدەغە ناکرێن، (**لأَنَّ الِاسْمَ إِنَّمَا يَصِيرُ غَيْرَ مُنْصَرِفٍ**) چونکە «اِسْم» بۆیە دەبێتە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» (**بِسَبَبِ الثِّقْلِ الْحاصِلِ مِنَ السَّبَبَيْنِ**) بەهۆی ئەم قورساییەی کە بەم دوو سەبەبە پەیدا بووە (**وَالثُّلاثِيُّ السَّاكِنُ الْوَسَطِ**) وە ئەو ئیسمە لەسەر سێ حەرفانە و حەرفی ناوەڕاستی ساکنە (**فِي غَايَةِ الْخِفَّةِ**) لەوپەڕی سووکیدایە (**فَلا يُؤَثِّرُ فِيهِ ثِقْلُ السَّبَبَيْنِ**) ئەوە قورسی ئەم دوو سەبەبانە هیچ کاری تێدا ناکات.

**وَالْمَذْهَبُ الثَّانِي: عَدَمُ الصَّرْفِ، لِحُصُولِ السَّبَبَيْنِ فِيهِ. وَ إِنَّمَا صَارَتِ الْأَسْبَابُ التِّسعَةُ مَانِعَةً مِنَ الصَّرْفِ لِأَنَّ الاِسْمَ بِسَبَبِهَا يُشْبِهُ الْفِعْلَ فِي الْفَرْعِيَّةِ، كَمَا ذَكَرْنَا؛ فَإِنَّ كُلّاً مِنْ هٰذِهِ الْأَسْبَابِ فَرْعٌ لِلْأَصْلِ: الْعَلَمِيَّةُ فَرْعٌ لِلتَّنْكِيرِ؛ وَالتَّأْنِيث لِلتَّذْكِيرِ؛ وَوَزْنُ الْفِعْلِ**

---

**(وَالْمَذْهَبُ الثَّانِي)** بۆچوونی دووەم: بەشێکی تر لە زانایان دەفەرموون: **(عَدَمُ الصَّرْفِ)** ئەم ئیسمە دەبێتە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» **(لِحُصولِ السَّبَبَيْنِ فِيهِ)** چونکە دوو هۆکاری «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـایەتی تێدا کۆ بوونەتەوە، بۆیە «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی لێ قەدەغە دەکرێن، هەرئیسمێکیش دووهۆکاری تێدا کۆبوونەوە دەبێتە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف».

**(وَ إِنَّمَا صَارَتِ الأَسْبابُ التِّسْعَةُ مَانِعَةً مِنَ الصَّرْفِ)** ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: بۆچی ئەم نۆ هۆکارانەی باسمانکردن «اِسْم» دەکەنە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» و «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی لێ قەدەغە دەکەن؟ **(لأَنَّ الاِسْمَ بَسَبَبِهَا)** چونکە «اِسْم» بە هۆی ئەم نۆ سەبەبانە **(يَشْبَهُ الْفِعْلَ)** دەشوبهێتە «فِعْل»ـێ **(فِي الْفَرْعِيَّةِ)**[1] لە دوو «فَرْعِيَّة»دا: **یەکەم:** چونکە «فِعْل» پێویستی بە «اِسْم» هەیە لە دروستکردنی «کلام»ـدا، **دووەم:** «فِعْل» لە ئیسمێ وەرگیراوە **(كَمَا ذَكَرْنَا)** هەروەکوو ئاماژەمان پێ دا لە وانەی هەشتەم (باسی «مُعرب»)، کەواتە: مادام ئەو ئیسمەی کە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـە دەشوبهێتە «فِعْل»ـێ و هەروەها «فِعْل» «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی ناچنە سەرێ، بۆیە ئەو ئیسمەی کە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـە «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی لێ قەدەغە دەکرێن و ناچنە سەری. **(فَإِنَّ كُلّاً مِنْ هَذِهِ الأَسْبابِ فَرْعٌ لِلأَصْلِ)** چونکە هەریەکە لەم نۆ سەبەبانە فەرعە لەبۆ «أَصْل»ـێک، هەر وەکوو «فِعْل» فەرع بوو بۆ «اِسْم»، بۆ نموونە **(اَلْعَلَمِيَّةُ)** هەر ئیسمێک کە ناو بێت بۆ کەسێک یاخود بۆ شوێنێک **(فَرْعُ لِلتَّنْكِيرِ)** فەرعە بۆ ئیسمێک کە «نَكِرَة» بێت **(وَالتَّأْنِيث)** هەر ئیسمێک کە «مُؤَنَّث» بێت **(لِلتَّذْكِيرِ)** فەرعە بۆ ئیسمێک کە ناو بێت بۆ «مُذَكَّر»ێک، **(وَ)** هەروەها **(وَزْنُ الْفِعْلِ)** هەر ئیسمێک کە لەسەر وەزنێکی تایبەت بێت بە ئیسمان

---

١. بڕوانە: اَلْمُقْتَضَبْ: ٢/ ٢٧٨، وأسرار العربية: ٥٤.

**لِوَزْنِ الِاسْمِ؛ وَالْوَصْفُ لِلْمَوْصُوفِ؛ وَالْعَدْلُ لِلْمَعْدُولِ عَنْهُ؛ وَالْجَمْعُ لِلْوَاحِدِ؛ وَالتَّرْكِيبُ لِلْمُفْرَدِ؛ وَالْعُجْمَةُ لِلْعَرَبِيَّةِ؛ وَالْأَلِفُ وَالنُّونُ لِمَدْخُولِهِمَا.**

**وَ إِنَّمَا احْتِيجَ فِي مَنْعِ الصَّرْفِ إِلَى السَّبَبَيْنِ، أَوْ تَكَرُّرِ وَاحِدٍ مِنْهَا؛ لِئَلَّا يَلْزَمَ مَنْعُ الصَّرْفِ الْمُخَالِفُ لِلْأَصْلِ فِي أَكْثَرِ الْأَسْمَاءِ، فَإِنَّ**

---

(**لِوَزْنِ الِاسْمِ**) فەرعە بۆ ئیسمێک لەسەر وەزنێکی تایبەت بێت بە ئیسمان. (**وَالوَصْفُ**) وە هەر ئیسمێک کە مانای وەسف ببەخشێت (**لِلْمَوْصُوفِ**) فەرعە بۆ ئەو ئیسمەی کە وەسفەکەی پێ ڕاوەستاوە، (**وَالْعَدْلُ**) وە هەر ئیسمێکی وەرگیراو، فەرعە (**لِلْمَعْدُولِ عَنْهُ**) بۆ ئەو ئیسمەی کە لێی وەرگیراوە، (**وَالْجَمْعُ**) وە هەر ئیسمێک کە «جَمْع» بێت و لەسەر وەزنی «مَفَاعِلَ» یاخود «مَفَاعِيلَ» بێت کە پێک هاتووە لە چەند تاکێک (مُفْرَد)، فەرعە (**لِلْواحِدِ**) بۆ ئەو «واحد»انەی کە جەمعەکەی لێ پێک هاتووە، (**وَالتَّرْكِيبُ**) وە هەر وشەیەک کە لە دوو برگە پێک هاتووە یاخود زیاتر، فەرعە (**لِلْمُفْرَدِ**) بۆ ئەو «مُفْرَد»انەی کە «مُرَكّب»ەکەی لێ پێک هاتووە، (**وَالْعُجْمَةُ**)[1] هەروەها هەر ناوێک غەیرە عەرەبی بێت، فەرعە (**لِلْعَرَبِيَّةِ**) بۆ ناوی عەرەبی، (**وَالأَلِفُ وَالنُّونُ**) وە هەر ئیسمێکیش ئەلیف و نوونی تێدا بێت، فەرعە (**لِمَدْخُولِهِما**) بۆ ئەو وشەیەی کە ئەلیف و نوونەکەی لەسەرن.

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: (**وَ إِنَّمَا احْتِيجَ فِي مَنْعِ الصَّرْفِ إِلَى سَبَبَيْنِ أَوْ تَكَرُّرِ واحِدٍ مِنْهَا**) بۆچی پێویستە بۆ ئەوەی «اِسْم» ببێتە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» دوو «سَبَبْ»ـی تێدا بن یاخود «سَبَبْ»ـێکی تێدا هەبێت دوو جار دووبارە ببێتەوە، وەکوو «جَمْع» و «أَلِفَي التَّأْنِيث»؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: (**لِئَلّا يَلْزَمَ مَنْعُ الصَّرْفِ الْمُخالِفِ لِلأَصْلِ فِي أَكْثَرِ الأَسْماءِ**) بۆ ئەوەی زۆربەی هەرە زۆری ئیسمەکان نەبن بە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» کە پێچەوانەی ئەسڵ و یاسایە لە زانستی «نَحْو»دا[2] (**فَإِنَّ**

---

١. بڕوانە: شرح جمل الزجاجي (٢/٣٤٠) وأسرار العربية: (٥٤) وشرح كافية ابن الحاجب الكردي: (٩٧).

٢. چونکە ئەسڵ وایە هەموو ئیسمێک «مُنْصَرِف» بێت «الأَصْلُ فِي الأَسْماءِ أَنْ تَكُونَ مُنْصَرِفَةً مُعْرَبَةً بِتَمامِ الْحَرَكاتِ». بڕوانە: شەرحی أنموذج: وانەی هەشتەم باسی «مُعْرَب» لەم کتێبە.

**أَكْثَرَ الْأَسْمَاءِ مُشَابِهَةٌ لِلْفِعْلِ فِي سَبَبٍ وَاحِدٍ مِنْ تِلْكَ الْأَسْبَابِ.**

**وَإِنَّمَا مَثَّلَ لِلثُّلَاثِيِّ الَّذِي فِيهِ مَذْهَبَانِ، بِـ «نُوحٍ وَلُوطٍ» احْتِرَازاً مِنَ الثُّلَاثِيِّ السَّاكِنِ الْوَسَطِ الَّذِي يَكُونُ فِيهِ ثَلَاثَةٌ مِنَ الْأَسْبَابِ، فَإِنَّهُ لَا يَنْصَرِفُ أَلْبَتَّةَ، كَـ «مَاهَ وَجُورَ»، إِذْ هُمَا عَلَمَانِ لِبَلْدَتَيْنِ، وَفِيهِمَا الْعُجْمَةُ**

---

**أَكْثَرَ الأَسْمَاءِ مُشابِهَةٌ لِلْفِعْلِ فِي سَبَبٍ وَاحِدٍ مِنْ تِلْكَ الأَسْبابِ)** چونکە زۆربەی هەرە زۆری ئیسمەکان لە یەک «سَبَبْ»ـدا دەشوبهێنە «فِعْل»ـێ، کەواتە: ئەگەر «اِسْم» بە یەک «سَبَب» ببێتە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» ئەوە زۆربەی هەرە زۆری ئیسمەکان دەبنە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» و کەمێکی زۆر کەم بە «مُنْصَرِف»ـایەتی دەمێنێتەوە، ئەو کاتە «فَرْع» زۆر زیاتر دەبێت لە «أَصْل» کە پێچەوانەی یاسای زانستی «نَحْوَ»ە.

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: **(وَإِنَّمَا مَثَّلَ لِلثُّلاثِيِّ الَّذِي فِيهِ مَذْهَبانِ بِنُوحٍ وَلُوطٍ)** بۆچی مامۆستا نموونەی بە وشەی «نُوح» و بە وشەی «لُوط» هێنایەوە بۆ ئەو وشەیەی کە سێ حەرفە و پیتی ناوەندی «سَاكِن»ـە کە دوو ڕای جیاوازی لەسەرە ئایا «مُنْصَرِف»ـە یاخود «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـە؟ **(اِحْتِرازاً مِنَ الثُّلاثِيِّ السّاكِنِ الْوَسَطِ)** بۆ ئەوەی خۆی بپارێزێ لەم وشەیەی کە سێ حەرفە و پیتی ناوەندی «ساكن»ـە **(الَّذِي يَكُونُ فِيهِ ثَلاثَةٌ مِنَ الأَسْبابِ)** کە سێ سەبەبی «مَنْعُ الصَّرْف»ـی تێدایە **(فَإِنَّهُ لا يَنْصَرِفُ اَلْبَتَّةَ)** چونکە ئەو وشەیە بە هیچ جۆرێک نابێتە «مُنْصَرِف» **(كَماهَ وَجورَ)** وەکوو وشەی «ماه» کە ناوی شارێکە لە وڵاتی ئێران[1]، هەروەها وەکوو وشەی «جُوْرَ» کە ئەویش ناوی شارێکە لە وڵاتی ئێران، بیست کیلۆمەتر لە شیراز دوورە[2]، ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: بۆچی ئەم دوو وشەیە سێ سەبەبی «مَنْعُ الصَّرْف»ـی تێدایە؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: **(إِذْ هُما عَلَمانِ لِبَلْدَتَيْنِ)** چونکە ئەم دوو وشەیە هەریەکەو ناوە لەبۆ شارێک، کەواتە: «عَلَمِيَّة»ـیان تێدایە **(وَفِيهِما الْعُجْمَةُ)** هەروەها هەردوو وشەکە

---

١. بڕوانە: معجم البلدان: (٣١/٥).

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو: (١٨١/٢).

**وَالتَّأْنِيث الْمَعْنَوِيُّ.**

ناوی عەرەبی نین، کەواتە: «عُجْمِيَّة»ـیشیان تێدایە **(وَالتَّأْنِيث الْمَعْنَوِيُّ)** هەروەها هەردوو وشەکە «التَّأْنِيث الْمَعْنَوِيّ»ـی تێدایە، چونکە ناوی هەموو شار و دێهاتێک «التَّأْنِيث»ـێکی «مَعْنَوِي» تێدایە، کەواتە ئەم دوو وشەیە و هاووێنەکانیان هەرگیز نابن بە «مُنْصَرِف»، ئەگەرچی لە سێ حەرفان پێک هاتوون و پیتی ناوەندیان ساکنە، چونکە سێ سەبەبی «مَنْعُ الصَّرْفِ»ـیان تێدایە، هەر ئیسمێکیش سێ سەبەبی تێدا بوون، هەرگیز نابێتەوە بە «مُنْصَرِف».

* ◌ *

**قَالَ: وَكُلُّ عَلَمٍ لَا يَنْصَرِفُ، يَنْصَرِفُ عِنْدَ التَّنْكِيرِ فِي الْغَالِبِ.**

**أَقُولُ: لَمَّا فَرَغَ مِنْ ذِكْرِ الْأَسْبَابِ الَّتِي تَمْنَعُ الصَّرْفَ وَمَا يَتَعَلَّقُ بِهَا، أَرَادَ أَنْ يُشِيرَ إِلَىٰ قَاعِدَةٍ تُفِيدُكَ فَائِدَةً، وَهِيَ: أَنَّ غَيْرَ الْعَلَمِيَّةِ مِنَ الْأَسْبَابِ التِّسعَةِ لَا يَزُولُ عَنِ الِاسْمِ بِالْكُلِّيَّةِ أَلْبَتَّةَ. وَأَمَّا الْعَلَمِيَّةُ فَقَدْ تَزُولُ بِقَصْدِ التَّنْكِيرِ،**

## وانەی پازدەهەم: چۆن ئیسمێکی «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» دەبێتەوە بە «مُنْصَرِف»؟

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: (وَكُلُّ عَلَمٍ لا يَنْصَرِفُ) هەر ئیسمێک بە هۆی «عَلَمِيَّة»ـەوە ببێتە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» و «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی لێ قەدەغە کرابن (يَنْصَرِفُ عِنْدَ التَّنْكِيرِ فِي الْغالِبِ) ئەوە ئەو ئیسمە بە زۆری وایە دەبێتەوە بە «مُنْصَرِف»، ئەگەر بێت و «عَلَمِيَّة»ـەکەی تێدا نەمێنێت و بڕوات و «قَصْدُ التَّنْكِير»ـی لێ بکرێت و بە شێوەیەک مەبەستت بە وشەکە تەنها کەسێکی دیاریکراو نەبێت، بەڵکوو مەبەستت چەند کەسێک بێت کە هەڵگری هەمان ناون.

(أَقُولُ) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (لَمَّا فَرَغَ مِنْ ذِكْرِ الأَسْبابِ الَّتِي تَمْنَعُ الصَّرْفَ وَمَا يَتَعَلَّقُ بِها) لە کاتێکدا مامۆستا لەوانەی ڕابوردوو ئەم هۆکارانەی ژماردن کە ئیسم دەکەنە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» و «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی لێ قەدەغە دەکەن، وە ئەو پرسانەی کە پەیوەندییان بەم بابەتەوە هەیە (أَرادَ) مامۆستا ویستی (أَنْ يُشِيرَ إِلَى قَاعِدَةٍ تُفِيدُكَ فائِدَةً تامَّةً) ئاماژە بە یاسایەک بکات کە سوود و قازانجێکی تەواوت پێ دەگەیەنێت و بەرچاوت ڕۆشن دەکات لە بارەی ئەم هۆکارانەی کە ئیسم دەکەنە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»، (وَهِيَ) یاساکەش بریتییە لەوەی (أَنَّ غَيْرَ الْعَلَمِيَّةِ مِنَ الأَسْبابِ التِّسْعَةِ) کە جگە لە «عَلَمِيَّة» لە هەر نۆ سەبەبەکەی «مَنْعُ الصَّرْفِ» (لا يَزُولُ عَنِ الِاسْمِ بِالْكُلِّيَّةِ اَلْبَتَّةَ) بە هیچ شێوەیەک لەناو ئەو ئیسمە ناڕۆن و ناچنە دەرەوە، بەڵکوو هەروەکوو خۆیان دەمێننەوە بە کاریگەری.

(وَأَمَّا الْعَلَمِيَّةُ) بەڵام سەبارەت بە «عَلَمِيَّة» (فَقَدْ تَزُولُ بِقَصْدِ التَّنْكِيرِ) لە

**أَعْنِي: الْعُمُومَ فِي ذٰلِكَ الِاسْمِ، نَحْوُ: «رُبَّ أَحْمَدٍ كَرِيمٍ لَقِيتُهُ»؛ وَحِينَئِذٍ يُنْظَرُ فِيهِ: فَإِنْ لَمْ تَكُنِ الْعَلَمِيَّةُ فِي ذٰلِكَ الِاسْمِ سَبَباً لِمَنْعِ الصَّرْفِ، لَا يَصِيرُ مُنْصَرِفاً بِزَوَالِهَا، كَـ «مَسَاجِدَ»، إِذَا جُعِلَ عَلَماً ثُمَّ نُكِّرَ؛**

---

ڕاستیدا ئەگەر بێت و ئیسمەکە «قَصْدُ التَّنْكِير»ی لێ بکرێت «عَلَمِيَّة»ـەکەی تێدا نامێنێت و دەڕوات (أَعْنِي:) مەبەستم ئەوەیە (**الْعُمُومَ فِي ذَلِكَ الِاسْمِ**) کە ئیسمەکە «عام» بکرێت، بە شێوەیەک مەبەستت بە وشەکە تەنها کەسێکی دیاریکراو نەبێت، بەڵکوو مەبەست چەند کەسێک بێت کە هەڵگری هەمان ناون، (**نَحْوُ:**) وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: (**رُبَّ أَحْمَدٍ كَرِيمٍ لَقِيتُهُ**) واتە: کەم «أَحْمَد» هەن کە خاوەن سەخاوەت بن من ئاشنایان ببم، سەرنج بدە: وشەی «أَحْمَدَ» لێرەدا بە مانای یەک کەس نایەت، چونکە «قَصْدُ التَّنْكِير»ی لێ کراوە و «عَلَمِيَّة»ـەکەی تێدا نەماوە، بەڵکوو بە مانای چەند «أَحْمَد»ێک دێت، بۆیە ئیسمەکە بۆتەوە بە «مُنْصَرِف» و «جَرّ»ە و«تَنْوِين»ـی چوونەتەوە سەر. (**وَحِينَئِذٍ يُنْظَرُ فِيهِ**) ئینجا پاش ئەوەی ئیسمەکە «قَصْدُ التَّنْكِير»ی لێ کرا و «عَلَمِيَّة»ـەکەی تێدا نەما، تەماشا دەکەین: (**فَإِنْ لَمْ تَكُنِ الْعَلَمِيَّةُ فِي ذَلِكَ الِاسْمِ**) ئەگەر بێت و «عَلَمِيَّة» لەم ئیسمەدا (**سَبَباً لِمَنْعِ الصَّرْفِ**) هۆکارێکی سەرەکی نەبوو بۆ ئەوەی ئیسمەکە ببێتە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» و «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی لێ قەدەغە بکرێن، (**لا يَصِيرُ مُنْصَرِفاً بِزَوالِها**)[1] ئەوە ئیسمەکە نابێتەوە بە «مُنْصَرِف» و «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی وێ نادرێنەوە ئەگەر«عَلَمِيَّة»ـی تێدا نەما و «قصد التّنكير»ی لێ کرا، چونکە ئیسمەکە بە هۆی «عَلَمِيَّة»ـەوە نەبووە بە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» تاوەکوو بە ڕۆویشتنی ببێتەوە بە «مُنْصَرِف» (**كَـ**) وەکوو وشەی (مَساجِدَ)، (**إِذا جُعِلَ عَلَماً**) ئەگەر بێت و بکرێت بە ناو بۆ کەسێک (**ثُمَّ نُكِّرَ**) پاشان «قَصْدُ التَّنْكِير»ی لێ بکرێت، ئەو کاتە وشەی «مَساجِدَ» نابێتە «مُنْصَرِف»، چونکە ئەم وشەیە لەبەر «جَمْع» بووە بە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» کە «صِيغَةُ مُنْتَهى الْجُمُوع»ـە، بۆیە ئەگەر «عَلَمِيَّة»ـیشی تێدا نەمێنێت هەر بە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» حیساب دەکرێت و

---

١. بڕوانە: شَرْحُ الْمُفَصَّل: ١/ ١٨٦.

**وَإِنْ كَانَتِ الْعَلَمِيَّةُ سَبَباً لِمَنْعِ الصَّرْفِ، يَنْصَرِفُ ذٰلِكَ الِاسْمُ بِالتَّنْكِيرِ فِي الْغَالِبِ، نَحْوُ: «أَحْمَدَ»؛ لِأَنَّ الِاسْمَ كَمَا أَنَّهُ لَا يَنْصَرِفُ بِعُرُوضِ الْعَلَمِيَّةِ يَنْصَرِفُ بِزَوَالِهَا.**

**وَإِنَّمَا قَالَ: «فِي الْغَالِبِ» احْتِرَازاً عَنْ نَحْوِ: «أَحْمَرَ»؛ فَإِنَّهُ غَيْرُ مُنْصَرِفٍ لِوَزْنِ الْفِعْلِ وَالْوَصْفِ؛**

---

«جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی وێ نادرێنەوە، چونکە ئەم ئیسمە بە هۆی «عَلَمِيَّة»ـەوە نەبووە بە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» تاوەکوو بە ڕۆویشتنی «عَلَمِيَّة» ببێتەوە بە «مُنْصَرِف».

**(وَإِنْ كَانَتِ الْعَلَمِيَّةُ)** بەڵام ئەگەر بێت و «عَلَمِيَّة» لەو ئیسمەدا **(سَبَباً لِمَنْعِ الصَّرْفِ)** هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ ئەوەی ئیسمەکە ببێتە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» و «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی لێ قەدەغە بکرێن **(يَنْصَرِفُ ذَلِكَ الِاسْمُ بِالتَنْكِيرِ فِي الْغالِبِ)** ئەوە ئیسمەکە بە زۆری وایە دەبێتەوە بە «مُنْصَرِف» و «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی دەچنەوە سەر **(نَحْوُ:)** وەکوو وشەی **(أَحْمَدَ)** لەم نموونەیەی کە دەڵێت: «رُبَّ أَحْمَدٍ كَرِيمٍ لَقِيتُهُ» واتە: کەم «أَحْمَد» هەن کە خاوەن سەخاوەت بن من ئاشنایان ببم، **سەرنج بدە:** وشەی «أَحْمَدَ» لێرەدا بە مانای یەک کەس نایەت چونکە «قَصْدُ التَّنْكِير»ی لێ کراوە و «عَلَمِيَّة»ـەکەی تێدا نەماوە، بەڵکوو بە مانای چەند ئەحمەدێک دێت **(لأَنَّ الِاسْمَ كَمَا أَنَّهُ لا يَنْصَرِفُ بِعُروضِ الْعَلَمِيَّةِ)** چونکە «اِسْم» چۆن بە هۆی هاتنی «عَلَمِيَّة» دەبێتە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» **(يَنْصَرِفُ بِزَوالِها)** بە هەمان شێوەش بە هۆی لاچوون و ڕۆویشتنی «عَلَمِيَّة» دەبێتەوە بە «مُنْصَرِف»، هەروەکوو نموونەی تازە باسمان کرد.

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: **(وَإِنَّما قَالَ فِي الْغالِبِ)** بۆچی مامۆستا گوتی: بە زۆری وایە هەر ئیسمێک بە هۆی «عَلَمِيَّة» ببێتە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» بە هۆی لاچوون و ڕۆویشتنی «عَلَمِيَّة» دەبێتەوە بە «مُنْصَرِف»؟ بۆچی نەیگوت: ئەمە یاسایەکی گشتییە؟ **(احْتِرازاً عَنْ نَحْوِ: أَحْمَرَ)** بۆ ئەوەی خۆی بپارێزیت لەو وشانەی کە لەسەر وەزنی «أَفْعَلَ»نە و مانای «وَصْفِيَّة»ـیان تێدایە، وەکوو وشەی «أَحْمَرَ» یاخود «أَبْيَضَ» و «أَسْوَدَ» **(فَإِنَّهُ غَيْرُ مُنْصَرِفٍ لِوَزْنِ الْفِعْلِ وَالْوَصْفِ)** چونکە ئەم جۆرە وشانە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـن لەبەر دوو هۆکار (سَبَبْ) **یەکەم:** لەبەر «وَزْنُ الْفِعْل» **دووەم:** لەبەر «وَصْفِيَة».

**فَإِنْ جُعِلَ عَلَماً، لَا يَنصَرِفُ أَيْضاً لِوَزْنِ الْفِعْلِ وَالْعَلَمِيَّةِ. وَحِينَئِذٍ لَا تُعْتَبَرُ وَصْفِيَّتُهُ؛ لِأَنَّهَا تُضَادُّ الْعَلَمِيَّةَ؛ فَإِذَا نُكِّرَ، لَا يَصِيرُ مُنْصَرِفاً، بَلْ يَبْقَىٰ غَيْرَ مُنْصَرِفٍ كَذَلِكَ؛ لِأَنَّ الْوَصْفِيَّةَ الزَّائِلَةَ بِالْعَلَمِيَّةِ قَدْ تَعُودُ بِزَوَالِهَا، وَهٰذَا مَذْهَبُ سِيبَوَيْهِ، وَعِنْدَ الأَخْفَشِ يَنْصَرِفُ**

---

**(فَإِنْ جُعِلَ عَلَماً)** ئینجا ئەگەر ئەم جۆرە وشانە بکرێن بە ناو (عَلَم) بۆ کەسێک، لەم حاڵەتەدا «وَصْفِيَّة» دەڕوات، بەڵام **(لا يَنْصَرِفُ أَيْضاً)** هەروەکوو خۆیان بە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـی دەمێننەوە **(لِوَزْنِ الْفِعْلِ وَالْعَلَمِيَّةِ)** لەبەر دوو هۆکار، **یەکەم:** لەبەر «وَزْنُ الْفِعْل»، **دووەم:** لەبەر «عَلَمِيَّة»، **(وَحِينَئِذٍ)** وە لەم کاتەی کە کراوە بە ناو (عَلَم) **(لا تُعْتَبَرُ وَصْفِيَتُهُ)** هیچ ئیعتیبارێک بۆ «وَصْفِيَّة»ـی پێشووی دانانرێت **(لأَنَّهَا تُضَادُّ الْعَلَمِيَّةَ)**[1] چونکە «وَصْفِيَّة» پێچەوانە و دژی «عَلَمِيَّة»ـە و لە هیچ شوێنێک بەیەکەوە کۆ نابنەوە، **(وَ إِذا نُكِّرَ)** ئینجا ئەگەر لەم کاتەدا ئەم وشەیە «قَصْدُ التَّنْكِير»ی لێ کرابێت **(لا يَصِيرُ مُنْصَرِفاً)** نابێتەوە بە «مُنْصَرِف» **(بَلْ يَبْقَى غَيْرَ مُنْصَرِفٍ كَذَلِكَ)** بەڵکوو هەروەکوو خۆی بە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـی دەمێنێتەوە. **(لأَنَّ الْوَصْفِيَّةَ الزائِلَةَ بِالْعَلَمِيَّةِ)** چونکە ئەم «وَصْفِيَّة»ـەی کە بە هۆی «عَلَمِيَّة»ـەوە ڕۆویشتووە **(قَدْ تَعُودُ بِزَوَالِها)** ئەگەر ئەم «عَلَمِيَّة»ـە بڕوات و نەمێنیت «وَصْفِيَّة»ـەکە دەگەڕێتەوە شوێنی خۆی، بۆیە ئیسمەکە هەر بە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» دەمێنێتەوە و «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی ناچنە سەر، **(وَهَذا مَذْهَبُ سِيبَوَيْهِ)**[2] ئەمەی کە باسمانکرد ڕا و بۆچوونی پێشەوا «سِيبَوَيْه»ـیە، **(وَعِنْدَ الأَخْفَشِ يَنْصَرِفُ)** بەڵام ڕا و بۆچوونی پێشەوا «أَخْفَش»[3]

---

١. بڕوانە: شرح ابن عقيل: ١/ ٢٧٩، وشرح المفصل: (١٩٢/١) وشرح التصريح: (٣٥٠/٢).

٢. ناوی تەواوی بریتییە لە «عمرو بن عثمان بن قنبر» لە ساڵی (١٤٨هـ ـ٧٦٥م) لە وڵاتی ئێران لە دایک بووە، لەقەبی «أبو بشر» بووە بەڵام دواتر بە «سيبويه» ناوبانگی دەرکردووە، یەکێکە لە دیارترین زانایانی زانستی «نحو»، خاوەنی نایابترین کتێبە لەم زانستەدا بە ناوی «الكتاب»، لە ساڵی (١٨٠هـ ـ٧٩٦م) لە شیراز کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: النجوم الزاهرة (١٠٣/٢).

٣. ناوی تەواوی «الأخفش الأوسط» بریتییە: «أبو الحسن سعيد بن مسعدة» لە ساڵی(٧٥٥م) لە دایک بووە، لە ساڵی (٨٣٠م) کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: معجم الأدباء: ٢٢٤/١١.

**لأَنَّ الزَّائِلَ لا يَعُودُ.**

❋ ❋ ❋

---

ئەوەیە: کە ئیسمەکە دەبێتەوە بە «مُنْصَرِف» و «جَرّ»ە و «تَنْوِين»ـی دەچنەوە سەر **(لأَنَّ الزَّائِلَ لا يَعُودُ)** چونکە پێشەوا «أَخْفَش» دەفەرموێت: شتێک ئەگەر ڕۆویشت جارێکیتر ناگەڕێتەوە.

**ئینجا بزانە:** «غَيْرُ الْمُنْصَرِف» بەم سێ ڕێگەیە «جَرّ» و «تَنْوِين»ی دەچنە سەر:

حاڵەتی یەکەم: ئەگەر ئیسمەکە «قَصْدُ التَّنْكِير»ی لێ بکرێت وەکوو باسمانکرد، نموونەکەی «مَرَرْتُ بِأَحْمَدِكُمْ».

حاڵەتی دووەم: ئەگەر ئەو ئیسمەی کە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـە «إِضافَة» بکرێت بۆ لای وشەیەکیتر (ئیسمێک) وەکوو «مَرَرْتُ بِأَحْمَدِكُمْ».

حاڵەتی سێیەم: ئەگەر ئەو ئیسمەی کە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـە ئەلیف و لامی بچێتە سەر (أَلْ) وەکوو «مَرَرْتُ بِالأَحْمَرِ».

* ◌ *

## بَابُ المَرفوعَاتِ

**قَالَ: الْمَرْفُوعَاتُ عَلَىٰ ضَرْبَيْنِ: أَصْلٍ وَمُلْحَقٍ بِهِ، فَالْأَصْلُ: هُوَ الْفَاعِلُ، وَهُوَ عَلَىٰ نَوْعَيْنِ: مُظْهَرٍ، كَـ «ضَرَبَ زَيْدٌ»، وَمُضْمَرٍ، نَحْوُ: «ضَرَبْتُ زَيْداً، وَزَيْدٌ ضَرَبَ».**

---

### وانەی شازدەهەم: باسی ئەو ئیسمانەی کە «مَرْفُوع» دەبن

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: (اَلْمَرْفُوعاتُ عَلى ضَرْبَيْنِ:) ئەو ئیسمانەی کە «مَرْفُوع» دەبن، دوو جۆریان هەیە، جۆری یەکەم: (أَصْلٌ) پێی دەگوترێت ئەسڵ (وَ) هەروەها جۆری دووەم: (مُلْحَقٌ بِهِ) پێی دەگوترێت: «مُلْحَق» بە ئەسڵ؛ ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: (فَالأَصْلُ هُوَ: الْفاعِلُ)[1] ئەوەی پێی دەگوترێت ئەسڵ لە نێو هەموو ئەو ئیسمانەی کە «مَرْفُوع» دەبن بریتییە لەو ئیسمەی کە دەبێتە «فاعِل»، جیاوازی نییە فیعلەکەی «ماضِي» بێت یا «مُضارِعْ» یاخود «أَمْر» بێت؛ ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: (وَهُوَ عَلَى نَوْعَيْنِ:) ئەو ئیسمەی دەبێتە «فاعل» دوو جۆری هەیە: (مُظْهَرٌ) جۆری یەکەم: پێی دەگوترێت «فاعل»ـی ئاشکرا و بەرچاو (كَـ) وەکوو ئەم نموونەی کە دەفەرموێت: (ضَرَبَ زَيْدٌ، وَ) هەروەها جۆری دووەم: پێی دەگوترێت «فاعل»ـێکی (مُضْمَر) واتە: فاعیلەکە ئیسمێکی ئاشکرا نییە، بەڵکوو «ضمیر»ە؛ ئینجا ئەم «ضمیر»ە: یا بە «فیعلەکەوە نووساوە (كَـ) وەکوو ئەم نموونەی کە دەفەرموێت: (ضَرَبْتُ زَيْداً) سەرنج بدە: ئێستا وشەی «ضَرَب» فاعیلێکی «بارز»ی پێوە نووساوە کە بریتییە لە وشەی «تُ» (وَ) یاخود فاعیلەکە لەناو فیعلەکەوە شاردراوەتەوە و «مُسْتَتِر»ە، وەکوو ئەم نموونەیە: (زَيْدٌ ضَرَبَ) سەرنج بدە: ئێستا لەناو وشەی «ضَرَبَ» فاعیلێکی شاراوە (مُسْتَتِر) هەیە کە بریتییە لە وشەی «هُوَ» و دەگەڕێتەوە بۆ لای «زید».

° °

---

١. بڕوانە: شرح التصريح: ٢/٣٥٠.

**أَقُولُ: لَمَّا كَانَ الصِّنْفُ الثَّالِثُ مِنْ أَصْنَافِ الِاسْمِ، وَهُوَ الْمُعْرَبُ عَلَىٰ ثَلَاثَةِ أَقْسَامٍ، أَعْنِي: مَرْفُوعاً وَمَنْصُوباً وَمَجْرُوراً؛ وَكَانَ لِكُلِّ قِسْمٍ مِنْهَا أَفْرَادٌ مُتَعَدِّدَةٌ، أَرَادَ الْمُصَنِّفُ أَنْ يَذْكُرَ تِلْكَ الْأَفْرَادَ عَلَىٰ وَجْهٍ يَقْتَضِيهِ الْوَضْعُ، فَقَدَّمَ الْمَرْفُوعَاتِ عَلَى الْمَنْصُوبَاتِ وَالْمَجْرُورَاتِ؛ لِأَنَّ الْمَرْفُوعَ أَصْلٌ، وَهُمَا فَرْعَانِ؛ إِذِ الْكَلَامُ إِنَّمَا يَتِمُّ بِالْمَرْفُوعِ وَحْدَهُ**

---

(**أَقُولُ**) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (**لَمَّا كَانَ الصِّنْفُ الثَّالِثُ مِنْ أَصْنافِ الِاسْمِ**) لە کاتێکدا بەشی سێیەم لە بەشەکانی «اِسْم» ـکە بریتی بوو لە «مُعْرَب»ـ سێ بەشی هەبوو (**أَعْنِي:**) مەبەستم ئەوەیە کە بەشی یەکەمی بریتی بوو (**مَرْفُوعاً**) لەو ئیسمانەی کە «مَرْفُوع» دەبن (**وَمَنْصُوباً**) بەشی دووەمی بریتی بوو لەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوب» دەبن (**وَمَجْرُوراً**) بەشی سێیەمی بریتی بوو لەو ئیسمانەی کە «مَجْرُور» دەبن (**وَكَانَ لِكُلِّ قِسْمٍ مِنْها**) لە هەمان کاتدا هەر بەشێک لەم سێ بەشانە (**أَفْرادٌ مُتَعَدِّدَةٌ**) چەند جۆر و بابەتێکی جیاواز و تایبەت بە خۆی هەبوون، (**أَرادَ الْمُصَنِّفُ**) مامۆستا ویستی (**أَنْ يَذْكُرَ تِلْكَ الأَفْرادَ عَلَى وَجْهٍ يَقْتَضِيهِ الْوَضْعُ**)[1] هەموو ئەم بەشانە بە شێوەیەکی گونجاو لەگەڵ ئاستی تێگەیشتنی قوتابیان لەم قۆناغەدا باس بکات، بە گوێرەی یاسا و دانانی زانایانی زانستی زمانی عەرەبی؛ (**فَقَدَّمَ الْمَرْفُوعاتِ عَلَى الْمَنْصُوباتِ، وَالْمَجْرُوراتِ**) ئینجا مامۆستا باسی ئەو ئیسمانەی کە «مَرْفُوع» دەبن وەپێش خست لەسەر ئەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوب» دەبن، هەروەها پێشی خست لەسەر ئەو ئیسمانەی کە «مَجْرُور» دەبن (**لأَنَّ الْمَرْفُوعَ أَصْلُ**) چونکە ئەو ئیسمەی کە «مَرْفُوع» دەبێت ئەسڵە و (**وَهُما فَرْعانِ**) وە ئەو ئیسمەی کە «مَنْصُوب» دەبێت و ئەوەی کە «مَجْرُور» دەبێت هەردووکیان فەرعن؛ بۆچی ئەو ئیسمە کە «مَرْفُوع» دەبێت ئەسڵە؟ (**إِذْ الْكَلامُ إِنَّما يَتِمُّ بِالْمَرْفُوعِ وَحْدَهُ**) چونکە ڕستە (کلام) بە تەنها بەو ئیسمە دروست دەبێ کە «مَرْفُوع» بێت و هیچ پێویستی بەو ئیسمە نییە کە «مَنْصُوب» دەبێت، هەروەها هیچ پێویستی بەو

١. واتە: يقتضيه الوضع العربي، بڕوانە: حاشية الصبان: (٣٠/١).

**دُونَ الْمَنْصُوبِ وَالْمَجْرُورِ، فَيُقَالُ: «قَامَ زَيْدٌ وَزَيْدٌ قَائِمٌ»، وَلَا يُقَالُ: «زَيْداً أَوْ بِزَيْدٍ أَوْ غُلَامَ زَيْدٍ».**

**وَالْمَرْفُوعَاتُ عَلَىٰ ضَرْبَيْنِ: أَصْلٍ وَمُلْحَقٍ بِهِ. وَالْأَصْلُ هُوَ الْفَاعِلُ؛ لِأَنَّ عَامِلَهُ فِعْلٌ حَقِيقِيٌّ غَالِباً، وَعَامِلَ بَاقِي الْمَرْفُوعَاتِ لَيْسَ كَذٰلِكَ.**

---

ئیسمە نییە کە «مَجْرُور» دەبێت، **(دُونَ الْمَنْصُوبِ وَالْمَجْرُورِ)** بەڵام ئەو ئیسمە کە «مَنْصُوب» دەبێت و ئەو ئیسمەی کە «مَجْرُور» دەبێت ڕستە و «کَلام»ـیان بە تەنها پێ دروست نابێت، بەڵکوو پێویستیان بەو ئیسمە هەیە کە «مَرْفُوع» دەبێت **(فَيُقالُ)** بۆیە دەگوترێت: **(قَامَ زَيْدٌ، وَ زَيْدٌ قَائِمٌ)**، سەرنج بدە: لەم دوو ڕستەیەدا بە ئیسمێکی «مَرْفُوع» کەلام دروست بووە و پێک هاتووە **(وَلا يُقالُ)** بەڵام بە ئیسمێکی «مَنصوب» وەکوو **(زَيْداً، أَوْ)** یاخود بە ئیسمێکی «مَجْرُور» وەکوو **(بِزَيْدٍ، أَوْ)** یاخود وەکوو **(غُلامُ زَيْدٍ)** ڕستە دروست نابێت بە تەنها، کەواتە: بەم وشانە ناگوترێت «کلام».

**(وَالْمَرْفُوعاتُ عَلى ضَرْبَيْنِ:)** ئەو ئیسمانەی کە «مَرْفُوع» دەبن، دوو جۆریان هەیە، جۆری یەکەم: **(أَصْلٌ)** پێی دەگوترێت ئەسڵ **(وَ)** جۆری دووەم: **(مُلْحَقٌ بِهِ)** پێی دەگوترێت: «مُلْحَق» بە ئەسڵ، ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: **(فَالأَصْلُ هُوَ: الْفاعِلُ)**[1] ئەوەی پێی دەگوترێت ئەسڵ ـ لە نێو هەموو ئەو ئیسمانەی کە «مَرْفُوع» دەبن ـ بریتییە لەو ئیسمەی کە دەبێتە «فاعِل»، جیاوازی نییە فیعلەکەی «ماضِي» بێت یاخود «مُضارِعْ» یاخود «أَمْر» بێت.

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: بۆچی لە نێو هەموو ئەو ئیسمانەی کە مەرفووع دەبن «فاعِل» ئەسڵە؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: لەبەر چەند هۆکارێک، **یەکەم: (لأَنَّ عامِلَهُ)** چونکە ئەو «عامِل»ـەی کە فاعیل «مَرْفُوع» دەکات و ئیشی تێدا دەکات **(فِعْلٌ حَقِيقِيٌّ غالِباً)** بە زۆری وایە کە فیعلێکی حەقیقییە **(وَعامِلُ باقِي الْمَرْفُوعاتِ لَيْسَ كَذَلِكَ)** بەڵام ئەو عامیلەی کە ئیسمەکانی‌تر مەرفووع[2] دەکات

---

١. بڕوانە: شرح ابن عقیل: ١٤٨/١، وشرح المفصل: ١٩١/١.

٢. ئینجا بزانە ئەی قوتابی بەڕێز: هەریەکە لە وشەی «رَفْع» و «نَصْب» و «جَرّ» بۆ ئەو ئیسمانە ☜

**وَالْفِعْلُ الْحَقِيقِيُّ أَصْلٌ فِي الْعَمَلِ، فَمَعْمُولُهُ أَيْضاً يَكُونُ أَصْلاً بِالْقِيَاسِ إِلَىٰ مَعْمُولِ غَيْرِهِ.**

**وَ إِنَّمَا جُعِلَ الْفَاعِلُ مَرْفُوعاً، وَالْمَفْعُولُ مَنْصُوباً، وَالْمُضَافُ إِلَيْهِ مَجْرُوراً؛ لِأَنَّ الرَّفْعَ -أَعْنِي: الضَّمَّ-**

---

بەم شێوەیە نییە، واتە: فیعلێکی حەقیقی نییە، بەڵکوو «شِبْهُ الْفِعْل»ـە یاخود «حَرْف»ـە (فالْفِعْلُ الْحَقِيقِيُّ أَصْلٌ فِي الْعَمَلِ) ئینجا ئەوەش بزانە کە فیعلی حەقیقی ئەسڵە لە کارکردن (فَمَعْمُولُهُ) کەواتە: ئەو ئیسمەی کە فیعلێکی حەقیقی مەرفووع دەکات و ئیشی تێدا دەکات (أَيْضاً) وەکوو خودی فیعلەکە (يَكُونُ أَصْلاً)ئەویشیان دەبێتە ئەسڵ (بِالْقِياسِ إِلَى مَعْمُولِ غَيْرِهِ) بە بەراورد بەو ئیسمانەی کە بە عامیلێکی‌تر «مَرْفُوع» دەبن.

دووەم: چونکە ئەو «عامِل»ـەی کە کار لە «فاعِل» دەکات عامیلێکی «لَفْظِي»ـیە، گومانیشی تێدا نییە کە عامیلی «لَفْظِي» بەهێزترە لە عامیلی «مَعْنَوِي»، ئەمە ڕای جمهووری زانایانە. بەڵام هێندێک لە زانایان دەفەرموون: ئەسڵ لەو ئیسمانەی کە مەرفووع دەبن بریتییە لە «مُبْتَدَأ»[1] لەبەر چەند هۆکارێک: یەکەم: چونکە «مُبْتَدَأ» لە سەرەتای ڕستەوە دێت، هەر ئیسمێکیش لە سەرەتای ڕستەدا هات، ڕێز و شەرەفی زیاترە. دووەم: ئەو وشەیەی دەبێت بە «مُبْتَدَأ» چ لە سەرەتای ڕستەدا بێت چ لە کۆتای ڕستەدا بێت هەر «مُبتدا»یە، بەڵام «فاعِل» ئەگەر لەسەر «فِعْل» پێش بکەوێت ئەوە دەبێتە «مُبْتَدَأ» و گۆڕانکاری بەسەردا دێت.

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: (وَ إِنَّما جُعِلَ الْفاعِلُ مَرْفُوعاً) بۆچی ئەو ئیسمەی دەبێت بە «فَاعِل» مەرفووع دەبێت؟ (وَالْمَفْعُولُ مَنْصُوباً) هەروەها بۆچی ئەو ئیسمەی دەبێت بە «مَفْعُول» «مَنصوب» دەبێت؟ (وَالْمُضافُ إِلَيْهِ مَجْرُوراً) هەروەها بۆچی ئەو ئیسمەی دەبێت بە «مُضافُ إِلَيْهِ» مەجروور دەبێت؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: (لأَنَّ الرَّفْعَ) چونکە «رَفْع»ـە (أَعْنِي:الضَّمَّ) کە مەبەستم

---

☜ بەکار دێن کە «مُعْرَب»ـن، بەڵام «ضَمّة، فَتْحَة، كَسْرَة» بۆ ئەو ئیسمانە بەکار دێن کە «مَبْنِي»ـنە. بڕوانە: شرح ملا جامي: ١/ ٦٧.

١. ئەمە بۆچوونی پێشەوا «سیبویه»یە. بڕوانە: البهجة المرضية: ل، (٨٠)وشرح شذور الذهب: (١٥٥) وشرح المفصل: ١٩٦/١.

**أَثْقَلُ الْحَرَكَاتِ، وَالْفَاعِلَ أَقَلُّ الْمَعْمُولَاتِ، فَأُعْطِيَ الثَّقِيلُ الْقَلِيلَ؛ وَالنَّصبَ ـ أَعْنِي: الْفَتْحَةَ ـ أَخَفُّ الْحَرَكَاتِ، وَالْمَفعُولَ أَكْثَرُ الْمَعْمُولَاتِ، فَأُعْطِيَ الْخَفِيفُ الْكَثِيرَ؛ فَبَقِيَ الْجَرُّ ـ أَعْنِي: الْكَسْرَةَ ـ لِلْمُضَافِ إِلَيْهِ. أَوْ نَقُولُ: الْكَسْرَةُ لَمَّا لَمْ تَبْلُغْ مَرْتَبَةَ الضَّمَّةِ فِي الثِّقْلِ، وَلَا مَرْتَبَةَ الْفَتْحَةِ فِي الْخِفَّةِ، وَالْمُضَافُ إِلَيْهِ لَا يَبْلُغُ أَيْضاً مَرْتَبَةَ الْفَاعِلِ فِي الْقِلَّةِ، وَلَا مَرْتَبَةَ الْمَفْعُولِ فِي الْكَثْرَةِ فَتَنَاسَبَا فَأُعْطِيَتْ إِيَّاهُ.**

---

پێی «ضَمَّة»یە (أَثْقَلُ الْحَرَكَاتِ) لە هەموو حەرەکەتەکان قورسترە (وَالْفاعِلَ أَقَلُّ الْمَعْمُولاتِ) هەروەها ڕێژەی ئەو ئیسمەی کە دەبێتە «فَاعِل» لە هەموو «معمول»ـان کەمترە (فَأُعْطِيَ الثَّقِيلُ اَلْقَلِيلَ)[1] کەواتە: ئەو «حَرَكَة»ی کە قورسە و بریتییە لە «ضَمَّة» درا بەو «مَعْمُول»ـەی کە کەمە و بریتییە لە «فاعِل»، (وَالنَّصْبُ) هەروەها «نَصب»ـە (أَعْنِي الْفَتْحَةَ) کە مەبەستم پێی «فَتْحَة»یە (أَخَفُّ الْحَرَكَاتِ) لە هەموو حەرەکەتەکان سووکترە (وَالْمَفْعُولُ أَكْثَرُ الْمَعْمُولاتِ) وە ڕێژەی ئەو ئیسمەی کە دەبێت بە «مَفْعُول» لە هەموو مەعموولان زیاترە (فَأُعْطِيَ الْخَفِيفُ اَلْكَثِيرَ) کەواتە: ئەو حەرەکەیەی کە قورسە و بریتییە لە «فَتْحَة» درا بەو «مَعْمُول»ـە کە زۆرە و بریتییە لە «مَفْعُول».

(فَبَقِيَ الْجَرُّ) ئینجا «جَرّ»ە مایەوە (أَعْنِي الْكَسْرَةَ) کە مەبەستم پێی «كَسْرَة»یە (لِلْمُضافِ إِلَيْهِ) ئەویش درا بە «مضاف إليه» چونکە هیچ «مَعْمُول»ـی ترمان نەمابوون. (أَوْ نَقُولُ) یاخود ئێمە دەڵێین: (اَلْكَسْرَةُ لَمَّا لَمْ تَبْلُغْ مَرْتَبَةَ الضَّمَةِ فِي الثِّقْلِ) لە کاتێکدا کە «كَسْرَة» نەگەیشتە پلەی «ضَمَّة» لە قورسایەتیدا (وَلا مَرْتَبَةَ الْفَتْحَةِ فِي الْخِفَّةِ) هەروەها نەگەیشتە پلەی «فَتْحَة» لە سووکایەتیدا (وَالْمُضافُ إِلَيْهِ) وە ئەو وشەیەی کە دەبێتە «مضاف إليه» لە زمانی عەرەبیدا (لا يَبْلُغُ أَيْضاً) ئەویش بە هەمان شێوە (مَرْتَبَةَ الْفاعِلِ فِي الْقِلَّةِ) ناگاتە پلەی فاعیل لە کەمیدا (وَلا مَرْتَبَةَ الْمَفْعُولِ فِي الْكَثْرَةِ) وە هەروەها ناگاتە پلەی مەفعوولەکان لە زۆریدا (فَتَناسَبا) کەواتە: هەردووکیان لەگەڵ یەکتر گونجاو و شایەن بوون (فَأُعْطِيَتْ إِيَّاهُ) بۆیە «كَسْرَة» بەخشرایە «مُضافُ إِلَيْه» و تایبەت کرا بەو.

---

١. بڕوانە: شرح التصريح: ٣٤٥/٢.

**وَالْفَاعِلُ عِنْدَ الْمُصَنِّفِ: اسْمٌ أُسْنِدَ إِلَيْهِ مَا تَقَدَّمَهُ مِنْ فِعْلٍ أَوْ شِبْهِهِ. وَهُوَ عَلَىٰ ضَرْبَيْنِ: مُظْهَرٍ، كَـ «ضَرَبَ زَيْدٌ»، فَإِنَّ «زَيْداً» اسْمٌ أُسْنِدَ إِلَيْهِ فِعْلٌ مُقَدَّمٌ عَلَيْهِ، وَهُوَ «ضَرَبَ».**

**وَمُضْمَرٍ، وَهُوَ عَلَىٰ نَوْعَيْنِ: بَارِزٍ،**

## پێناسەی «فاعِل» لە لای زانایانی زانستی «نَحْو»

**(وَالْفاعِلُ عِنْدَ الْمُصَنِّفِ)** پێناسەی «فاعل» لەلای مامۆستای دانەر **(اِسْمٌ)** بریتییە لە ئیسمێک ـکەواتە: «فِعْل» و «حَرْف» هەرگیز نابن بە «فاعل»ـ **(أُسْنِدَ إِلَيْهِ ما تَقَدَّمَهُ)** کە ئەو ئیسمە نیسبەت و «إِسْناد»ی وشەیەکی پێشەخۆی درابێتە پاڵ، ئینجا جیاوازی نییە **(مِنْ فِعْلٍ)**[1] وشەکە «فِعْل» بێت وەکوو «ضَرَبَ زَيْدٌ» جیاوازی نییە فیعلەکەی «ماضِي» بێت یاخود «مُضارِعْ» یاخود «أَمْر» بێت، یاخود نیسبەت و ئیسنادی «شِبْهُ الْفِعْل»ـێکی درابێتە پاڵ، وەکوو «اِسْمُ الْفاعِل» و «صِفَةُ الْمُشَبَّهَة...» وەکوو «زَيْدٌ ضَارِبٌ غُلامُهُ» یاخود «زَيْدٌ حَسَنٌ وَجْهُهُ».

## باسی جۆرەکانی «فاعِل»

ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: **(وَهُوَ عَلَى ضَرْبَيْنِ:)** ئەو ئیسمەی دەبێتە «فاعل» دوو جۆری هەیە: **(مُظْهَرٌ)** **جۆری یەکەم:** پێی دەگوترێت فاعیلی ئاشکرا و بەرچاو **(كَ)** وەکوو ئەم نموونەی کە دەفەرموێت: **(ضَرَبَ زَيْدٌ)** واتە: زەید لێی دا، سەرنج بدە: **(فَإِنَّ زَيْداً اِسْمٌ)** وشەی زەید لەم نموونەیەدا ئیسمە لە هەمان کاتدا **(أُسْنِدَ إِلَيْهِ فِعْلٌ مُقَدَّمٌ عَلَيْهِ)** نیسبەت و ئیسنادی فیعلێکی دراوەتە پاڵ، کە لە سەری وەپێش کەوتووە **(وَهُوَ ضَرَبَ)** کە بریتییە لە وشەی «ضَرَبَ».

**جۆری دووەم: (وَمُضْمَرٌ)** پێی دەگوترێت فاعیلێکی «مُضْمَر» واتە: فاعیلەکە ئیسمێکی ئاشکرا نییە، بەڵکوو «ضمیر»ە **(وَهُوَ عَلَى نَوْعَيْنِ:)** ئەویش دوو جۆری هەیە: **(بارِزٌ) یەکەم:** پێی دەگوترێت «ضَمِيرٌ بارِزٌ» وە ئەو «ضمير»ە بە فیعلەکەوە دەنووسێت

[1] بڕوانە: الأصول في النحو: ٥٨/١.

**كَـ «ضَرَبْتُ»، فَإِنَّ «التَّاءَ» ضَمِيرٌ بَارِزٌ أُسْنِدَ إِلَيْهِ «ضَرَبَ»؛ وَمُسْتَتِرٍ، كَـ «زَيْدٌ ضَرَبَ»، فَإِنَّ فِي «ضَرَبَ» ضَمِيراً مُسْتَتِراً أُسْنِدَ إِلَيْهِ «ضَرَبَ».**

**وَالْمُرَادُ بِشِبْهِ الْفِعْلِ الْأَسْمَاءُ الْمُتَّصِلَةُ بِالْأَفْعَالِ، أَعْنِي: الْمَصْدَرَ، وَاسْمَ الْفَاعِلِ، وَالْمَفْعُولِ، وَالصِّفَةَ الْمُشَبَّهَةَ، وَأَفْعَلَ التَّفْضِيلِ، نَحْوُ: «زَيْدٌ ضَارِبٌ غُلَامُهُ عَمْراً» فَإِنَّ «غُلَاماً» اِسْمٌ أُسْنِدَ إِلَيْهِ شِبْهُ الْفِعْلِ، وَهُوَ «ضَارِبٌ» مُقَدَّمٌ عَلَيْهِ؛ وَسَيَجِيءُ مَبَاحِثُ كُلِّ ذٰلِكَ عَنْ قَرِيبٍ.**

---

(**كَـ**) وەکوو ئەم نموونەیە: (**ضَرَبْتُ زَيْداً**)، سەرنج بدە: (**فَإِنَّ التَّاءَ ضَمِيرٌ بَارِزٌ أُسْنِدَ إِلَيْهِ ضَرَبَ**) ئێستا وشەی «تُ» «ضمیر»ێکی «بارز»ە و نیسبەت و ئیسنادی فیعلێکی دراوەتە پاڵ کە «ضَرَب»یە؛ (**وَمُسْتَتِرٌ**) دووەم پێی دەگوترێت: «ضَمِيرٌ مُسْتَتِرٌ» کە ئەو «ضمیر»ە لەناو فعلەکەوە شاردراوەتەوە و «مُسْتَتِر»ە وەکوو ئەم نموونەی کە دەفەرموێت: (**زَيْدٌ ضَرَبَ**)، سەرنج بدە: (**فَإِنَّ فِي ضَرَبَ**) ئێستا لە ناو وشەی «ضَرَبَ» (**ضَمِيراً مُسْتَتِراً**) فاعیلێکی «مُسْتَتِر» هەیە کە بریتییە لە وشەی «هُوَ» دەگەڕێتەوە بۆ لای «زەید» و (**أُسْنِدَ إِلَيْهِ ضَرَبَ**) نیسبەتی فیعلێکی دراوەتە پاڵ کە «ضَرَبَ»یە.

(**وَالْمُرادُ بِشِبْهِ الْفِعْلِ**) مەبەست بەو ئیسمانەی کە دەشوبهێنە فیعلێ (**الْأَسْماءُ الْمُتَّصِلَةُ بِالْأَفْعالِ**) بریتییە لەو ئیسمانەی کە هەم لە ڕووی ماناوە پەیوەندییان بە فیعلەوە هەیە و دەشوبهێنە فیعلێ، هەم لە کارکردن (**أَعْنِي:**) واتە مەبەستم پێی ئەم پێنج شتەیە، یەکەم: (**اَلْمَصْدَرَ**) دووەم: (**وَ**) هەروەها (**اسْمَ الْفاعِلِ**) سێیەم: (**وَ**) هەروەها (**اسْمَ الْمَفْعُولِ**) چوارەم: (**وَ**) هەروەها (**الصِّفَةَ الْمُشَبَّهَةَ**) پێنجەم: (**وَ**) هەروەها (**أَفْعَلَ التَّفْضِيلِ**) ئەم پێنج ئیسمانە پێیان دەگوترێت «شِبْهُ الْفِعْل» (**نَحْوُ**) وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: (**زَيْدٌ ضارِبٌ غُلامُهُ عَمْرواً**) واتە: خزمەتکاری زەید لە عەمری دا، سەرنج بدە: (**فَإِنَّ غُلاماً اِسْمٌ**) وشەی «غلام» لەم نموونەیەدا ئیسمە (**أُسْنِدَ إِلَيْهِ شِبْهُ الْفِعْلِ**) نیسبەت و «إسناد»ی «شِبه فِعْل»ـێکی دراوەتە پاڵ (**وَهُوَ ضارِبٌ**) کە «ضَارِب»ـە (**مُقَدَّمٌ عَلَيْهِ**) هەروەها لە سەریشی وەپێش کەوتووە (**وَسَيَجِيءُ مَباحِثُ كُلِّ ذَلِكَ عَنْ قَرِيبٍ**) وە لەمەودواش ئەم بابەتانە هەمووی بە درێژی باس دەکەین «إن شاء اللّٰه».

.............................................................................................................

**ئینجا بزانە:** ئەی قوتابی بەڕێز: کە «فَاعِل» سێ جۆری هەیە، **یەکەم:**«فَاعِلٌ فِي اللَّفْظِ وَالْمَعْنَى» واتە: وشەکە هەم لە «لَفْظ» و هەم لە «مَعْنَى»دا فاعیلە وەکوو «أَكْرَمَ زَيْدٌ بَكْراً»؛ **دووەم:** «وَفَاعِلٌ فِي اللَّفْظِ دُونَ الْمَعْنَى» واتە: وشەکە تەنها لە «لَفْظ»ـدا فاعیلە و لە «مَعْنَى»دا فاعیل نییە، وەکوو «مَاتَ زَيْدٌ»؛ **سێیەم:** «وفَاعِلٌ فِي الْمَعْنَى دُونَ اللَّفْظِ» واتە: وشەکە تەنها لە «مَعْنَى»دا فاعیلە و لە «لَفْظ»ـدا فاعیل نییە، وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا﴾ [سورەالنّساء: ٧٩] یاخود وەکوو ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا﴾ [سورەالنساء: ٦].




* ◌ *

# الْمُبْتَدَأُ وَالْخَبَرُ

**قَالَ: وَالْمُلْحَقُ بِهِ خَمْسَةُ أَضْرُبٍ: الْمُبْتَدَأُ وَخَبَرُهُ.**

**أَقُولُ: لَمَّا ذَكَرَ الْأَصْلَ فِي الْمَرْفُوعَاتِ، أَرَادَ أَنْ يَذْكُرَ الْمُلْحَقَ بِالْأَصْلِ وَمَا يَتَعَلَّقُ بِهِ؛ وَالْمُلْحَقُ بِالْأَصْلِ خَمْسَةُ أَضْرُبٍ: الضَّرْبُ الْأَوَّلُ: الْمُبْتَدَأُ وَخَبَرُهُ.**

---

## وانەی هەڤدەهەم: باسی «اَلْمُبْتَدَأُ» و «الْخَبَرُ»

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: **(وَالْمُلْحَقُ بِهِ خَمْسَةُ أَضْرُبٍ)** ئەو ئیسمانەی کە «مَرْفُوع» دەبن و «مُلْحَق»ـن بە فاعیل پێنج بەشیان هەیە: **(اَلْمُبْتَدَأُ وَ خَبَرُهُ)** بەشی یەکەمیان بریتییە لە باسکردنی «مُبْتَدَأ» و هەروەها «خَبَر»ی موبتەدا.

**(أَقُولُ)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(لَمَّا ذَكَرَ الأَصْلَ فِي الْمَرْفُوعاتِ)** پاش ئەوەی مامۆستا باسی ئەم ئیسمەی کرد کە «أَصْل» بوو لە نێو ئەم ئیسمانەی کە «مَرْفُوع» دەبن و بریتی بوو لە «فَاعِل» **(أَرادَ أَنْ يَذْكُرَ الْمُلْحَقَ بِالأَصْلِ وَما يَتَعَلَّقُ بِهِ)** ویستی باسی ئەو ئیسمانە بکات کە «مَرْفُوع» دەبن و «مُلْحَق»ـن بە «أَصْل»، لەگەڵ ئەو بابەتانەی کە پەیوەستن بەو ئیسمانەوە، بە شێوەیەکی دوور و درێژ ڕوونیان دەکاتەوە **(وَالْمُلْحَقُ بِهِ خَمْسَةُ أَضْرُبٍ)** ئەو ئیسمانەی کە «مَرْفُوع» دەبن و مولحەقن بە فاعیل پێنج بەشی سەرەکییان هەیە: **(اَلضَّرْبُ الأَوَّلُ)** بەشی یەکەمیان بریتییە لە **(اَلْمُبْتَدَأُ)** باسی پێناسەی «مُبْتَدَأ» و **(وَخَبَرُهُ)**[1] باسی پێناسەی «خَبَر»ی موبتەدا، وە ئەو بابەتانەی کە پەیوەستن بە ئەحکامەکانی «مُبْتَدَأ» و «خَبَر».

∘ ∘

---

١. دیارە مامۆستا «جار الله الزّمخشري» موبتەدا و خەبەری بە یەک بابەت حیساب کردوون، ئەگینا لە زۆربەی کیتابەکانی زانستی «نحو» ئەم دوو بابەتە بە جیا هەژمار کراون، هەریەکەو ژمارەی خۆی بۆ دانراوە، چونکە بە شێک لە ئەحکامەکانیان لە یەک جیاوازن. بڕوانە: شرح المفصل: (١/ ٢٢١) و شرح التسهیل: (١٥٨/١) و حاشية الصبان: (٢٨٢/١).

**وَهُمَا عِنْدَ الْمُصَنِّفِ: اسْمَانِ مُجَرَّدَانِ عَنِ الْعَوَامِلِ اللَّفْظِيَّةِ لِلْإِسْنَادِ، کَـ «زَيْدٌ قَائِمٌ»، فَإِنَّهُمَا اسْمَانِ مُجَرَّدَانِ عَنِ الْعَوَامِلِ اللَّفْظِيَّةِ، لإِسْنادِ أَحَدِهِمَا ـ وَهُوَ «قَائِمٌ» ـ إِلَى الْآخَرِ وَهُوَ «زَيْدٌ». وَالْمُسْنَدُ إِلَيْهِ ـ أَعْنِي: زَيْداً ـ يُسَمَّىٰ مُبْتَدَأً، وَالْمُسْنَدُ ـ أَعْنِي: قَائِماً ـ يُسَمَّىٰ خَبَراً.**

## پێناسەی «اَلْمُبْتَدَأ» و «اَلْخَبَرُ»

**(وَهُمَا عِنْدَ الْمُصَنِّفِ)** پێناسـەی «اَلْمُبْتَدَأ» و «اَلْخَبَر» لە لای مامۆسـتا «جاراللّه»ی زەمەخشـەری بریتییـە لـەوەی **(اِسْمان)** کـە «مُبْتَـدَأ» و«خَبَـر» هەردووکیـان ئیسـمن و هەردووکیـان «مَرْفُـوعْ» دەبـن بـە عامیلێکـی «مَعْنَـوِي»، کەواتە: بـەم بڕگەیە بۆت ڕوون بوویەوە «فِعْل» و «حَرْف» هەرگیز نابن بە «مُبْتَدَأ» **(مُجَرَّدانِ عَنِ الْعَوامِلِ اللَّفْظِيَّةِ)**[1] هیچ عامیلێکی «لَفْظِي»ـیان لەسەر نییە ـ وەکوو «كَانَ وَأَخَواتُها، إِنَّ وَأَخَواتُها» ـ **(لِلإِسْنادِ)** بۆ ئەوەی نیسبەت و ئیسنادی یەکێکیان بدرێت بۆ لای ئەویتر **(کَـ)** وەکوو ئەم نموونەیەی کـە دەڵێـت: **(زَيْدٌ قَائِمٌ)** یاخـود وەکـوو «مُحَمَّـدٌ رَسُـولُ اللّٰهِ»، **(فَإِنَّهُما اِسْمانِ)** سـەرنجی ئـەم نموونەیـە بـدە: هەردووکیـان پێـک هاتـوون لـە دوو «اِسْـم» کـە ئیسـمی یەکـەم پێـی دەگوترێت: «اَلْمُبْتَدَأ» و ئیسمی دووەم پێی دەگوترێت: «اَلْخَبَر» **(مُجَرَّدانِ مِنَ الْعَوامِلِ اللَّفْظِيَّةِ)** هەردووکیـان داڕنـدراون لـە هەمـوو عامیلێکـی «لَفْظِي»، واتـە: بـە عامیلێکـی «مَعْنَـوِي» مەرفـووع بـوون **(لإِسْنادِ أَحَدِهِمَا)** بـۆ ئەوەی نیسـبەت و ئیسـنادی یەکێکیان بدرێت **(وَهُوَ قائِمٌ)** کە بریتیە لە وشەی «قائِمٌ» **(إِلَى الآخَرِ)** بۆ لای ئەویتر **(وَهُوَ زَيْدٌ)** کـە بریتییـە لـە وشـەی «زَيْـدٌ»، **(وَالْمُسْنَدُ إِلَيْهِ)** ئـەم وشـەیەی کـە بووە بە «مُسْـنَدُ إِلَيْهِ» **(أَعْنِي: زَيْداً)** مەبەستم پێی وشەی «زَيْد»ە **(يُسَمَّى مُبْتَدَأً)** پێی دەگوترێت: «مُبْتَدَأ» و مەرفووع بووە، **(وَالْمُسْنَدُ)** ئەم وشەیەی کە بووە «مُسْنَد» **(أَعْنِي قائِماً)** مەبەستم پێی وشـەی «قائِم»ـە **(يُسَمَّى خَبَراً)** پێی دەگوترێت: «خَبَر» و مەرفووع بووە.

---

١. دیـارە هـەر یەکـە لـە «مُبْتَـدَأ» و لـە «خَبَر» بە چەند شـێوازێکیتریش پێناسـە کراون، لـەم بابەتە ڕای جیـاواز زۆرن، بـەڵام ئێمـە بـۆ ئـەوەی بابەتەکـە درێـژ نەبێتـەوە، ئەم خیلافە بـۆ کتێبە درێـژەکان بەجێ دێڵین. بڕوانە: الأنصاف فی مسائل الخلاف: (٤٩/١).

**قَالَ: وَحَقُّ الْمُبْتَدَإِ أَنْ يَكُونَ مَعْرِفَةً، وَقَدْ يَجِيءُ نَكِرَةً، نَحْوُ: «شَرٌّ أَهَرَّ ذَا نَابٍ».**

**أَقُولُ: وَحَقُّ الْمُبْتَدَإِ أَنْ يَكُونَ مَعْرِفَةً؛ لِأَنَّهُ مَحْكُومٌ عَلَيْهِ، وَالشَّيْءُ لَا يُحْكَمُ عَلَيْهِ إِلَّا بَعْدَ مَعْرِفَتِهِ.**

## وانەی هەژدەهەم: باسی «حُكْمُ الْمُبْتَدَإِ»

**(قالَ:)** مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: **(وَحَقُّ الْمُبْتَدَإِ)** ئەسڵ وایە کە ئەو ئیسمەی دەبێتە «مُبْتَدَأ» **(أَنْ يَكُونَ مَعْرِفَةً)** ئیسمێکی ناسراو (مَعْرِفَة) بێت، **(وَقَدْ يَجِيءُ نَكِرَةً)** بەڵام هێندێک جار بە پێچەوانەی یاسای خۆی دێت و دەبێتە «نَكِرَة» **(نَحْوُ:)** وەکوو ئەم نموونەیە کە دەفەرموێت: **(شَرٌّ أَهَرَّ ذا نَابٍ)**[1] واتە: تەنها شەڕە کە ئەم سەگەی وە مرەمرِ خستووە؛ **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «شَرٌّ» بۆتە «مُبْتَدَأ» کەچی ئیسمێکی «نَكِرَة»یە.

**(أَقُولُ)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(وَحَقُّ الْمُبْتَدَإِ)** ئەسڵ وایە کە ئەو ئیسمەی دەبێتە «مُبْتَدَأ» **(أَنْ يَكُونَ مَعْرِفَةً)** ئیسمێکی ناسراو (مَعْرِفَة) بێت **(لأَنَّهُ مَحْكُومٌ عَلَيْهِ)** چونکە «مُبْتَدَأ» حوکمی لەسەر دەدرێت و باسی لێوە دەکرێت، وە نیسبەت و ئیسنادی شتێکی‌تری دەدرێتە پاڵ، کەواتە: دەبێت شتێکی دیار و «مَعْلُوم» بێت **(وَالشَّيْءُ)** هەموو شتێکی نادیاریش **(لا يُحْكَمُ عَلَيْهِ)** ناتواندرێت خەبەری لە بن بدرێت و حوکمی لەسەر بدرێت **(إِلَّا بَعْدَ مَعْرِفَتِهِ)** تەنها پاش ناساندنی نەبێت بە شێوەیەکی دیار و «مَعْلُوم»، چونکە نیسبەت و ئیسنادی هەر وشەیەک بۆ لای شتێکی نادیار و «مَجْهُول» هیچ سوود و ئیستیفادەیەکی نییە[2] «لأَنَّ الإِسْنادَ إِلَى الْمَجْهُولِ لا يُفِيدُ شَيْئاً».

---

**١.** ئەم ڕستەیە پەندێکی مەشهوورە لە نێو عەرەباندا، وشەی «ذُو نابٍ» بە مانای سەگ دێت، هەروەها وشەی «أَهَرَّ» بە مانای «مرەمرِ» و «لوورین» دێت، نەک بە مانای «حەپەحەپ» و «عەوین»، هەروەکوو سەرچاوەکان دەفەرموون: «وَأَهَرَّ الْكَلْبُ، أَيْ: جَعَلَهُ يُصَوِّتُ دُونَ أَنْ يَنْبَحَ». بڕوانە: لسان العرب، (٩/ ٤٧) وشرح الْمُفَصَّل: (٢٢٤/١) وشرح كافيه ابن الحاجب (٢٠٢/١).

**٢.** بڕوانە: قطر النّدى: ل، ١٥٦.

**وَقَدْ يَجِيءُ الْمُبْتَدَأُ نَكِرَةً قَرِيبَةً مِنَ الْمَعْرِفَةِ، نَحْوُ: «شَرٌّ أَهَرَّ ذَا نَابٍ»؛ فَإِنَّ «شَرّاً» نَكِرَةٌ قَرِيبَةٌ مِنَ الْمَعْرِفَةِ، لِأَنَّهُ فِي مَعْنَى: «مَا أَهَرَّ ذَا نَابٍ إِلَّا شَرٌّ»، فَـ «الشَّرُّ» فِي الْحَقِيقَةِ فَاعِلٌ، وَالْفَاعِلُ النَّكِرَةُ يَقْرُبُ مِنَ الْمَعْرِفَةِ بِتَقْدِيمِ الْفِعْلِ عَلَيْهِ.**

---

(وَقَدْ يَجِيءُ الْمُبْتَدَأُ نَكِرةً) بەڵام لە چەند حاڵەتێکدا ئەو ئیسمەی کە دەبێتە «مُبْتَدَأ» نادیار و نەناسراو (نَكِرَة) دەبێت، بەڵام بەم مەرجەی (قَرِيبَةً مِنَ الْمَعْرِفَةِ) دەبێت «نَكِرَة»یەکی نزیک بێت لە «مَعْرِفَة» بە هۆی یەکێک لەو ڕێگایانەی باسی دەکەین کە بریتین لە:

**ڕێگای یەکەم:** ئەگەر بێت و ئەو ئیسمەی دەبێتە «مُبْتَدَأ» مانای کورتهەڵێنانی تێدا بێت (نَحْوُ) وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: (شَرٌّ أَهَرَّ ذا نابٍ) تەنها شەڕە کە ئەم سەگەی وە مڕەمڕ و لوورین خستووە، (فَإِنَّ شَراً نَكِرَةٌ قَرِيبَةٌ مِنَ الْمَعْرِفَةِ) سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «شَرٌّ» بۆتە «مُبْتَدَأ» کەچی ئیسمێکی «نَكِرَة»یە، بەڵام لە هەمان کاتدا نزیکە لە «معرفة» چونکە مانای «حَصْر»ی تێدایە (لأَنَّهُ فِي الْمَعْنى) چونکە ماناکەی وای لێ دێتەوە: (مَا أَهَرَّ ذا نابٍ إِلّا شَرٌّ) واتە تەنها شەڕە ـ خێر نییە ـ کە ئەم سەگەی وە مڕەمڕ و لوورین خستووە، (فَالشَّرُ فِي الْحَقِيقَةِ فاعِلٌ) کەواتە: وشەی «شَرٌّ» لە ڕاستیدا دەبێتە «فاعِل» بۆ وشەی «أَهَرَّ» و ئامرازی «حَصْر»ی لە سەرە کە وشەی «إِلّا»یە؛ (وَالْفاعِلُ النَّكِرَةُ) ئەگەر هاتوو فاعیلیش ئیسمێکی «نَكِرَة» بوو (يَقْرُبُ مِنَ الْمَعْرِفَةِ) نزیک دەبێتەوە لە «مَعْرِفَة» (بِتَقْدِيمِ الْفِعْلِ عَلَيْهِ) ئەگەر بێت و فیعلەکەی لەسەر وەپێش بکەوێت؛ بەڵام هێندێک لە زانایان دەفەرموون: بۆیە دروستە «مُبْتَدَأ» لێرەدا ئیسمێکی «نَكِرَة» بێت، چونکە وشەی «شَرٌّ» بۆتە «مَوْصُوف» بەڵام «صِفَة»ـەکەی «حَذْف» کراوە «أَيْ: شَرٌّ عَظِيمٌ أَهَرَّ ذا نَابٍ»[1].

**ڕێگای دووەم:** ئەگەر بێت و ئەو ئیسمەی دەبێتە «مُبْتَدَأ» (أداة الإستفهام) ئامرازێکی پرسیاری لە پێش هاتبێت، وەکوو: ﴿أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ﴾ [النمل: ٦٢] یا خود وەکوو: «هَلْ صالِحٌ فِيكُمْ».

---

١. بڕوانە: شرح ابن عقيل: (٢٢١/١) وشرح ملا جامی (١/ ١٥٥).

**ڕێگای سێیەم:** ئەگەر بێت و ئەو ئیسمەی دەبێتە «مُبْتَدَأ» (أَدَاةُ نَفْي) ئامرازێکی نەرێنی لە پێش هاتبوو، وەکوو: «ما صَدِيقٌ لَنا».

**ڕێگای چوارەم:** ئەگەر بێت و ئەو ئیسمەی دەبێتە «مُبْتَدَأ» وشەیەکی «عام» بوو، وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِۗ﴾ [آل عمران: ١٨٥] یاخود وەکوو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: **«كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ»**.

**ڕێگای پێنجەم:** ئەگەر بێت و ئەو ئیسمەی دەبێتە «مُبْتَدَأ» ئیسمێکی وەسفدارکراو بوو، وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ﴾ [البقرة: ٢٢١].

**ڕێگای شەشەم:** ئەگەر بێت و ئەو ئیسمەی دەبێتە «مُبْتَدَأ» ئیسمێک بێت بۆ دوعاکردن بەکار بێت، وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ﴾ [الصّافّات: ١٠٩].

**ڕێگای حەوتەم:** ئەگەر بێت و ئەو ئیسمەی دەبێتە «مُبْتَدَأ» ئیسمێکی «تَصْغِير»کراو بێت، وەکوو: «رُجَيْلٌ عِنْدَنَا».

**ڕێگای هەشتەم:** ئەگەر بێت و ئەو ئیسمەی دەبێتە موبتەدا «اِسْمَ الشّرط» بێت، وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ﴾ [النّساء: ١٢٣].[1]

* ◌ *

---

١. لە هەموو ئەم نموونانەی کە باسمان کردن ئەو وشەیەی کە بۆتە «مُبْتَدَأ» ئیسمێکی «نَكِرَة»یە، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەو «نَكِرَة»یە لە هەموو نموونەکان بە هۆی «قَيْد»ێک نزیک بۆتەوە لە «معرفة» هەروەکوو لە سەرچاوەکان ئاماژەی بۆ کراوە. بڕوانە: شرح قطر النّدى، وشرح ابن عقيل: (٢٢١/١) و شرح كافيه ابن الحاجب: (١٠٥/١) وشرح ملا جامی (١/ ١٥٥).

**قَالَ: وَحَقُّ الْخَبَرِ أَنْ يَكُونَ نَكِرَةً، وَقَدْ يَجِيئَانِ مَعْرِفَتَيْنِ، نَحْوُ: «اللهُ إِلٰهُنَا، وَمُحَمَّدٌ نَبِيُّنَا».**

**أَقُولُ:** وَحَقُّ الْخَبَرِ أَنْ يَكُونَ نَكِرَةً؛ لِأَنَّهُ مَحْكُومٌ بِهِ، وَالْمَحْكُومُ بِهِ يَنْبَغِي أَنْ يَكُونَ نَكِرَةً؛ لِأَنَّهُ إِنْ كَانَ مَعْرِفَةً كَانَ مَعْلُوماً لِلْمُخَاطَبِ، فَلَا يَكُونُ فِي الْحُكْمِ فَائِدَةٌ.

---

## وانەی نۆزدەهەم: باسی «حُكْمُ الْخَبَرِ»

**(قالَ:)** مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: **(وَحَقُّ الْخَبَرِ)** ئەسڵ وایە کە ئەو ئیسمەی دەبێتە «خَبَر» **(أَنْ يَكُونَ نَكِرَةً)** ئیسمێکی نەناسراو (نَكِرَة) بێت، **(وَقَدْ يَجِيئانِ مَعْرِفَتَيْنِ)** بەڵام هێندێک جار بە پێچەوانەی یاسای خۆی دێت و «مُبْتَدَأ» و «خَبَر» هەردووکیان دەبنە «مَعْرِفَة» **(نَحْوُ)** وەکوو ئەم دوو نموونەیە: یەکەم **(اَللّٰهُ إِلٰهُنا)**. **(وَ)** نموونەی دووەم وەکوو **(مُحَمَّدٌ نَبِيُّنا)** سەرنج بدە: لەم دوو نموونەیە وشەی «مُبْتَدَأ» و «خَبَر» هەردووکیان «مَعْرِفَة»ن.

**(أَقُولُ)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(وَحَقُّ الْخَبَرِ)** ئەسڵ وایە کە ئەو ئیسمەی دەبێتە «خَبَر» **(أَنْ يَكُونَ نَكِرَةً)** ئیسمێکی نەناسراو (نَكِرَة) بێت **(لأَنَّهُ مَحْكُومٌ بِهِ)** چونکە «مُبْتَدَأ» حوکمی پێ دەدرێت، واتە: نیسبەت و «إِسْناد»ی پێ دەدرێتە لای شتێکی‌تر، **(وَالْمَحْكُومُ بِهِ)** کەواتە ئەو وشەیەی حوکمی پێ دەدرێت **(يَنْبَغِي أَنْ يَكُونَ نَكِرَةً)** پێویستە شتێکی نادیار و نەناسراو (نَكِرَة) بێت **(لأَنَّهُ إذا كانَ مَعْرِفَةً)** چونکە ئەگەر بێت و ئەو وشەیەی خەبەری پێ دەدرێت شتێکی دیار و ناسراو (مَعْرِفَة) بێت **(كانَ مَعْلُوماً لِلْمُخاطَبِ)** ئەو کاتە شتێکی زانراو و «مَعْلُوم» دەبێت لە لای ئەو کەسەی کە تۆ خەبەری پێ دەدەیت **(فَلا يَكُونُ فِي الْحُكْمِ فائِدَةً)**[1] کەواتە: خەبەر و هەواڵدانەکە هیچ سوود و قازانجی نابێت، چونکە گومانی تێدا نییە کە تۆ هەواڵ بە کەسێک بدەی ئەویش بابەتەکەی زانیبێت، هیچ سوودی نییە.

---

١. بڕوانە: شرح قطر النّدى، وشرح ابن عقيل: (٢٢١/١) و شرح كافيه ابن الحاجب: (١٠٥/١).

**وَقَدْ يَجِيئَانِ ـ يَعْنِي: الْمُبْتَدَأَ وَخَبَرَهُ ـ مَعْرِفَتَيْنِ، نَحْوُ: «اللّٰهُ إِلٰهُنَا، وَمُحَمَّدٌ نَبِيُّنَا»، فَالْمُقَدَّمُ مِنَ الِاسْمَيْنِ فِي الْمِثَالَيْنِ يَكُونُ مُبْتَدَأً، وَالْمُؤَخَّرُ خَبَراً.**

**(وَقَدْ يَجِيئانِ مَعْرِفَتَيْنِ)** بەڵام هێندێک جار خەبەر بە پێچەوانەی یاسای خۆی دێت و وەکوو «مُبْتَدَأ» هەردووکیان دەبنە «مَعْرِفَة» **(يَعْنِي: اَلْمُبْتَدَأُ وَالْخَبَرُ)** مەبەستم «مُبْتَدَأ» و «خَبَر»ن **(نَحْوُ)** وەکوو ئەم دوو نموونەیە: یەکەم **(اَللّٰهُ إِلٰهُنا)** **(وَ)** نموونەی دووەم **(مُحَمَّدٌ نَبِيُّنا)** سەرنج بدە: لەم دوونموونەیە هەردوو وشەی موبتەدا و خەبەر «مَعْرِفَة»ن **(فَالْمُقَدَّمُ مِنَ الِاسْمَيْنِ فِي الْمِثالَيْنِ)**[1] ئەو وشەیەی کە وەپێش کەوتووە و لە سەرەتای ڕستەکەدا هاتووە، **(يَكُونُ مُبْتَدَأً)** لە هەردوو نموونەکاندا دەبێتە «مُبْتَدَأ» **(وَالْمُؤَخَّرُ خَبَراً)** وە ئەو وشەیەی کە لە دوای وشەی یەکەم هاتووە، دەبێتە خەبەر و «إِضافَة» کراوە بۆ لای وشەی «نُونُ الْمُتَكَلِّمِ»؛ **ئینجا بزانە:** لە هەر شوێنێک وشەی «مُبْتَدَأ» و وشەی «خَبَر» هەردووکیان «مَعْرِفَة» بوون، واجبە ئەو وشەیەی کە بووە بە «مُبْتَدَأ» لەسەر ئەو وشەیەی بووە بە «خَبَر» پێش بکەوێت.

* ◌ *

---

١. بڕوانە: شرح المفصل: (٢٢٦/١) وشرح قطر النّدى، وشرح ابن عقيل: (٢٢١/١) و شرح كافية ابن الحاجب: (١٠٨/١)

**قَالَ: وَالْخَبَرُ عَلَىٰ نَوْعَيْنِ: مُفْرَدٍ، نَحْوُ: «زَيْدٌ غُلَامُكَ» وَ «عَمْرٌو مُنْطَلِقٌ»؛**
**وَجُمْلَةٍ، وَهِيَ عَلَىٰ أَرْبَعَةِ أَضْرُبٍ: [١] فِعْلِيَّةٍ، نَحْوُ: «زَيْدٌ ذَهَبَ أَبُوهُ». [٢] وَاسْمِيَّةٍ، نَحْوُ: «عَمْرٌو أَخُوهُ ذَاهِبٌ». [٣] وَشَرْطِيَّةٍ، نَحْوُ: «زَيْدٌ إِنْ تُكْرِمْهُ يُكْرِمْكَ».**

## وانەی بیستەم: باسی بەشەکانی «خَبَر»

**(قالَ:)** مامۆستا «جار اللّه» زەمەخشەری دەفەرموێت: **(وَالْخَبَرُ عَلَى نَوْعَيْنِ:)** ئەو شتانەی دەبن بە «خَبَر» لەبۆ «مُبْتَدَأ» دوو جۆریان هەیە: **(مُفْرَدٌ)** **جۆری یەکەم:** پێی دەگوترێت «مُفْرَد» **(نَحْوُ:)** وەکوو **(زَيْدٌ غُلامُكَ)**، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «غُلامُكَ» بووە بە خەبەر بۆ وشەی «زید» کە ئیسمێکی موفرەدە، **(وَ)** هەروەها وەکوو **(عَمْرٌو مُنْطَلِقٌ)**، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەشدا وشەی «مُنْطَلِقٌ» بۆتە خەبەر بۆ وشەی «عَمرو» کە ئیسمێکی موفرەدە.

**جۆری دووەم: (وَجُمْلَةٌ)** پێی دەگوترێت «جُمْلَة» **(وَهِيَ عَلَى أَرْبَعَةِ أَضْرُبٍ:)** ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: خەبەری «جُمْلَة» چوار جۆری هەیە: **(فِعْلِيَّة)** **جۆری یەکەم:** پێی دەگوترێت: «اَلْجُمْلَةُ الْفِعْلِيَّةُ» **(نَحْوُ)** وەکوو **(زَيْدٌ ذَهَبَ أَبُوهُ)**، **سەرنج بدەن:** ئێستا لەم نموونەیەدا ڕستەی «ذَهَبَ أَبُوهُ» ڕستەیەکی «فِعْلِية»یە و بووە بە خەبەر بۆ وشەی «زَيْدٌ». **(وَ)** **جۆری دووەم: (اِسْمِيَّةٌ،)** پێی دەگوترێت: «اَلْجُمْلَةُ الاِسْمِيَّة» **(نَحْوُ)** وەکوو **(عَمْرٌو أَخُوهُ ذَاهِبٌ)**، **سەرنج بدەن:** ئێستا لەم نموونەیەدا ڕستەی «أَخُوهُ ذَاهِبٌ» ڕستەیەکی «اِسْمية»یە و بووە بە خەبەر بۆ وشەی «عَمْرٌو». **(وَ)** **جۆری سێیەم: (شَرْطِيَّةٌ)** پێی دەگوترێت: «اَلْجُمْلَةُ الشَّرْطِيَّة» **(نَحْوُ)** وەکوو **(زَيْدٌ إِنْ تُكْرِمْهُ يُكْرِمْكَ)**، **سەرنج بدەن:** ئێستا لەم نموونەیەدا ڕستەی «إِنْ تُكْرِمْهُ يُكْرِمْكَ»[1] ڕستەیەکی «شَرْطِيَّة»یە و بووە بە خەبەر بۆ وشەی «زَيْدٌ».

---

١. بڕوانە: شرح المفصل: (٢٢٦/١) وشرح قطر النّدى، وشرح ابن عقيل: (٢٢١/١) و شرح كافيه ابن الحاجب: (١٠٨/١).

[٤] **وَظَرْفِيَّةٍ، نَحْوُ: «خَالِدٌ أَمَامَكَ وَبِشْرٌ مِنَ الْكِرَامِ».**

**أَقُولُ: الْخَبَرُ عَلَىٰ نَوْعَيْنِ: الْأَوَّلُ: مُفْرَدٌ، ـ أَيْ: غَيْرُ جُمْلَةٍ ـ سَوَاءٌ كَانَ: [١] مُشْتَقّاً غَيْرَ مُضَافٍ، نَحْوُ: «زَيْدٌ ضَارِبٌ»؛ [٢] أَوْ مُشْتَقّاً مُضَافاً، نَحْوُ: «زَيْدٌ ضَارِبُكَ»؛ [٣] أَوْ كَانَ جَامِداً غَيْرَ مُضَافٍ،**

---

(وَ) جۆری چوارەم: (ظَرْفِيَّةٌ) پێی دەگوترێت: «اَلْجُمْلَةُ الظَّرْفِيَّةُ» (نَحْوُ) وەکوو (خالِدٌ أَمَامَكَ) سەرنج بدەن: ئێستا لەم نموونەیەدا ڕستەی «أَمَامَكَ» ڕستەیەکی «ظَرْفِيَّة»ی حەقیقییە و بووە بە «خَبَر» بۆ وشەی «خَالِدٌ»، (وَ) هەروەها وەکوو (بِشْرٌ مِنَ الْكِرامِ) سەرنج بدەن: ئێستا ڕستەی «مِنَ الْكِرامِ»[١] ڕستەیەکی «ظَرْفِيَّة»ی مەجازییە و بووە بە خەبەر بۆ وشەی «بِشْرٌ».

(أَقُولُ) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (اَلْخَبَرُ عَلَى نَوْعَيْنِ) ئەو ئیسمەی دەبێتە خەبەر بۆ «مُبْتَدَأ» دوو بەشی هەیە: (اَلأَوَّلُ) بەشی یەکەم: (مُفْرَدٌ) پێی دەگوترێت خەبەری «مُفْرَدٌ» (أَيْ غَيْرَ جُمْلَةٍ)[٢] مەبەست بە وشەی «مُفْرَد» لێرەدا ئەوەیە کە خەبەرەکە «جُمْلَة» نەبێت، نەک «تَثْنِيَة» یاخود «جَمْع»[٣] نەبێت. (سَواءٌ كَانَ مُشْتَقاً غَيْرَ مُضافٍ) ئینجا جیاوازی نییە: خەبەرەکە ئیسمێکی «مُشْتَق» بێت و «إِضافَة» نەکرابێت (نَحْوُ) وەکوو (زَيْدٌ ضَارِبٌ)، سەرنج بدەن: ئێستا لەم نموونەیەدا وشەی «ضارِبٌ» بووە بە خەبەر لەبۆ وشەی «زَيْدٌ» لە هەمان کاتدا ئیسمێکی «مُشْتَق»ـە و «إِضافة» نەکراوە. (أَوْ مُشْتَقاً مُضافاً) یاخود خەبەرەکە ئیسمێکی «مُشْتَق» بێت و «إِضافَة» کرابێت (نَحْوُ) وەکوو (زَيْدٌ ضَارِبُكَ)، سەرنج بدەن: ئێستا لەم نموونەیەدا وشەی «ضارِبُكَ» بووە بە خەبەر لەبۆ وشەی «زَيْدٌ»، لە هەمان کاتدا ئیسمێکی «مُشْتَق»ـە و «إِضافة» کراوە بۆ لای «كَافُ الْخِطاب». (أَوْكَانَ جَامِداً غَيْرَ مُضافٍ) یاخود

---

١. بڕوانە: الإنصاف (٢٥٦/١) وشرح قطر النّدى، وشرح ابن عقيل: (٢٢١/١) و شرح كافية ابن الحاجب: (١٠٩/١)

٢. بۆیە وشەی «مُفْرَد»ی ئاوا مانا کرد چونکە وشەی «مُفْرَد» لە لای زانایانی (نَحو) چوار مانای جیاوازی هەیە.

٣. کەواتە: لەم دوو نموونەیەدا «الزيدان قائمان» یاخود «الزيدون قائمون» وشەی «قائمان، قائمون» بە «مفرد» دادەندرێن چونکە«جملة» نینە.

**نَحْوُ: «زَيْدٌ غُلَامٌ»؛ [٤] أَوْ كَانَ جَامِداً مُضَافاً، نَحْوُ: «زَيْدٌ غُلَامُكَ».**

**وَالثَّانِي: جُمْلَةٌ، وَالْجُمْلَةُ عَلَىٰ أَرْبَعَةِ أَضْرُبٍ: [١] فِعْلِيَّةٍ، أَي: يَكُونُ جُزْؤُهَا الْأَوَّلُ فِعْلاً، نَحْوُ: «زَيْدٌ ذَهَبَ أَبُوهُ». فَإِنَّ «ذَهَبَ أَبُوهُ» جُمْلَةٌ فِعْلِيَّةٌ، خَبَرٌ لِـ «زَيْدٌ». [٢] وَاسْمِيَّةٍ، أَي: يَكُونُ جُزْؤُهَا الْأَوَّلُ اسْماً، نَحْوُ:**

---

خەبەرەکە ئیسمێکی «جامِد» بێت و «إضافة» نەکرابێت (**نَحْوُ**) وەکوو (**زَيْدٌ غُلامٌ**)، **سەرنج بدەن:** ئێستا لەم نموونەیەدا وشەی «غلامٌ» بووە بە خەبەر لەبۆ وشەی «زَيْدٌ» لە هەمان کاتدا ئیسمێکی «جامِد»ە و «إِضافَة» نەکراوە، (**أَوْ كَانَ جَامِداً مُضافاً**) یاخود خەبەرەکە ئیسمێکی «جامد» بێت و «إضافة» کرابێت (**نَحْوُ**) وەکوو (**زَيْدٌ غُلامُكَ**)، **سەرنج بدەن:** ئێستا لەم نموونەیەدا وشەی «غُلامُكَ» بووە بە خەبەر لەبۆ وشەی «زَيْدٌ» لە هەمان کاتدا ئیسمێکی «جامِد»ە و «إِضافَة» کراوە بۆ لای «كافُ الْخِطابِ». هەموو ئەم نموونانەی کە باسمان کرد ئیسمێکی «مُفْرَد»ن بوونەتە خەبەر بۆ «مُبْتَدَأ»؛ کەواتە: بۆت ڕوون بوویەوە کە خەبەری «مُفْرَد» چوار جۆری هەیە.

(**وَالثَّانِي:**) **بەشی دووەمی خەبەر: (جُمْلَةٌ)** پێی دەگوترێت: «جُمْلَة»، (**وَالْجُمْلَةُ عَلَى أَرْبَعَةِ أَضْرُبٍ:**) ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: خەبەری «جُمْلَة» چوار جۆری هەیە:

**جۆری یەکەم: (فِعْلِيَةٍ)** پێی دەگوترێت: «اَلْجُمْلَةُ الْفِعْلِيَّةُ»، ئینجا مامۆستا پێناسەی دەکات و دەفەرموێت: (**أَيْ: يَكُونُ جُزْؤُها الأَوَّلُ فِعْلاً**) واتە: «اَلْجُمْلَةُ الْفِعْلِيَّة» بریتییە لەو ڕستەیەی کە سەرەتاکەی بە «فِعْل» دەست پێدەکات، جیاوازی نییە فیعلەکە «ماضِي» بێ یاخود «مُضارِع» یاخود «أَمْر» بێت (**نَحْوُ**) وەکوو (**زَيْدٌ ذَهَبَ أَبُوهُ**) سەرنج بدە: (**فَإِنَّ «ذَهَبَ أَبُوهُ» جَمْلةٌ فِعْلِيَّةٌ خَبَرٌ لِزَيْدٍ**) ئێستا لەم نموونەیەدا ڕستەی «ذَهَبَ أَبُوهُ» ڕستەیەکی «فِعْلِيّة»یە و بووە بە خەبەر بۆ وشەی «زَيْدٌ».

(**وَ**) **جۆری دووەم: (اِسْمِيَّةٍ)** پێی دەگوترێت: «اَلْجُمْلَةُ الاسْمِيَّةُ»، ئینجا مامۆستا پێناسەی دەکات و دەفەرموێت: (**أَيْ: يَكُونُ جُزْؤُها الأَوَّلُ اِسْماً**) واتە: «اَلْجُمْلَةُ الاسْمِيَّةُ» بریتییە لەو ڕستەیەی کە سەرەتاکەی بە «اِسم» دەست پێدەکات (**نَحْوُ**)

**«عَمْروٌ أَخُوهُ ذَاهِبٌ». فَإِنَّ «أَخُوهُ ذَاهِبٌ» جُمْلَةٌ اسْمِيَّةٌ، خَبَرٌ لِـ «عَمْرٍو».** [٣] **وَشَرْطِيَّةٍ، أَي: يَكُونُ أَوَّلُهَا حَرْفَ شَرْطٍ، نَحْوُ: «زَيْدٌ إِنْ تُكْرِمْهُ يُكْرِمْكَ». فَإِنَّ «إِنْ تُكْرِمْهُ يُكْرِمْكَ» جُمْلَةٌ شَرْطِيَّةٌ، خَبَرٌ لِـ «زَيْدٍ».** [٤] **وَظَرْفِيَّةٍ، أَي: يَكُونُ أَوَّلُهَا ظَرْفاً أَوْ بِمَنْزِلَةِ الظَّرْفِ لِفِعْلٍ مُقَدَّرٍ، نَحْوُ: «خَالِدٌ أَمَامَكَ». فَإِنَّ «أَمَامَكَ» ظَرْفٌ لِفِعْلٍ مُقَدَّرٍ،**

---

وەکوو (**عَمْروٌ أَخُوهُ ذاهِبٌ**)، سەرنج بدەن: (**فَإِنَّ**) ئێستا لەم نموونەیەدا ڕستەی (**أَخُوهُ ذاهِبٌ**) پێی دەگوترێت: (**جَمْلَةٌ اِسْمِيَّةٌ، خَبَرٌ لِزَيْدٍ**) ڕستەیەکی «فِعْلِيّة»یە و بووە بە خەبەر بۆ وشەی «زَيْدٌ».

(**وَ**) **جۆری سێیەم: (شَرْطِيَّةٌ:)** پێی دەگوترێت: «اَلْجُمْلَةُ الشَّرْطِيَّة»، ئینجا مامۆستا پێناسەی دەکات و دەفەرموێت: (**أَيْ: أَنْ يَكُونَ أَوَّلُها حَرْفَ الشَّرْطِ**) واتە: «اَلْجُمْلَةُ الشَّرْطِيَّة» بریتییە لەو ڕستەیەی کە سەرەتاکەی بە ئامرازی مەرج (حَرْفُ شَرْط) دەست پێ‌دەکات (**نَحْوُ**) وەکوو (**زَيْدٌ إِنْ تُكْرِمْهُ يُكْرِمْكَ**)، سەرنج بدەن: (**فَإِنَّ**) ئێستا لەم نموونەیەدا ڕستەی (**إِنْ تُكْرِمْهُ يُكْرِمْكَ**) پێی دەگوترێت: (**جُمْلَةٌ شَرْطِيَّةٌ، خَبَرٌ لِزَيْدٍ**) ڕستەیەکی «شَرْطِيَّة»یە و بووە بە خەبەر بۆ وشەی «زَيْدٌ».

(**وَ**) **جۆری چوارەم: (ظَرْفِيَّةٌ)** پێی دەگوترێت: «اَلْجُمْلَةُ الظَّرْفِيَّةُ»، ئینجا مامۆستا پێناسەی دەکات و دەفەرموێت: (**أَيْ: أن يَكُونُ جُزْؤُها الأَوَّلُ ظَرْفاً**)[1] واتە: «اَلْجُمْلَةُ الظَّرْفِيَّة» بریتییە لەو ڕستەیەی کە سەرەتاکەی بە «ظَرْفُ الزَّمان» یاخود بە «ظَرْفُ الْمَكان» دەست پێ‌دەکات، (**أَوْ بِمَنْزِلَةِ الظَّرْفِ لِفِعْلٍ مُقَدَّرٍ**) یاخود وەکوو «ظَرْف» بن واتە: سەرەتاکەی بە «جارّ و مَجرور» دەست پێ‌دەکات کە «مُتَعَلِّق» بن بە فیعلێکی «مُقَدَّر» کە بە جێگرەوەی «ظَرْف» دادەندرێت (**نَحْوُ**) وەکوو (**خالِدٌ أَمامَكَ**)، سەرنج بدە: (**فَإِنَّ**) ئێستا لەم نموونەیەدا وشەی (**أَمامَكَ**) پێی دەگوترێت: (**ظَرْفٌ**) ڕستەیەکی «ظَرْفيّة»یە (**لِفِعْلٍ مُقَدَّرٍ**) بۆ فیعلێکی «مُقَدَّر» کە ئەم «ظَرْف»ـە

---

١. بڕوانە: النحو الوافی : (١٩٣/٢) وشرح قطر النّدی، وشرح ابن عقیل: (٢٢١/١) و شرح کافیة ابن الحاجب: (١٠٨/١).

**وَهُوَ حَصَلَ، وَالْجُمْلَةُ خَبَرٌ لِـ«خَالِدٍ»؛ وَنَحْوُ: «بِشْرٌ مِنَ الْكِرَامِ»، فَإِنَّ «مِنَ الْكِرَامِ» بِمَنْزِلَةِ الظَّرْفِ لِفِعْلٍ مُقَدَّرٍ وَهُوَ حَصَلَ أَيْضاً، وَالْجُمْلَةُ خَبَرٌ لِـ«بِشْرٍ».**

«تَعَلُّق»ـی پێ دەبەستێت (وَهُوَ حَصَلَ) کە بریتییە لە وشەی «حَصَلَ» و «فِعْلُ الْماضِي»ـیە، (وَالْجُمْلَةُ خَبَرٌ لِخالِدٍ) ئینجا ڕستەکە بەیەکەوە لە «مَحَلُّ الرَّفْعَ»دا خەبەرە بۆ وشەی «زَيْدٌ». (وَنَحْوُ:) هەروەها وەکوو ئەم نموونەی کە دەڵێت: (بِشْرٌ مِنَ الْكِرامِ)، سەرنج بدە: (فَإِنَّ مِنَ الْكِرامِ) ئێستا لەم نموونەیەدا وشەی «مِنَ الْكِرامِ» پێی دەگوترێت «الجارّ والمجرور» (بِمَنْزِلَةِ الظَّرْفِ لِفِعْلٍ مُقَدَّرٍ)[1] کە بە جێگرەوەی «ظَرْف» دادەندرێت، بۆیە ئەم ڕستەیە پێی دەگوترێت «جُمْلَة»یەکی «ظَرْفِيّة» بۆ فیعلێکی «مُقَدَّر» کە ئەم «ظَرْف»ـە «تَعَلُّق»ی پێ دەبەستێت (وَهُوَ حَصَلَ أَيْضاً) کە بریتییە لە وشەی «حَصَلَ» کە «فِعْلُ الْماضِي»ـیە بە هەمان شێوەی ڕستەی ڕابوردوو، (وَالْجُمْلَةُ خَبَرٌ لِبِشْرٍ) ئینجا «الجارّ والمجرور» بەیەکەوە لە «مَحَلُّ الرَّفْعَ»دا خەبەرە بۆ وشەی «بِشْرٌ».

١. بڕوانە: جامع الدروس العربية: (٣١٥) وشرح المفصل: (٢٢٦/١) وشرح قطر النّدى، وشرح التسهيل: (٢٩٥/١) وشرح ابن عقيل: (٢٢١/١) وشرح التسهيل: (١/ ٢٨٠)، و شرح كافية ابن الحاجب: (١٠٨/١)


أنواع الخبر
مفرد
جملة
مشتق
جامد
مضاف
مثل:
زيد ضاربک
غير مضاف
مثل:
زيدٌ ضاربٌ
مضاف
مثل:
زيد غلامُک
غير مضاف
مثل:
زيدٌ غلامٌ
الفعلية
مثل:
زيدٌ ذهب أبوه
الاسمية
مثل:
عمرٌ أخوه ذاهبٌ
الشرطية
مثل:
زيدٌ إن تكرمه يكرمک
الظرفية
مثل:
خالد أمامک و بشر من الكرام

* ◌ *

**قَالَ: وَلَا بُدَّ فِي الْجُمْلَةِ مِنْ ضَمِيرٍ يَرْجِعُ إِلَى الْمُبْتَدَإِ إِلَّا إِذَا كَانَ مَعْلُوماً، نَحْوُ: «الْبُرُّ الْكُرُّ بِسِتِّينَ دِرْهَماً».**

**أَقُولُ: وَلَا بُدَّ فِي الْجُمْلَةِ الْوَاقِعَةِ خَبَراً لِلْمُبْتَدَإِ مِنْ ضَمِيرٍ يَرْجِعُ إِلَى الْمُبْتَدَإِ، كَمَا مَرَّ فِي الْأَمْثِلَةِ الْمَذْكُورَةِ؛ لِأَنَّ الْجُمْلَةَ مُسْتَقِلَّةٌ بِنَفْسِهَا،**

## وانەی بیستویەکەم: باسی جۆرەکانی «خَبَر»

**(قالَ:)** مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: **(وَلا بُدَّ فِي الْجُمْلَةِ مِنْ ضَمِيرٍ)** پێویستە بۆ هەموو ئەو ڕستانەی کە دەبن بە خەبەر بۆ موبتەدا «ضَمِير»ێکیان تێدا بێت **(يَرْجِعُ إِلَى الْمُبْتَدَأِ)** کە «جُمْلَة»کە بگێڕێتەوە بۆ لای «مُبْتَدَأ»، بۆ ئەوەی کە لە ڕووی ماناوە بەیەکەوە گرێ بدرێن و پەیوەست بن بەیەکەوە، چونکە ئەم ڕستەیەی دەبێتە «خَبَر» شتێکی جیاوازە لە «مُبْتَدَأ»، ئەگەر «ضَمِير»ێک نەبێت بەیەکەوە بیان بەستێتەوە ڕستەکە مانایەکی سەربەخۆ دەبەخشێت و هیچ پەیوندی بە پێش خۆیەوە نابێت **(إِلّا إِذا كانَ مَعْلُوماً)** تەنها مەگەر ئەو کاتە نەبێت کە «ضَمِير»ەکە «مَعْلُوم» و ئاشکرا بێت، ئەو کاتە پێویست ناکات کە «ضَمِير» لە «لَفْظ»ـدا هەبێت **(نَحْوُ)** وەکوو ئەم نموونەیەی **(اَلْبُرُّ)** واتە: گەنم **(اَلْكُرُّ بِسِتِّينَ دِرْهَماً)**[1] تەنەکەی یاخود ڕبەی گەنم بە شێست درهەمە، **سەرنج بدە:** ئێستا ڕستەی «اَلْكُرُّ بِسِتِّينَ دِرْهَماً» بۆتە «خَبَر» بۆ وشەی «اَلْبُرُّ» کەچی هیچ «ضَمِير»ێکی تێدا باس نەکراوە، چونکە ڕستەکە مانای ئاشکرایە.

**(أَقُولُ)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(وَلَا بُدَّ فِي الْجُمْلَةِ الْواقِعَةِ خَبَراً لِلْمُبْتَدَأِ مِنْ ضَمِيرٍ يَرْجِعُ إِلَى الْمُبْتَدَأِ)** پێویستە بۆ هەموو ئەو ڕستانەی کە دەبن بە خەبەر بۆ موبتەدا «ضَمِير»ێکیان تێدا بێت کە «جُمْلَة»کە بگێڕێتەوە بۆ لای «مُبْتَدَأ»، بۆ ئەوەی کە لە ڕووی ماناوە بەیەکەوە گرێ بدرێن و پەیوەست بن بەیەکەوە، **(كَما مَرَّ فِي الأَمْثِلَةِ الْمَذْكُورَةِ)** هەروەکوو لە نموونەکانی ڕابوردوو باسمانکرد، **(لأَنَّ الْجُمْلَةَ مُسْتَقِلَّةٌ بِنَفْسِها)** چونکە «جملة» شتێکی

---

١. وشەی «اَلْبُرُّ» بە مانای گەنم دێت، هەروەها وشەی «الكُرُّ» ئامێری شت پێ‌کێشان «وهو ستّون قفيزا»، من بە تەنەکەی یاخود ڕبە مانام کردووە، بۆ باشتر تێگەیشتن. بڕوانە: لسان العرب: (٣٨٣/١) والقاموس المحيط: (١٤٠٦).

**فَلَوْ لَمْ يَكُنْ فِيهَا ضَمِيرٌ يَرْبِطُهَا بِالْمُبْتَدَإِ لَكَانَتْ أَجْنَبِيَّةً عَنْهُ؛ إِلَّا إِذَا كَانَ هٰذَا الضَّمِيرُ مَعْلُوماً مِنْ سِيَاقِ الْكَلَامِ، فَإِنَّهُ حِينَئِذٍ يُحْذَفُ مِنَ اللَّفْظِ وَيُقَدَّرُ فِي النِّيَّةِ، نَحْوُ: «الْبُرُّ الْكُرُّ بِسِتِّينَ دِرْهَماً»، فَإِنَّ «الْكُرَّ بِسِتِّينَ دِرْهَماً» جُمْلَةٌ مِنَ الْمُبْتَدَإِ وَالْخَبَرِ، وَهِيَ خَبَرٌ لِـ «الْبُرِّ»؛ وَالضَّمِيرُ مَحْذُوفٌ، وَالتَّقْدِيرُ: «الْبُرُّ الْكُرُّ مِنْهُ بِسِتِّينَ دِرْهَماً»؛ وَإِنَّمَا حُذِفَ مِنْهُ؟ لِدَلَالَةِ سَوْقِ الْكَلَامِ عَلَيْهِ، فَإِنَّ تَقْدِيمَ «الْبُرِّ» عَلَى «الْكُرِّ»**

---

سەربەخۆیە واتە: ئەم ڕستەیەی دەبێتە «خَبَر» شتێکی جیاوازە لە «مُبْتَدَأ» **(فَلَوْ لَمْ يَكُنْ فِيهَا ضَمِيرٌ يَرْبِطُهَا بِالْمُبْتَدَأ)** ئەگەر «ضمیر»ێک نەبێت ئەو ڕستەیەی بووە بە «خَبَر» ببەستێتەوە بە «مُبْتَدَأ»کەوە **(لَكَانَتْ أَجْنَبِيَّةً عَنْهُ)** ئەوە ڕستەکە دەبێتە بێگانە لە «مُبْتَدَأ» و هیچ پەیوەندییەکیان بەیەکەوە نامێنێت، چونکە ڕستە مانایەکی سەربەخۆ دەبەخشێت. **(إِلَّا إِذا كَانَ هَذا الضَّمِيرُ مَعْلُوماً مِنْ سِيَاقِ الْكَلَامِ)** تەنها ئەوکاتە نەبێت کە «ضمیر»ەکە ڕوون و ئاشکرا بێت، لە کاتی گوتنی ڕستەکەدا **(فَإِنَّهُ حِينَئِذٍ يُحْذَفُ مِنَ اللَّفْظِ)** ئەو کاتە پێویست ناکات کە هیچ «ضَمِیر»ێک هەبێت، بۆیە لە لەفزدا «ضَمیر»ەکە «حذف» دەکرێت، **(وَيُقَدَّرُ فِي النِّيَّةِ)** بەڵام لە نییەتدا هەر دەمێنێت **(نَحْوُ)** وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: **(اَلْبُرُّ)** واتە: گەنم **(اَلْكُرُّ بِسِتِّينَ دِرْهَماً)** تەنەکەی یاخود ڕبەی بە شێست درهەمە، **(فَإِنَّ الْكُرَّ بِسِتِّينَ دِرْهَماً)**، سەرنج بدە: ئێستا ڕستەی «اَلْكُرُّ بِسِتِّينَ دِرْهَماً» **(جُمْلَةٌ مِنَ الْمُبْتَدَأِ وَالْخَبَرِ)** ڕستەیەکە لە «مُبْتَدَأ» و لە «خَبَر» پێک هاتووە **(وَهِيَ خَبَرٌ لِلْبُرِّ)** بۆتە خەبەر بۆ وشەی «اَلْبُرُّ» کەچی هیچ «ضَمِیر»ێکی تێدا نییە، چونکە ڕستەکە ئاشکرایە، **(وَالضَّمِيرُ مَحْذُوفٌ)** بۆیە «ضَمیر»ەکەی «حذف» کراوە، **(وَالتَّقْدِيرُ)** ڕستەکە وای لێ دێتەوە: **(اَلْبُرُّ، اَلْكُرُّ مِنْهُ بِسِتِّينَ دِرْهَماً)** ئەو کاتە وشەی «مِنْهُ» دەگەڕێتەوە بۆ لای وشەی «اَلْبُرُّ». ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: **(وَإِنَّما حُذِفَ مِنْهُ؟)** بۆچی وشەی «مِنْهُ» لەم ڕستەیەدا «حَذْف» کراوە؟ یاخود بۆچی ئەم ڕستەیە «ضَمیر»ەکەی لێ «حذف» کراوە[1] **(لَدِلالَةِ سَوْقِ الْكَلامِ عَلَيْهِ)** چونکە سیاقی ڕستەکە دەلالەتی لەسەر دەکات **(فَإِنَّ تَقْدِيمَ الْبُرِّ عَلَى الْكُرِّ)** چونکە

---

١. ئەم ڕستەیە بە هەردوو شێوە مانا دەکرێت.

**يَدُلُّ عَلَىٰ أَنَّ «الْكُرَّ» يَكُونُ مِنَ «الْبُرِّ» فَيُسْتَغْنَىٰ عَنْ ذِكْرِهِ. وَالْكُرُّ: نَوْعٌ مِنَ الْمِكْيَالِ.**

وەپێشکەوتنی وشەی «اَلْبُرّ» ـکە بە مانای «گەنم» دێت ـ لەسەر وشەی «اَلْكرّ» ـکە بە مانای «ڕبە» دێت ـ (**يَدُلُّ عَلَى أَنَّ الْكُرَّ، يَكُونُ مِنَ الْبُرِ**)[1] دەلاڵەت دەکات لەسەر ئەوە کە ڕبەکە (اَلْكُرّ) لە گەنمەکەیە (اَلْبُرّ)، واتە: کاتێک تۆ دەچیت بۆ لای گەنمفرۆشێک تەنەکەی گەنمکێشان لەسەر کۆمەڵە گەنمەکە داندراوە، پرسیار دەکەیت: ئەم گەنمە تەنەکەی بە چەندە؟ فرۆشیار یەکسەر وەڵام دەداتەوە و دەڵێت: تەنەکەی بە شێست درهەمە، پێویست ناکات فرۆشیار بڵێت: ئەم گەنمە تەنەکەی ئەم گەنمە بە شێست درهەمە، چونکە ئاشکرایە تۆ پرسیاری ئەو گەنمەت کردووە کە تەنەکەی لەسەر دانراوە، نەک گەنمێکی‌تر.

## ئەو شوێنانەی کە دروستە «حَذْفِ»ی «ضَمِیرِ»ی تێدا بکرێت

**یەکەم:** ئەگەر بێت و ڕستەکە مانەکەی ڕوون و ئاشکرا بوو (مَعْلُوم) ئەو کاتە «ضَمِیر»ەکە «حذف» دەکرێت وەکوو ئەم نموونەیە کە باسمانکرد.

**دووەم:** ئەگەر بێت و ئەو ڕستەیەی کە بۆتە «خَبَر» بۆ «مُبْتَدَأ» سەرەتاکەی بە «اسم الإشارة» دەست پێبکات، وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ﴾[2]، **سەرنج بدە:** ئێستا ڕستەی «ذَٰلِكَ خَيْرٌ» بووە بە خەبەر بۆ وشەی «وَلِباسُ التَّقْوى» لە هەمان کاتدا «ضَمیر»ەکەی «حذف» کراوە.

**سێیەم:** ئەگەر بێت و ئەو وشەیەی کە بووە بە «مُبْتَدَأ» بە هەمان «لَفْظ» لە خەبەریش دووبارە بوویەوە ئەوکاتەش پێویست نییە «ضَمیر»ەکەی باس بکرێت، بەڵکوو «حذف» دەکرێت، وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلْحَآقَّةُ ۝١ مَا ٱلْحَآقَّةُ﴾[3] **سەرنج بدە:** ئێستا ڕستەی «مَالْحَاقَة» بووە بە خەبەر بۆ وشەی «اَلْحَاقَّة» لە هەمان کاتدا «ضَمیر»ەکەی «حذف» کراوە.

---

١. بڕوانە: شرح قطر النّدى (١١٥)جامع الدروس العربية: (٣١٥) وشرح المفصل: (٢٢٦/١)، وشرح التسهيل: (٢٩٥/١) وشرح ابن عقيل: (٢٢١/١) وشرح المفصل: (١/ ٢٣٣)، و شرح كافية ابن الحاجب: (١٠٨/١).

٢. سورة الأعراف: (٢٦).

٣. سورة الحاقة: (١، ٢).

# تَقْدِيمُ الْخَبَرِ عَلَى الْمُبْتَدَأِ

**قَالَ: وَقَدْ يَتَقَدَّمُ الْخَبَرُ عَلَى الْمُبْتَدَإِ، نَحْوُ: «مُنْطَلِقٌ زَيْدٌ».**

**أَقُولُ: حَقُّ الْمُبْتَدَإِ أَنْ يَكُونَ مُقَدَّماً عَلَى الْخَبَرِ؛ لِأَنَّهُ مَحْكُومٌ عَلَيْهِ، وَحَقُّ الْمَحْكُومِ عَلَيْهِ التَّقْدِيمُ؛ لَكِنْ قَدْ يُقَدَّمُ الْخَبَرُ عَلَى الْمُبْتَدإِ، نَحْوُ: «مُنْطَلِقٌ زَيْدٌ»، فَإِنَّ «زَيْداً» مُبْتَدَأٌ وَ «مُنْطَلِقٌ» خَبَرُهُ مُقَدَّمٌ عَلَيْهِ؛**

## وانهِ بیستودووهەم: باسی پێشکەوتنی «مُبْتَدَأ» لەسەر «خَبَر»

**(قَالَ:)** مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: «أَصْل»و یاسە وایە کە هەموو کات دەبێت«مُبْتَدَأ»ە لە پێش «خَبَر»بێت وەکو: «زَيْدٌ مُنْطَلِقٌ» بەڵام **(وَقَدْ يَتَقَدَّمُ الْخَبَرُ عَلَى الْمُبْتَدَإِ)** هێندێک جار «خَبَر» لەسەر «مُبْتَدَأ» وەپێش دەکەوێت **(نَحْوُ)** وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: **(مُنْطَلِقٌ زَيْدٌ)** **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «مُنْطَلِقٌ» ـ کە «خَبَر»ە ـ لەسەر وشەی «زَيْدٌ» وە پێش کەوتووە ـ کە «مُبْتَدَأ»یە ـ.

**(أَقُولُ)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(وَحَقُّ الْمُبْتَدَإِ أَنْ يَكُونُ مُقَدَّماً عَلَى الْخَبَرِ)** «أَصْل» و یاسا وایە کە هەموو کات دەبێت «مُبْتَدَأ» لە پێش «خَبَر» بێت **(لأَنَّهُ مَحْكُومٌ عَلَيْهِ)** چونکە «مُبْتَدَأ» خەبەری لە بارەوە دراوە و بۆتە «مُسْنَدُ إِلَيْهِ» و حوکمی بەسەردا دراوە **(وَحَقُّ الْمَحْكُومِ عَلَيْهِ التَّقْديمُ)**[1] وە ئەو شتەی کە حوکمی بەسەردا دەدرێت بەپێی یاسا دەبێت پێش بکەوێت وەکوو: «زَيْدٌ مُنْطَلِقٌ» **(لَكِنْ قَدْ يُقَدَّمُ الْخَبَرُ عَلَى الْمُبْتَدَإِ)** بەڵام هێندێک جار «خَبَر» لەسەر «مُبْتَدَأ» وەپێش دەکەوێت **(نَحْوُ)** وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: **(مُنْطَلِقٌ زَيْدٌ)** **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا **(فَإِنَّ زَيْداً مُبْتَدَأٌ)** وشەی «زَيْدٌ» موبتەدایە **(وَمُنْطَلِقٌ خَبَرُهُ)** وشەی «مُنْطَلِقٌ» خەبەرە بۆ «زَيْدٌ» و **(مُقَدَّمٌ عَلَيْهِ)** لەسەر «مُبْتَدَأ» پێش کەوتووە.

---

١. بڕوانە: شرح جمل الزجاجي: (٣٣٢/١) و الإنصاف في مسائل الخلاف: (٦٩/١) وشرح قطر النّدى (١١٥)جامع الدروس العربية: (٣١٥) وشرح المفصل: (٢٢٦/١)، وشرح التسهيل: (٢٨٣/١) وشرح ابن عقيل: (٢٢١/١) وشرح المفصل: (١/ ٢٣٣)، و شرح كافية ابن الحاجب: (١٠٨/١).

**وَ إِنَّمَا جَازَ ذٰلِكَ لِلتَّوَسُّعِ فِي الْكَلَامِ، فَإِنَّهُ رُبَّمَا يُحْتَاجُ فِي الْوَزْنِ وَالْقَافِيَةِ وَالسَّجْعِ إِلَىٰ تَقْدِيمِ بَعْضِ أَجْزَاءِ الْكَلَامِ عَلَىٰ بَعْضٍ.**

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: **(وَ إِنَّما جَازَ ذَلكَ؟)** بۆچی زانایان بە دروستیان داناوە کە «خَبَر» لەسەر «مُبْتَدَأ» وەپێش بکەوێت؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: **(لِلتَّوَسُّعِ فِي الْكَلَامِ)** بۆ ئەوەی مەجال و بەرفراوانی لە زمانی عەربیدا پەیدا ببێت **(فَإِنَّهُ رُبَّما يَحْتاجُ فِي الْوَزْنِ وَالقافِيَةِ وَالسَّجْعِ)** چونکە زۆر جار پێویست دەبێت لە کاتی نووسینی هۆنراوە و پەخشان و ڕێکخستنی کێش و سەروا لە زمانی شیعر و ئەدەبدا **(إِلَى تَقْدِيمِ بَعْضِ أَجْزاءِ الْكَلامِ عَلَى بَعْضٍ)**[1] بۆ پێشخستنی بەشێک لە بڕگەکانی ڕستە لەسەر بەشێکی‌تر وەکوو پێشخستنی «مَفْعُول بِهِ» لەسەر «فِعْل» یاخود پێشخستنی «خَبَر» لەسەر «مُبْتَدَأ».

**ئینجا بزانە:** ئەی قوتابی بەڕێز و فەقێی خۆشەویست، لە هێندێک شوێن واجبە کە «خَبَر» لەسەر «مُبْتَدَأ» وەپێش بکەوێت، لە هێندێک شوێن بە پێچەوانەوە: واجبە کە «مُبْتَدَأ» لەسەر «خَبَر» وەپێش بکەوێت، لە هێندێک شوێن هەردوو بابەت دروستن، واتە: «جَواز الأَمْرَيْن» وەکوو ئەم نموونەی کە باسمان کرد؛ بەڵام بۆ ئەوەی بابەتەکە درێژتر نەبێت، من ئەم بابەتە بۆ کتێبە گەورەکان جێ دەهێڵم پشت بەخوا لەوێدا بابەتەکانت باشتر بۆ ڕوون دەبنەوە «إن شاء الله».

* ◌ *

١. بڕوانە: معاني النحو: (١/ ١٣٧)، وشرح جمل الزجاجي: (٣٣٢/١) و الإنصاف في مسائل الخلاف: (٦٩/١) وشرح قطر النّدى (١١٥)جامع الدروس العربية: (٣١٥) وشرح المفصل: (٢٢٦/١)، وشرح التسهيل: (٢٨٣/١) وشرح ابن عقيل: (٢٢١/١) وشرح المفصل: (١/ ٢٣٣)، و شرح كافية ابن الحاجب: (١٠٨/١).

# جَوَازُ حَذْفِ الْمُبْتَدَإِ أَوِ الْخَبَرِ

**قَالَ: وَيَجُوزُ حَذْفُ أَحَدِهِمَا عِنْدَ الدّلالَةِ، قَالَ اللهُ تَعَالَىٰ: ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ﴾.**

**أَقُولُ: الْأَصْلُ فِي الْمُبْتَدَإِ وَالْخَبَرِ هُوَ الثُّبُوتُ؛ لِأَنَّ الْحَذْفَ خِلَافُ الْأَصْلِ؛ لٰكِنْ يَجُوزُ حَذْفُ أَحَدِهِمَا عِنْدَ الدِّلالَةِ، أَيْ: إِذَا وُجِدَتْ قَرِينَةٌ تَدُلُّ عَلَىٰ ذٰلِكَ الْمَحْذُوفِ،**

---

## وانەی بیستوسێهەم: باسی «حذف»کردنی «مُبْتَدَأ» و «خَبَر»

**(قَالَ:)** مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: ئەگەرچی ئەسڵ وایە «مُبْتَدَأ» و «خَبَر» هەردووکیان لەناو ڕستە وجوودیان هەبێت، بەڵام **(وَيَجُوزُ حَذْفُ أَحَدِهِما عِنْدَ الدِّلالَةِ)** دروستە هەریەکە لە «مُبْتَدَأ» یاخود «خَبَر» لەناو ڕستە «حَذْف» بکرێن، ئەگەر بەڵگەیەک هەبێت دەلالەت بکات لەسەر ئەوەی کە یەکیان «حَذْف» کراوە لەناو ڕستەکە **(قَالَ اللّٰهُ تَعالَى)** وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ﴾[1]

**سەرنج بدە:** ئەم نموونەیە یا موبتەدایە و خەبەرەکەی «حذف» کراوە، یاخود خەبەرە و موبتەداکەی «حذف» کراوە، هەروەک پاش کەمێکیتر ڕوونی دەکەینەوە.

**(أَقُولُ:)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(اَلأَصْلُ فِي الْمُبْتَدَإِ وَالْخَبَرِ هُوَ الثُّبُوتُ)** بەپێی یاسای زانایانی زمانی عەرەبی «أَصْل» وایە کە «مُبْتَدَأ» و «خَبَر» هەردووکیان لەناو ڕستە وجوودیان هەبێت و هەریەکەیان لە شوێنی خۆی بێت **(لأَنَّ الْحَذْفَ خِلافُ الأَصْلِ)** چونکە «حذف»کردن لە هەموو شوێنێک پێچەوانەی ئەسڵ و پێچەوانەی یاسایە **(لَكِنْ يَجُوزُ حَذْفُ أَحَدِهِما عِنْدَ الدِّلالَةِ)** بەڵام دروستە هەریەکە لە «مُبْتَدَأ» و لە «خَبَر» لەناو ڕستە «حَذْف» بکرێن، ئەگەر بەڵگەیەک هەبێت دەلالەت بکات لەسەر ئەوەی کە یەکیان «حذف» کراوە لەناو ڕستەکە **(أَيْ: إِذا وُجِدَتْ قَرِينَةٌ تَدُلُّ عَلَى ذَلِكَ الْمَحْذُوفِ)** مەبەستم ئەوەیە

---

١. سورة يوسف: الأية: (١٨).

**كَمَا قَالَ اللَّهُ تَعَالَىٰ: ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ﴾؛ فَإِنَّهُ إِمَّا خَبَرٌ لِمُبْتَدَإٍ مَحْذُوفٍ، وَالتَّقْدِيرُ: «أَمْرِي صَبْرٌ جَمِيلٌ»؛ أَوْ مُبْتَدَأٌ لِخَبَرٍ مَحْذُوفٍ، وَالتَّقْدِيرُ: «فَصَبْرٌ جَمِيلٌ أَجْمَلُ». وَالْقَرِينَةُ هٰهُنَا وُجُودُ ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ﴾؛ لِأَنَّهُ يَصْلُحُ أَنْ يَكُونَ أَحَدَ جُزْئَيِ الْكَلَامِ، فَيَدُلُّ عَلَىٰ أَنَّ الْجُزْءَ الْآخَرَ مَحْذُوفٌ يُنَاسِبُهُ.**

---

هەرکاتێک بەڵگە و نیشانەیەک هەبوو لەناو ڕستەکەدا، دەلالەتی دەکرد کە ئەم ڕستەیە یا موبتەدایە و خەبەرەکەی «حذف» کراوە، یاخود خەبەرە و موبتەداکەی «حذف» کراوە، هەروەکوو (قَالَ اللَّهُ تَعالَى) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ﴾ واتە: ئارامگرتنێکی جوان، (فَإِنَّهُ إِمّا خَبَرٌ لِمُبْتَدَإٍ مَحْذُوفٍ) سەرنج بدە: ئەم نموونەیە یا خەبەرە و موبتەداکەی «حذف» کراوە، چونکە ئەم ڕستەیە بە تەنها مانایەکی تەواوی نییە (وَالتَّقْدِيرُ) ئەوکاتە ڕستەکە وای لێ دێتەوە: (أَمْرِي صَبْرٌ جَمِيلٌ) ئەو کاتە وشەی «أَمْرِي»، «تَقْدِيراً مَرْفُوع» دەبێتە «مُبْتَدَأ» و وشەی «صَبْرٌ» دەبێتە خەبەری، هەروەها وشەی «جَمِيلٌ» دەبێتە «صِفَة»ی.

(أَوْ مُبْتَدَأٌ لِخَبَرٍ مَحْذوفٍ) یاخود موبتەدایە و خەبەرەکەی «حذف» کراوە (وَالتَّقْدِيرُ) ئەو کاتە ڕستەکە وای لێ دێتەوە (فَصَبْرٌ جَمِيلٌ أَجْمَلُ) ئەو کاتە وشەی «فَصَبْرٌ» دەبێتە «مُبْتَدَأ» و وشەی «جَمِيلٌ» دەبێتە «صِفَة»ی، هەروەها وشەی (أَجْمَلُ) دەبێتە خەبەر بۆ وشەی «فَصَبْرٌ» (وَالْقَرِينَةُ هَهُنا) بەڵگەشمان لێرەدا بریتییە لە (وُجودُ ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ﴾) هەبوونی ڕستەی «فَصَبْرٌ جَميلٌ»ـە (لأَنَّهُ يَصْلُحُ أَنْ يَكُونَ أَحَدَ جُزْئَيِ الْكَلامِ) چونکە ئەم دوو وشەیە دەکرێت ببن بە بەشێک لە ڕستەی «مُبْتَدَأ»، یاخود «خَبَر» (فَيَدُلَّ عَلَى أَنَّ الْجُزْءَ الآخَرَ مَحْذُوفٌ) کەواتە دەلالەت دەکەن کە بەشەکەیتری ڕستەکە «حذف» کراوە کە لە ڕووی ماناوە (يُناسِبُهُ) گونجاوە لەگەڵ ئەم بەشەی کە ماوە.

* ◌ *

# الِاسْمُ فِي بَابِ كَانَ

**قَالَ: وَالِاسْمُ فِي بَابِ كَانَ، نَحْوُ: «كَانَ زَيْدٌ مُنْطَلِقاً».**

**أَقُولُ: لَمَّا فَرَغَ مِنَ الضَّرْبِ الْأَوَّلِ مِنْ ضُرُوبِ الْمُلْحَقِ بِالْأَصْلِ، شَرَعَ فِي الضَّرْبِ الثَّانِي، وَهُوَ الِاسْمُ فِي بَابِ كَانَ، أَي: الْمَرْفُوعُ بِالْأَفْعَالِ النَّاقِصَةِ، وَالْأَفْعَالُ النَّاقِصَةُ أَفْعَالٌ تُذْكَرُ فِي بَابِ الْفِعْلِ؛**

---

## وانەی بیستوچوارەم: باسی «اِسْمُ بَابِ كَانَ»

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: **(وَالِاسْمُ فِي بابِ كَانَ)** یەکێکی‌تر لەو ئیسمانەی کە «مَرْفُوع» دەبن، بریتییە لەو ئیسمەی کە مەرفووع دەبێت بە یەکێک لە «أَفْعالُ النَّاقِصَة» کە بە «اِسْمُ بَابِ كَانَ» مەشهوورن، **(نَحْوُ)** وەکوو ئەم نموونەیە کە دەڵێت: **(كَانَ زَيْدٌ مُنْطَلِقاً)**، **سەرنج بدە:** ئێستا لەم نموونەیەدا وشەی «زَيْدٌ» بە یەکێک لە فیعلەکانی «نَاقِصَة» مەرفووع بووە کە وشەی «كَانَ»یە.

(أَقُولُ:) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(لَمَّا فَرَغَ مِنَ اَلضَّرْبِ الأَوَّلِ مِنْ ضُروبِ الْمُلْحَقِ بِالأَصْلِ)** لە کاتێکدا مامۆستا باسی بابەتی یەکەمی تەواو کرد لەم بابەتانەی «مُلْحَق» بوون بە «فاعِل» کە باسی «مُبْتَدَأ» و «خَبَر» بوو، **(شَرَعَ فِي الضَّرْبِ الثَّانِي)**[1] دەستی کرد بە باسکردنی بابەتی دووەم لەو بابەتانەی کە مولحەقن بە «فَاعِل» **(وهُوَ: الإِسْمُ فِي بابِ كَانَ)** کە بریتییە لە ئیسمی «أَفْعالُ النَّاقِصَة» **(أَيْ:)** مەبەست بە ئیسمی «بَابُ كَانَ» **(اَلْمَرْفُوعُ بِالأَفْعالِ النَّاقِصَةِ)** ئەو ئیسمەیە کە «مَرْفُوع» دەبێت بە یەکێک لە «أَفْعالُ النَّاقِصَة» **(والأَفْعالُ النَّاقِصَةُ)** وە «أَفْعالُ النَّاقِصَة»یش **(أَفْعالٌ تُذْكَرُ فِي بَابِ الْفِعْلِ)** بریتین لە چەند فیعلێک کە لە بەشی دووەمی ئەم کتێبە لە «بَابُ الْفِعْل» بە درێژی باسیان دەکرێت و ڕوون دەکرێنەوە، ئەگەر خوای گەورە پشت‌وپەنامان بێت.

---

١. بڕوانە: شرح المفصل: ١/٢٣٥.

**وَسُمِّيَتْ نَاقِصَةً لِأَنَّ فِيهَا نُقْصَاناً، وَذٰلِكَ لِأَنَّهَا أَفْعَالٌ لَا تَتِمُّ بِفَاعِلِهَا بَلْ تَحْتَاجُ إِلَىٰ اسْمٍ آخَرَ تَنْصِبُهُ كَمَا سَيَجِيءُ، وَيُسَمَّى الْمَرْفُوعُ اسْمَهَا، وَالْمَنْصُوبُ خَبَرَهَا، فَالِاسْمُ بِمَنْزِلَةِ الْفَاعِلِ، وَالْخَبَرُ بِمَنْزِلَةِ الْمَفْعُولِ، نَحْوُ: «كَانَ زَيْدٌ مُنْطَلِقاً».**

---

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: **(وَسُمِّيَتْ نَاقِصَةً)** بۆچی ئەم فیعلانە پێیان دەگوترێت: «أَفْعَالُ النَّاقِصَة»؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: **(لأَنَّ فِيهَا نُقْصَاناً)** چونکە ئەم فیعلانە هەموویان «نَقْص»ـیان تێدا هەیە، ئینجا مامۆستا بەیانی«نَقْص»ـەکەیان دەکات و دەفەرموێت: **(وَذَلِكَ،لأَنَّها أَفْعالٌ لا تَتِمُّ بِفَاعِلِها)** چونکە ئەم فیعلانە بریتین لە کۆمەڵە فیعلێک کە مانایان بە هاتنی «فَاعِل» تەواو نابێت **(بَلْ تَحْتاجُ إِلَى اِسْمٍ آخَرَ تَنْصِبُهُ)** بەڵکوو جگە لە «فَاعِل» پێویستیان بە ئیسمێکیتر هەیە کە «مَنْصُوب»ـیان بکەن **(كَمَا سَيَجِيءُ إِنْ شَاءَاللَّهُ تَعَالَى)** هەروەکوو لەمەودوا بە درێژی باسیان دەکەین، ئەگەر خوای گەورە پشتوپەنامان بێت.

ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: **(وَيُسَمَّى الْمَرْفُوعُ اِسْمَهَا)** ئەو وشەیەی کە بەم فیعلانە «مَرْفُوع» دەبێت، دەبێتە «اِسْم» بۆ ئەو فیعلەی کە لە دوای هاتووە، پێشی دەگوترێت: «اِسْمُ بابِ كَانَ»، **(وَالْمَنْصُوبُ خَبَرَهَا)** هەروەها ئەو وشەیەی کە بەم فیعلانە «مَنْصُوب» دەبێت، دەبێتە «خَبَر» بۆ ئەو فیعلەی کە لە دوای هاتووە، پێشی دەگوترێت: «خَبَرُ بَابِ كَانَ»، **(فَالاِسْمُ بِمَنْزِلَةِ الْفَاعِلِ)** کەواتە: ئیسمەکە لە جێگای فاعیلە **(وَالْخَبَرُ بِمَنْزِلَةِ الْمَفْعُولِ)** وە هەروەها خەبەرەکە لە جێگای «مَفْعُول بِهِ»ـیە **(نَحْوُ)** وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: **(كَانَ زَيْدٌ مُنْطَلِقاً)** سەرنج بدە: ئێستا وشەی «زَيْدٌ» پێی دەگوترێت «اِسْمُ كَانَ»، هەروەها وشەی «مُنْطَلِقاً» پێی دەگوترێت «خَبَرُ كَانَ».

* ◌ *

# الْخَبَرُ فِي بَابِ إِنَّ

**قَالَ: وَالْخَبَرُ فِي بَابِ «إِنَّ»، نَحْوُ: «إِنَّ زَيْداً مُنْطَلِقٌ».**

**أَقُولُ: الضَّرْبُ الثَّالِثُ مِنْ ضُرُوبِ الْمُلْحَقِ بِالْفَاعِلِ هُوَ الْخَبَرُ فِي بَابِ «إِنَّ»، أَي: الْمَرْفُوعُ بِالْحُرُوفِ الْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْلِ، وَهِيَ سِتَّةُ أَحْرُفٍ تُذْكَرُ فِي بَابِ الْحَرْفِ إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَىٰ، تَدْخُلُ عَلَى الْمُبْتَدَإِ وَالْخَبَرِ،**

## وانەی بیستوپێنجەم: باسی «خَبَرُ بَابِ إِنَّ»

**(قالَ:)** مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: **(وَالْخَبَرُ فِي بابِ إِنَّ)** یەكێكیتر لەو ئیسمانەی كە «مَرْفُوع» دەبن، بریتییە لەو ئیسمەی كە مەرفووع دەبێت بە یەكێک لە «حُروفُ الْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل» كە بە «خَبَرُ بَابِ إِنَّ» مەشهوورن، **(نَحْوُ)** وەكوو ئەم نموونەیە كە دەڵێت: **(إِنَّ زَيْداً مُنْطَلِقٌ)** سەرنج بدە: ئێستا لەم نموونەیەدا وشەی «مُنْطَلِقٌ» بە یەكێك لە حەرفەكانی «الْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل» مەرفووع بووە كە وشەی «إِنَّ»یە.

**(أَقُولُ:)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(اَلضَّرْبُ الثَّالِثُ مِنْ ضُروبِ الْمُلْحَقِ بِالأَصْلِ)**[1] بابەتی سێیەم لەو بابەتانەی كە مولحەقن بە فاعیل **(هُوَ: الْخَبَرُ فِي بابِ إِنَّ)** بریتییە لە ئیسمی «بَاب إِنَّ» **(أَيْ: اَلْمَرْفُوعُ بِالْحُروفِ الْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْلِ)** واتە: ئەو ئیسمەی كە «مَرْفُوع» دەبێت بە یەكێک لە حەرفەكانی «الْمُشَبَّهَةُ بِالْفِعْل» **(وَهِيَ سِتَّةُ أَحْرُفٍ)** كە ژمارەیان بریتین لە شەش «حَرْف» **(تُذْكَرُ فِي بَابِ الْحَرْفِ، إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعالَى)** كە لە بەشی سێیەمی ئەم كتێبە لە «بَابُ الْحَرْف» بە درێژی باسیان دەكرێت و ڕوون دەكرێنەوە، ئەگەر خوای گەورە پشتوپەنامان بێت.

ئینجا ئەم شەش حەرفە **(تَدْخُلُ عَلَى الْمُبْتَدَإِ وَالْخَبَرِ)** دەچنە سەر ئەو دوو ئیسمانەی كە لە ئەسڵدا «مُبْتَدَأ» و «خَبَر» بوون و هەردووكیان مەرفووع بوون

---

١. بڕوانە: الإنصاف في مسائل الخلاف: (٦٩/١) وشرح قطر النّدى (١١٥) جامع الدروس العربية: (٣١٥) وشرح المفصل: (٢٢٦/١)، وشرح التسهيل: (٢٨٣/١)

**فَتَنْصِبُ الْمُبْتَدَأَ وَيُسَمَّىٰ اسْمَهَا، وَتَرْفَعُ الْخَبَرَ وَيُسَمَّىٰ خَبَرَهَا.**

**(فَتَنْصِبُ الْمُبْتَدَأَ)** ئینجا ئەم حەرفانە ئیسمی یەکەم «مَنْصُوب» دەکەن کە «مُبْتَدَأ»یە **(وَيُسَمَّى اِسْمَهَا)** وە دەبێتە «اِسْم» بۆ ئەم حەرفەی کە لە دوای هاتووە، پێشی دەگوترێت: «اِسْمُ بابِ إِنَّ» **(وَتَرْفَعُ الْخَبَرَ)** هەروەها ئەم حەرفانە ئیسمی دووەم مەرفووع دەکەن کە «خَبَر»ە **(وَيُسَمَّى خَبَرَهَا)** وە دەبێتە «خَبَر» بۆ ئەم حەرفەی کە لە دوای هاتووە و پێشی دەگوترێت: «خَبَرُ بَابِ إِنَّ».

## بۆچی ئەم شەش حەرفانە پێیان دەگوترێت «الْحُروفُ الْمُشَبَّهَةُ بِالْفِعْل»؟

**یەکەم:** چونکە هەریەکە لەم شەش حەرفانە مانای فیعلیان لە نێو خۆدا گرتووە، بۆ نموونە وشەی «إِنَّ» و «أَنَّ» مانای «تأكيد» و «تحقيق»ـیان لە نێو خۆدا گرتووە، هەروەها وشەی «كَأَنَّ» مانای «تَشْبِيه»ـی لە نێو خۆدا گرتووە.

**دووەم:** هەروەها هەریەکە لەم شەش حەرفانە وەکوو «الفِعْلُ الْماضِي» حەرفی کۆتاییان «مَفْتُوح»ـە بۆیە وەکوو «الفِعْلُ الْماضِي» «مَبني»ـیە لەسەر«فَتْحَة».

**سێیەم:** هەروەها هەریەکە لەم شەش حەرفانە وەکوو «فِعْل» ئیسمێک «مَرْفُوع» دەکەن و ئیسمێک «مَنْصُوب» دەکەن.

**چوارەم:** هەروەها هەریەکە لەم شەش حەرفانە وەکوو «فِعْل» لەسەر سێ یاخود چوار یاخود پێنج حەرف دامەزراون.

* ◌ *

**قَالَ: وَحُكْمُهُ حُكْمُ خَبَرِ الْمُبْتَدَإِ، إِلَّا فِي تَقْدِيمِهِ؛ إِلَّا إِذَا كَانَ ظَرْفاً، نَحْوُ: «إِنَّ زَيْداً مُنْطَلِقٌ»، وَلَا تَقُولُ: «إِنَّ مُنْطَلِقٌ زَيْداً» وَلٰكِنْ تَقُولُ: «إِنَّ فِي الدَّارِ زَيْداً».**

## وانەی بیستوشەشەم: باسی «حُكْمُ خَبَرِ الْحُروفِ الْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل»

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: (**وَحُكْمُهُ**) یاسا و ڕێساکانی خەبەری حەرفی «اَلْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل» (**كَحُكْمِ خَبَرِ الْمُبْتَدَأِ**) وەکوو یاسا و ڕێساکانی خەبەرێ موبتەداینە و لە هەموو حوکمەکان وەکوو یەکترن (**إِلّا فِي تَقْدِيمِهِ**) تەنها لە وەپێشکەوتنێ خەبەری حەرفێ «اَلْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل» نەبێت لەسەر ئیسمێ خۆیان، ئەمەیان دروست نییە، بەڵام وەپێشکەوتنی خەبەری «مُبْتَدَأ» لەسەر «مُبْتَدَأ» دروست بوو، وەکوو «مُنْطَلِقٌ زَيْدٌ». (**إِلّا إِذا كَانَ ظَرْفاً**) تەنها ئەگەر بێت و خەبەری حەرفێ «اَلْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل»، «ظَرْفُ الزَّمان» یاخود «ظَرْفُ الْمَكان» بوو، یاخود «جَارّ و مَجْرُور» بوو، ئەو کاتە دروستە خەبەری حەرفێ «اَلْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل» لەسەر ئیسمێ خۆیان پێش بکەوێت (**نَحْوُ**) وەکوو (**إِنَّ زَيْداً مُنْطَلِقٌ**)، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «زَيْدٌ» بووە بە «اِسْمُ إِنَّ» هەروەها وشەی «مُنْطَلِقٌ» بووە بە «خَبَرُ إِنَّ» و لە دوای ئیسمەکە هاتووە (**وَلا تَقُولُ:**) کەواتە، دروست نییە بگوترێت: (**إِنَّ مُنْطَلِقٌ زَيْداً**) چونکە وەپێشکەوتنێ خەبەری حەرفێ «اَلْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل» لەسەر ئیسمێ خۆیان دروست نییە، (**وَلَكِنْ تَقُولُ:**) بەڵام دروستە بگوترێت: (**إِنَّ فِي الدّارِ زَيْداً**)[1] چونکە بڕگەی «فِي الدَّارِ» جارڕ و مەجروورە، ئێمەش گوتمان: ئەگەر بێت و خەبەرێ حەرفی «اَلْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل»ـێ «ظَرْفُ الزَّمان» بوو، یاخود «ظَرْفُ الْمَكان» بوو، یاخود «جَارّ و مَجْرُور» بوو دروستە لەسەر ئیسمێ خۆی وەپێش بکەوێت.

° °

١. بڕوانە: القوعد والفوائد: (١٦٣) وشرح المفصل: (٢٥٩/١).

**أَقُولُ: وَحُكْمُ خَبَرِ الْحُرُوفِ الْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْلِ مِثْلُ حُكْمِ خَبَرِ الْمُبْتَدَإِ: مِنْ كَوْنِهِ مُفْرَداً مُشْتَقّاً أَوْ غَيْرَ مُشْتَقٍّ، مُضَافاً أَوْ غَيْرَ مُضَافٍ، نَحْوُ: «إِنَّ زَيْداً ضَارِبٌ، وَ إِنَّ زَيْداً ضَارِبُكَ، وَ إِنَّ زَيْداً غُلَامٌ، وَ إِنَّ زَيْداً غُلَامُكَ»؛ وَمِنْ كَوْنِهِ جُمْلَةً**

---

**(أَقُولُ:)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(وَحُكْمُ خَبَرِ الْحُروفِ الْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْلِ)** یاسا و ڕێساکانی خەبەری حەرفێ «اَلْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل» **(مِثْلُ حُكْمِ خَبَرِ الْمُبْتَدَإِ)** وەکوو یاسا و ڕێساکانی خەبەری «مبتدأ»ینە و لە هەموو حوکمەکان وەکوو یەکترن، کە بریتین لەم شتانەی خوارەوە:

**حاڵەتی یەکەم:** ئەگەر خەبەرەکە موفرەد بێت، یەکەم: **(مِنْ كَوْنِهِ مُفْرَداً مُشْتَقاً)** هەندێک جار خەبەرەکە ئیسمێکی موفرەدی «مُشْتَق» دەبێت وەکوو خەبەری «مُبْتَدَأ»، دووەم: **(أَوْ غَيْرَ مُشْتَقٍ)** یاخود هەندێک جار خەبەرەکە ئیسمێکی موفرەدی «غَيْرُ الْمُشْتَقّ» دەبێت، سێیەم: **(مُضافاً)** هێندێک جار خەبەرەکە ئیسمێکی موفرەدی «إضافة»کراو دەبێت، چوارەم: **(أَوْ غَيْرَ مُضافٍ)** یاخود هەندێک جار خەبەرەکە ئیسمێکی «مُفْرَد»ی «غَيْرُ الْمضاف» دەبێت **(نَحْوُ)** نموونەی یەکەم: وەکوو **(إِنَّ زَيْداً ضَارِبٌ)**، سەرنج بدەن: ئێستا لەم نموونەیەدا وشەی «ضارِبٌ» بووە بە خەبەر لەبۆ وشەی «إِنَّ» لە هەمان کاتدا ئیسمێکی «مُشْتَقّ»ـە و «إِضافَة» نەکراوە؛ **(وَ)** نموونەی دووەم: وەکوو **(إِنَّ زَيْداً ضَارِبُكَ)** لەم نموونەیەدا وشەی «ضارِبُكَ» بووە بە خەبەر لەبۆ وشەی «إِنَّ» لە هەمان کاتدا ئیسمێکی «مُشْتَقّ»ـە و «إِضافَة» کراوە بۆ لای «كاف الخطاب»؛ **(وَ)** نموونەی سێیەم: وەکوو **(إِنَّ زَيْداً غُلامٌ)** لەم نموونەیەدا وشەی «غُلامٌ» بووە بە خەبەر لەبۆ وشەی «إِنَّ» لە هەمان کاتدا ئیسمێکی «جامد»ە و «إِضافَة» نەکراوە؛ **(وَ)** نموونەی چوارەم: وەکوو **(إِنَّ زَيْداً غُلامُكَ)** لەم نموونەیەدا وشەی «غُلامُكَ» بووە بە خەبەر لەبۆ وشەی «إِنَّ» لە هەمان کاتدا ئیسمێکی «جامِد»ە و «إِضافَة» کراوە.

**حاڵەتی دووەم:** ئەگەر خەبەرەکە «جُمْلَة» بێت، لەوەشدا وەکوو یەکترن **(وَمِنْ كَوْنِهِ جُمْلَةً)** هەندێک جار خەبەری حەرفێ «اَلْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل» جوملە دەبێت، کە چوار

**فِعْلِيَّةً، نَحْوُ: «إِنَّ زَيْداً ذَهَبَ أَبُوهُ»؛ وَاسْمِيَّةً، نَحْوُ: «إِنَّ عَمْراً أَخُوهُ ذَاهِبٌ»؛ وَشَرْطِيَّةً، نَحْوُ: «إِنَّ زَيْداً إِنْ تُكْرِمْهُ يُكْرِمْكَ»؛ وَظَرْفِيَّةً حَقِيقِيَّةً، نَحْوُ: «إِنَّ خَالِداً أَمَامَكَ»؛ أَوْ مَجَازِيَّةً، نَحْوُ: «إِنَّ بِشْراً مِنَ الْكِرَامِ»؛ وَمِنْ كَوْنِهِ مُسْتَحِقاً لِلضَّمِيرِ إِذَا كَانَ جُمْلَةً،**

---

جۆری هەیە: **جۆری یەکەم: (فِعْلِيَةً)** واتە: هەندێک جار خەبەری حەرفێ «اَلْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْلِ» ڕستەیەکی فیعلی (اَلْجُمْلَةُ الْفِعْلِيَّة) دەبێت **(نَحْوُ)** وەکوو **(إِنَّ زَيْداً ذَهَبَ أَبُوهُ)**، **سەرنج بدە:** ئێستا لەم نموونەیەدا ڕستەی «ذَهَبَ أَبُوهُ» ڕستەیەکی «فِعْلِية»یە و بووە بە خەبەر بۆ وشەی «إِنَّ»، **(وَ) جۆری دووەم: (اِسْمِيَّةً)** هەروەها هەندێک جار خەبەری حەرفێ «اَلْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل» ڕستەیەکی ئیسمی (اَلْجُمْلَةُ الاِسْمِيَّة) دەبێت **(نَحْوُ)** وەکوو **(إِنَّ عَمْراً أَخُوهُ ذاهِبٌ)**، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا ڕستەی «أَخُوهُ ذاهِبٌ» ڕستەیەکی «اِسْمِيَة»یە و بووە بە خەبەر بۆ وشەی «إِنَّ»، **(وَ) جۆری سێیەم: (شَرْطِيَّةً:)** هەروەها هەندێک جار خەبەری حەرفێ «اَلْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل» ڕستەیەکی شەرتی (اَلْجُمْلَةُ الشَّرْطِيَّة) دەبێت **(نَحْوُ)** وەکوو **(إِنَّ زَيْداً إِنْ تُكْرِمْهُ يُكْرِمْكَ)**، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا ڕستەی «إِنْ تُكْرِمْهُ يُكْرِمْكَ» پێی دەگوترێت: ڕستەیەکی «شَرْطِيَّة»یە و بووە بە خەبەر بۆ وشەی «إِنَّ»، **(وَ) جۆری چوارەم: (ظَرْفِيَّةً حَقِيقِيَّةً)** هەروەها هەندێک جار خەبەری حەرفێ «اَلْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل» ڕستەیەکی «اَلْجُمْلَةُ الظَّرْفِيَّة الحَقِيقِيَّة» دەبێت، کە بریتییە لەو ڕستەیەی کە سەرەتاکەی بە «ظَرْفُ الزَّمانِ» یاخود بە «ظَرْفُ الْمَكان» دەست پێ‌دەکات **(نَحْوُ)** وەکوو **(إِنَّ خَالِداً أَمَامَكَ)**، ئێستا لەم نموونەیەدا وشەی «أَمامَكَ» لە «مَحَلُّ الرَّفْع»دا بووە بە «خَبَر» بۆ وشەی «إِنَّ»، **(أَوْ مَجَازِيَّةً)** یا پێی دەگوترێت «اَلْجُمْلَةُ الظَّرْفِيَّةُ الْمَجَازِيَّة» وەکوو **(إِنَّ بِشْراً مِنَ الْكِرامِ)**، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «مِنَ الْكِرامِ» پێی دەگوترێت «الجارّ والمجرور» و بەیەکەوە لە «مَحَلُّ الرَّفْع»دا بوون بە «خَبَر» بۆ وشەی «إِنَّ».

**حاڵەتی سێیەم (وَمِنْ كَوْنِهِ)** هەروەها لەوەشدا وەکوو یەکترن **(مُسْتَحِقاً لِلضَّمِيرِ إِذا كَانَ جُمْلَةً)** ئەگەر خەبەرەکە «جُمْلَة» بێت، دەبێت «ضَمِير»ێک هەبێت ئەم

**كَمَا مَرَّ فِي الأَمْثِلَةِ؛ وَمِنْ كَوْنِهِ مُسْتَغْنِياً عَنْ ذِكْرِ ذٰلِكَ الضَّمِيرِ إِذَا كَانَ مَعْلُوماً، نَحْوُ: «إِنَّ الْبُرَّ الْكُرُّ بِسِتِّينَ دِرْهَماً»؛ وَمِنْ كَوْنِهِ جَائِزَ الْحَذْفِ عِنْدَ الدِّلالَةِ، نَحْوُ: «إِنَّ مَالاً، وَ إِنَّ وَلَداً»، أَيْ: إِنَّ لَهُمْ مَالاً، وَ إِنَّ لَهُمْ وَلَداً؛ إِلَّا فِي تَقْدِيمِهِ، أَي: إِلَّا فِي تَقْدِيمِ خَبَرِ بَابِ «إِنَّ» عَلَى اسْمِهِ،**

---

جوملەیە بە پێشەخۆی ببەستێتەوە (**كَمَا مَرَّ فِي الأَمْثِلَةِ**) هەروەکوو لە نموونەکانی ڕابوردوو باسمانکرد و ڕوونمان کردەوە.

**حاڵەتی چوارەم (وَمِنْ كَوْنِهِ)** هەروەها لەوەشدا وەکوو یەکترن (**مُسْتَغْنِياً عَنْ ذِكْرِ ذَلِكَ الضَّمِيرِ**) کە پێویست بە هەبوونی «ضَمِیر» ناکات (**إِذَا كَانَ مَعْلُوماً**) ئەگەر بێت و «ضمیر»ەکە ڕوون و ئاشکرا بێت، ئەو کاتە دروستە «ضَمِیر»ەکە لە «لَفْظ»ـدا «حذف» بکرێت (**نَحْوُ**) وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: (**إِنَّ الْبُرَّ اَلْكُرُّ بِسِتِّينَ دِرْهَماً**) **سەرنج بدە:** لە ڕستەی «اَلْكَرُّ بِسِتِّينَ دِرْهَماً» وشەی «مِنْهُ» «حذف» کراوە، چونکە مانای ڕستەکە ڕوون و ئاشکرایە و «ضَمِیر»ەکە زانراوە لە نێو ڕستەکەدا.

**حاڵەتی پێنجەم (وَمِنْ كَوْنِهِ)** هەروەها لەمەشدا خەبەری حەرفیٚ «اَلْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل» وەکوو خەبەریٚ موبتەدایە کە (**جَائِزُ الْحَذْفِ عِنْدَ الدِّلالَةِ**) دروستە «اِسْم» یاخود «خَبَر»یٚ «الْحُرُوفُ اَلْمُشَبَّهَةُ بِالْفِعْل» «حذف» بکرێت ئەگەر بێت و بەڵگەیەک هەبێت دەلاڵەت بکات لەسەر ئەوە کە یەکێک لە «اِسْم» یاخود لە «خَبَر» لە ڕستەکەدا «حذف» کراوە (**نَحْوُ**) وەکوو (**إِنَّ مَالاً وَ إِنَّ وَلَداً**) واتە: بەڕاستی ماڵ بەڕاستی منداڵ، **سەرنج بدە:** ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە مانا نابەخشێت، بۆیە دەردەکەوێت کە لەم ڕستەدا شتێک «حَذْف» کراوە و بریتییە لە وشەی «لَهُمْ» کە دەبێتە خەبەریٚ «إِنَّ» (**أَيْ**) واتە: ڕستەکە ئاوای لیٚ دێتەوە: (**إِنَّ لَهُمْ مَالاً**) بەڕاستی ئەوان خاوەن ماڵ و (**وَ إِنَّ لَهُمْ وَلَداً**) وە هەروەها خاوەنی منداڵن.

لە هەموو ئەو حوکمانەی کە باسمان کرد خەبەری حەرفیٚ «اَلْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل» وەکوو خەبەری موبتەدایە (**إِلَّا فِي تَقْدِيمِهِ أَيْ: فِي تَقْدِيمِ خَبَرِ بَابِ إِنَّ عَلَى اِسْمِهِ**) تەنها لە وەپێشکەوتنیٚ خەبەری حەرفیٚ «اَلْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل» نەبێت لەسەر ئیسمی خۆیان

**فَإِنَّهُ غَيْرُ جَائِزٍ، وَتَقْدِيمُ خَبَرِ الْمُبْتَدَإِ عَلَى الْمُبْتَدَإِ جَائِزٌ؛ لِأَنَّ هَذِهِ الْحُرُوفَ إِنَّمَا تَعْمَلُ لِمُشَابِهَتِهَا الْفِعْلَ، كَمَا سَيَجِيءُ، فَيَكُونُ عَمَلُهَا فَرْعاً لِعَمَلِ الْفِعْلِ. وَمَرْفُوعُ الْفِعْلِ مُقَدَّمٌ عَلَىٰ مَنْصُوبِهِ. فَلَوْ قُدِّمَ مَرْفُوعُ هٰذِهِ الْحُرُوفِ أَيْضاً، لَمْ يَبْقَ فَرْقٌ بَيْنَ عَمَلِ الْأَصْلِ وَالْفَرْعِ؛ إِلَّا إِذَا كَانَ الْخَبَرُ ظَرْفاً، فَإِنَّهُ حِينَئِذٍ يَجُوزُ تَقْدِيمُهُ عَلَى الِاسْمِ؛ لِأَنَّ رَفْعَ الظَّرْفِ لَا يَظْهَرُ فِي اللَّفْظِ.**

---

(فَإِنَّهُ غَيْرُ جَائِزٍ) ئەمەیان دروست نییە، (وَتَقْدِيمُ خَبَرِ الْمُبْتَدَأِ عَلَى الْمُبْتَدَأِ جَائِزٌ) بەڵام وەپێشکەوتنیٚ خەبەری «مُبْتَدَأ» لەسەر «مُبْتَدَأ» دروست بوو، وەکوو «مُنْطَلِقٌ زَيْدٌ». ئینجا ئەگەر قوتابی پرسیار بکات و بڵێت: بۆچی وەپێشکەوتنیٚ خەبەری حەرفیٚ «اَلْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل» لەسەر ئیسمیٚ دروست نییە؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرمویٚت: (لأَنَّ هَذِهِ الْحُرُوفَ) چونکە ئەم شەش حەرفانە (إِنَّمَا تَعْمَلُ لِمُشابَهَتِهَا الْفِعْلَ) تەنها لەبەر ئەوە کار دەکەن چونکە دەشوبهێنە فیعلیٚ هەم لە ڕووی «لَفْظ» هەم لە ڕووی ماناوە، هەروەکوو ڕوونمان کردەوە و (كَمَا سَيَجِيءُ) لەمەودواش لە «بَابُ الْحَرْف» بە درێژی تیشکی دەخەینە سەر «إن شاء الله».

(فَيَكُونُ عَمَلُها) کەواتە: کارکردنی ئەم شەش حەرفانە (فَرْعاً لِعَمَلِ الْفِعْلِ) دەبێتە «فَرْع» بۆ کارکردنی فیعلیٚ (وَمَرْفُوعُ الْفِعْلِ مُقَدَّمٌ عَلَى مَنْصُوبِهِ) وە ئەو ئیسمەی کە «فِعْل» مەرفووعی دەکات وەپێش دەکەویٚت لەسەر ئەو ئیسمەی کە «مَنصوب»ـی دەکات، (فَلَوْ قُدِّمَ مَرْفُوعُ هَذِهِ الْحُروفِ) کەواتە: ئەگەر دروست بێت ئەو ئیسمە کە ئەم شەش حەرفە مەرفووعی دەکەن، وەپێش کەویٚت لەسەر ئەو ئیسمە کە «مَنصوب»ی دەکەن (أَيْضاً) بە هەمان شێوەی خەبەری «مُبْتَدَأ» (لَمْ يَبْقَ فَرْقٌ، بَيْنَ عَمَلِ الأَصْلِ وَالْفَرْعِ) ئەو کاتە هیچ جیاوازی نامێنێت لە نێوان کارکردنی «أَصْل» و «فَرْع»ـدا (إِلّا إِذا كَانَ الْخَبَرُ ظَرْفاً) تەنها ئەگەر بێت و خەبەری حەرفیٚ «اَلْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل» «ظَرْفُ الزَّمان» یاخود «ظَرْفُ الْمَكان» یاخود «جَارّ و مَجْرُور» بوو (فَإِنَّهُ حِينَئِذٍ، يَجُوزُ تَقْدِيمُهُ عَلَى الِاسْمِ) ئەو کاتە دروستە خەبەری حەرفیٚ «اَلْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل» وەپێش بکەویٚت، لەبەر دوو هۆکار: یەکەم (لأَنَّ رَفْعَ الظَّرْفِ لا يَظْهَرُ فِي اللَّفْظِ) چونکە

**أَوْ لِأَنَّ فِي الظُّرُوفِ اتِّسَاعاً لِكَثْرَةِ وُقُوعِهَا فِي كَلَامِهِمْ لَيْسَ فِي غَيْرِهَا، فَتَقُولُ فِي مِثَالِ ذٰلِكَ: «إِنَّ زَيْداً مُنْطَلِقٌ».**
**وَلَا تَقُولُ: «إِنَّ مُنْطَلِقٌ زَيْداً» بِتَقْدِيمِ الْخَبَرِ غَيْرِ الظَّرْفِ، وَلٰكِنْ تَقُولُ: «إِنَّ فِي الدَّارِ زَيْداً» بِتَقْدِيمِ الْخَبَرِ الظَّرْفِ عَلَى الاسْمِ.**

---

ئەم ڕەفعەی كە دەچێتە سەر «ظَرْف» لە «لَفْظ»ـدا بەدیار ناكەوێت، چونكە «ظَرْف» مەبنینە. دووەم **(أَوْ لأَنَّ فِي الظّروفِ اِتِّساعاً)**[١] یاخود لەبەر ئەوەی چونكە مەجالێكی زۆر بۆ «ظَرْف» ڕەخسێندراوە، **(لِكَثْرَةِ وُقُوعِها فِي كَلامِهِمْ)** چونكە زۆر وارد دەبێت لە نێو زمانی عەرەبیدا و لە كاتی قسەكردن و ئاخاوتندا زۆر بەكار دێت **(لَيْسَ فِي غَيْرِهَا)** كە ئەو مەجالە لەبۆ بابەتەكانیتر نەڕەخساوە و ناڕەخسێت.

**(فَتَقُولُ: فِي مِثالِ ذَلِكَ)** كەواتە، تۆ دەڵێیت بۆ نموونەی ئەم بابەتە: **(إِنَّ زَيْداً مُنْطَلِقٌ)**، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «زَيْدٌ» بووە بە «اِسْمُ إِنَّ»، هەروەها وشەی «مُنْطَلِقٌ» بووە بە «خَبَرُ إِنَّ» و لە دوای ئیسمەكە هاتووە؛ **(ولا تَقُولُ:)** بەڵام دروست نییە بگوترێت: **(إِنَّ مُنْطَلِقٌ زَيْداً، بِتَقْدِيمِ الْخَبَرِ غَيْرَ الظَّرْفِ)** بە وەپێشخستنی خەبەری حەرفی «اَلْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل» لەسەر ئیسمی خۆیان ـ ئەگەر «ظَرْف» نەبێت ـ **(وَلَكِنْ تَقُولُ:)** بەڵام دروستە بگوترێت: **(إِنَّ فِي الدّارِ زَيْداً)**[٢] **(بِتَقْدِيمِ الْخَبَرِ غَيْرِ الظَّرْفِ عَلَى الاسْمِ)** بە وەپێشخستنی خەبەری حەرفی «اَلْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل» لەسەر ئیسمی خۆیان ـ ئەگەر «ظَرْف» بێت ـ، چونكە بڕگەی «فِي الدّارِ» «جَارّ و مَجْرُور»ە ئێمەش گوتمان: ئەگەر بێت و خەبەری حەرفی «اَلْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل»ـی «ظَرْفُ الزَّمان» بوو یاخود «ظَرْفُ الْمَكان» بوو یاخود «جَارّ و مَجْرُور» بوو، دروستە لەسەر ئیسمی خۆی وەپێش بكەوێت.

* ◌ *

---

١. بڕوانە: شرح المفصل: ٢٥٩/١، والفوائد والقواعد: ١٦٢.

٢. بڕوانە: جامع الدروس العربية: ١٥١.

# خَبَرُ لَا الَّتِي لِنَفْيِ الْجِنْسِ

**قَالَ: وَخَبَرُ «لَا» الَّتِي لِنَفْيِ الْجِنْسِ، نَحْوُ: «لَا رَجُلَ أَفْضَلُ مِنْكَ». وَقَدْ يُحْذَفُ الْخَبَرُ كَقَوْلِهِمْ: «لَا بَأْسَ» أَيْ لَا بَأْسَ عَلَيْكَ.**

**أَقُولُ: الضَّرْبُ الرَّابِعُ مِنْ ضُرُوبِ الْمُلْحَقِ بِالْفَاعِلِ خَبَرُ «لَا» الَّتِي لِنَفْيِ الْجِنْسِ، أَي: الْمَرْفُوعُ بِهَا.**

---

## وانەی بیست‌وحەوتەم: باسی «خَبَرُ لا الَّتِي لِنَفْيِ الْجِنْسِ»

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: (وَخَبَرُ «لا» الَّتِي لِنَفْيِ الْجِنْسِ) یەکێکی‌تر لەو ئیسمانەی کە «مَرْفُوع» دەبێت و «مُلْحَق»ـە بە «فاعِل» بریتییە لەو ئیسمەی دەبێتە خەبەر بۆ «لا» کە لە ڕووی ماناوە بۆ «نَفْيِ صِفَةِ الْجِنْس» بەکار دێت (نَحْوُ) وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: (لَا رَجُلَ أَفْضَلُ مِنْكَ) واتە: هیچ پیاوێک لە تۆ باشتر نییە، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «أَفْضَلُ» بووە بە «خَبَر» بۆ وشەی «لا» کە بۆ «نَفْيِ صِفَةِ الْجِنْسِ» بەکار دێت.

(وَقَدْ يُحْذَفُ الْخَبَرُ) هێندێک جار ئەو وشەی کە بووە بە خەبەر بۆ وشەی «لا» «حذف» دەکرێت (كَقَوْلِهِمْ) وەکوو عەرەب دەڵێن بۆ کەسێک کە ترسی لە شتێک هەبێت یاخود نەخۆش بێت: (لَا بَأْسَ) واتە: هیچ باس نییە، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا خەبەری «لا» «حذف» کراوە کە بریتییە لە وشەی «عَلَيْكَ» (أَيْ) بۆیە ڕستەکە وای لێ دێتەوە (لَا بَأْسَ عَلَيْكَ).

(أَقُولُ:) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (اَلضَّرْبُ الرَّابِعُ مِنْ ضُروبِ الْمُلْحَقِ بِالْفاعِلِ) بەشی چوارەم: لەو بەشانەی کە «مَرْفُوع» دەبێت و «مُلْحَق»ـە بە «فاعِل» بریتییە (خَبَرُ "لا" الَّتِي لِنَفْيِ الْجِنْسِ) لەو ئیسمەی دەبێتە خەبەر بۆ «لا» کە لە ڕووی ماناوە بۆ «نَفْيِ صِفَةِ الْجِنْس» بەکار دێت، (أَيْ الْمَرْفُوعُ بِهَا) واتە: ئەو ئیسمەی کە «مَرْفُوع» دەبێت بە وشەی «لا».

**وَ إِنَّمَاقُيِّدَ «لَا» بِالَّتِي لِنَفْيِ الْجِنْسِ، احْتِرَازاً عَنْ «لَا» الَّتِي بِمَعْنَىٰ «لَيْسَ»، فَإِنَّ خَبَرَهَا مَنْصُوبٌ. وَقَدْ يُحْذَفُ خَبَرُ «لَا» الَّتِي لِنَفْيِ الْجِنْسِ إِذَا دَلَّ عَلَيْهِ قَرِينَةٌ، كَقَوْلِ الْعَرَبِ: «لَا بَأْسَ»، أَيْ: «لَا بَأْسَ عَلَيْكَ».**

---

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: **(وَ إِنَّمَا قَيَّدَ "لا" بِالَّتِي لِنَفْيِ الْجِنْسِ)** بۆچی مامۆستا گوتی دەبێت وشەی «لا» بۆ «نَفْي الْجِنْسِ» بێت و ئەم بڕگەیەی لەبەر چی زیاد کرد؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: **(اِحْتِرازاً عَنْ "لَا" اَلّتِي بِمَعْنَى لَيْسَ)** بەم بڕگەیە خۆی پاراست لەو «لا»یەی کە لە ڕووی ماناوە بە مانای «لَيْسَ» دێت **(فَإِنَّ خَبَرَهَا مَنْصُوبٌ)** چونکە خەبەری ئەم «لا»یە «مَنْصُوب» دەبێت و پێی دەگوترێت «لَا اَلْمُشَبَّهَة بِلَيْسَ».

**(وَقَدْ يُحْذَفُ خَبَرُ "لا" الّتي لِنَفْيِ الْجِنْسِ)** هێندێک جار ئەم وشەیەی کە بووە بە «خَبَر» بۆ وشەی «لا» کە بۆ «نَفْيُ صِفَةِ الْجِنْسِ» بەکار دێت، «حَذْف» دەکرێت **(إِذَا دَلَّ عَلَيْهِ قَرِينَةٌ)**[1] بەو مەرجەی کە وشەیەک هەبێت دەلالەت بکات لەسەر ئەوەی کە لەم ڕستەیەدا وشەیەک «حذف» کراوە **(كَقَوْلِ الْعَرَبِ:)** وەکوو عەرەب دەڵێن بە کەسێک کە ترسی لە شتێک هەبێت یاخود نەخۆش بێت: **(لَا بَأْسَ)** واتە: هیچ باس نییە، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا خەبەری «لا» «حذف» کراوە کە بریتییە لە وشەی «عَلَيْكَ» **(أَيْ)** بۆیە ڕستەکە وای لێ دێتەوە: **(لَا بَأْسَ عَلَيْكَ)**؛ **ئینجا بزانە:** لە زاراوەی «بنو تميم» و «طائي»ـیەکان ئەگەر بەڵگەیەک هەبوو دەلالەت لەسەر خەبەری «لا» بکات واجبە خەبەری «لا» «حذف» بکرێت، بەڵام لە زاراوەی «حیجازي»ـیەکان «جَائِز»ە و «واجب» نییە، بەڵام ئەگەر بەڵگە نەبوو، نابێت «حذف» بکرێت وەکوو ئەم نموونەیەی کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: **«لا أَحَدَ أَغْيَرُ مِنَ اللَّهِ»**[2].

---

١. بڕوانە: جامع الدروس العربية: (٣٣٤) وشرح جمل الزجاجي: (٤١٠/٢) وشرح ابن العقيل: (٨/٢) وشرح كافيه ابن الحاجب الكوردي: (٢٥٥/١) والقوعد والفوائد: (١٦٣) وشرح المفصل: (٢٥٩/١) و الانصاف فی مسائل الخلاف: (٤١٠/٢).

٢. أخرجه البخاری (٥٢٢٠).

## مەرجەکانی کارکردنی «لا الّتِي لِنَفْيِ الْجِنْسِ»

**ئینجا بزانە:** ئەی قوتابی خۆشەویست، کە زانایان کۆمەڵێک مەرجیان داناوە بۆ کارکرنی ئەم «لا»یەی کە بۆ «نَفْيُ الْجِنْسِ» بەکار دێت، پێویستە ئاگاداری ئەم مەرجانە بیت کە بریتین لە:

**یەکەم:** ئەو ئیسمەی کە وشەی «لا» دەچێتە سەری و کاری تێدا دەکات دەبێت «نَكِرَة» بێت وەکوو «لا غلامَ رَجُلٍ حَاضِرٌ» واتە ئەگەر بێت و ئیسمەکە «مَعْرِفَة» بێت کاری تێدا ناکات.

**دووەم:** دەبێت وشەی «لا» ڕاستەوخۆ (مُباشَرَةً) بچێتە سەر ئەو ئیسمەی کە کاری تێدا دەکات وەکوو «لا عَمَلَ حَاسِدٍ مَقْبُولٌ» چونکە ئەگەر وشەی «لا» ڕاستەوخۆ نەچێتە سەر ئیسمەکە کار ناکات، وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ﴾[1] سەرنج بدە: وشەی «لا» چونکە ڕاستەوخۆ نەچۆتە سەر وشەی «غَوْلٌ» کاری تێدا نەکردووە، بۆیە وشەی «فیها» دەبێتە «خَبَرٌ مُقَدَّمٌ» و وشەی «غَوْلٌ» دەبێتە «مُبْتَدَأ مُؤَخَّر» .

**سێیەم:** دەبێت ئەو ئیسمەی کە وشەی «لا» کاری تێدا دەکات «مُضاف» بێت وەکوو «لا صَاحِبَ جُودٍ مَذْمُومٌ» یاخود «شِبْهُ الْمُضاف»[2] بێت وەکوو «لا قَبِيحاً فِعْلُهُ مَرْدُودٌ» یان وەکوو «لا طَالِباً وَفِيّاً مَخْذولٌ» چونکە ئەگەر بێت و ئیسمی «لا» «مُضاف» نەبێت یاخود «شِبْهُ الْمُضاف» نەبێت ئەوکاتە وشەی «لا» «مَنْصُوب»ـی ناکات، بەڵکوو «مَبْنِي» دەبیت لەسەر «فَتْحَة».

* ◌ *

١. سورة الصافات: الأية: (٤٧).

٢. بڕوانە: الدرة النحوية: (٣٧٠) جامع الدروس العربية: (٣٤٤) وشرح جمل الزجاجى: (٤١٠/٢) و شرح قطر النّدى وبلّ الصّدى: (٢٢٢) وشرح ابن العقيل: (١٠/٢) وشرح كافيه ابن الحاجب الكوردي: (٢٥٨/١) والقوعد والفوائد: (١٦٣) وشرح المفصل: (٢٥٩/١) و الانصاف فى مسائل الخلاف: (٤١٠/٢).

## اِسْمُ مَا وَلَا بِمَعْنَى لَيْسَ

**قَالَ: وَاسْمُ مَا وَلَا بِمَعْنَى لَيْسَ، نَحْوُ: «مَا زَيْدٌ مُنْطَلِقاً» وَ «مَا رَجُلٌ خَيْراً مِنْكَ» وَ «لَا أَحَدٌ أَفْضَلَ مِنْكَ».**

**أَقُولُ: الضَّرْبُ الْخَامِسُ مِنْ ضُرُوبِ الْمُلْحَقِ بِالْفَاعِلِ اسْمُ مَا وَلَا بِمَعْنَى لَيْسَ، أَي: الْمَرْفُوعُ بِهِمَا، نَحْوُ «زَيْدٌ» فِي «مَا زَيْدٌ مُنْطَلِقاً»؛ وَ «رَجُلٌ» فِي «مَا رَجُلٌ خَيْراً مِنْكَ»؛ وَ «أَحَدٌ» فِي «لَا أَحَدٌ أَفْضَلَ مِنْكَ».**

---

## وانەی بیستوهەشتەم: باسی «ما و لا الْمُشَبَّهتانِ بِلَيْسَ»

(قالَ:) مامۆستا «جار اللّٰه» زەمەخشەری دەفەرموێت: («مَا» وَ «لَا بمَعْنی لَيْسَ) یەکێکی‌تر لەو ئیسمانەی کە «مَرْفُوع» دەبێت و «مُلْحَق»ـە بە «فاعِل» بریتییە لەو وشەیەی کە دەبێتە «اِسْم» بۆ وشەی «لا» یاخود بۆ وشەی «ما» کە لە ڕووی ماناوە دەشوبهێنە «لَیْسَ»، (نَحْوُ) وەکوو ئەم نموونانەی کە دەڵێن: (ما زَيْدٌ مُنْطَلِقاً وَ مَا رجُلُ خيْراً مِنْكَ، وَ لَا أَحَدٌ أَفْضَل مِنْك)، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «زَيْدٌ» هەروەها وشەی «رَجُلٌ» بوونەتە «اِسْم» بۆ وشەی «ما»، هەروەها وشەی «أَحَدٌ» بووە بە «اِسْم» بۆ وشەی «لا» و هەرسێ وشەکانیش مەرفووع بوون.

(أَقُولُ:) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (اَلضَّرْبُ الخامِسُ مِنْ ضُروبِ الْمُلْحَقِ بِالْفاعِلِ) بەشی پێنجەم: لەو بەشانەی کە مەرفووع دەبێت و «مُلْحَق»ـە بە «فاعِل» بریتییە لە (اَسْمُ "مَا" وَ"لَا" بِمَعْنَى لَيْسَ) لەو وشەیەی کە دەبێتە ئیسمی «ما» و «لا» کە لە ڕووی ماناوە دەشوبهێنە «لَيْسَ»، (أَيْ الْمَرْفُوعُ بِهِمَا) واتە: ئەو ئیسمەی کە بە وشەی «ما» و بە وشەی «لا» مەرفووع دەبێت (نَحْوُ: زَيْدٌ) وەکوو وشەی «زَيْدٌ» (فِي) لەم نموونەیەی کە دەڵێت: (مَا زَيْدٌ مُنْطَلِقاً، وَ) هەروەها وەکوو (رَجُلٌ) وشەی «رَجُلٌ» (فِي) لەم نموونەیەی کە دەڵێت: (مَا رَجُلٌ خَيْراً مِنْكَ، وَ) هەروەها وەکوو (أَحَدٌ) وشەی «أَحَدٌ» (فِي) لەم نموونەیەی کە دەڵێت: (لَا أَحَدٌ أَفْضَلَ مِنْكَ).

**وَ إِنَّمَا مَثَّلَ فِي «مَا» بِمِثَالَيْنِ، لِأَنَّهَا تَعْمَلُ فِي الْمَعْرِفَةِ وَالنَّكِرَةِ بِخِلَافِ «لَا» فَإِنَّهَا لَا تَعْمَلُ إِلَّا فِي النَّكِرَةِ؛ وَذٰلِكَ لِأَنَّهُمَا إِنَّمَا تَعْمَلَانِ لِشِبْهِهِمَا بِلَيْسَ؛ وَشَبَهُ «مَا» أَكْثَرُ مِنْ شَبَهِ «لَا» لَا بِلَيْسَ؛ لِأَنَّ مَا لِنَفْيِ الْحَالِ مِثْلُ «لَيْسَ»؛ بِخِلَافِ «لَا»، لِأَنَّهُ لِنَفْيِ الِاسْتِقْبَالِ فَقَطْ.**

---

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت (**وَ إِنَّما مَثَّلَ فِي "ما" بِمِثالَيْنِ**) بۆچی مامۆستا بۆ وشەی «ما» دوو نموونەی هێنایەوە، بەڵام بۆ وشەی «لا» تەنها یەک نموونەی هێنایەوە؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: (**لأَنَّها تَعْمَلُ فِي الْمَعْرِفَةِ وَالنَّكِرَةِ**) چونکە وشەی «ما» هەم ئیسمێکی «مَعْرِفَة» و هەم ئیسمێکی «نَكِرَة» مەرفووع دەکات (**بِخِلافِ لا**) بە پێچەوانەی وشەی «لا» (**فَإِنَّها لا تَعْمَلُ إِلّا فِي النَّكِرَةِ**) ئەو تەنها ئیسمێکی «مَعْرِفَة» مەرفووع دەکات و کار لە ئیسمی «نَكِرَة» ناکات. (**وَذَلِكَ**) هۆکارەکەی ئەوەیە: (**لأَنَّهُما إِنَّمَا تَعْمَلانِ لِمُشابَهَتِهِما بِلَيْسَ**) چونکە وشەی «ما» و وشەی «لا» تەنها لەبەر ئەوە کار دەکەن چونکە دەشوبهێنە وشەی «لَيْسَ» (**وَشَبَهُ مَا أَكْثَرُ مِنْ شَبَهِ لا بِلَيْسَ**) وە هەروەها موشابەهەی وشەی «ما» زیاترە لەگەڵ «لَيْسَ» لە وشەی «لا» (**لأَنَّ مَا لِنَفْيِ الْحالِ مِثْلُ لَيْسَ**)[1] چونکە وشەی «ما» لەبۆ «نَفْي» ئێستا و داهاتوو بە کار دێت، (**بِخِلافِ لَا**) بە پێچەوانەی وشەی «لا» (**لأَنَّها لِنَفْيِ الاِسْتِقْبالِ فَقَطْ**) چونکە ئەو تەنها بۆ «نَفْي» دەمی داهاتوو بەکار دێت.

## بۆچی «ما» و «لا» پێیان دەگوترێت «اَلْمُشَبَّهَتانِ بِلَيْسَ»؟

**یەکەم:** چونکە وشەی «ما» و «لا» وەکوو وشەی «لَيْسَ» دەچنە سەر «مُبْتَدَأ» و «خَبَر».

**دووەم:** لە ڕووی ماناوە وشەی «ما» و «لا» وەکوو وشەی «لَيْسَ» لەبۆ «نَفْي» بەکار دێن.

---

١. بڕوانە: شرح قطر النّدى وبلّ الصّدى: (٢٢٢) وشرح ابن عقيل: (١٠/٢) وشرح كافيه ابن الحاجب الكوردي: (٢٥٨/١) والقوعد والفوائد: (١٦٣) وشرح المفصل: (٢٥٩/١) و الانصاف فى مسائل الخلاف:

.............................................................................................................................

سێیەم: هەروەها لە ڕووی کارکردنەوە وشەی «ما» و وشەی «لا» وەکوو وشەی «لَيْسَ» ئیسمی خۆیان «مَرْفُوع» دەکەن و خەبەری خۆیان «مَنْصُوب» دەکەن، لەبەر ئەم سێ هۆکارە پێیان دەگوترێت «ما و لا اَلْمُشَبَّهَتانِ بِلَيْسَ».

## مەرجەکانی کارکردنی «ما ولا اَلْمُشَبَّهَتانِ بِلَيْسَ»

ئینجا بزانە: ئەی قوتابی خۆشەویست، لە زاراوەی «بَنُو تَمیم»ـدا وشەی «ما» و «لا» بە هیچ جۆرێک کار ناکەن بەڵام لە زاراوەی «أَهْلُ الْحِجاز»دا وشەی «ما» و «لا» کار دەکەن و ئیسمی خۆیان «مَرْفُوع» دەکەن و خەبەری خۆیان «مَنْصُوب» دەکەن، هەروەکوو لە قورئانی پیرۆزیش بەم شێوەیە وارد بووە، وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا هَٰذَا بَشَرًا﴾[1] یاخود وەکوو ﴿مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمۡ﴾[2]؛ بەڵام ئەوانیش دەفەرموون وشەی «ما» و «لا» بە چەند مەرجێک کاردەکەن:

یەکەم: دەبێت وشەی «ما» و «لا» ڕاستەوخۆ بچنە سەر ئیسمی خۆیان، واتە: نابێت وشەی «إِنْ» یاخود وشەیەکیتر بکەوێتە نێوانیان، چونکە ئەگەر هاتوو وشەی «إِنْ» یاخود وشەیەکیتر کەوتە نێوانیان ئەوکاتە وشەی «ما» و «لا» کار (عَمَلْ) ناکەن، بەڵکوو ئەو دوو ئیسمەی لە دوایان دێن دەبن بە «مُبْتَدَأ» و بە «خَبَر» وەکوو «مَا إِنْ زَيْدٌ مُنْطَلِقٌ»[3].

دووەم: نابێت خەبەری وشەی «ما» و «لا» لەسەر ئیسمی خۆیان وەپێش بکەوێت، چونکە ئەگەر خەبەری وشەی «ما» و «لا» لەسەر ئیسمی خۆیان وەپێش کەوت ئەو کاتە وشەی «ما» و وشەی «لا» کار (عَمَلْ) ناکەن وەکوو «ما مُنْطَلِقٌ زَيْدٌ» یا خود وەکوو «لا قَائِمٌ رَجُلٌ»؛ سەرنج بدە: لەم دوو نموونەیەدا وشەی «ما» و

---

١. سورة يوسف: الأية: (٣١)

٢. سورة المجادلة: الأية: (٢)

٣. ئەو کاتە وشەی «إِنْ» بە «زَائِدَة» هەژمار دەکرێت، لە لای زانایانی «بَصْرِي» بەڵام «کوفي»ـیەکان دەفەرموون: لەم کاتەدا وشەی «إِنْ» پێی دەگوترێت «اَلْعازِلَةُ» یاخود «نافِيَةٌ مُؤَكِدَةٌ».

* * *

---

«لا» کار ناکەن، بەڵکوو لە نموونەی یەکەم وشەی «مُنْطَلِقٌ» دەبێتە «خَبَر مُقَدَّم» و هەروەها وشەی «زَيْدٌ» دەبێتە «مُبْتَدَأ مُؤَخَّر»، نموونەی دووەمیش بە هەمان شێوە.

**سێیەم:** نابێت وشەی «ما» و «لا» لە ڕووی ماناوە «نَفْي»ـیان تێک بچێت، یاخود هەڵبوەشێتەوە بە هۆی زیادکردنی وشەی «إِلَّا» لەدوای ئیسمی «ما» و «لا»، چونکە ئەم دوو وشەیە بۆیە کار دەکەن چونکە لە ڕووی ماناوە دەشوبهێنە «لَيْسَ»، ئەگەر «نَفْي»ـیەکەیان تێک چوو بێگومان «مُشابَهَة»ـەکەش تێک دەچێ، بۆیە لەم حاڵەتەدا کار ناکەن، بەڵکوو ئەم دوو ئیسمەی لە دوایان دێن دەبن بە «مُبْتَدَأ» و «خَبَر» وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَآ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا﴾[1] یاخود وەکوو ﴿وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ﴾[2]، سەرنج بدە: لەم دوو نموونەیەدا وشەی «ما» و «لا» کاریان نەکردووە[3].

* ◌ *

---

١. سورة يس الآية: (١٥).

٢. سورة الأحقاف الآية: (٩).

٣. بروانە: شرح قطر النّدى وبلّ الصّدى: (٢٣٢) وشرح ابن عقيل: (٣٠٣/١) وشرح كافيه ابن الحاجب الكوردي: (٢٥٨/١) والقوعد والفوائد: (١٦٣) والإظهار (٢٧)

# بَابُ الْمَنْصُوبَاتِ

**قَالَ: الْمَنْصُوبَاتُ عَلَىٰ ضَرْبَيْنِ: أَصْلٍ وَمُلْحَقٍ بِهِ. فَالْأَصْلُ: هُوَ الْمَفْعُولُ؛ وَهُوَ عَلَىٰ خَمْسَةِ أَضْرُبٍ: الْمَفْعُولِ الْمُطْلَقِ، وَهُوَ الْمَصْدَرُ، نَحْوُ: «ضَرَبْتُ ضَرْباً، وَضَرْبَةً، وَضَرْبَتَينِ؛ وَقَعَدْتُ جُلوساً».**

## وانەی بیست‌ونۆهەم: باسی «اَلْمَنْصُوبات»

**(قالَ:)** مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت:**(اَلْمَنْصُوباتُ عَلى ضَرْبَيْنِ:)** ئەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوب» دەبن، دوو جۆریان هەیە: جۆری یەکەم **(أَصْلٌ)** پێی دەگوترێت ئەسڵ،**(وَ)** جۆری دووەم **(مُلْحَقٌ بِهِ)** پێی دەگوترێت: «مُلْحَق» بە ئەسڵ؛ ئینجا مامۆستا دەفەرموێت:**(فَالأَصْلُ هُوَ: الْمَفْعُولُ)** ئەوەی پێی دەگوترێت ئەسڵ لە نێو هەموو ئەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوب» دەبن بریتییە لەو ئیسمانەی کە دەبنە «مَفْعُول» **(وَهُوَ عَلَى خَمْسَةِ أَضْرُبٍ)** ئەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوب» دەبن و دەبنە «مَفْعُول» پێنج بەشیان هەیە، کە بریتین لە:

**بەشی یەکەم: (اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَقُ)** بریتییە لەو ئیسمەی کە پێی دەگوترێت «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَق»؛ ئینجا مامۆستا پێناسەی دەکات و دەفەرموێت:**(وَهُوَ الْمَصْدَرُ)** «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَق» بریتییە لەو «مَصْدَر»ەی کە خودی فیعلەکەی لێ وەرگیراوە یاخود بە مانای ئەو «مصدر»ەیە کە لە فیعلەکە وەرگیراوە**(نَحْوُ:)** وەکوو ئەم نموونانە: **(ضَرَبْتُ ضَرْباً)** کە بۆ «تأكيد»ە**(وَ)** یاخود وەکوو «ضَرَبْتُ**(ضَرْبَةً، وَضَرْبَتَيْنِ)**» کە بۆ «عَدَد»ە **(وَ)** یاخود وەکوو **(قَعَدْتُ جُلُوساً)** کە «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَق»ـی «مَعْنَوِي»ـیە[1].

---

١. بۆیە مامۆستا سەرەتا باسی «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَق»ـی کرد، چونکە لە هەموو «مَفْعُول»ـەکانیتر «أصل»ترە، لەبەر ئەوەی مانای «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَق» بەشێکە لە مانای خودی فیعلەکە بەبێ ئەوەی شتێکی زیاتر یاخود کەمتر بێت، بۆیە بە نزیکترین «مَفْعُول» دادەندرێت لە فیعل. بڕوانە: الأصول في النحو: (١/٥٥) وشرح كافية ابن الحاجب الكردي: (١/٢٥٨).

أَقُولُ: **لَمَّا فَرَغَ مِنَ الْقِسْمِ الْأَوَّلِ مِنْ أَقْسَامِ الْمُعْرَبِ وَهُوَ الْمَرْفُوعَاتُ، شَرَعَ فِي الْقِسْمِ الثَّانِي، أَعْنِي: الْمَنْصُوبَاتِ. وَإِنَّمَا قَدَّمَهَا عَلَى الْمَجْرُورَاتِ؛ لِأَنَّ الْمَنْصُوبَاتِ فِي الْكَلَامِ أَكْثَرُ مِنَ الْمَجْرُورَاتِ، فَيَكُونُ الْمَنْصُوبَاتُ أَصْلاً بِالْقِيَاسِ إِلَى الْمَجْرُورَاتِ؛ أَوْ لِأَنَّ عَامِلَ الْمَنْصُوبَاتِ إِنَّمَا يَكُونُ فِعْلاً غَالِباً، وَعَامِلَ الْمَجْرُورَاتِ لَا يَكُونُ إِلَّا غَيْرَ فِعْلٍ كَمَا سَيَجِيءُ. وَقَدْ قُلْنَا: إِنَّهُ أَصْلٌ فِي الْعَمَلِ، فَمَعْمُولُهُ أَيْضاً يَكُونُ أَصْلاً.**

---

(أَقُولُ) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(لَمّا فَرَغَ مِنَ الْقِسْمِ الأَوَّلِ مِنْ أَقْسامِ الْمُعْرَبِ)** لە کاتێک باسی بەشی یەکەمی تەواو کرد لە بەشەکانی ئیسمی «مُعْرَب» **(وَهُوَ الْمَرْفُوعاتُ)** کە بریتی بوو لە باسکردنی ئەو ئیسمانەی کە «مَرْفُوع» دەبوون، ئینجا مامۆستا **(شَرَعَ فِي الْقِسْمِ الثَّانِي)** دەستی کرد بە باسکردنی بەشی دووەم **(أَعْنِي: اَلْمَنْصُوباتِ)** کە مەبەستم باسکردنی ئەو ئیسمانەیە کە «مَنْصُوب» دەبن. ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: **(وَ إِنَّمَا قَدَّمَها عَلَى الْمَجْرُوراتِ)** بۆچی مامۆستا باسکردنی ئەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوب» دەبن، وەپێش خست لەسەر ئەو ئیسمانەی کە «مَجْرُور» دەبن؟ مامۆستا دوو وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: **یەکەم: (لأَنَّ الْمَنْصُوباتِ فِي الْكَلامِ أَكْثَرُ مِنَ الْمَجْرُوراتِ)** چونکە ئەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوب» دەبن، لە کاتی قسەکردن و گفتوگۆدا ژمارەیان زۆرترە لەو ئیسمانەی کە «مَجْرُور» دەبن. **دووەم: (أَوْ)** یاخود لەبەر ئەوەیە **(لأَنَّ عامِلَ الْمَنْصُوباتِ إِنَّما يَكُونُ فِعْلاً غالِباً)** چونکە ئەو «عامل»ـەی کە کار لەو ئیسمانە دەکات کە «مَنْصُوب» دەبن، بە زۆری وایە فیعلە **(وَعامِلُ الْمَجْرُوراتِ لا يَكُونُ إِلّا غَيْرَ فِعْلٍ)** بەڵام ئەو عامیلەی کە کار لەو ئیسمانە دەکات کە «مَجْرُور» دەبن، هەرگیز فیعل نابێت **(كَمَا سَيَجِيءُ)** هەروەکوو لەمەودوا باسی دەکەین «إن شاء الله» **(وَقَدْ قُلْنا إِنَّهُ أَصْلٌ فِي الْعَمَلِ)** ئێمەش گوتمان کە «فِعْل» ئەسڵە لە کارکردندا **(فَمَعْمُولُهُ أَيْضاً يَكُونُ أَصْلاً)** کەواتە: ئەو ئیسمەی کە فیعل کاری تێدا دەکات ئەویش دەبێت بە «أَصْل» بە نیسبەت «مَعْمُول»ـەکانی تری «اِسْم» و «حَرْف».

**وَالْمَنْصُوبَاتُ عَلَىٰ ضَرْبَيْنِ، كَالْمَرْفُوعَاتِ: أَصْلٍ وَمُلْحَقٍ بِالْأَصْلِ، فَالْأَصْلُ هُوَ الْمَفَاعِيلُ؛ لِأَنَّ عَوَامِلَهَا أَفْعَالٌ حَقِيقِيَّةٌ، بِخِلَافِ بَاقِي الْمَنْصُوبَاتِ، فَإِنَّ عَوَامِلَهَا إِمَّا حُرُوفٌ أَوْ أَفْعَالٌ غَيْرُ حَقِيقِيَّةٍ.**

## الْمَفْعُولُ الْمُطْلَقُ

**وَالْمَفَاعِيلُ عَلَىٰ خَمْسَةِ أَضْرُبٍ: الْأَوَّلُ: الْمَفْعُولُ الْمُطْلَقُ،**

ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: (**وَالْمَنصوباتُ عَلى ضَرْبَيْنِ**) ئەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوب» دەبن، دوو جۆریان هەیە (**كَالْمَرْفُوعاتِ**) وەکوو ئەو ئەو ئیسمانەی کە «مَرْفُوع» دەبوون: جۆری یەکەم (**أَصْلٌ**) پێی دەگوترێت ئەسڵ، (**وَ**) جۆری دووەم (**مُلْحَقٌ بِالأَصْلِ**) پێی دەگوترێت: «مُلْحَق» بە ئەسڵ؛ ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: (**فَالأَصْلُ: هُوَ الْمَفاعيلُ**) ئەوەی پێی دەگوترێت ئەسڵ لە نێو هەموو ئەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوب» دەبن بریتییە لەو پێنج ئیسمانەی کە دەبنە «مَفْعُول». ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: بۆچی ئەو ئیسمانەی کە دەبنە «مَفْعُول» ئەسڵن؟ مامۆستا دەفەرموێت: (**لأَنَّ عَوامِلَها أَفْعالٌ حَقِيقِيَّةٌ**) چونکە ئەو عامیلانەی کە دەچنە سەر مەفعوولەکان فیعلی «حَقِيقِي»ـن و ڕاست و دروستن (**بِخِلافِ بَاقِي الْمَنْصُوباتِ**) بە پێچەوانەی هەموو ئەو ئیسمانەیتر کە «مَنْصُوب» دەبن، (**فَإِنَّ عَوامِلَهَا إِمَّا حُروفٌ**) چونکە ئەو عامیلانەی کە دەچنە سەر ئیسمەکانیتر و «مَنْصُوب»ـیان دەکەن، یاخود حەرفن کە دەشوبهێنە فیعلێ (**أَوْ أَفْعالٌ غَيْرُ حَقِيقِيَّةٍ**) یاخود فیعلی ڕاستەقینە نینە، بەڵکوو «نَاقِصِ»ـن.

## باسی «الْمَفْعُولُ الْمُطْلَق»

(**وَالْمَفاعيلُ عَلَى خَمْسَةِ أَضْرُبٍ:**) ئەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوب» دەبن و دەبنە «مَفْعُول» پێنج بەشیان هەیە، وەکوو زانایانی «نحو» دەفەرموون:

**بەشی یەکەم:** (**اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَقُ**) بریتییە لەو ئیسمەی کە پێی دەگوترێت: «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَقُ».

**وَهُوَ الْمَصْدَرُ غَالِباً، نَحْوُ: «ضَرَبْتُ ضَرْباً»، وَهُوَ لِلتَّأْكِيدِ، أَي: مَعْنَاهُ مَعْنَى الْفِعْلِ بِلَا زِيَادَةٍ، وَ «ضَرَبْتُ ضَرْبَةً وَضَرْبَتَيْنِ»، وَهٰذَانِ لِلْعَدَدِ، أَي: مَعْنَاهُمَا مَعْنَى الْفِعْلِ مَعَ زِيَادَةٍ، وَهِيَ إِفَادَةُ الْعَدَدِ. وَقَدْ يَكُونُ الْمَفْعُولُ الْمُطْلَقُ لِلنَّوْعِ، نَحْوُ: «جَلَسْتُ جِلْسَةً»**

---

## پێناسەی «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَق» و جۆرەکانی

ئینجا مامۆستا پێناسەی دەکات و دەفەرموێت: (**وَهُوَ الْمَصْدَرُ**) «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَق» بریتییە لەو «مَصْدَر»ەی کە خودی فیعلەکەی لێ وەرگیراوە (**غَالِباً**)[1] ئینجا ئەمە بە زۆری وایە کە «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَق» «مَصدَر» بێت، نەک بە شێوەیەکی گشتی؛ پاشان مامۆستا دێتە سەر باسکردنی جۆرەکانی «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَق» لە ڕێگای هێنانی نموونەکان؛ **جۆری یەکەم:** پێی دەگوترێت «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَق» کە بۆ «تَأْكِيد»ی مانای خودی فیعلەکە بەکار دێت (**نَحْوُ:**) وەکوو ئەم نموونانەی کە دەڵێت: (**ضَرَبْتُ ضَرْباً، وَهُوَ**) ئەم نموونەیە (**لِلتَّأْكِيدِ**) بۆ «تأكید»ی مانای خودی فیعلەکە بەکار دێت (**أَيْ: مَعْنَاهُ مَعْنَى الْفِعْلِ بِلا زِيادَةٍ**) واتە: ماناکەی هەمان مانای فیعلەکەیە بەبێ زیاد و کەم، وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا﴾.

**جۆری دووەم:** پێی دەگوترێت «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَق» کە بۆ «عَدَد» بەکار دێت (**وَ**) وەکوو ئەم نموونەی کە دەڵێت: (**ضَرَبْتُ ضَرْبَةً**) واتە: لێم دا بە یەك لێدان (**وَضَرْبَتَيْنِ**) هەروەها لێم دا بە دوو لێدان (**وَهَذانِ لِلْعَدَدِ**) ئەم دوو نموونەیە بۆ دیاریکردنی ژمارەی مانای فیعلەکەیە، (**أَيْ: مَعْناهُمَا مَعْنَى الْفِعْلِ**) واتە: مانای ئەم دوو «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَق»ـە هەمان مانای فیعلەکەیە (**مَعَ زِيادَةٍ**) لەگەڵ هەبوونی شتێکی زیاتر لە مانای فیعلەکەی (**وَهِيَ إِفادَةُ الْعَدَدِ**) کە بریتییە لە بەخشینی مانای ژمارەی لێدانەکە.

**جۆری سێیەم:** (**وَقَدْ يَكُونُ الْمَفْعُولُ الْمُطْلَقُ لِلنَّوْعِ**) هەروەها هێندێک جار «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَق» بۆ بەیانکردنی جۆر و چۆنیەتی ئەنجامدانی فیعلەکە بەکار دێت (**نَحْوُ:**) وەکوو ئەم نموونەیە (**جَلَسْتُ جِلْسَةً**)، سەرنج بدەن: ئێستا وشەی

---

[1] بۆیە مامۆستا وشەی بە زۆری (غالِباً) لە نێو پێناسەکەدا بەکار هێنا، چونکە هێندێک جار «الْمَفْعُولُ الْمُطْلَق» «مَصدَر» نییە، بەڵکوو «إسْمُ الْمَصْدَر» یاخود «إسْمُ الآلَة»ـە. بڕوانە: توضيح المقاصد: (٦٤٤/٢).

**بِكَسْرِ الْجِيمِ، أَيْ: نَوْعاً مِنَ الجُلُوسِ، وَ إِنَّمَا لَمْ يَذْكُرْهُ لِقِلَّتِهِ.**

**وَ إِنَّمَا ذَكَرَ قَوْلَهُ: «قَعَدْتُ جُلُوساً» لِيُعْلَمَ أَنَّ شَرْطَ الْمَفْعُولِ الْمُطْلَقِ مُوَافَقَةُ الْفِعْلِ فِي الْمَعْنَىٰ، وَ إِنْ لَمْ يُوَافِقْهُ فِي اللَّفْظِ.**

**وَ إِنَّمَا سُمِّيَ مَفْعُولاً مُطْلَقاً؟**

---

«جِلْسَةً» بۆتە «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَق» (بِكَسْرِ الْجِيمِ) وشـەی «جِلْسَـةً» بە کەسرەی «فَاءُ الْفِعْل» بخوێنەوە، چونکە لەسـەر وەزنی «فِعْلَة» مانای جۆرێکی تایبەت لە دانیشـتن دەبەخشـێت (أَيْ: نَوْعاً مِنَ الْجُلُوسِ) واتـە مـن دانیشـتم بـە جۆرێکـی تایبـەت لـە دانیشـتن. ئینجـا ئەگـەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: (وَ إِنَّمَا لَمْ يَذْكُرْهُ) بۆچـی مامۆستا «جار الله» زەمەخشـەری باسـی ئەم جۆرەی نەکرد؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: (لِقِلَّتِهِ) چونکـە ئـەم جـۆرە لـە «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَق» زۆر کەمە لە زمانی عەرەبیدا، هەر بۆیە مامۆستا گرنگی پێ نەداوە.

**ئینجا بزانـە:** ئـەی فەقێـی خۆشەویسـت و مامۆسـتای بەرێـز، لـە هـەر شـوێنێک فیعلێکـت بینـی کـە «مَصْدَر»ەکـەی لەسـەر وەزنی «فِعْلَة» بوو، هەروەهـا «مَنْصُوب» ببـوو، ئـەوە بزانـە کـە ئـەم جـۆرە «مَصدَر»ە پێـی دەگوترێـت «اَلْمَفْعُـولُ الْمُطْلَق» لەبۆ «نَوْع» بەکار دێت، چونکە سیغەی «فِعْلَة» هەمیشە بۆ «نَوْع» بەکار دێت.

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: (وَ إِنَّمَا ذَكَرَ قَوْلَهُ:) بۆچی مامۆستا «جار الله» زەمەخشـەری باسـی نموونـەی (قَعَدْتُ جُلوساً)ی کـرد؟ مامۆسـتا دەفەرموێـت: (لِيُعْلَمَ) بـۆ ئـەوەی بزاندرێـت (أَنَّ شَرْطَ الْمَفْعُولِ الْمُطْلَقِ) کـە مەرجـی «اَلْمَفْعُـولُ الْمُطْلَق» بریتییـە (مُوافَقَةُ الْفِعْلِ فِي الْمَعْنَى) لـەوەی کـە دەبێـت «مَصْدَر»ەکە لەگەڵ ئـەو فیعلـەی کـە لـە دوای هاتووە لـە ڕووی ماناوە وەکـوو یەک بن، واتـە: هەردووکیان یـەک واتـا ببەخشـن (وَ إِنْ لَمْ يُوافِقْهُ فِي اللَّفْظِ) هەرچەنـدە لـە ڕووی «لَفْظ»ـیشەوە ماناکانیان لە یەکتری جیاواز بێت.

ئینجـا ئەگەر کەسێک پرسـیار بـکات و بڵێـت: (وَ إِنَّمَا سُمِّيَ مَفْعُولاً مُطْلَقاً) بۆچی ئـەم «مَفْعُول»ـە پێـی دەگوترێـت «اَلْمَفْعُـولُ الْمُطْلَق»؟ مامۆسـتا وەڵام دەداتـەوە و

**لِأَنَّهُ غَيْرُ مُقَيَّدٍ بِشَيْءٍ كَقَيْدِ الْمَفْعُولِ بِهِ بِـ «الْبَاءِ»؛ وَالْمَفْعُولِ فِيهِ بِـ «فِي»؛ وَالْمَفْعُولِ لَهُ بِـ «اللَّامِ»؛ وَالْمَفْعُولِ مَعَهُ بِـ «مَعَ».**

دەفەرموێت: (**لأَنَّهُ غَيْرُ مُقَيَّدٍ بِشَيْءٍ**) چونکە ئەم مەفعوولە وابەندەی هیچ «قَیْد» و بڕگەیەک نەکراوە (**كَقَيْدِ الْمَفْعُولِ بِهِ بِالباءِ**) وەکوو «مَفْعُولَ بِـهِ» کە بە بڕگەی «بِهِ» وابەندە (مُقَيَّد) کراوە، وە لە هیچ شوێنێک بەبێ ئەم بڕگەیە باسی ناکرێت و دەبێت هەر لەگەڵی بگوترێت، (**وَالْمَفْعُولِ فِيهِ بِفِي**) هەروەها وەکوو «مَفْعُولَ فِيهِ» کە بە بڕگەی «فيـهِ» وابەندە کراوە، وە لە هیچ شوێنێک بەبێ ئەم بڕگەیە باسی ناکرێت و دەبێت هەر لەگەڵی بگوترێت، (**وَالْمَفْعُولِ لَهُ بِاللَّامِ**) هەروەها وەکوو «مَفْعُولَ لَـهُ» کە بە بڕگەی «لَهُ» وابەندە (مُقَيَّد) کراوە، وە لە هیچ شوێنێک بەبێ ئەم بڕگەیە باسی ناکرێت و دەبێت هەر لەگەڵیدا بگوترێت، (**وَالْمَفْعُولِ مَعَهُ بِـ مَعَ**) هەروەها وەکوو «مَفْعُولَ مَعَهُ» کە بە بڕگەی «مَعَ» وابەندە کراوە، وە لە هیچ شوێنێک بەبێ ئەم بڕگەیە باسی ناکرێت و دەبێت هەر لەگەڵی بگوترێت. بەڵام بەشێکی تر لە زانایان دەفەرموون: بۆیە پێی دەگوترێت «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَقُ»[1]، چونکە ئەم فیعلەی کاری تێدا دەکات ڕاستەوخۆ دەچێتە سەری، بە پێچەوانەی مەفعوولەکانی تر، چونکە ئەوان ڕاستەوخۆ فیعلەکە یان ناچێتە سەر، بەڵکوو بە واسیتەی «اَلْبـاءُ» یاخود «فِي» یاخود «اللَّامُ» فیعلەکەیان دەچێتە سەر.

**ئاگاداری:** ئەی قوتابی ڕێزدار و مامۆستای بەڕێز، ئێمە گوتمان ئەو وشەیەی کە دەبێتە «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَق» بە زۆری وایە دەبێت «مَصْدَر» بێت، بەڵام هێندێک جار «مَصدَر»ەکە «حذف» دەکرێت و وشەیەکی تر لە جێگای دادەنیشێت، ئەم وشەیە دەبێتە «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَق» و هەمان حوکم وەردەگرێت، وەکوو ئەم بابەتانەی خوارەوە:

**یەکەم:** هێندێک جار «مَصْدَر»ەکە «حذف» دەکرێت و ژمارەکەی لە جێگایدا دادەنیشێت، وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً﴾[2]، سەرنج

---

١. بڕوانە: شرح جمل الزجاجی: (٣/ ٣٢) و والفوئد والقواعد: (٢٥٠) وشرح التصريح: (١/٤٩٠).

٢. سوره النور: الأيه: (٣)

..........................................................................................

بدە: وشەی «ثَمانِینَ» بە «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَق» ئیعراب دەكرێت هەرچەندە «مَصْدَر» نییە، چونكە لەم ئایەتەدا «مَصدَر»ەكە «حذف» كراوە و «عَدَد»ەكەی لە جێگایدا دانیشتووە «أَيْ: جَلْداً ثَمانِينَ».

دووەم: هێندێك جار «مَصْدَر»ەكە «حذف» دەكرێت و وشەی «كُلّ» یاخود وشەی «بَعْض»ی لە جێگەدا دادەنیشێت، بەڵام بەو مەرجەی ئەم دوو وشەیە «إِضافَة» بكرێن بۆ لای وشەیەك كە وەكوو «مَصدَر»ە «حذف»ـكراوەكە بێت، وەكوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلۡمَيۡلِ﴾[١]، سەرنج بدە: لەم ئایەتەدا وشەی «كُلَّ» بە «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَق» ئیعراب دەكرێت هەرچەندە «مَصْدَر» نییە، چونكە لەم ئایەتەدا «مَصدَر»ەكە «حذف» كراوە و وشەی «كُلَّ» لە جێگایدا دانیشتووە و ئەسڵەكەی بەم شێوەیە بووە: «مَيْلاً كُلَّ الْمَيْلِ». یاخود وەكوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ تَقَوَّلَ عَلَيۡنَا بَعۡضَ ٱلۡأَقَاوِيلِ﴾[٢]، سەرنج بدە: لەم ئایەتەدا وشەی «بَعْضَ» بە «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَق» ئیعراب دەكرێت هەرچەندە «مَصْدَر» نییە، چونكە لەم ئایەتەدا «مَصدَر»ەكە «حذف» كراوە و وشەی «بَعْضَ» لە جێگایدا دانیشتووە.

سێیەم: هێندێك جار «مَصْدَر»ەكە «حَذْف» دەكرێت و وشەی «اِسْمُ الآلَة» لە جێگای دادەنیشێت و بە «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَق» ئیعراب دەكرێت هەرچەندە «مَصْدَر» نییە، وەكوو «ضَرَبْتُهُ سَوْطاً، أَوْ عَصاً، أَوْ مِقْرَعَةً»، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «سَوْطاً» هەروەها وشەی «عَصاً» و وشەی «مِقْرَعَةً» بە «اَلْمَفْعُولُ الْمُطْلَق» ئیعراب دەكرێن هەرچەندە «مَصْدَر» نینە، بەڵام لە جێگای «مَصْدَر» دانیشتوون، چونكە «مَصدَر»ەكە «حذف» كراوە، ڕستەكە وای لێ دێتەوە: «ضَرَبْتُهُ ضَرْبَ سَوْطِ...»[٣].

* ◌ *

---

١. سوره النساء الآية: ١٢٩.
٢. سوره الحاقة الآية: ٤٤.
٣. بۆ زیاتر زانیاری تەماشای ئەم سەرچاوانە بكە: شرح ابن عقيل: (٢/ ١٧٢) و شرح قطر النّدى: (٣٠٤) والأصول في النحو: (٥٨/١)، و شرح كافيه ابن الحاجب، (٢٦٨/١).

# الْمَفْعُولُ بِهِ

**قَالَ: وَالْمَفْعُولُ بِهِ، نَحْوُ: «ضَرَبْتُ زَيْداً».**

**أَقُولُ: الضَّرْبُ الثَّانِي مِنْ ضُرُوبِ الْمَفَاعِيلِ الْمَفْعُولُ بِهِ، وَيُسَمَّىٰ مَفْعُولاً بِهِ لِوُقُوعِ فِعْلِ الْفَاعِلِ عَلَيْهِ، نَحْوُ: «ضَرَبْتُ زَيْداً».**

---

## وانەی سیهەم: باسی «المَفْعُولُ بِهِ»

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: (وَالْمَفْعُولُ بِهِ) یەکێکی‌تر لەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوب» دەبێت بریتییە لە «مَفْعُولُ بِهِ» (نَحْوُ) وەکوو ئەم نموونەیە کە دەفەرموێت: (ضَرَبْتُ زَيْداً) واتە: من لە زەیدم دا، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «زَيْداً» پێی دەگوترێت: «مَفْعُولُ بِهِ» و «مَنْصُوب» بووە.

(أَقُولُ) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (اَلضَّرْبُ الثَّانِي مِنْ ضُروبِ الْمَفاعِيلِ) بەشی دووەم لەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوب» دەبن و دەبێتە «مَفْعُول»، بریتییە لە «مَفْعُولُ بِهِ».

### پێناسەی «اَلْمَفْعُولُ بِهِ»

ئینجا مامۆستا پێناسەی دەکات و دەفەرموێت: (وَيُسَمَّى الْمَفْعُولَ بِهِ) ئەو ئیسمەی کە «مَنْصُوب» دەبێت، بۆیە پێی دەگوترێت «مَفْعُولُ بِهِ» (لِوُقوعِ فِعْلِ الْفاعِلِ عَلَيْهِ) چونکە ئەم کارەی کە «فاعِل»ـی فیعلەکە ئەنجامی داوە «واقِع» دەبێتە سەر ئەو، ئینجا جیاوازی نییە ئەم کارە بە هەبوون بێت وەکوو ئەم نموونەیە کە دەفەرموێت: (ضَرَبْتُ زَيْداً)، سەرنج بدە: وشەی «زَيْداً» لەم نموونەیەدا پێی دەگوترێت: «مَفْعُولُ بِهِ» و «مَنْصُوب» بووە، چونکە ئەم کارەی کە فاعیلی فیعلەکە ئەنجامی داوە «واقِع» بووەتە سەر زەید؛ یاخود بە نەبوون (نَفْي) بێت، وەکوو «ما ضَرَبْتُ عَمْراً»، سەرنج بدە: وشەی «عَمْراً» لەم نموونەیەدا پێی دەگوترێت «مَفْعُولُ بِهِ»، چونکە ئەم کارەی کە فاعیلی فیعلەکە ئەنجامی داوە بە نەبوون (نَفْيِ) «واقِع» بۆتە سەری.

**قَالَ: وَيُنْصَبُ الْمَفْعُولُ بِهِ بِفِعْلٍ مُضْمَر، كَقَوْلِكَ لِلْحَاجِّ: «مَكَّةَ»، وَلِلرَّامِي: «الْقِرْطَاسَ».**

## وانەی سی‌ویەکەم: باسی «حذف»ی عامیلی «مَفْعُولُ بِهِ»

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: (وَيُنْصَبُ الْمَفْعُولُ بِهِ) «مَفْعُولُ بِهِ» هێندێک جار «مَنْصُوب» دەبێت (بِفِعْلٍ مُضْمَرٍ) بە هۆی عامیلێک کە لە «لَفْظ»ـدا «حذف» کراوە بەڵام لە «نِيَّة»دا هەر ماوە (كَقَوْلِكَ لِلْحَاجِّ) وەکوو ئەوەی کە تۆ کەسێک دەبینی کە خۆی ئامادە کردووە بۆ سەفەری حەج و عومرە پێی دەڵێیت: (مَكَّةَ) واتە: دەچیە شاری «مَكَّة»ی پیرۆز؟ **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «مَكَّةَ» بووە بە «مَفْعُولُ بِهِ» و «مَنْصُوب» بووە بە فیعلێکی «مُقَدَّر» کە بریتییە لە وشەی «تُرِيدُ». (وَلِلرَّامِي) یاخود وەکوو ئەوەی کە تۆ کەسێک دەبینی کە خۆی ئامادە کردووە بۆ شکاندنی نیشانە پێی دەڵێیت: (اَلْقِرْطَاسَ)[1] واتە: نیشانە دەشکێنی؟ **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «اَلْقِرْطَاسَ» بووە بە «مَفْعُولُ بِهِ» و «مَنْصُوب» بووە بە فیعلێکی «مُقَدَّر» کە بریتییە لە وشەی «تُصِيبُ».

(أَقُولُ) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (وَيُنْصَبُ الْمَفْعُولُ بِهِ) «مَفْعُولُ بِهِ» هێندێک جار «مَنْصُوب» دەبێت (بِفِعْلٍ مُضْمَرٍ) بە هۆی فیعلێکی شاراوە (أَيْ: مُقَدَّرٍ) واتە: لە «لَفْظ»ـدا «حذف» کراوە بەڵام لە «نِيَّة»دا هەر ماوە (كَقَوْلِكَ لِلْحَاجِّ) وەکوو ئەوەی کە تۆ کەسێک دەبینی کە خۆی ئامادە کردووە بۆ سەفەری حەج و عومرە و پێی دەڵێیت: (مَكَّةَ) واتە: دەچییە شاری «مَكَّة»ی پیرۆز؟ **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «مَكَّةَ» بووە بە «مَفْعُولُ بِهِ» و «مَنْصُوب» بووە بە فیعلێکی «مُقَدَّر» کە بریتییە لە وشەی «تُرِيدُ». (وَلِلرَّامِي) یاخود وەکوو ئەوەی کە تۆ کەسێک دەبینی کە خۆی ئامادە کردووە بۆ شکاندنی نیشانە ئینجا پێی دەڵێی: (اَلْقِرْطَاسَ) واتە: نیشانە دەشکێنی؟ **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «اَلْقِرْطَاسَ» بووە بە «مَفْعُولُ بِهِ» و «مَنْصُوب» بووە بە فیعلێکی «مُقَدَّر» کە

١. بڕوانە: شرح كافية ابن الحاجب: ١/٢٦٨.

**أَقُولُ: وَيُنْصَبُ الْمَفْعُولُ بِهِ بِفِعْلٍ مُضْمَرٍ، أَي: مُقَدَّرٍ، كَقَوْلِكَ لِلْحَاجِّ: «مَكَّةَ» وَلِلرَّامِي**
**«الْقِرْطَاسَ». فَإِنَّ «مَكَّةَ» وَ «الْقِرْطَاسَ» مَنْصُوبَانِ بِفِعْلٍ مُضْمَرٍ، وَالتَّقْدِيرُ: «تُرِيدُ مَكَّةَ» وَ «تُصِيبُ الْقِرْطَاسَ». وَ إِنَّمَا حُذِفَ لِدَلَالَةِ الْحَالِ عَلَيْهِ.**

---

بریتییه له وشهی «تُصِیبُ». سهرنج بده: **(فَإِنَّ مَكَّةَ، وَالْقِرْطاسَ)** لهم نموونهیهدا وشهی «مَكَّةَ» ههروهها وشهی «اَلْقِرْطاسَ» **(مَنْصُوبانِ بِفِعْلٍ مُضْمَرٍ)** ههردووکیان «مَنْصُوب» بوون و بوونهته «مَفْعُولُ بِهِ» بۆ فیعلێکی «مُقَدَّر» **(وَالتَّقْدِيرُ)** ڕستهی یهکهم وای لێ دێتهوه: **(تُريدُ مَكَّةَ)**؟ **(وَ)** ههروهها ڕستهی دووهم وای لێ دێتهوه: **(تُصِيبُ الْقِرْطاسَ)**؟.

**(وَ إِنَّمَا حُذِفَ)** ئینجا ئهگهر کهسێک پرسیار بکات و بڵێت: بۆچی لهم دوو نموونهیهدا «عامِل»هکه «حَذْف» کراوه؟ **(لِدِلالَةِ الْحَالِ عَلَيْهِ)** چونکه لهم دوو نموونهیهدا «حال» و «مقام» واته: دیمهنهکان بهڵگهن لهسهر ئهوهی که عامیلهکه «حذف» کراوه.

ههروهها هێندێک جار قهرینهکه «مَقَالِي» دهبێت وهکوو وهڵامدانهوهی پرسیار هتد... وهکوو خوای گهوره دهفهرموێت: ﴿قَالُوا خَيْراً﴾ [النّحل: ٣٠] **سهرنج بده:** لهم نموونهیهدا وشهی «خَيْراً» بۆته «مَفْعُولُ بِهِ» بۆ فیعلێکی «مُقَدَّر» که «أَنْزَلَ»یه، «أَيْ: أَنْزَلَ رَبُّنا خَيْراً» [1] بهڵگهش ئهمهیه که بێبڕواکان دهیانگوت: ﴿مَّاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمْ﴾ [النّحل: ٣٠].

* ○ *

---

١. بڕوانه: شرح شذور الذهب، (١٩٩) شرح جمل الزجاجي(٣٤/٣)، شرح ابن عقيل: (١٧٤/٢)

## الْمُنَادَىٰ

**قَالَ: وَمِنْهُ الْمُنَادَىٰ الْمُضَافُ، نَحْوُ: «يَا عَبْدَ اللهِ»، وَالْمُضَارِعُ لَهُ، نَحْوُ: «يَا خَيْراً مِنْ زَيْدٍ»، وَالنَّكِرَةُ، نَحْوُ: «يَا رَاكِباً».**

**أَقُولُ: إِضْمَارُ فِعْلِ الْمَفْعُولِ بِهِ إِمَّا عَلَىٰ طَرِيقِ الْجَوَازِ، كَمَا مَرَّ فِي الْمِثَالَيْنِ، وَ إِمَّا عَلَىٰ طَرِيقِ الْوُجُوبِ،**

## وانەی سیودووهەم: باسی «اَلْمُنادَى» و جۆرەکانی

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: (وَمِنْهُ) یەکێکیتر لەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوب» دەبێت بە فیعلێکی «مُقَدَّر» بریتییە لە: یەکەم (الْمُنادَى الْمُضافُ) لە «مُنادَى الْمُضاف» (نَحْوُ) وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: (يَا عَبْدَاللّٰهِ) سەرنج بدە: وشەی «عَبْدَاللّٰهِ» «مَنْصُوب» بووە بە فیعلێکی «مُقَدَّر» کە بریتییە لە «أُنادِي» یاخود «أَدْعُو»ە؛ (وَ) دووەم: بریتییە لە (الْمُضارِعُ لَهُ) لە «مُنادَى شِبْهُ الْمُضاف» (نَحْوُ:) وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: (يَا خَيْراً مِنْ زَيْدٍ) سەرنج بدە: وشەی «يَا خَيْراً» «مَنْصُوب» بووە بە فیعلێکی «مُقَدَّر» کە بریتییە لە «أُنادِي» یاخود «أَدْعُو»؛ (وَ) سێیەم: بریتییە لە (النَّكِرَةُ) لە «مُنادَى النَّكِرَةِ غَيْرِ الْمَقْصُودَةِ»[1] (نَحْوُ:) وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: (يَا راكِباً) سەرنج بدە: وشەی «يَا رَاكِباً» «مَنْصُوب» بووە بە فیعلێکی «مُقَدَّر» کە بریتییە لە «أُنادِي» یاخود «أَدْعُو».

(أَقُولُ) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (إِضْمارُ فِعْلِ الْمَفْعُولِ بِهِ) شاردنەوە و «حذف»ـکردنی ئەو فیعلەی کە «مَفْعُولُ بِهِ» «مَنصوب» دەکات دوو جۆری هەیە: جۆری یەکەم: (إِمَّا عَلَى طَرِيقِ الْجَوازِ) یاخود فیعلەکە بە «جائِز»ی «حذف» دەکرێت (كَمَا مَرَّ فِي الْمِثالَيْنِ) هەروەکوو لە هەردوو نموونەی ڕابوردوو باسمانکرد. (وَ) جۆری دووەم: (إِمَّا عَلَى طَرِيقِ الْوُجُوبِ) یاخود فیعلەکە

١. بڕوانە: علل النحو: ٤٤٣، وأوضح المسالك: ٨/٢.

**وَذٰلِكَ فِي الْمُنَادَىٰ الْمُضافُ؛ فَلِذٰلِكَ قَالَ: وَمِنْهُ ـأَيْ: مِنَ الْمَنْصُوبِ بِالْفِعْلِ الْمُضْمَرِـ الْمُنَادَى الْمُضَافُ، نَحْوُ: «يَا عَبْدَ اللَّهِ».**

**وَالْمُضَارِعُ لَهُ ـأَي: الْمُشَابِهُ لِلْمُضَافِـ نَحْوُ: «يَا خَيْراً مِنْ زَيْدٍ». فَإِنَّ «خَيْراً» لَا يَتِمُّ إِلَّا بِـ «مِنْ زَيْدٍ»، كَمَا أَنَّ الْمُضَافَ لَا يَتِمُّ إِلَّا بِالْمُضَافِ إِلَيْهِ.**

---

بە «واجِب»ـی «حذف» دەکرێت، واتە: بە هیچ جۆرێک ناتواندرێت لە «لَفْظ»ـدا باس بکرێت، **(وَذَلِكَ فِي)** ئەمەش لە چەند شوێنێک دەبێت کە بریتین لەم شوێنانە: **شوێنی یەکەم: (الْمُنادَى الْمُضافُ)** بریتییە لە «اَلْمُنادَى الْمُضاف» **(فَلِذلِكَ)** هەر لەبەر ئەمەش بوو **(قَال)** مامۆستا لە سەرەتای وانەکەدا فەرمووی: **(وَمِنْهُ)** واتە: یەکێکی‌تر **(أَيْ: مِنَ الْمَنْصُوبِ بِالْفِعْلِ الْمُضْمَرِ)** لەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوب» دەبێت بە فیعلێکی «مُقَدَّر» بریتییە لە **(الْمُنادَى الْمُضافُ)** لەو ئیسمەی کە «إِضافَة» کراوە بۆ لای ئیسمێکی‌تر و یەکێک لە حەرفەکانی بانگکردن و «نِداء»ـی چۆتە سەر کە پێی دەگوترێت «اَلْمُنادَى الْمُضافُ» **(نَحْوُ)** وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: **(يَا عَبْدَاللهِ)**، **سەرنج بدە:** وشەی «عَبْدَاللهِ» «مَنْصُوب» بووە بە فیعلێکی «مُقَدَّر» کە بریتییە لە «أُنادِي» یاخود «أَدْعُو».

**(وَ) شوێنی دووەم:** بریتییە لە **(الْمُضارِعُ لَهُ)** لەو ئیسمەی کە پێی دەگوترێت: «مُنادَى شِبْهُ الْمُضاف» **(أَيْ: اَلْمُشابِهُ لِلْمُضافِ)** کە دەشوبهێتە ئیسمی «مضاف» لەوەی کە چۆن «مُضاف» بەبێ «مُضافُ إِلَيْهِ» مانای تەواو نابێت، ئەویش بە هەمان شێوە بەبێ بڕگەی دووەم مانای تەواو نابێت **(نَحْوُ)** وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: **(يَا خَيْراً مِنْ زَيْدٍ)**، **سەرنج بدە:** وشەی «خَيْراً» «مَنْصُوب» بووە بە فیعلێکی «مُقَدَّر» کە بریتییە لە «أُنادِي» یاخود «أَدْعُو». **(فَإِنَّ خَيْراً لا يَتِمُّ إِلَّا بِـمِنْ زَيْدٍ)** تەماشا بکە: وشەی «خَيْراً» ماناکەی تەواو نابێت تاوەکوو وشەی «مِنْ زَيْدٍ» نەگوترێت، **(كَمَا أَنَّ الْمُضافَ لَا يَتِمُّ إِلَّا بِالْمُضافِ إِلَيْهِ)** هەروەکوو چۆن «مُضاف» بەبێ «مُضافُ إِلَيْهِ» مانای تەواو نابێت، ئەمەش بە هەمان شێوەیە، بۆیە پێی دەگوترێت: «مُنادَى شِبْهُ الْمُضاف».

**وَالنَّكِرَةُ ـأَيْ: غَيْرُ الْمُعَيَّنِـ نَحْوُ: «يَا رَاكِباً». فَكُلٌّ مِنْ هٰذِهِ الثَّلَاثَةِ مَنْصُوبٌ بِفِعْلٍ مُضْمَرٍ لَا يَجُوزُ إِظْهَارُهُ؛ لِأَنَّ حَرْفَ النِّدَاءِ ـأَعْنِي: «يَا»ـ بَدَلٌ مِنْهُ، وَلَا يَجُوزُ الْجَمْعُ بَيْنَ الْبَدَلِ وَالْمُبْدَلِ مِنْهُ، وَالتَّقْدِيرُ: «أَدْعُو عَبْدَ اللّٰهِ»، وَ «أَدْعُو خَيْراً مِنْ زَيْدٍ»، وَ «أَدْعُو رَاكِباً»؛**

(**وَ**) شوێنی سێیەم: (**النَّكِرَةُ**) بریتییە لە «مُنادَى النَّكِرَةِ غَيْرِ الْمَقْصُودَةِ» (**أَيْ: غَيْرُ الْمُعَيَّنِ**)[1] واتە: بریتییە لە ناوێکی نادیار کە تۆ بانگی دەکەیت و دەتەوێت بەدەمتەوە بێت (**نَحْوُ:**) وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: (**يَا راكِباً**)، **سەرنج بدە:** وشەی «رَاكِباً» «مَنْصُوب» بووە بە فیعلێکی «مُقَدَّر» کە بریتییە لە «أُنادِي» یاخود «أَدْعُو». (**فَكُلٌّ مِنْ هذِهِ الثَّلاثَةِ**) هەریەکە لەم سێ نموونانەی کە باسمان‌کردن (**مَنْصُوبٌ بِفِعْلٍ مُضْمَرٍ**) «مَنْصُوب» بووە بە هۆی فیعلێکی «مُقَدَّر» کە بریتییە لە «أُنادِي» یاخود «أَدْعُو»، (**لا يَجُوزُ إِظْهارُهُ**) بە هیچ جۆرێک دروست نییە فیعلەکە ئاشکرا بکرێت و لە ڕستەکەدا بگوترێت.

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: بۆچی دروست نییە فیعلەکە ئاشکرا بکرێت؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: (**لأَنَّ حَرْفَ النِّداءِ**) چونکە ئامرازی بانگکردن (**أَعْنِي: يا**)[2] کە مەبەستم پێی حەرفی «یاء»ـە لەم نموونەیەدا (**بَدَلٌ مِنْهُ**) لەجیاتی فیعلەکە باس کراوە و هاتووە، (**وَلَا يَجُوزُ الْجَمْعُ بَيْنَ الْبَدَلِ وَالْمُبْدَلِ مِنْهُ**) بەپێی یاسای زانایانی زانستی «نحو» دروست نییە بە هیچ جۆرێک «بَدَل» و «مُبْدَلُ مِنْهُ» بەیەکەوە کۆ ببنەوە لە یەک نموونەدا. (**وَالتَّقْدِيرُ**) بۆیە نموونەی یەکەم وای لێ دێتەوە: (**أَدْعُو عَبْدَاللّٰهِ. وَ**) هەروەها نموونەی دووەم وای لێ دێتەوە: (**أَدْعُو خَيْراً مِنْ زَيْدٍ. وَ**) هەروەها نموونەی سێیەم وای لێ دێتەوە: (**أَدْعُو رَاكِباً**) کەواتە هەرسێ

١. بۆیە ئەم برگە و «قَيْد»ەی زیاد کرد، چونکە ئەگەر ناوەکە «النَّكِرَةُ الْمَقْصُودَة» بوو واتە: ناوەکە دیار بوو کە تۆ بانگی دەکەیت و دەتەوێت بەدەمتەوە بێت، ئەو کاتە «مُنادَى»کە «مَضْمُوم» دەبێت وەکوو «يا رَجُلُ» هەروەکوو لە دەرسەکانی داهاتوو باسی دەکەین. بڕوانە: النحو الوافي: (١٠/٤).

٢. ئەم بابەتە تەنها تایبەت نییە بە ئامرازی «یا» بەڵکوو هەموو ئامرازەکانی‌تری بانگکردن دەگرێتەوە، هەروەکوو زانایانی زانستی «نَحو» دەفەرموون، بەڵام بۆ تەنها باسی حەرفی «یا» کراوە؟ چونکە لە هەموو ئامرازەکانی‌تری «مُنادَى» مەشهوورترە.

**فَحُذِفَ «أَدْعُو» وَأُبْدِلَ مِنْهُ «يَا».**

---

وشەی «عَبْدَاللّٰهِ، خَيْراً، رَاكِباً» دەبن بە «مَفْعُولُ بِهِ» لەبۆ وشەی «أَدْعُو» کە «فِعْلُ الْمُضارِع»ە[1] **(فَحُذِفَ: أَدْعُو)** بۆیە مامۆستا دەفەرمویێت: لەم سێ نمونانەدا وشەی «أَدْعُو» لابردرا و «حذف» کراوە **(وَ أُبْدِلَ مِنْهُ «يا»)** ئینجا لەجیاتی وشەی «أَدْعُو» وشەی «ياء» داندراوە، کە هەمان مانا و مەبەست دەبەخشێت.

* ◌ *

---

١. «وفاعله ضمير مستتر تقديره "أَنا"» بڕوانە: شرح التصريح: (٢/ ٢١٢).

**قَالَ: وَأَمَّا الْمُفْرَدُ الْمَعْرِفَةُ: فَمَضْمُومٌ فِي اللَّفْظِ وَمَنْصُوبٌ فِي الْمَعْنَىٰ، نَحْوُ: «يَا زَيْدُ» وَ «يَا رَجُلُ».**

**أَقُولُ: الْمُنَادَى إِمَّا مُفْرَدٌ مَعْرِفَةٌ، أَوْ غَيْرُ مُفْرَدٍ مَعْرِفَةٌ؛ وغَيْرُ الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَةُ**

## وانەی سیوسێهەم: باسی «اَلْمُنادَى الْمُفْرَدُ الْمَعْرِفَةُ»

پاش ئەوەی مامۆستا باسی حوکمی «مُنادَى الْمُضاف» و «مُنادَى شِبْهُ الْمُضاف» و «مُنادَى النَّكِرَة غَيْرِ الْمَقْصُودَة»ـی کرد، ئینجا (قالَ:) مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: (وَأَمَّا الْمُفْرَدُ الْمَعْرِفَةُ) سەبارەت بە «اَلْمُنادَى الْمُفْرَدُ الْمَعْرِفَة» کە بەم ئیسمە دەگوترێت، کە هەم تاکە و هەم ناسراوە، ئامرازێکی بانگکردنی چۆتە سەر، وەکوو «يا زَيْدُ، يا يُوسُفُ، يا إِبْراهِيمُ» (فَمَضْمُومٌ فِي اللَّفْظِ) ئەم جۆرە «مُنادَي»یە لە «لَفظ»ـدا «مَضْمُوم» دەبێت (وَمَنْصُوبٌ فِي الْمَعْنىَ) وە لە «تَقْدِير» و لە ماناشدا «مَنْصُوب» دەبێت، ئەمەش دوو جۆری هەیە: یەکەم پێی دەگوترێت: «اَلْمُنادَى الْمُفْرَدُ الْمَعْرِفَةُ»، (نَحْوُ) وەکوو (يا زَيْدُ). دووەم: پێی دەگوترێت: «اَلْمُنادَى النَّكِرَةُ غَيْرُ الْمَقْصُودَة» (نَحْوُ) وەکوو (يا رَجُلُ).

پاش ئەوەی مامۆستا باسی حوکمی «مُنادَى الْمُضافُ» و «مُنادَى شِبْهُ الْمُضاف» و «مُنادَى النَّكِرَة غَيْرِ الْمَقْصُودَة»ـی کرد، ئینجا دێتە سەر دوو جۆریتری «مُنادَى» بۆیە دەڵێت: (أَقُولُ) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (اَلْمُنادَى) ئەو ئیسمەی کە دەبێتە «مُنادَى» لە هەمان کاتدا تاکە (مفرد)، دوو جۆری هەیە: (إِمَّا مُفْرَدٌ مَعْرِفَةٌ) یاخود پێی دەگوترێت «اَلْمُنادَى الْمُفْرَدُ الْمَعْرِفَةُ» کە بەم ئیسمە دەگوترێت کە هەم تاکە و هەم ناسراوە و ئامرازێکی بانگکردنی چۆتە سەر، وەکوو «يا زَيْدُ»، (أَوْ) یاخود پێی دەگوترێت (غَيْرُ مُفْرَدٍ مَعْرِفَةٌ) کە بریتییە لە «مُنادَى الْمُضافُ» و «مُنادَى شِبْهُ الْمُضاف» ...هتد.

(وَغَيْرُ الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَةِ) ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: بەشی دووەم کە «مُنادَى الْمُضافُ» و «مُنادَى شِبْهُ الْمُضاف» و «مُنادَى النَّكِرَة غَيْرِ الْمَقْصُودَة» دەگرێتەوە،

**مَنْصُوبٌ فِي اللَّفْظِ، كَمَا مَرَّ.**

**وَأَمَّا الْمُفْرَدُ الْمَعْرِفَةُ فَمَضْمُومٌ فِي اللَّفْظِ، وَمَنْصُوبٌ فِي الْمَعْنَىٰ، نَحْوُ: «يَا زَيْدُ»، فَإِنَّ تَقْدِيرَهُ: «أَدْعُو زَيْداً»، أَمَّا لَفْظُهُ فَمَبْنِيٌّ عَلَى الضَّمِّ.**

**وَإِنَّمَا بُنِيَ هٰذَا؛ لِأَنَّهُ يُشْبِهُ كَافَ الْخِطَابِ فِي «أَدْعُوكَ» مِنْ حَيْثُ الْإِفْرَادِ وَالتَّعْرِيفِ؛**

---

ئەوە ئەم سێ جۆرە «مُنادَي»یە (**مَنْصُوبٌ فِي اللَّفْظِ**) لە «لَفْظ»ـدا «مَنْصُوب» دەبێت (**كَمَا مَرَّ**) هەروەکوو لە نموونەکانی ڕابوردوو باسمان‌کرد.

(**وَأَمَّا الْمُفْرَدُ الْمَعْرِفَةُ**) سەبارەت بە «اَلْمُنـادَى الْمُفْـرَدُ الْمَعْرِفَـة» کە بەم ئیسمە دەگوترێت، کە هەم تاکە و هەم ناسراوە، ئامرازێکی بانگکردنی چۆتە سەر، (**فَمَضْمُومٌ فِي اللَّفْظِ**) ئـەم جـۆرە «مُنادَي»یـە لـە «لَفْظ»ـدا «مَضْمُـوم» دەبێـت (**وَمَنْصُوبٌ فِي الْمَعْنَىٰ**) لـە «تَقْدِيـر» و لـە ماناشـدا «مَنْصُـوب» دەبێـت، ئەمـەش دوو جۆری هەیـە: یەکـەم پێـی دەگوترێـت: «اَلْمُنـادَى الْمُفْـرَدُ الْمَعْرِفَـةُ» (**نَحْوُ**) وەکـوو ئـەم نموونەیە (**يَا زَيْدُ**)، سـەرنج بـدە: (**فَإِنَّ تَقْدِيرَهُ**) ئـەم ڕستەیە لە «تقدیـر»دا وای لێ دێتەوە: (**أَدْعُو زَيْداً**)[1] واتـە: وشـەی «زَيْـداً» دەبێتـە «مَفْعُولُ بِهِ» بۆ فیعلێکـی «مُقَدَّر» کە بریتییە لە «أَدْعُـو» یاخـود «أُنـادِي». (**أَمَّا لَفْظُهُ**) بـەڵام سـەبارەت بە لایەنی «لَفْظ»ـی «اَلْمُنادَى الْمُفْرَدُ الْمَعْرِفَة» (**فَمَبْنِيٌّ عَلَى الضَّمِّ**) ئەوە بێ‌گومان «مَبْنِي»ـیە لەسەر «ضَمَّة».

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: (**وَ إِنَّمَا بُنِيَ هَذَا**) بۆچـی «اَلْمُنادَى الْمُفْـرَدُ الْمَعْرِفَـةُ» «مَبْنِي»ـیە؟ مامۆستا وەڵام دەداتـەوە و دەفەرموێـت: (**لأَنَّهُ يَشْبَهُ كافَ الْخِطابِ فِي أَدْعُوكَ**) چونکـە «اَلْمُنـادَى الْمُفْـرَدُ الْمَعْرِفَـة» دەشـوبهێتە (**كافَ الْخِطابِ فِي أَدْعُوكَ**) ئـەو «كَاف»ـەی کـە بـۆ کەسـی بەرامبـەر (مخاطب) بـەکار دێت کـە بـە وشـەی «أَدْعُـوكَ»وە نووسـاوە و بـووە بـە «مَفْعُـولُ بِـهِ» لـە دوو ڕووەوە: **یەکـەم** (**مِنْ حَيْثُ الإِفْرادِ**) هـەم لـەو ڕووەی کـە هەردووکیـان دەلاڵـەت لەسـەر تـاک (إِفْـراد) دەکـەن و بۆ یـەک کـەس بەکار دێـن، **دووەم** (**وَالتَّعْرِيفِ**) لەو ڕووەی کە هەردووکیان

---

١. بڕوانە: أوضح المسالك: (٢/ ١٠)

**وَكَافُ «أَدْعُوكَ» يُشْبِهُ كَافَ ذٰاكَ مِنْ هَاتَيْنِ الْجِهَتَيْنِ؛ وَكَافُ ذَاكَ حَرْفٌ مَبْنِيُّ الْأَصْلِ، فَمُشَابِهُهُ يَكُونُ مَبْنِيّاً أَيْضاً؛ وَمُشَابِهُ الْمُشَابِهِ مُشَابِهٌ لِذٰلِكَ الشَّيْءِ، فَيَكُونُ مَبْنِيّاً أَيْضاً. وَ إِنَّمَا بُنِيَ عَلَى الْحَرَكَةِ فَرْقاً بَيْنَ الْبِنَاءِ اللَّازِمِ وَالْعَارِضِ.**

---

دەلالەت لەسەر کەسێکی ناسراو دەکەن، **(وَكَافُ أَدْعُوكَ)** هەروەها ئەم «كاف»ـەی کە بە وشەی «أَدْعُوكَ»وە نووساوە **(يَشْبَهُ كافَ ذاكَ)** دەشوبهێتە ئەو «كَاف»ـەی کە بە وشەی «ذاكَ»ـەوە نووساوە **(مِنْ هَاتَيْنِ الْجِهَتَيْنِ)** لەم دوو ڕووەی کە باسمان‌کردن، کە بریتی بوون لە «إِفْراد» و لە «تَعْرِيف».

ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: **(وَكَافُ ذاكَ حَرْفٌ)** ئەو «كَاف»ـەی کە بە وشەی «ذاكَ»ـەوە نووساوە حەرفە و دەلالەت لەسەر «خِطاب»ـێ دەکات **(مَبْنِيُّ الأَصْلِ)** هەر لە ئەساسدا «مَبْنِي» بووە لەسەر «فَتْحَة» **(فَمُشابِهُهُ)** کەواتە: ئەم «كاف»ـەی کە بە وشەی «أَدْعُوكَ»وە نووساوە و دەشوبهێتە «كَاف»ـی «ذاكَ» **(يَكُونُ مَبْنِيّاً)** ئەویش دەبێتە «مَبْنِي» **(أَيْضاً)** بە هەمان شێوەی «كَاف»ـی «ذاكَ» **(وَمُشابِهُ الْمُشابِهِ)** هەروەها وشەی «يَا زَيْدُ» کە دەشوبهێتە ئەم «كاف»ـەی کە بە وشەی «أَدْعُوكَ»وە نووساوە، کە ئەویش دەشوبهێتە ئەو «كَاف»ـەی کە بە وشەی «ذاكَ»ـەوە نووساوە **(مُشابِهٌ لِذلِكَ الشَّيْءِ)** ئەویش وا حیساب دەکرێت کە ڕاستەوخۆ شوبهابێتە «كَاف»ـی «ذاكَ» **(فَيَكُونُ مَبْنِياً)** کەواتە: «يَا زَيْدُ» «اَلْمُنادَى الْمُفْرَدُ الْمَعْرِفَة»یە و ئەویش دەبێتە «مَبْنِي» **(أَيْضاً)** وەکوو ئەو «كاف»ـەی کە بە وشەی «أَدْعُوكَ»وە نووساوە.

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: **(وَ إِنَّمَا بُنِيَ عَلَى الْحَرَكَةِ)** بۆچی «اَلْمُنادَى الْمُفْرَدُ الْمَعْرِفَةُ» «مَبْنِي»ـیە لەسەر «حَرَكَة»؟ بۆچی «مَبْنِي» نەبوو لەسەر «سُكُون»؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: **(فَرْقاً بَيْنَ الْبِناءِ اللّازِمِ وَالْعارِضِ)** بۆ ئەوەی جیاوازی هەبێت لە نێوان وشەیەک کە «مَبْنِيُ الأَصْل»ـە لەگەڵ وشەیەک کە «مَبْنِيُ الْعارِض»ـە، چونکە ئەم وشانەی کە «مَبْنِيُ الأَصْل»ـن وەکوو «مَنْ، كَمْ، عَنْ» بە زۆری وایە کە «سَاكِنْ» دەبن، بۆیە ئەگەر وشەیەک «مَبْنِيُ الْعارِض» بێت دەبێت «حَرَكَة»ی بدرێتێ بۆ ئەوەی جیاوازی دروست بێت لە نێوان «مَبْنِيُ الأَصْل» و «مَبْنِيُ الْعارِض»ـدا.

**وَ إِنَّمَا بُنِيَ عَلَى الضَّمِّ لِيُخَالِفَ حَرَكَةُ بِنَائِهِ حَرَكَةَ إِعْرَابِهِ، فَإِنَّ الْمُنَادَىٰ الْمُعْرَبَ إِمَّا مَنْصُوبٌ كَمَا عَرَفْتَ، أَوْ مَجْرُورٌ. وَذٰلِكَ إِذَا دَخَلَ عَلَيْهِ لَامُ الْجَرِّ، نَحْوُ: «يَا لَزَيْدٍ»؛ وَتُسَمَّىٰ هٰذِهِ اللَّامُ، لَامَ الِاسْتِغَاثَةِ؛ وَهٰذَا الْمُنَادَىٰ، الْمُنَادَىٰ الْمُسْتَغَاثَ.**

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: **(وَ إِنَّمَا بُنِيَ عَلَى الضَّمِّ)** بۆچی «اَلْمُنادَى الْمُفْرَدُ الْمَعْرِفَةُ» «مَبْنِي»ـیە لەسەر «ضَمَّة»؟ مامۆستا دەفەرموێت: **(لِيُخالِفَ حَرَكَةُ بِنائِهِ حَرَكَةَ إِعْرابِهِ)** بۆ ئەوەی «حَرَكَة»ی «مُنادَى الْمُعْرَب»[1] جیاواز بێت لەگەڵ «حَرَكَة»ی «مُنادَى الْمَبْنِي» **(فَإِنَّ الْمُنادَى الْمُعْرَبَ)** چونکە «مُنادَى الْمُعْرَب» دوو جۆری هەیە: **یەکەم (إِمَّا مَنْصُوبٌ كَمَا عَرَفْتَ)** یاخود «مَنْصُوب» دەبێت ـ هەر وەکوو باسمان کرد لە «یا عَبْدَاللّٰهِ....»ـ **دووەم (أَوْ مَجْرُورٌ)** یاخود «مَجْرُور» دەبێت **(وَذَلِكَ إِذا دَخَلَ عَلَيْهِ لامُ الْجَرِّ)** ئەگەر بێت و ئەم وشەیەی کە بووە بە «مُنادَى» حەرفی «لام»ـی بچێتە سەر کە ئیسمێک لە دوای خۆی «مَجْرُور» دەکات **(نَحْوُ)** وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: **(یالَزَيْدٍ)**[2] واتە: هاوار بۆ زەیدێ.

ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: **(وَيُسَمَّى هَذا اللّامُ)** ئەم «لام»ـە پێی دەگوترێت **(لامَ الاسْتِغاثَةِ)** لامی هاوارکردنێ **(وَهَذا الْمُنادَى، اَلْمُنادَى الْمُسْتَغاثَ)** ئەو ئیسمەش کە بووە بە «مُنادَى» پێی دەگوترێت: «مُنادَى الْمُسْتَغاث» واتە: ئەو کەسەی کە هاواری بۆ کراوە.

---

١. بەڵام هێندێکی تر لە زانایان دەفەرموون: بۆیە: «اَلْمُنادَى الْمُفْرَدُ الْمَعْرِفَةُ» «مَبْنِي»ـیە لەسەر «ضَمَّة» چونکە ئەگەر «مَفْتُوح» بوایە «اِلتباس»ـی دەبوو بە «غَيْرُ الْمُنْصَرِف»ـەوە، هەروەها ئیلتیباسی دەبوو بەو ئیسمەی کە «إِضافَة» کراوە بۆ لای «یاءُ الْمُتَكَلِّم» ئەگەر «مَكْسُور» بوایە. بڕوانە: علل النحو: (٤٦٣) وأسرار العربیە: (٢٠١).

٢. لەم نموونەیەدا دەبێت «لام»ـەکە بە «مَفْتُوح»ـی بخوێندرێتەوە، ئەگەرچی لە ئەسڵدا مەبنییە لەسەر «كَسْرَة»، چونکە «مُنادَى الْمُسْتَغاث» لە جێگای «كافُ الضَّمیر»ە وەکوو وشەی «لَكَ» ئەویش «لام»ـەکەی بە مەفتووحی دەخوێندرێتەوە، بۆیە لەگەڵ «مُنادَى الْمُسْتَغاث» هەر بە مەفتووحی دەخوێندرێتەوە، هەروەها ئەگەر «لام»ـەکەی بە مەکسووری بخوێندرێتەوە خەڵکی نازانن ئایا وشەی «زَيْد» «مُسْتَغاث»ـە یاخود «مُسْتَغاث لە»وە کە «حذف»ـی «مُسْتَغاث»ـی لێ کراوە. بڕوانە: شرح ملا جامی، (٢٤٨/١)

**وَإِنَّمَا أُعْرِبَ الْمُنادَى الْمُضَافُ وَالْمُضَارِعُ لَهُ وَالنَّكِرَةُ لِانْتِفَاءِ وَجْهِ الشَّبَهِ، أَعْنِي: الْإِفْرَادَ فِي الْأَوَّلَيْنِ وَالتَّعْرِيفَ فِي الثَّالِثِ. وَإِنَّمَا أُعْرِبَ الْمُسْتَغَاثُ؛ لِأَنَّ إِلْغَاءَ عَمَلِ حَرْفِ الْجَرِّ غَيْرُ وَاقِعٍ فِي كَلَامِ الْعَرَبِ.**

---

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت:(**وَإِنَّمَا أُعْرِبَ الْمُنادَى الْمُضاف، وَالْمُضارِعُ لَهُ، وَالنَّكِرَةُ**) بۆچی «مُنادَى الْمُضاف» و «مُنادَى شِبْهُ الْمُضاف» و «مُنادَى النَّكِرَة غَيْرِ الْمَقْصُودَة» موعرەبن؟ بۆچی ئەوانیش «مَبني» نەبوون؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت:(**لِانْتِفاءِ وَجْهِ الشَّبَهِ**) چونکە ئەوان نەدەشوبهانە ئەم کافەی کە بە وشەی «أَدْعُوكَ»وە نووساوە، واتە: خاڵی هاوبەش نەبوو لە نێوانیاندا(**أَعْنِي: اَلإِفْرادَ فِي الأَوَّلَيْنِ**)[1] مەبەستم ئەوەیە کە «مُنادَى الْمُضاف» و «مُنادَى شِبْهُ الْمُضاف» «مُفْرَد» نەبوون وەکوو کافی وشەی «أَدْعُوكَ».(**وَالتَّعْرِيفَ فِي الثَّالِثِ**) هەروەها «الْمُنادَى النَّكِرَة غَيْرِ الْمَقْصُودَة»ش ناسراو (مَعْرِفَة) نەبوو، وەکوو ئەو کافەی کە بە وشەی «أَدْعُوكَ»وە نووساوە، کەواتە: بۆیە ئەم سێ جۆرەی «مُنادَى» نەبوون بە «مَبْنِي» چونکە «مُشَابَهَة»یان نییە لەگەڵ کافی «أَدْعُوكَ».

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت:(**وَإِنَّمَا أُعْرِبَ الْمُنادَى الْمُسْتَغاثُ**) بۆچی «مُنادَى الْمُسْتَغاث» «مُعرب»ـە؟ ئەگەرچی هەم «مُفْرَد»ە هەم «مَعْرِفَة»یە؟ بۆچی ئەویش «مَبْنِي» نەبوو؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت:(**لأَنَّ إِلْغاءَ عَمَلِ حَرْفِ الْجَرِّ غَيْرُ واقِعٍ فِي كَلامِ الْعَرَبِ**) چونکە هەڵوەشاندنەوە و «إِلْغاء»ی کارکردنی «حُروفُ الْجَرّ» لە زمانی عەرەبیدا وارد نەبووە، بۆیە «مُنادَى الْمُسْتَغاث» هەر بە «مُعْرَب»ی مایەوە.

**ئاگاداری:** ئەی قوتابی بەرێز و فەقێی خۆشەویست، ئاگادار بە لێرەدا کە دەڵێین: «اَلْمُنادَى الْمُفْرَدُ» مەبەستمان بە وشەی «مُفْرَد» ئەوەیە کە «مُنادَى»یەکە «مُضاف» و «شِبْهُ الْمُضاف» نەبێت، نەک «مُثَنَّى» و «جَمْع»[2]، کەواتە: «يا زَيْدانِ» یاخود «يا زَيْدُونَ» لێرەدا بە «مُفْرَد» هەژمار دەکرێن، چونکە وشەی «مُفْرَد» بە پێنچ مانای جیاواز بەکار دێت و بەگوێرەی شوێن و بابەت ماناکەی دەگۆڕێت.

---

١. بڕوانە: شرح ملا جامی، (١/٢٤٨) و شرح قطر النّدى و بلّ الصّدى: (٢٩٥).

٢. بڕوانە: شرح ملا جامی (١/٢٤٨) وشرح قطر النّدى: (٢٨٠) وأوضح المسالك: (٢/ ١٠)

**قَالَ: وَفِي الصِّفَةِ المُفْرَدَةِ الرَّفْعُ وَالنَّصْبُ، نَحْوُ: «يَا زَيْدُ الظَّرِيفُ وَالظَّرِيفَ»، وَفِي الْمُضَافَةِ النَّصْبُ لَاغَيْرُ، نَحْوُ: «يَا زَيْدُ صَاحِبَ عَمْرٍو».**

**أَقُولُ: صِفَةُ الْمُنَادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَةِ إِذَا كَانَتْ مُفْرَدَةً، أَيْ: غَيْرَ مُضَافَةٍ،**

## وانەی سیوچوارەم: باسی «صِفَةُ اَلْمُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَةُ»

پاش ئەوەی مامۆستا باسی حوکمی هەر شەش جۆری «مُنادَى»ی کرد، ئینجا دێتە سەر ڕوونکردنەوەی «صِفَةُ اَلْمُنادَى» **(قالَ:)** مامۆستا «جار اللّه» زەمەخشەری دەفەرموێت: **(وَفِي الصِّفَة الْمُفْرَدَةِ)** لەم وشەیەی دەبێتە «صِفَة» بۆ «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَةُ» تەماشا دەکەین: ئەگەر «صِفَة»ـەکە «مُفْرَد» بوو وەکوو وشەی «الظَّرِيفُ، اَلْبَخِيلُ، اَلْحاسِدُ» ئەوکاتە دروستە **(الرَّفْعُ)** هەم بە مەڕفووعی بخوێندرێتەوە **(وَالنَّصْبُ)** هەم بە «مَنصوب»ـی بخوێندرێتەوە **(نَحْوُ)** وەکوو ئەم نموونەیە: **(يا زَيْدُ الظَّرِيفُ وَالظَّرِيفَ)** سەرنج بدە: وشەی «الظَّرِيفُ» وشەیەکی «مُفْرَد»ە و بۆتە «صِفَة» بۆ وشەی «يا زَيْدُ» کە «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَةِ»یە، بۆیە هەم بە مەڕفووعی هەم بە «مَنصوب»ـی دەخوێندرێتەوە.

**(وَفِي الْمُضافَةِ)** هەروەها ئەگەر سیفەتەکە «مُضاف» بوو وەکوو وشەی «صَاحِبَ عَمْرٍو، غُلامَ بَكْرٍ» **(النَّصْبُ لا غَيْرُ)**[1] تەنها بە «مَنصوب»ـی دەخوێندرێتەوە **(نَحْوُ:)** وەکوو ئەم نموونەیە **(يَا زَيْدُ صَاحِبَ عَمْرٍو)**، سەرنج بدە: وشەی «صَاحِبَ عَمْرٍو» وشەیەکی «مُضاف»ـە و بووە بە سیفەت بۆ وشەی «يا زَيْدُ» کە «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَةِ»یە بۆیە تەنها بە «مَنصوب»ـی دەخوێندرێتەوە.

**(أَقُولُ)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(صِفَةُ الْمُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَةِ)** ئەگەر وشەیەک بوو بە «صِفَة» بۆ «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَةِ» تەماشا دەکەین: **(إِذا كانَتْ مُفْرَدَةً)** ئەگەر سیفەتەکە «مُفْرَد» بوو **(أَيْ: غَيْرَ مُضافَةٍ)** مەبەستم وایە کە سیفەتەکە «مُضاف» نەبوو وەکوو وشەی «الظَّرِيفُ، اَلْبَخِيلُ، اَلْحاسِدُ»

---

١. شرح قطر النّدى: (٢٨٣)

**يَجُوزُ فِيهَا الرَّفْعُ وَالنَّصْبُ، نَحْوُ: «يَا زَيْدُ الظَّرِيفُ وَالظَّرِيفَ»؛ لِأَنَّ الْمُنَادَى الْمُفْرَدَ الْمَعْرِفَةَ مَبْنِيٌّ يُشْبِهُ الْمُعْرَبَ؛ أَمَّا بِنَاؤُهُ فَظَاهِرٌ، وَأَمَّا شَبَهُهُ بِالْمُعْرَبِ فَلِعُرُوضِ حَرَكَتِهِ كَحَرَكَةِ الْمُعْرَبِ، فَبِاعْتِبَارِ بِنَائِهِ يَجُوزُ فِي صِفَتِهِ النَّصْبُ؛ لِأَنَّ صِفَةَ الْمَبْنِيِّ إِنَّمَا تَتْبَعُهُ فِي الْمَحَلِّ؛ وَمَحَلُّهُ النَّصْبُ،**

---

**(يَجُوزُ فِيهَا)** ئەوكاتە دروستە سیفەتەكە **(الرَّفْعُ)** هەم: بە مەرفووعی بخوێندرێتەوە **(وَالنَّصْبُ)** هەم بە «مَنصوب»ی بخوێندرێتەوە، **(نَحْوُ)** وەكوو ئەم نموونەیە: **(يا زَيْدُ الظّرِيفُ وَالظّرِيفَ)** سەرنج بدە: وشەی «الظّرِيفُ» وشەیەكی موفرەدە و بۆتە «صِفَة» بۆ وشەی «يا زَيْدُ» كە «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَة»یە، بۆیە هەم بە مەرفووعی هەم بە «مَنصوب»ی دەخوێندرێتەوە.

ئینجا ئەگەر كەسێك پرسیار بكات و بڵێت: بۆچی دروستە سیفەتەكە بە دوو جۆر بخوێندرێتەوە؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: **(لأَنَّ الْمُنادَى الْمُفْرَدَ الْمَعْرِفَةَ)** چونكە «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَةِ» **(مَبْنِيٌّ)** لە ڕووی «لَفْظ»ـەوە «مَبْنِي»ـیە، لە هەمان كاتدا **(يَشْبَهُ الْمُعْرَبَ)** دەشوبهێتە «مُعْرَب»، **(أَمَّا بِناؤُهُ فَظاهِرٌ)** سەبارەت بە بابەتی «مَبْنِي»ـیایەتی، ئەوە شتێكی ڕوون و ئاشكرایە، لەوانەی ڕابوردوو ئاماژەمان پێ دا، **(وَأَمَّا شَبَهُهُ بِالْمُعْرَبِ)** بەڵام سەبارەت بە وێكچوون و «مُشابَهَة»ی لەگەڵ «مُعْرَب» و هۆكارەكەی چییە؟ **(فَلِعُروضِ حَرَكَتِهِ)** چونكە «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَة» ئەم «حَرَكَة»ی لە سەریەتی دێت و دەڕوات **(كَحَرَكَةِ الْمُعْرَبِ)** وەكوو ئەو حەرەكەیەی سەر موعرەبەكە، ئەمەش پێچەوانەی حەرەكەی «مَبْنِيُ الأَصْل»ـە، كە نابێت بە هیچ جۆرێك گۆڕانكاری بەسەردا بێت.

**(فَباعْتِبارِ بِنائِهِ)** ئینجا بە لەبەرچاوگرتنی ئیعتیباری ئەوەی كە «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَةِ» مەبنییە **(يَجُوزُ فِي صِفَتِهِ النَّصْبُ)** دروستە سیفەتەكەی بە «مَنصوب»ی بخوێندرێتەوە **(لأَنَّ صِفَةَ الْمَبْنِيِّ)** چونكە ئەگەر وشەیەك بوو بە «صِفَة» بۆ ئیسمێكی «مَبْنِي» **(إِنَّمَا تَتْبَعُهُ فِي الْمَحَلِّ)** بە هیچ جۆرێك تابیعی لەفزی وشەكە نابێت، بەڵكوو تەنها تابیعی «مَحَلّ»ی وشەكە دەبێت **(وَمَحَلُّهُ النَّصْبُ)** «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَة»ش

**كَمَا ذَكَرْنَا. وَبِاعْتِبَارِ شِبْهِهِ بِالْمُعْرَبِ يَجُوزُ فِي الصِّفَةِ الرَّفْعُ؛ لِأَنَّ صِفَةَ الْمُعْرَبِ إِنَّمَا تَتْبَعُهُ فِي اللَّفْظِ.**

**وَأَمَّا فِي الصِّفَةِ الْمُضَافَةِ فَإِنَّمَا يَجُوزُ النَّصْبُ لَا غَيْرُ، نَحْوُ: «يَا زَيْدُ صَاحِبَ عَمْرٍو»؛ لِأَنَّ الْمُنَادَى الْمُضَافَ مَعَ قُرْبِهِ مِنْ حَرْفِ النِّدَاءِ لَا يَجُوزُ فِيهِ غَيْرُ النَّصْبِ، فَصِفَتُهُ الْمُضَافَةُ**

---

لە «مَحَلّ»ـدا «مَنْصُوب» دەبێت (**كَمَا ذَكَرْنا**) هەروەکوو باسمان کرد و گوتمان «يا زَيْدُ» لە «تَقْدِير»دا دەبێتە «أَدْعُو زَيْداً».

(**وَبِاعْتِبارِ شَبَهِهِ بِالْمُعْرَبِ**) بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی ئیعتیباری ئەوەی کە «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَة» دەشوبهێتە موعرەب (**يَجُوزُ فِي الصِّفَة الرَّفْعُ**) دروستە سیفەتەکەی بە مەرفووعی بخوێندرێتەوە (**لأَنَّ صِفَةَ الْمُعْرَبِ**) چونکە ئەگەر وشەیەک بوو بە «صِفَة» بۆ ئیسمێکی «مُعْرَب» (**إِنَّمَا تَتْبَعُهُ فِي اللَّفْظِ**) بە هیچ جۆرێک تابیعی «مَحَلّ»ـی وشەکە نابێت، بەڵکوو تەنها تابیعی «لَفْظ»ـی وشەکە دەبێت.

(**وَ أَمَّا فِي الصِّفَة الْمُضافَةِ**) هەروەها لەم «صِفَة»ەی کە «إِضافَة» کراوە بۆ لای ئیسمێکیتر وەکوو «صَاحِبَ عَمْرٍو، غُلامَ بَكْرٍ» (**فَإِنَّمَا يَجُوزُ النَّصْبُ لا غَيْرُ**) تەنها دروستە سیفەتەکە بە «مَنصوب»ـی بخوێندرێتەوە (**نَحْوُ:**) وەکوو ئەم نموونەیە: (**يَا زَيْدُ صَاحِبَ عَمْرٍو**)، سەرنج بدە: وشەی «صَاحِبَ عَمْرٍو» وشەیەکی «مُضاف»ـە و بۆتە «صِفَة» بۆ وشەی «يا زَيْدُ» کە «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَةِ» بۆیە تەنها بە «مَنصوب»ـی دەخوێندرێتەوە.

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: بۆچی دروستە سیفەتەکە تەنها بە «مَنصوب»ـی بخوێندرێتەوە؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: (**لأَنَّ الْمُنادَى الْمُضافَ**) چونکە «مُنادَى المُضاف» (**مَعَ قُرْبِهِ مِنْ حَرْفِ النِّداءِ**) لەگەڵ ئەوەی زۆر نزیکە لە ئامرازی بانگکردن (حَرْفُ النِّداءِ) (**لا يَجُوزُ فِيهِ غَيْرُ النَّصْبِ**) جگە لە «مَنصوب»ـی دروست نەبوو بە هیچ جۆرێکیتر بخوێندرێتەوە (**فَصِفَتُهُ الْمُضافَةُ**) کەواتە: ئەگەر سیفەتی «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَة» «إضافة» کرابوو بۆلای ئیسمێکیتر

**تَكُونُ كَذٰلِكَ، بَلْ هِيَ بِطَرِيقٍ أَوْلَىٰ لِبُعْدِهَا مِنْهُ.**

(**تَكُونُ كَذٰلِكَ**) ئەویش بە هەمان شێوە جگە لە «مَنصوب»ـی دروست نییە بە هیچ جۆرێکی‌تر بخوێندرێتەوە، (**بَلْ هِيَ بِطَرِيقٍ أَوْلَى**)[1] بەڵکوو ئەو شایانتر و لە پێشتریشە بۆ ئـەوەی تەنها بـە «مَنصوب»ـی بخوێندرێتـەوە، لەبـەر چـی؟ (**لِبُعْدِها مِنْهُ**) چونکە سیفەتەکە دوورترە لە ئامرازی بانگکردن (حَرْفُ النِّداء) لە «مُنادَى المُضاف».

* ◌ *

---

١. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە ئەم سەرچاوانە: شرح المفصل: (١٢٨/١) والكتاب: (١٨٦/٢) شرح ملا جامی (٢٤٨/١) وشرح قطر النّدى: (٢٨٣).

**قَالَ: وَإِذَا وُصِفَ الْمُنَادَىٰ بِـ «ابْنٍ» نُظِرَ فِيهِ، فَإِنْ وَقَعَ بَيْنَ الْعَلَمَيْنِ فُتِحَ الْمُنَادَىٰ، نَحْوُ: «يَا زَيْدَ بْنَ عَمْرٍو»؛ وَإِلَّا فَالضَّمُّ، نَحْوُ: «يَا زَيْدُ ابْنَ أَخِي» وَ «يَا رَجُلُ ابْنَ زَيْدٍ».**

**أَقُولُ: إِذَا وُصِفَ الْمُنَادَىٰ بِلَفْظَةِ «ابْنٍ» نُظِرَ فِيهِ،**

---

## وانەی سیوپێنجەم: باسی «إذا وُصِفَ الْمُنادَى بِابْنٍ»

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: (وَ إِذَا وُصِفَ الْمُنادَى بِابْنٍ) هەرکاتێک وشەی «ابن» بوو بە «صِفَة» بۆ «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَة» (نُظِرَ فِيهِ) تەماشا دەکرێت، چونکە دوو حاڵەتی هەیە:

**حاڵەتی یەکەم:** (فَإِنْ وَقَعَ بَيْنَ الْعَلَمَيْنِ) ئەگەر وشەی «ابن» کەوتە نێوان دوو ناو (عَلَم) ئەوکاتە (فُتِحَ الْمُنادَى) ئەو وشەیەی بووە بە «مُنادَى» مەفتووح دەکرێت لەجیاتی «ضَمَّة» (نَحْوُ:) وەکوو (يَا زَيْدَ بْنَ عَمْرٍو)، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «ابن» کەوتۆتە نێوان دوو ناو (عَلَم) بۆیە «مُنادَى»کە (يا زَيْدَ) «مَفْتُوح» کراوە.

**حاڵەتی دووەم:** (وَ إِلَّا) بەڵام ئەگەر وشەی «ابن» نەکەوتە نێوان دوو «عَلَم» (فَضُمَّ) ئەوکاتە ئەم وشەیەی بووە بە «منادى» «مَضمُوم» دەکرێت لەجیاتی «فَتْحَة» (نَحْوُ:) وەکوو (يَا زَيْدُ ابْنَ أَخِي)، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «ابن» نەکەوتۆتە نێوان دوو ناو (عَلَم) چونکە وشەی «أَخِي» عەلەم نییە، بۆیە «مُنادَى»کە (يَا زَيْدُ) «مَضمُوم» بووە و هەروەکوو خۆی دەخوێندرێتەوە، (وَ) هەروەها وەکوو (يَا رَجُلُ ابْنَ زَيْدٍ)[1]، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «ابن» نەکەوتۆتە نێوان دوو ناو چونکە وشەی «رَجُل» ناو نییە، بۆیە «مُنادَى»کە (يَا رَجُلُ) «مَضمُوم» بووە و هەروەکوو خۆی دەخوێندرێتەوە.

(أَقُولُ) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (إِذا وُصِفَ الْمُنادَى بِلَفْظَةِ «اِبْنٍ») هەرکاتێک وشەی «ابن» بوو بە «صِفَة» بۆ «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَة» (نُظِرَ فِيهِ) تەماشا دەکرێت، چونکە دوو حاڵەتی هەیە:

---

١. بڕوانە: الفوائد و القواعد: (٤٥٠) وشرح كافية ابن الحاجب: (٣٣٧/١) شرح التسهيل: (١٣٠/١)

**فَإِنْ وَقَعَ «الاِبْنُ» بَيْنَ الْعَلَمَيْنِ؛ بِأَنْ يَكُونَ قَبْلَهُ وَبَعْدَهُ عَلَمٌ، فُتِحَ الْمُنَادَىٰ، أَيْ: بُنِيَ الْمُنَادَىٰ عَلَى الْفَتْحِ اخْتِيَاراً مَعَ جَوَازِ الضَّمِّ، كَقَوْلِكَ: «يَا زَيْدَ بْنَ عَمْرٍو».**

**وَ إِنْ لَمْ يَقَعْ بَيْنَ الْعَلَمَيْنِ فَضُمَّ الْمُنَادَىٰ، أَي: يُبْنَىٰ عَلَى الضَّمِّ وُجوباً، وَذٰلِكَ: [١] بِأَنْ لَا يَكُونَ بَعْدَهُ عَلَمٌ، نَحْوُ: «يَا زَيْدُ ابْنَ أَخِي»، [٢] أَوْ لَا يَكُونَ قَبْلَهُ عَلَمٌ،**

---

**حاڵەتـی یەکـەم:** **(فَإِنْ وَقَعَ بَيْنَ الْعَلَمَيْنِ)** ئەگـەر وشـەی «ابـن» کەوتە نێوان دوو ناو (عَلَم) **(بِأَنْ يَكُونَ قَبْلَهُ، وَبَعْدَهُ عَلَمٌ)** بە جۆرێک کە هەم ئیسمی پێش خۆی و هەم ئیسمی دوای خـۆی «عَلَـم» بـوون، ئەو کاتـە **(فُتِحَ الْمُنادَى)** ئەو وشـەیەی کە بووە بە «مُنـادَى» مەفتـووح دەکرێـت لەجیاتـی «ضَمَّـة» **(أَيْ: بُنِيَ عَلَى الْفَتْحِ اِخْتِياراً)** واتـە: لـەم کاتـەدا موناداکـە «مَبْنِي» دەبێت لەسـەر «فَتْحَـة» بە شـێوازێکی «اِخْتِيارِي» **(مَعَ جَوازِ الضَّمِ)** لەگەڵ ئەوەی دروستە ئەم وشەیەی کە بووە بە «مُنادَى» بە «مَضْمُوم»ـی بخوێندرێتـەوە **(كَقَوْلِكَ:)** وەکـوو تـۆ دەڵێیـت: **(يَا زَيْدَ بْنَ عَمْرٍو)**، سـەرنج بـدە: لەم نموونەیەدا وشەی «ابن» کەوتۆتە نێوان دوو ناو، بۆیە موناداکە (يا زَيْدَ) بە مەفتووحی دەخوێندرێتەوە لەگەڵ ئەوەشدا دروستە بە «مَضْمُوم»ـی بخوێندریتەوە.

**حاڵەتـی دووەم:** **(وَ إِنْ لَمْ يَقَعْ بَيْنَ الْعَلَمَيْنِ)** بـەڵام ئەگـەر وشـەی «ابن» نەکەوتە نێوان دوو ناو (عَلَم) **(فَضُمَّ الْمُنادَى)** ئەوکاتە ئەم وشـەیەی بووە بە مونادا «مَضَمُوم» دەکرێـت لەجیاتـی «فَتْحَـة» **(أَيْ: يُبْنَى عَلَى الضَّمِ وُجوباً)** واتـە: لـەم کاتەدا موناداکە «مَبْنِيَ» دەبێت لەسەر «ضَمَّة» بە شێوازێکی «وُجُوبِي» واتە: بەهیچ جۆرێک دروست نییە بە مەفتووحی بخوێندرێتەوە.

**(وَذَلِكَ)** ئەمەش لە کاتێکدایە کە **(بِأَنْ لا يَكُونَ بَعْدَهُ عَلَمٌ)** ئەو ئیسـمەی کەوتۆتە دوای وشەی «ابن» ناو (عَلَم) نەبێت **(نَحْوُ:)** وەکوو **(يَا زَيْدُ ابْنَ أَخِي)**، **سەرنج بدە:** لـەم نموونەیـەدا وشـەی «ابـن» نەکەوتۆتـە نێوان دوو «عَلَـم»، چونکە وشـەی «أَخِي» ناو نییە، بۆیە موناداکە (يَا زَيْدُ) «مَضَمُوم» بووە و هەر وەکوو خۆی دەخوێندرێتەوە، **(أَوْ)** یاخود **(لا يَكُونَ قَبْلَهُ عَلَمٌ)** ئەو ئیسمەی کەوتۆتە پێش وشەی «ابن» ناو نەبێت

**نَحْوُ: «يَا رَجُلُ ابْنَ زَيْدٍ»، [٣] أَوْ لَا يَكُونَ قَبْلَهُ وَلَا بَعْدَهُ عَلَمٌ، نَحْوُ: «يَا رَجُلُ ابْنَ أَخِي». وَإِنَّمَا لَمْ يَذْكُرْهُ الْمُصَنِّفُ؟ لِأَنَّهُ يُعْلَمُ مِمَّا ذَكَرَهُ؛ لِأَنَّ انْتِفَاءَ الْعَلَمِيَّةِ فِي أَحَدِ الطَّرَفَيْنِ إِذَا كَانَ مُوجِباً لِلضَّمِّ، فَفِي كِلَا الطَّرَفَيْنِ بِالطَّرِيقِ الْأَوْلَىٰ. وَإِنَّمَا فَعَلُوهُ كَذٰلِكَ لِأَنَّ وَصْفَ الْمُنَادَىٰ بِـ «ابْنٍ» بَيْنَ الْعَلَمَيْنِ كَثِيرٌ فِي كَلَامِ الْعَرَبِ،**

---

**(نَحْوُ:)** وەکوو **(يَا رَجُلُ ابْنَ زَيْدٍ)**[١]، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «ابن» نەکەوتۆتە نێوان دوو «عَلَم» چونکە وشەی «رَجُل» ناو نییە، بۆیە موناداکە (يَا زَيْدُ) «مَضمُوم» بووە و هەر وەکوو خۆی دەخوێندرێتەوە، **(أَوْ)** یاخود **(لا يَكُونَ قَبْلَهُ، وَلَا بَعْدَهُ عَلَمٌ)** نە ئەو ئیسمەی کەوتۆتە پێش وشەی «ابن»، وە نە ئەو ئیسمەی کەوتۆتە دوای وشەی «ابن» ناو (عَلَم) نەبێت **(نَحْوُ:)** وەکوو **(يا رَجُلُ ابْنَ أَخِي)**، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «ابن» نەکەوتۆتە نێوان دوو «عَلَم»، چونکە نە وشەی «رَجُل» ناوە، نە وشەی «أَخِي»، بۆیە موناداکە (يَا زَيْدُ) «مَضمُوم» بووە.

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: **(وَإِنَّمَا لَمْ يَذْكُرْهُ الْمُصَنِّفُ)** بۆچی مامۆستای زەمەخشەری باسی ئەم سوورەتەی نەکرد؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەڵێت: **(لأَنَّهُ يُعْلَمُ مِمَّا ذَكَرَهُ)** چونکە ئەم سوورەتە بەخۆی دەزاندرێت لەوەی کە مامۆستا لە پێشدا باسی کرد، **(لأَنَّ انْتِفاءَ الْعَلَمِيَّةِ فِي أَحَدِ الطَّرَفَيْنِ)** چونکە ئەگەر نەبوونی ئیسمێکی «عَلَمْ» لە پێشەوەی وشەی «اِبْن» یاخود لەدوای وشەی «اِبْن» **(إذا كَانَ مُوجِباً لِلضَّمِ)** ببێتە هۆی ئەوەی کە «مُنادَى»کە بە واجبی بە «مَضْمُوم»ـی بخوێندرێتەوە، **(فَفِي كِلا الطَّرَفَيْنِ بِالطَّرِيقِ الأَوْلَى)** ئەگەر بێت و وشەی «اِبْن» لە پێشدا و لە دواوەی ئیسمێکی «عَلَمْ» نەبوو، ئەوە ئەولاترە کە ئیسمەکە بە «مَضْمُوم»ـی بخوێندرێتەوە.

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: **(وَإِنَّمَا فَعَلُوهُ كَذٰلِكَ)** بۆچی هەرکاتێک وشەی «ابن» بوو بە «صِفَة» بۆ «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَة» و کەوتە نێوان دوو «عَلَمْ» موناداکە «مَفْتُوح» دەکرێت؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەڵێت: **(لأَنَّ وَصْفَ الْمُنادَى بِـ«اِبْنٍ» بَيْنَ الْعَلَمَيْنِ كَثيرٌ فِي كَلامِ الْعَرَبِ)** چونکە وەسفدارکردنی «مُنادَى الْمُفْرَدِ

---

١. بڕوانە: الفوائد و القواعد: (٤٥٠) وشرح كافية ابن الحاجب: (٣٣٧/١) شرح التسهيل: (١٣٠/١)

**وَالْفَتْحَةَ خَفِيفَةٌ، وَالْكَثْرَةَ تَسْتَدْعِي الْخِفَّةَ، فَلِذٰلِكَ قَيَّدَ الْوَصْفَ بِـ «ابْنٍ» بَيْنَ الْعَلَمَيْنِ، فَإِنَّ الْوَصْفَ بِغَيْرِ «ابْنٍ» أَوْ بِـ «ابْنٍ» غَيْرِ وَاقِعٍ بَيْنَ الْعَلَمَيْنِ غَيْرُ كَثِيرٍ فِي كَلَامِهِمْ.**

**وَحُكْمُ «ابْنَةٍ» كَحُكْمِ «ابْنٍ» فِي ذٰلِكَ، نَحْوُ: «يَا هِنْدُ ابْنَةَ زَيْدٍ»،**

---

الْمَعْرِفَة» بە وشەی «ابن» لە نێوان دوو «عَلَمْ» ئیجگار زۆرە لە زمانی عەرەبیدا (**وَالْفَتْحَةَ خَفِيفَةٌ**) هەروەها «حَرَكَة»ی «فَتْحَة»ش ئێجگار سووکە (**وَالْكَثْرَةُ تَسْتَدْعِي الْخِفَّةَ**) شتێکیش کە زۆر بوو پێویست دەکات کە حەرەکەیەکی سووکی پێ بدرێت، بۆیە لەم حاڵەتدا موناداکە «مَفْتُوحْ» دەکرێت.

**ئینجا بزانە:** ئەگەر وشەی «اِبْن» کەوتە نێوان دوو «عَلَم» ئەوە پیتی هەمزەکەی نانووسرێت وەکوو «يا زَيْدَ بْنَ عَلِيٍ» بەڵام ئەگەر نەکەوتە نێوان دوو «عَلَم»[1] ئەوە هەمزەکەی دەنووسرێت، وەکوو «يَا غُلامُ ابْنَ بَكْرٍ» بەڵام لە هەردوو حاڵەتەکەدا هەمزەکە ناخوێندرێتەوە. (**فَلِذٰلِكَ**) هەر لەبەر ئەوەش مامۆستا (**قَيَّدَ الْوَصْفَ**) وەسفدارکردنی «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَة»ی تایبەت کرد و مەرجداری کرد (**بِـ «اِبْنٍ» بَيْنَ الْعَلَمَيْنِ**) بە وشەی «اِبْن» ئەگەر بکەوێتە نێوان دوو ناو، ئەو کاتە «مُنادَى»کە مەفتووح دەکرێت (**فَإِنَّ الْوَصْفَ بِغَيْرِ «اِبْنٍ»**) چونکە وەسفدارکردنی «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَة» بە وشەیەکی تر جگە لە وشەی «اِبْن» (**أَوْ**) یاخود (**بِـ «اِبْنٍ» غَيْرُ واقِعٍ بَيْنَ الْعَلَمَيْنِ**) وەسفدارکردنی «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَة» بە وشەی «اِبْن» کە نەکەوتبێتە نێوان دوو «عَلَمْ»، ئەم دوو بابەتە (**غَيْرُ كَثِيرٍ فِي كَلامِهِمْ**) گەلێک زۆر نین لە زمانی عەرەبیدا، بۆیە لەم دوو کاتەدا موناداکە «مَفْتُوحْ» ناکرێت.

ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: (**وَحُكْمُ «اِبْنَةٍ»**) حوکمی وشەی «ابنة» لە هەموو یاساکانی ڕابوردوو (**كَحُكْمِ «اِبْنٍ» فِي ذَلِكَ**) وەکوو وشەی «ابن»ـە لە هەموو بڕیارەکانی ڕابوردوو، واتە: ئەگەر وشەی «ابنة» کەوتە نێوان دوو «عَلَم» ئەوکاتە ئەم وشەیەی کە بووە بە «مُنادَى» مەفتووح دەکرێت (**نَحْوُ:**) وەکوو (**يا هِنْدَ اِبْنَةَ زَيْدٍ**) لەگەڵ ئەوەی دروستە

---

١. الفوائد و القواعد: (٤٥٠) وشرح كافية ابن الحاجب: (٣٣٧/١) شرح التسهيل: (١٣٠/١)

**وَ «يَا هِنْدُ ابْنَةَ أَخِي»، وَ «يَا امْرَأَةُ ابْنَةَ زَيْدٍ»، وَ «يَا امْرَأَةُ ابْنَةَ أَخِي».**

---

کە بە «مَضْمُوم»ـی بخوێندرێتەوە (وَ) هەروەها ئەگەر ئەو ئیسمەی کەوتۆتە دوای وشەی «ابنة» ناو نەبوو، وەکوو (**يا هِنْدُ اِبْنَةَ أَخِي**. وَ) هەروەها ئەگەر ئەو ئیسمەی کەوتۆتە پێش وشەی «ابنة» ناو نەبوو، وەکوو (**يَا اِمْرَأَةُ اِبْنَةَ زَيْدٍ**) هەروەها ئەگەر ئەو ئیسمەی کەوتۆتە دوای وشەی «ابنة» و پێش وشەی «ابنة» ناو نەبوو، وەکوو (**يا اِمْرَأَةُ اِبْنَةَ أَخِي**)، لەم سێ حاڵەتانەدا ئەم وشەیەی کە بووە بە «مُنادَى» بە «مَضموم»ـی دەخوێندرێتەوە.

**ئاگاداری:** هەرکاتێک وشەی «ابن» یاخود «ابنة» بوو بە «صِفَة» بۆ «**مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَة**» ئەوکاتە: «مُنادَى»کە «مَفْتُوح» دەکرێت بە چەند مەرجێک کە مامۆستا تەنها ئاماژەی بە یەک مەرجی یەکەم کردووە:

**یەکەم:** ئەگەر وشەی «ابن» یاخود «ابنة» کەوتە نێوان دوو «عَلَم» ئەوکاتە ئەم وشەیەی کە بووە بە «مُنادَى» مەفتووح دەکرێت: «يا زَيْدَ بْنَ عَمْرٍو».

**دووەم:** دەبێت ئەو وشەیەی بووە بە مونادا «مُفْرَد» بێت، نابێت «مُثَنَّى» یا خود «جَمْع» بێت، چونکە لەم کاتەدا موناداکە «مَضْمُومْ» دەبێت.

**سێیەم:** دەبێت ئەو وشەیەی دەبێت بە «مُنادَى» ئیعرابەکەی بە «حَرَکَة»ی «ظاهِرِي» بێت، چونکە ئەگەر وشەکە ئیعرابەکەی بە حەرەکەی «تَقْدِيرِي» بێت ـ وەکوو «يا مُوسَى» یاخود «يا لَيْلَى»ـ ئەو کاتە «مُنادَى»کە بە واجبی «مَضْمُومْ» دەبێت.

**چوارەم:** دەبێت وشەی «اِبْن» یاخود «اِبْنَة» ببنە «صِفَة»، چونکە ئەگەر ئەم دوو وشەیە ببنە «مَفْعُولُ بِهِ» یاخود ببنە «بَدَلْ» ئەو کاتە موناداکە بە واجبی «مَضْمُومْ» دەبێت.

**پێنجەم:** نابێت هیچ نێوانێک (فَصْل) هەبێت لە نێوان وشەی «اِبْن» و«اِبْنَة» لەگەڵ ئەو وشەیەی کە بووە بە «مُنادَى»، چونکە ئەگەر نێوانێک هەبوو ئەو کاتە «مُنادَى»کە مەفتووح نابێت.

**شەشەم:** دەبێ وشەی «ابن» یاخود «ابنة»، «مُفْرَدْ» بن، نابێت «مُثَنَّى» یا خود «جَمْع» بن، چونکە ئەو کاتە ئەو وشەیەی بووە بە «مُنادَى» مەفتووح نابێت[1].

---

١. بڕوانە: شرح الأنموذج في النحو: بعناية وتعليق: السيد مسلم بن السيد عبدالقادر القشمي. ل ٨٠.

**قَالَ: وَلَيْسَ فِي «يَا أَيُّهَا الرَّجُلُ» إِلَّا الرَّفْعُ.**

**أَقُولُ: لَمَّا ذَكَرَ جَوَازَ الرَّفْعِ وَالنَّصْبِ فِي صِفَةِ الْمُنَادَى الْمُفْرِدِ الْمَعْرِفَةِ إِذَا كَانَتْ مُفْرَدَةً، أَرادَ أَنْ يَذْكُرَ أَنَّ «أَيّاً» إِذَا وَقَعَ مُنَادًى يَكُونُ بِخِلَافِ ذٰلِكَ؛ فَإِنَّ صِفَتَهُ وَ إِنْ كَانَتْ مُفْرَدَةً لَا يَجُوزُ فِيهَا إِلَّا الرَّفْعُ فَلِذٰلِكَ قَالَ: "وَلَيْسَ فِي «يَا أَيُّهَا الرَّجُلُ» إِلَّا الرَّفْعُ"، يَعْنِي: فِي «الرَّجُلِ»،**

---

## وانەی سیوشەشەم: باسی وشەی «أَيُّ»

(**قالَ:**) مامۆستا «جار الله» زەمەخشـەری دەفەرمویت: (**وَلَيْسَ فِي يَا أَيُّها الرَّجُلُ إِلَّا الرَّفْعُ**) ئەگـەر وشـەی «أَيُّ» ببێتـە «مُنـادَى الْمُفْـرَدِ الْمَعْرِفَـة» سیفەتەکەی تەنها دروستە بە «مَرْفُوعٍ»ی بخوێندرێتەوە بە هیچ جۆرێک دروست نییە بە «مَنْصُوبِ»ی بخوێندرێتەوە.

(**أَقُولُ**) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرمویت: منیش دەڵێم: (**لَمَّا ذَكَرَ جَوازَ الرَّفْعِ وَالنَّصْبِ فِي صِفَةِ الْمُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَةِ**) پاش ئەوەی مامۆستا باسی ئەوەی کرد کە ئەم وشەیەی دەبێتە «صِفَةَ» بۆ«مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَة»ە دروستە هەم بە مەرفووعی هەم بە «مَنصوب»ـی بخوێندرێتەوە (**إذا كانَتْ مُفْرَدَةً**) ئەگەر بێت و سیفەتەکە تاک (مُفْرَدْ) بوو وەکوو «يا زَيْدُ الظَّرِيفُ وَالظَّرِيفَ»، (**أَرادَ أَنْ يَذْكُرَ**) ویستی باسی ئەوە بکات (**أَنَّ «أَيّاً» إذاَ وَقَعَ مُنادَى**) ئەگەر وشـەی «أَيُّ» بوو بـە «مُنـادَى الْمُفْـرَدِ الْمَعْرِفَـة» (**يَكُونُ بِخِلافِ ذَلِكَ**) یاساکەی پێچەوانـەی ئەم یاسایەی ڕابوردوو دەبێت، (**فَإِنَّ صِفَتَهُ**) چونکە «صِفَة»ی وشـەی «أَيُّ» (**وَ إِنْ كانَتْ مُفْرَدَةً**) هەرچەندە تاکیش بێت (**لا يَجُوزُ فِيهَا إِلَّا الرَّفْعُ**) تەنها دروستە بە مەرفووعی بخوێندرێتـەوە و بـە هیـچ جۆرێک دروسـت نییـە بە «مَنصوب»ـی بخوێندرێتـەوە (**فَلِذلِكَ قَالَ:**) هەر بۆیەش مامۆستا گوتی: (**وَلَيْسَ فِي يَا أَيُّها الرَّجُلُ إِلَّا الرَّفْعُ**) ئەگەر وشەی «أَيُّ» ببێتە «مُنادَى» سیفەتەکەی تەنها دروستە بە مەرفووعی بخوێندرێتەوە. (**يَعْنِي: فِي الرَّجُلِ**) مەبەستم وشەی «الرَّجُل»ـە؛ ئینجا ئەگەر قوتابی پرسیار بکات و بڵێت: هۆکارەکەی

**وَذٰلِكَ لِأَنَّ الْمَقْصُودَ بِالنِّدَاءِ هٰهُنَا هُوَ «الرَّجُلُ» إِلَّا أَنَّهُمْ لَمَّا كَرِهُوا الْجَمْعَ بَيْنَ حَرْفِ التَّعْرِيفِ ـأَعْنِي: اللَّامَـ وَحَرْفِ النِّدَاءِ فَأَتَوْا بِلَفْظَةِ «أَيِّ» لِتَفْصِلَ بَيْنَهُمَا، وَجَعَلُوهَا مُنَادًى ثُمَّ حَمَلُوا «الرَّجُلَ» عَلَيْهَا وَالْتَزَمُوا رَفْعَهُ لِيَدُلَّ عَلَىٰ أَنَّهُ هُوَ الْمَقْصُودُ بِالنِّدَاءِ.**

چییە؟ مامۆستا دەفەرموێت: **(وَذَلِكَ لأَنَّ الْمَقْصُودَ بِالنِّداءِ هَهُنا هُوَ الرَّجُلُ)** چونکە مەبەستی سەرەکی بانگکردن لەم نموونەیەدا بریتییە لە وشەی «الرَّجُل» نەک وشەی «أَيُّ» **(إِلَّا أَنَّهُمْ لَمَّا كَرِهُوا الْجَمْعَ بَيْنَ حَرْفَيِ التَّعْرِيفِ)** بەڵام چونکە زانایانی زانستی «نَحو» پێیان ناخۆش بوو کۆبوونەوە و ئیجتیماعی دوو ئامرازی ناساندن (أَداةُ التَّعْرِيفِ) بەیەکەوە **(أَعْنِي اللَّامَ وَحَرْفَ النِّداءِ)** مەبەستم پێی ئەلیف و لامە (أَلْ) لەگەڵ ئامرازی بانگکردن (یا) **(فَأَتَوْا بِلَفْظَةِ «أَيٍّ»)** ئەوان هاتن وشەی «أَيُّ»یان هێنا و دایان نا لە نێوان هەردوو ئامرازی «التَّعْرِيف» **(لِتَفْصِلَ بَيْنَهُما)** بۆ ئەوەی لەیەکیان جیا بکاتەوە **(وَجَعَلُوها مُنادَى)**[1] ئینجا وشەی «أَيُّ»یان کرد بە «مُنادَى» **(ثُمَّ حَمَلُوا الرَّجُلَ عَلَيْها)** پاشان وشەی «الرَّجُل»ـیان کرد بە «صِفَة» **(وَالْتَزَمُوا رَفْعَهُ)** وە بە واجبیشیان دانا کە دەبێت هەر بە مەرفووعی بخوێندرێتەوە **(لِيَدُلَّ عَلَى أَنَّهُ هُوَ الْمَقْصُودُ بِالنِّداءِ)** بۆ ئەوەی ئەم مەرفووعبوونە دەلالەت بکات لەسەر ئەوە کە مەبەستی سەرەکی لە بانگکردن لەم ڕستەیەدا بریتییە لە وشەی «الرَّجُل» نەک وشەی «أَيُّ».

**ئاگاداری، یەکەم:** ئەی قوتابی بەڕێز و فەقێی خۆشەویست بزانە: هەرکاتێک ویستت وشەیەک بکەیت بە «مُنادَى» کە ئەلیف و لامی لە سەرە وەکوو وشەی «الرَّجُلُ، اَلْعَباسُ، اَلْفاضِلُ» دوو ڕێگەت لە بەردەمە، **ڕێگای یەکەم:** یا دەبێت ئەلیف و لامەکە لە وشەکە بکەیتەوە ئینجا ئامرازی بانگکردنی بچێتە سەر وەکوو «یا عَباسُ، یا رَجُلُ، یا فَاضِلُ»؛ **ڕێگای دووەم:** یاخود دەبێت وشەی «أَيُّ» لە سەرەتای ڕستەکەدا واتە: لە پێش وشەکە زیاد بکەیت ئینجا ئامرازی بانگکردنی بچێتە سەر وەکوو «یا

---

١. وشەی «أَيُّ» تەنها لە «لَفظ»ـدا دەبێتە «مُنادَى» چونکە لە «مَعْنَى»دا وشەی «الرَّجُل» مەبەستە بە بانگکردن و ئاگادارکردنەوە. بڕوانە: شرح التسهيل: (١٣٠/١)

..................................................................................................................

أَيُّها الرَّجُلُ، يا أَيُّها اَلْعَباسُ، يا أَيُّها اَلْفاضِلُ» وشـەی «أَيُّ» تەنها لە «لَفْظ»ـدا دەبێتە «مُنـادَى»، چونکـە لـە «مَعْنَـى»دا وشـەی «اَلرَّجُلُ، اَلْعَبـاسُ، اَلْفاضِلُ»» مەبەستن بە بانگکردن، ئەوان مونادای «حَقِيقِي»ـنە.

دووەم: هەرکاتێک وشـەی «أَيُّ» بوو بە «مُنادَى» بۆ «مُفْرَد» و «مُثَنَّى» و «جَمْع» تەنهـا بـە سیغەی تـاک (مُفْـرَد) بـەکار دێت وەکـوو «يا أَيُّهـا الرَّجُـلُ» یاخـود وەکوو «يا أَيُّها الرَّجُلانِ» یاخود وەکوو «يا أَيُّها الرِّجالُ» یاخود وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْۚ﴾ [سورة الحج: ١] ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَـٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلْكَرِيمِ﴾ [سـورة الانفطـار: ٦] بـەڵام ئەگـەر بۆ ئافرەتـان بـەکار هات ئەو کاتـە دەبێتە «أَيَّتُهـا» وەکـوو «يَـا أَيَّتُهـا الْمَـرْأَةُ» ﴿يَـٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ﴾ [سـورة الفجـر: ٢٧] وشەی «هاء»ـیش ئامرازی ئاگادارکردنەوەیە (أَداةُ التَّنْبِيه).

سێیەم: هەروەها بزانە ئەم وشانەی کە پێیان دەگوترێت: «أَسْماءُ الإِشارَة» وەکوو «هـذا، هـذه، هـؤلاء» هەمان حوکمی وشـەی «أَيُّ»یان هەیە، وەکوو «يـا هذا الرَّجُلُ» و «يا هذا الرَّجُلانِ»[1].

* ◌ *

١. بۆ زیاتر ئاشـنابوون بەم بابەتانە تەماشـای ئەم سـەرچاوانە بکە: الفوائد والقواعد: (٤٥٠)وشرح كافية ابن الحاجب:(٣٣٧/١).

**قَالَ: وَقَدْ يُحْذَفُ حَرْفُ النِّدَاءِ عَنِ الْعَلَمِ الْمَضْمُومِ وَالْمُضَافِ كَقَوْلِهِ تَعالَى:** ﴿يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا﴾ **وَ** ﴿فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾.

**أَقُولُ: لَمَّا ذَكَرَ الْمُنَادَىٰ، أَرَادَ أَنْ يُشِيرَ إِلَىٰ جَوَازِ حَذْفِ حَرْفِ النِّدَاءِ، ثُمَّ مَثَّلَ بِمِثَالَيْنِ: الْمِثَالِ الْأَوَّلِ، قَوْلُهُ تَعَالَىٰ:**

## وانەی سی‌وحەوتەم: باسی «حَذْفُ حَرْفِ النِّداءِ»

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: **(وَقَدْ يُحْذَفُ حَرْفُ النِّداءِ عَنِ الْعَلَمِ)** هێندێک جار ئامرازی بانگکردن (حَرْفُ النِّداءِ) «حذف» دەکرێت، ئەمەش لە دوو شوێنانە: **یەکەم** (عَنِ الْعَلَمِ الْمَضْمُومِ) لە «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَة»، **دووەم** (وَالْمُضافِ) لە «مُنادَى مُضاف» (كَقَوْلِهِ تَعالَى:) وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (﴿يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا﴾)[1]، **سەرنج بدە:** لەم ئایەتەدا وشەی «يُوسُفُ» بووە بە «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَة»، بۆیە «حذف»ـی ئامرازی بانگکردنی لێ کراوە کە بریتییە لە حەرفی «يا»، ئەسڵی خۆی «يا يُوسُفُ» بووە، (وَ) هەروەها وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: (﴿فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾)[2]، **سەرنج بدە:** لەم ئایەتەدا وشەی «فَاطِرَ» «مُنادَى المُضاف»ـە و «حذف»ـی ئامرازی بانگکردنی لێ کراوە کە بریتییە لە حەرفی «يا»، ئەسڵی خۆی «يا فَاطِرَ» بووە.

(أَقُولُ) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(لَمَّا ذَكَرَ الْمُنادَى وَأَحْكامَهُ)** پاش ئەوەی مامۆستا بە درێژی باسی «مُنادَى»ی کرد و ئەحکامەکانی ڕوون کردنەوە **(أَرادَ أَنْ يُشِيرَ إِلَى جَوازِ حَذْفِ حَرْفِ النِّداءِ)** ویستی ئاماژە بە بابەتێکی‌تر بدات کە بریتییە لەوەی کە دروستە لە دوو شوێنان «حذف»ـی ئامرازی بانگکردن (حَرْفُ النِّداء) بکرێت.

**(فَمَثَّلَ بِمِثالَيْنِ:)** ئینجا مامۆستا دوو نموونەی هێنایەوە: **(الْمِثالِ الأَوَّلِ)** نموونەی یەکەم بۆ «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَة» کە بریتییە لە **(قَوْلُهُ تَعالَى:)** لەم فەرمایشتەی خوای

---

[1]. سورة يوسف: الأية، (٢٩)
[2]. سورة يوسف: الأية، (١١٠)

﴿يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا﴾. **وَالْمِثَالِ الثَّانِي، قَوْلُهُ تَعَالَىٰ:** ﴿فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾. **أَيْ: «يَا يُوسُفُ»، وَ «يَا فَاطِرَ السَّمَوَاتِ». وَإِنَّمَا جَازَ الْحَذْفُ مِنْهُمَا؛ لِأَنَّ الْعَلَمَ الْمَضْمُومَ كَثِيرُ الاِسْتِعْمَالِ، وَالْمُضَافَ قَدْ طَالَ بِالْإِضَافَةِ، فَيُنَاسِبُهُمَا التَّخْفِيفُ.**

**وَقَدْ يُحْذَفُ أَيْضاً مِنْ «أَيٍّ» وَ «مَنْ»، كَقَوْلِ الْخَطِيبِ:**

---

گەورە کە دەفەرموێت:(﴿يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا﴾)[1] **سەرنج بدە:** لەم ئایەتەدا وشەی «يُوسُفُ» «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَة»یە و «حذف»ـی ئامرازی بانگکردنی لێ کراوە کە بریتییە لە حەرفی «یا»، ئەسڵی خۆی «يا يُوسُفُ» بووە.

**(وَالْمِثَالِ الثَّانِي)** نموونەی دووەم بۆ «مُنادَى المُضاف»ـە کە بریتییە لە **(قَوْلُهُ تعالى)** لەم فەرمایشتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت:(﴿فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾)[2] **سەرنج بدە:** لەم ئایەتەدا وشەی «فَاطِرَ» «مُنادَى المُضاف»ـە و «حذف»ـی ئامرازی بانگکردنی لێ کراوە کە بریتییە لە حەرفی «یا»**(أَيْ:)** واتە: ئەسڵی نموونەی دووەم **(يا فَاطِرَ السَّمواتِ)** بووە،(وَ) ئەسڵی نموونەی یەکەم**(يا يُوسُفُ)** بووە. ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت:**(وَإِنَّمَا جَازَ الْحَذْفُ مِنْهُمَا)** بۆچی دروستە لە «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَة» و لە «مُنادَى المُضاف» «حذف»ـی ئامرازی بانگکردن بکرێت؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: **(لأَنَّ الْعَلَمَ الْمَضْمُومَ)** چونکە «مُنادَى الْمُفْرَدِ الْمَعْرِفَة»**(كَثِيرُ الاِسْتِعْمالِ)** زۆر بەکار دێت لە کاتی قسەکردندا**(وَالْمُضافُ)** هەروەها «مُنادَى المُضاف»**(قَدْ طَالَ بِالإِضافَةِ)** بەهۆی «إضافة»کردنەوە درێژ بۆتەوە **(فَيُناسِبُهُمَا التَّخْفِيفُ)** کەواتە: هەردووکیان گونجاو بوون بۆ ئەوەی سووک بکرێن.

**(وَقَدْ يُحْذَفُ أَيْضاً)** هەروەها هێندێک جار «حذف»ی ئامرازی بانگکردن (حَرْفُ النِّداءِ) دەکرێت لە دوو شوێنی‌تریش، شوێنی یەکەم:**(مِنْ أَيٍّ)** لە وشەی «أَيُّ»، شوێنی دووەم: لە وشەی «مَنْ»، نموونەی یەکەم**(كَقَوْلِ الْخَطِيبِ:)** وەکوو ئەم

---

١. سورة يوسف: الأية، (٢٩)
٢. سورة يوسف: الأية، (١١٠)

**«أَيُّهَا النَّاسُ»، وَقَوْلِ الْعُبَّادِ: «مَنْ لَايَزَالُ مُحْسِناً أَحْسِنْ إِلَيَّ»، وَالتَّقْدِيرُ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ»، وَ «يَا مَنْ لَا يَزَالُ». وَالْمُرَادُ بِـ «مَنْ» هُوَ: اللَّهُ تَعَالَىٰ.**

---

برگەیەی کە وتاربێژ دەڵێت: **(أَيُّهَا النَّاسُ. وَ)** نموونەی دووەم وەکوو **(قَوْلِ الْعُبَّادِ)**[1]، ئەم دوعایەی کە بەندەی خواناس لە کاتی پاڕانەوەدا دەڵێت: **(مَنْ لا يَزالُ مُحْسِناً أَحْسِنْ إِلَيَّ)** واتە: ئەی ئەو زاتەی کە بەردوام چاکە لەگەڵ بەندەکانتدا دەکەیت و چاکەکار و میهرەبان بە لەگەڵ مندا **(وَالتَّقْدِيرُ)** ئەم دوو ڕستەیە لە «تَقْدِير»دا بەم شێوەیەن: ڕستەی یەکەم **(يَا أَيُّها النَاسُ)** ڕستەی دووەم **(يَا مَنْ لا يَزالُ)** واتە: هەردوو ڕستەکان لە ئەسڵدا ئامرازی بانگکردنیان لەسەر بووە، ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: **(وَالْمُرادُ بِمَنْ: هُوَ اللَّهُ تَعالَى)** مەبەست بە وشەی «مَنْ» لەم ڕستەیەدا خوای پەروەردگارە.

**ئاگاداری:** ئینجا بزانە لە چەند شوێنێک دروست نییە «حذف»ـی ئامرازی بانگکردن (حَرْفُ النِّداءِ) بکرێت، **یەکەم:** لە «مُنادَى الْمُسْتَغاث» وەکوو «يَا لَزَيْدٍ»، **دووەم:** لە «مُنادَى الْمُتَعَجَّبُ مِنْهُ» وەکوو: «يا للماء»، **سێیەم:** وشەی پیرۆزی «اَللّٰه» وەکوو «يا اللّٰه»، بەڵام ئەگەر بێت و لە کۆتاییدا میمێکی لەجیاتی دابندرێت، دروستە «حذف»ـی ئامرازی بانگکردن بکرێت وەکوو «اَللّٰهُمّ»، **چوارەم:** لە «مُنادَى الْمَنْدُوب» وەکوو: «وا إِسْلاماه» یاخود وەکوو «وا مُحَمَّدَاهُ»[2].

* ◌ *

---

١. وشەی «العُبّاد» جەمعی وەشەی «عَابِد»ە، بەم کەسانە دەگوترێت کە زۆر ملکەچی دەنوێنن لەکاتی خواپەرستیدا، هەروەها دروستە بە «العِباد» بخوێندرێتەوە، بەبێ شەددە، ئەوکاتە دەبێتە جەمعی «عَبْد»، بەڵام بۆچوونی یەکەم گونجاوترە. داغستانی: ١٥٢.

٢. بڕوانە: شرح كافية ابن الحاجب الكوردي: (٣٨٨/١). (والإنصاف في مسائل الخلاف: (٣١٢/١).

**قَالَ: وَمِنْ خَصَائِصِ الْمُنَادَىٰ، التَّرْخِيمُ إِذَا كَانَ عَلَماً غَيْرَ مُضَافٍ وَزَائِداً عَلَىٰ ثَلَاثَةِ أَحْرُفٍ، نَحْوُ: «يَا حَارِ» وَ «يَا أَسْمُ» وَ «يَا عُثْمُ» وَ «يَا مَنْصُ».**

**أَقُولُ: لَمَّا ذَكَرَ الْمُنَادَىٰ، أَرادَ أَنْ يَذْكُرَ بَعْضَ خَصَائِصِهِ، وَمِنْهَا التَّرْخِيمُ،**

## وانەی سیوهەشتەم: باسی «تَرْخِيمُ الْمُنادَى» و مەرجەکانی

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: **(وَمِنْ خَصائِصِ الْمُنادَى)** یەکێکی‌تر لە تایبەتمەندییەکانی «مُنـادَى» بریتییـە لـە سووککردن **(التَّرْخِيمُ)** کـە بریتییـە لـە لابردنـی چەنـد حەرفێـک لـە کۆتایـی ئـەم وشـەیەی کە بـووە بـە «مُنادَى» بەمەبەستی سووککردن کـە پێـی دەگوترێت: «التَّرْخِيـم»، بـەڵام بـەم مەرجانـەی خوارەوە: **مەرجی یەکەم: (إِذَا كانَ عَلَماً)** دەبێت ئەو ئیسمەی دەبێت بە «مُنادَى» ناو (عَلَمْ) بێت، **مەرجی دووەم: (غَيْرَ مُضافٍ)** نابێت ئیسـمەکە «مُنادَى المُضافُ» بێت، هەروەها نابێت «مُنادَى شِـبْهُ الْمُضاف» بێت، **(وَ) مەرجی سێیەم: (زائِداً عَلَى ثَلاثَةِ أَحْرُفٍ)** دەبێـت ئـەو ئیسـمەی دەبێتـە «مُنـادَى» لـە سـێ حەرفـان زیاتر بێـت، **(نَحْوُ)** وەکـوو ئـەم نموونانـە: **(يا حَارُ)** کـە لە ئەسـڵدا «یـا حارِثُ» بـووە، **(وَ)** هەروەها وەکوو **(يا أَسْمَ)** کە لە ئەسڵدا «يا أَسْمَاءُ» بووە، **(وَ)** هەروەها وەکوو **(يا عُثْمَ)** کە لە ئەسڵدا «يا عُثْمانُ» بووە، **(وَ)** هەروەها وەکوو **(يا مَنْصُ)** کە لە ئەسڵدا «يا مَنْصُورُ» بووە[١].

**(أَقُولُ)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلـی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(لَمّا ذَكَرَ الْمُنادَى)** پـاش ئـەوەی مامۆسـتا باسـی هەمـوو جۆرەکانـی «مُنـادَى»ی کـرد **(أَرادَ أَنْ يَذْكُرَ بَعْضَ خَصَائِصِهِ)** ئـەم جـارە دەیەوێـت باسـی هێندێـک لـە تایبەتمەندییەکانـی «مُنادَى» بکات و ڕوونیان بکاتەوە بۆیە دەفەرموێت:

### پێناسەی «اَلتَّرْخِيمُ»

**(وَمِنْهَا)** یەکێـک لـە تایبەتمەندییەکانـی «مُنـادَى» بریتییـە لـە **(التَّرْخِيم)** کـە لـە ڕووی زمانەوانییـەوە بـە مانـای سووککردن و ئاسـانکردن (التَّخْفِيـفُ، وَالتَّسْـهِيل)[٢]

١. بڕوانە: الفوائد و القواعد: (٤٥٥)

٢. بڕوانە: القاموس المحيط: (٦٢٦).

**وَهُوَ: حَذْفٌ فِي آخِرِ الْمُنَادَىٰ لِلتَّخْفِيفِ. وَالْمُنَادَىٰ إِنَّمَا يُرَخَّمُ إِذَا كَانَ عَلَماً؛ لِأَنَّهُ لَوْ لَمْ يَكُنْ عَلَماً لَمْ يُعْلَمْ أَنَّهُ حُذِفَ مِنْهُ شَيْءٌ أَوْ لَا.**

**وَيُشْتَرَطُ أَنْ يَكُونَ غَيْرَ مُضَافٍ؛ لِأَنَّهُ لَوْ كَانَ مُضَافاً فَإِمَّا أَنْ يُحْذَفَ فِيهِ مِنْ آخِرِ الْمُضَافِ**

---

دێت هەروەها لە ڕووی «اِصْطِلاح»ـیشەوە مامۆستا دەفەرموێت: **(وَهُوَ حَذْفٌ فِي آخِرِ الْمُنادَى لِلتَّخْفِيفِ)** بریتییە لە لابردن و «حَذْف»ی حەرفێک یاخود چەند حەرفێک لە کۆتایی ئەم وشەیەی کە بووە بە «مُنادَى» بەمەبەستی سووککردن و ئاسان خوێندنەوە.

## باسی مەرجەکانی تەرخیمکردنی «مُنادَى»

**(وَالْمُنادَى إِنَّمَا يُرَخَّمُ)** ئەو ئیسمەی دەبێت بە «مُنادَى» بەم مەرجانەی خوارەوە نەبێت «تَرْخِيم» ناکرێت:

**مەرجی یەکەم: (إِذَا كانَ عَلَماً)** دەبێت ئەو ئیسمەی دەبێتە «مُنادَى» ناو (عَلَمْ) بێت **(لأَنَّهُ لَوْ لَمْ يَكُنْ عَلَماً)** چونکە ئەگەر ئەو ئیسمەی دەبێتە «مُنادَى» ناو نەبێت **(لَمْ يُعْلَمْ أَنَّهُ حُذِفَ مِنْهُ شَيْءٌ، أَمْ لا)** بە هیچ جۆرێک نازاندرێت ئایا هیچ حەرفێکی لێ «حذف» کراوە یاخود نا، چونکە ئەگەر وشەکە «عَلَمْ» بوو بە هۆی مەشهوورییەوە دەزاندرێت کە کامە حەرفەی لێ «حذف» کراوە، هەروەها پێویستە ناوەکە تاکیش بێت، چونکە ئەگەر ناوەکە «مُرَكَّبْ»[1] بوو، ئەوە دروست نییە «تَرْخِيم» بکرێت.

**مەرجی دووەم: (وَ)** وە هەروەها **(يُشْتَرَطُ أَنْ يَكُونَ غَيْرَ مُضافٍ)**[2] بە مەرج داندراوە کە نابێت ئیسمەکە «مُنادَى الْمُضاف» یاخود مونادای «شِبْهُ الْمُضاف» بێت **(لأَنَّهُ لَوْ كَانَ مُضافاً)** چونکە ئەگەر بێت و ئەو ئیسمەی کە بۆتە «مُنادَى» «إضافة» کراو بوو، لەم دوو حاڵەتە بەدەر نییە: حاڵەتی یەکەم **(فَإِمّا أَنْ يُحْذَفَ فِيهِ مِنْ آخِرِ الْمُضافِ)**

---

١. بڕوانە: شرح كافية ابن الحاجب الكوردي: (٣٦٤/١)

٢. جگە لەم هۆکارەی کە مامۆستا ئاماژەی بۆ دەکات ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: بۆچی «مُنادَى المُضاف» تەرخیم ناکرێت، لە وەڵامدا دەڵێین: چونکە تەرخیم تایبەتە بە مونادای «مَبْنِي»، «مُنادَى المُضاف»ـیش «مُعْرَب»ـە بۆیە تەرخیم ناکرێت.

**أَوْ مِنْ آخِرِ الْمُضَافِ إِلَيْهِ. وَالْأَوَّلُ بَاطِلٌ؛ لِأَنَّ تَمَامَ الْمُضَافِ بِالْمُضَافِ إِلَيْهِ، فَهُوَ كَالْوَسَطِ، وَالثَّانِي كَذٰلِكَ لِأَنَّهُ لَيْسَ بِآخِرِ الْمُنَادَىٰ.**

**وَيُشْتَرَطُ أَيْضاً أَنْ يَكُونَ زَائِداً عَلَىٰ ثَلَاثَةِ أَحْرُفٍ، لِأَنَّ الثُّلَاثِيَّ لَوْ رُخِّمَ بَقِيَ عَلَىٰ حَرْفَيْنِ، وَذٰلِكَ غَيْرُ جَائِزٍ.**

**وَمِثَالُهُ: يَا «حَارِ» فِي «يَا حَارِثُ»، وَ «يَا أَسْمُ» فِي «يَا أَسْمَاءُ»، وَ**

---

یاخود دەبێت «حذف»ـەکە لە کۆتایی ئەو وشەیە بکرێت کە بۆتە «مُضاف»، حاڵەتی دووەم (**أَوْ**) یاخود دەبێت «حذف»ـەکە (**مِنْ آخِرِ الْمُضافِ إِلَيْهِ**) لە کۆتایی ئەو وشەیە بکرێت کە بۆتە «مُضاف إِلَيْهِ».(**وَالْأَوَّلُ بَاطِلٌ**) حاڵەتی یەکەم دروست نییە و بەتاڵە، لەبەر چی؟(**لأَنَّ تَمامَ الْمُضافِ بِالْمُضافِ إِلَيْهِ**) چونکە «مُضاف» بە «مُضاف إِلَيْهِ» تەواو دەبێت و هەردووکیان بە یەک وشە هەژمار دەکرێن (**فَهُوَ كَالْوَسَطِ**) کەواتە: کۆتایی «مُضاف» وەکوو ناوەندی وشەکە وایە، تەرخیم و «حذف»ـکردنیش لە ناوەندی وشەکە دروست نییە و نابێت.(**وَالثَّانِي كَذٰلِكَ**) حاڵەتی دووەمیش بە هەمان شێوە دروست نییە و بەتاڵە، لەبەر چی؟(**لأَنَّهُ لَيْسَ بآخِرِ الْمُنادَى**)[1] چونکە کۆتایی «مُضافُ إِلَيْهِ» بە کۆتایی «مُنادَى» هەژمار ناکرێت، «تَرْخِيم»ـیش تەنها لە کۆتایی «مُنادَى» دەکرێت، بۆیە ئەگەر موناداکە «مُضاف» یاخود «شِبْهُ الْمُضاف» بوو ئەوە دروست نییە تەرخیم بکرێت.

مەرجی سێیەم:(**وَ**) هەروەها(**يُشْتَرَطُ أَيْضاً**) بە مەرج داندراوە کە دەبێت(**أَنْ يَكُونَ زائِداً عَلَى ثَلاثَةِ أَحْرُفٍ**) ئەو ئیسمەی دەبێتە «مُنادَى» لە سێ حەرفان زیاتر بێت،(**لأَنَّ الثُّلاثِيَّ**) چونکە ئیسمی سێ حەرفی(**لَوْ رُخِّمَ**) ئەگەر «تَرْخِيم» بکرێت (**بَقِيَ عَلَى حَرْفَيْنِ**) لەسەر دوو حەرفان دەمێنێتەوە، (**وَذٰلِكَ غَيْرُ جائِزٍ**) ئەمەش دروست نییە، چونکە ئەسڵ وایە کە «اِسْم» لەسەر سێ حەرفان «بِناء» بکرێت. (**وَمِثالُهُ:**) نموونانەکانیش وەکوو(**يا حَارِ**) کە(**فِي**) لە ئەسڵدا (**يا حارِثُ**) بووە،(**وَ**) هەروەها وەکوو(**يا أَسْمَ،**) کە(**فِي**) لە ئەسڵدا(**يا أَسْمَاءُ**) بووە،(**وَ**) هەروەها وەکوو

---

١. بڕوانە: شرح المفصل: (٣٧٥/١) وشرح كافية ابن الحاجب الكوردي: (٣٦٤/١).

**«يَا عُثْمُ» فِي «يَا عُثْمَانُ»، وَ «يَا مَنْصُ» فِي «يَا مَنْصُورُ».**

**وَاعْلَمْ أَنَّ الْعَلَمِيَّةَ وَالزِّيَادَةَ عَلَىٰ ثَلَاثَةِ أَحْرُفٍ إِنَّمَا يَشْتَرِطَانِ فِي الْمُنَادَىٰ الَّذِي لَا يَكُونُ فِيهِ تَاءُ التَّأْنِيث. وَأَمَّا إِذَا كَانَ فِيهِ تَاءُ التَّأْنِيث فَيَجُوزُ تَرْخِيمُهُ وَ إِنْ لَمْ يَكُنْ عَلَماً، وَلَا زَائِداً عَلَىٰ ثَلَاثَةِ أَحْرُفٍ، نَحْوُ: «يَا عَاذِلُ» وَ «يَا ثُبُ» فِي: «يَا عَاذِلَةُ» وَ «يَا ثُبَةُ». وَ إِنَّمَا مَثَّلَ بِمِثَالَيْنِ، لِأَنَّ أَحَدَهُمَا غَيْرُ عَلَمٍ؛ إِلَّا أَنَّهُ زَائِدٌ عَلَىٰ ثَلَاثَةِ أَحْرُفٍ، وَالْآخَرُ**

---

**(يا عُثْمَ)** کە **(فِي)** لە ئەسڵدا **(يا عُثْمانُ)** بووە، **(وَ)** هەروەها وەکوو **(يا مَنْصَ)** کە **(فِي)** لە ئەسڵدا **(يا مَنْصُورُ)** بووە.

**(وَاعْلَمْ)** ئینجا بزانە ئەی قوتابی خۆشەویست: **(أَنَّ الْعَلَمِيَّةَ وَالزِّيادَةَ عَلَى ثَلاثَةِ أَحْرُفٍ)** مەرجی یەکەم و دووەم کە بریتی بوون لە «عَلَمِيَّة» و زیادبوون لەسەر سێ حەرفان **(إِنَّمَا يُشْتَرَطانِ)** بە مەرج دانەندراون بۆ تەرخیمکردن تەنها **(فِي الْمُنادَى الّذِي لا يَكُونُ فِيهِ تَاءُ التَّأْنِيث)** لەم «مُنادَى»یە نەبێت کە نیشانەی ڕەگەزی مێینەی (تَاءُ التَّأْنِيث)ی پێوە نییە **(وَأَمَّا إِنْ كانَ فِيهِ تَاءُ التَّأْنِيث)** بەڵام ئەگەر بێت و ئەو ئیسمەی بووە بە «مُنادَى» نیشانەی «التَّأْنِيث»ی پێوە بوو **(فَيَجُوزُ تَرْخِيمُهُ)** ئەو کاتە دروستە تەرخیم بکرێت **(وَ إِنْ لَمْ يَكُنْ عَلَماً)** هەرچەندە «مُنادَى»کە ناویش نەبێت **(وَلا زَائِداً عَلَى ثَلاثَةِ أَحْرُفٍ)** هەروەها لە سێ حەرفان زیاتریش نەبێت، چونکە نیشانەی «تَاءُ التَّأْنِيث» بە تەنها وەکوو وشەیەکی سەربەخۆ هەژمار دەکرێت[1] **(نَحْوُ)** وەکوو **(يا عَاذِلُ)** هەروەها وەکوو **(يَا ثُبَ)** **(فِي (يا عَاذِلَةُ)، وَ (يَا ثُبَةُ)**.

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: **(وَ إِنَّمَا مَثَّلَ بِمِثالَيْنِ)** بۆچی مامۆستا دوو نموونەی هێنانەوە **(لأَنَّ أَحَدَهُما غَيْرُ عَلَمٍ)** چونکە نموونەی یەکەم مەرجی یەکەمی لێ نەهاتۆتە جێ، چونکە «عَلَمْ» نییە **(إِلَّا أَنَّهُ زائِدٌ عَلَى ثَلاثَةِ أَحْرُفٍ)** بەڵام لە سێ حەرفان زیاترە **(وَالآخَرُ)** هەروەها نموونەی دووەم هیچ مەرجی لێ نەهاتۆتە

---

١. «لأَنَّ تاءَ التَّأْنِيث بِمَنْزِلَةِ اسْمٍ ضَمَّ إِلَى اسْمٍ وَلَيْسَتْ مِنْ بِناءِ الِاسْمِ، فَيَجُوزُ حَذْفُها كَمَا يُحْذَفُ الِاسْمُ الأَخِيرُ مِنْ بَعْلَبَكّ». بڕوانە: أسرار العربية: (٢١٥).

**غَيْرُ عَلَمٍ وَغَيْرُ زَائِدٍ عَلَىٰ ثَلَاثَةِ أَحْرُفٍ، فَإِنَّ «الثُّبَةَ» فِي اللُّغَةِ: الْجَمَاعَةُ، فَيُقَالُ: «يَا ثُبَةُ! أَقْبِلْ» بِاعْتِبَارِ الْقَوْمِ، وَ «أَقْبِلِي» بِاعْتِبَارِ الْجَمَاعَةِ. وَيُعْلَمُ مِنْ قَوْلِهِ: «غَيْرَ مُضَافٍ»، أَنَّ الْمُرَكَّبَ الْغَيْرَ الْإِضَافِيَّ قَدْ يُرَخَّمُ، وَيُقَالُ: «يَا بَعْلُ» فِي «بَعْلَبَكَّ».**

**وَلَا يُرَخَّمُ الْمُسْتَغَاثُ؛ لِأَنَّ تَطْوِيلَ الصَّوْتِ فِيهِ مَطْلُوبٌ، وَالْحَذْفَ يُنَافِيهِ.**

---

جێ، چونکە (غَيْرُ عَلَمٍ) نە «عَلَم»ـە، (وَغَيْرُ زائِدٍ عَلَى ثَلاثَةِ أَحْرُفٍ) هەروەها نە لە سێ حەرفان زیاترە. (فَإِنَّ الثُّبَةَ فِي اللغَةِ: اَلْجَماعَةُ.)[1] چونکە وشەی «ثُبَة» لە ڕووی زمانەوانییەوە بە مانای دەستە و کۆمەڵ دەهێت (فَيُقالُ:) کەواتە: هێندێک جار دەگوترێت: (يا ثُبَةُ أَقْبِلْ) واتە: ئەی خەڵکینە ڕوو بکەنە ئێرە، بە سیغەی «مُذَكّر» دەگوترێت (بِإِعْتبارِ الْقَوْمِ) بە ئیعتیباری ئەوەی کە وشەی «ثُبَة» بە مانای «قَوْم» دێت؛ (وَ) هەروەها هێندێک جار دەگوترێت: (يا ثُبَةُ أَقْبِلي) بە سیغەی «مُؤَنَّث» (بِإِعْتِبارِ الْجَماعَةِ) بە ئیعتیباری ئەوەی کە وشەی «ثُبَة» بە مانای «جماعة» دێت.

ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: (وَيُعْلَمُ مِنْ قَوْلِهِ:) لەم قسەیەی مامۆستا دەزاندرێت کە فەرمووی مەرجی ئەو ئیسمەی کە ترخیم دەکرێت ئەوەیە (غَيْرُ مُضافٍ) کە نابێت «إضافة»کراو بێت (أَنَّ الْمُرَكَّبَ الْغَيْرَ الإضافِيَّ) کە ئەگەر ناو ئیسمێکی لێکدراو بوو بە «مُنادَى» بەڵام بەو مەرجەی کە مورەککەبێکی «إِضافِي» نەبوو، ئەوە (قَدْ يُرَخَّمُ) تەرخیم دەکرێت (وَيُقالُ) کەواتە دەگوترێت: (يا بَعْلُ)، سەرنج بدە: ئەم وشەیە تەرخیم کراوە (فِي) لە ئەسڵدا (يَا بَعْلَبَكّ) بوو کە ناوی شارێکە لە وڵاتی شام، چونکە «مُرَكّب»ـێکی غەیرە «إِضافِي»ـیە بۆیە دروستە تەرخیم بکرێت.

مەرجی چوارەم: (وَلَا يُرَخَّمُ الْمُسْتَغاثُ) نابێت ئەو ناوەی کە تەرخیم دەکرێت مونادای «مُسْتَغاث» بێت (لأَنَّ تَطْويلَ الصَّوْتِ فِيهِ مَطْلوبٌ) چونکە درێژکردنەوەی دەنگ لە مونادای «مُسْتَغاث» ئامانجێکی سەرەکییە (وَالْحَذْفُ يُنافِيهِ) وە تەرخیمکردنیش پێچەوانەی دەنگ درێژکردنەوەیە، کەواتە: نابێت «مُنادَى»ی «مُسْتَغاث» تەرخیم بکرێت.

---

[1] بڕوانە: لسان العرب: (٦٥٥/١).

..........................................................................................

**ئاگاداری؛ یەکەم:** بابەتی تەرخیمکردنی «اَلْمُنادَی الْمُرَكَّب» بابەتێکە ڕاجیایی لە سەرە لە نێوان زانایانی زانستی «نَحْو»، بەم شێوەیە: جمهووری زانایانی «نَحْو» دەفەرموون: «اَلْمُرَكَّبُ الْمَزْجِي» تەرخیم دەکرێت ئەگەر کۆتایی بە وشەی «وَيْه» نەهاتبوو، وەکوو «بَعْلَبَكّ» و «حَضْرَمَوْت»، بۆیە لە کاتی تەرخیمکردن دەڵێیت «یا بَعْلَ، یا حَضْرَ»، بەڵام ئەگەر کۆتایی بە وشەی «وَيْه» هاتبوو وەکوو وشەی «سِيبَوَيْهِ، خَالَوَيْهِ» زانایانی «کوفي» دەفەرموون: دروست نییە تەرخیم بکرێت، بەڵام زانایانی «بَصْرِي» دەفەرموون: دروستە، بۆیە لە کاتی تەرخیمکردنی «سِيبَوَيْهِ، خَالَوَيْهِ» دەگوترێت: «یا خالَ، یا سَيْبَ».

هەروەها سەبارەت بە تەرخیمکردنی «اَلْمُرَكَّب الْعَدَدِي» زاناکانی «بَصْرِي» دەفەرموون: تەرخیم دەکرێت، بۆیە لە کاتی تەرخیمکردنی «خَمْسَةَ عَشَرَ...» دەگوترێت: «یا خَمْسَةَ»[1]، هەروەک گوتمان «اَلْمُرَكَّبُ الإِضافِيُّ» تەرخیم ناکرێت.

**دووەم:** سەبارت بەو ئیسمەی کە تەرخیم دەکرێت لە پاش «حذف»ـکردنی حەرفەکە یاخود وشەی کۆتایی، دوو حاڵەتی هەیە، **حاڵەتی یەکەم:** دەتوانیت بە هەمان حەرەکەی خۆی بیخوێنیتەوە کە هەیەتی لە دوای «حذف»ـکردن، وەکوو «یا حَارِ، يَا جَعْفَ، یا مَنْصُ» ئەمەیان ڕاستتر و مەشهوورترە لە نێو زمانی عەرەبیدا، **حاڵەتی دووەم:** دەتوانیت بە حەرەکەی ئەو حەرفە بیخوێنیتەوە کە «حذف» کراوە «یا حَارُ، يَا جَعْفُ، یا مَنْصُ»[2]...

*ꙮ*

---

١. بڕوانە: الكتاب: (٢٧٨/١) وشرح كافية ابن الحاجب الكوردي: (٣٦٤/١).

٢. بڕوانە: الفوائد والقواعد، (٢٧٢) و شرح المفصل: (٣٧٥/١).

# الْمَفْعُولُ فِيهِ

**قَالَ: وَالْمَفْعُولُ فِيهِ، وَهُوَ ظَرْفَانِ: ظَرْفُ الزَّمانِ وَ ظَرْفُ الْمَكانِ، وَكُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مُبْهَمٌ وَ مُعَيَّنٌ؛ فَالزَّمَانُ يُنْصَبُ كُلُّهُ، نَحْوُ: «أَتَيْتُهُ الْيَوْمَ وَبُكْرَةً وَذَاتَ لَيْلَةٍ»، وَالْمَكَانُ لَا يُنْصَبُ مِنْهُ إِلَّا الْمُبْهَمُ، نَحْوُ:**

## وانەی سیونۆهەم: باسی «اَلْمَفْعُولُ فِيهِ»

**(قالَ:)** مامۆستا «جار اللّٰه» زەمەخشەری دەفەرمویت: **(وَ)** یەکێکیتر لەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوب» دەبێت **(الْمَفْعُولُ فِيهِ)** بریتییە لە «مَفْعُولُ فِيهِ» **(وَهُوَ ظَرْفانِ)** کە بریتییە لە دوو «ظَرْف»: **یەکەم** پێی دەگوترێت: **(ظَرْفُ الزَّمانِ)** کە هەموو ئەو وشانە دەگرێتەوە کە دەلالەت لەسەر کات و زەمان دەکەن؛ **(وَ) دووەم** پێی دەگوترێت: **(ظَرْفُ الْمَكانِ)** کە هەموو ئەو وشانە دەگرێتەوە کە دەلالەت لەسەر شوێن و مکان دەکەن، **(وَكُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا)** هەریەکە لە «ظَرْفُ الزَّمان» و «ظَرْفُ الْمَكان» دوو جۆری هەیە: **جۆری یەکەم** پێی دەگوترێت: **(مُبْهَمٌ)** کە هەموو ئەو وشانە دەگرێتەوە کە دەلالەت لەسەر «زَمان» و «مَكان»ـێکی نادیار دەکەن؛ **(وَ) جۆری دووەم** پێی دەگوترێت: **(مُعَيَّنٌ)** کە هەموو ئەو وشانە دەگرێتەوە کە دەلالەت لەسەر «زَمان» و «مَكان»ـێکی دیاریکراو دەکەن.

**(فَالزَّمانُ يُنْصَبُ كُلُّهُ)** ئینجا مامۆستا دەفەرمویت: «ظَرْفُ الزَّمانِ» بە هەردوو بەشەکەیەوە «مَنْصُوبْ» دەبێت **(نَحْوُ:)** وەکوو **(أَتَيْتُهُ الْيَوْمَ)**، **سەرنج بدە:** وشەی «اَلْيَوْمَ» پێی دەگوترێت: «ظَرْفُ الزَّمانِ الْمُعَيَّنِ» لە هەمان کاتدا «مَنْصُوبْ» بووە و بۆتە «مَفْعُولُ فِيهِ»، **(وَبُكْرَةً وَذاتَ لَيْلَةٍ)** هەروەها هەردوو وشەی «بُكْرَةً» و «ذاتَ لَيْلَةٍ» پێیان دەگوترێت: «ظَرْفُ الزَّمانِ الْمُبْهَمُ» لە هەمان کاتدا «مَنْصُوبْ» بوونە و بوونەتە «مَفْعُولُ فِيهِ».

**(وَالْمَكانُ لا يُنْصَبُ مِنْهُ إِلَا الْمُبْهَمُ)** بەڵام «ظَرْفُ الْمَكانِ» بە هەردوو بەشەکەیەوە «مَنْصُوبْ» نابێت، بەڵکوو تەنها بەشە موبهەمەکەی «مَنْصُوبْ» دەبێت **(نَحْوُ:)** وەکوو

**«قُمْتُ أَمَامَكَ»، وَلَابُدَّ لِلْمَحْدُودِ مِن «فِي»، نَحْوُ: «صَلَّيْتُ فِي الْمَسْجِدِ».**

**أَقُولُ: الضَّرْبُ الثَّالِثُ مِنْ ضُرُوبِ الْمَفَاعِيلِ، الْمَفْعُولُ فِيهِ وَهُوَ ظَرْفَانِ: يَعْنِي: ظَرْفُ الزَّمَانِ وَ ظَرْفُ الْمَكَانِ. وَيُسَمَّى الظَّرْفُ مَفْعُولاً فِيهِ لِوُقُوعِ فِعْلِ الْفَاعِلِ فِيهِ.**

**وَظَرْفُ الزَّمَانِ يُنْصَبُ كُلُّهُ، أَي: مَحْدُودُهُ، أَعْنِي: مُعَيَّنَهُ، نَحْوُ: «أَتَيْتُهُ الْيَوْمَ»،**

---

(قُمْتُ أَمامَكَ)، سەرنج بدە: وشەی «أَمَامَ» پێی دەگوترێت: «ظَرْفُ الْمَكان الْمُبْهَمْ» لە هەمان کاتدا «مَنْصُوبٌ» بووە و بۆتە «مَفْعُولُ فِيهِ» (وَلَا بُدَّ لِلْمَحْدُودِ مِنْ فِي) بەڵام پێویستە بۆ هەر وشەیەک کە «ظَرْفُ الْمَكان الْمَحْدُود» بێت کە حەرفی «في» بچێتە سەر و «مَجْرُور»ی بکات (نَحْوُ:) وەکوو (صَلَّيْتُ فِي الْمَسْجِدِ)، سەرنج بدە: وشەی «اَلْمَسْجِد» پێی دەگوترێت: «ظَرْفُ الْمَكانِ الْمُعَيّن» لە هەمان کاتدا بە حەرفی «في» مەجروور بووە، هەروەها «في محلّ النّصب» بۆتە «مَفْعُولُ فِيهِ».

(أَقُولُ) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (الضَّرْبُ الثّالِثُ مِنْ ضُروبِ الْمَفاعِيل) بەشی سێیەم لەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوب» دەبن و دەبێتە «مَفْعُول» (الْمَفْعُولُ فِيهِ) بریتییە لە «مَفْعُولُ فِيهِ» (وَهُوَ ظَرْفانِ) کە بریتییە لە دوو «ظَرْف» (يَعْنِي:) مەبەستم لەو دوو «ظَرْف»ـە یەکەم: پێی دەگوترێت (ظَرْفُ الزَّمانِ) کە هەموو ئەو وشانە دەگرێتەوە کە دەلالەت لەسەر کات و زەمان دەکەن، (وَ) دووەم: پێی دەگوترێت: (ظَرْفُ الْمَكانِ) کە هەموو ئەو وشانە دەگرێتەوە کە دەلالەت لەسەر شوێن و مەکان دەکەن؛ ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: (وَيُسَمَّى الظَرْفُ مَفْعُولاً فِيهِ) بۆیە ئەم دوو «ظَرْف»ـە پێیان دەگوترێت: «مَفْعُولُ فِيهِ» (لِوُقوعِ فِعْلِ الْفاعِلِ فِيهِ) چونکە ئەم کارەی کە فاعیلی فیعلەکە ئەنجامی داوە لەناو ئەم کاتەدا یاخود لە نێو ئەم شوێنەدا واقیع بووە.

(وَظَرْفُ الزَّمانِ يُنْصَبُ كُلُّهُ) ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: «ظَرْفُ الزَّمان» بە هەردوو بەشەکەیەوە هەمووی «مَنْصُوبٌ» دەبێت (أَيْ: مَحْدُودُهُ) واتە: هەم «ظَرْفُ الزَّمانِ الْمحدود» «مَنصوب» دەبێت (أَعْنِي مُعَيَّنَهُ) مەبەستم هەموو ئەو وشانەیە کە دەلالەت لەسەر زەمانێکی دیاریکراو دەکەن (نَحْوُ:) وەکوو (أَتَيْتُهُ الْيَوْمَ)، سەرنج

**وَمُبْهَمَهُ، نَحْوُ: «أَتَيْتُهُ بُكْرَةً وَذَاتَ لَيْلَةٍ». وَ «ذَاتَ» زَائِدَةٌ، أَيْ: فِي لَيْلَةٍ. وَيَجُوزُ أَنْ تَكُونَ بِمَعْنَىٰ: «صَاحِبَةٍ»، أَيْ: فِي سَاعَةٍ هِيَ صَاحِبَةُ هَذَا اللَّفْظِ، وَهُوَ «لَيْلَةٌ».**

**وَظَرْفُ الْمَكَانِ لَا يُنْصَبُ مِنْهُ إِلَّا الْمُبْهَمُ، نَحْوُ: «قُمْتُ أَمَامَكَ». وَلَابُدَّ لِظَرْفِ الْمَكَانِ الْمَحْدُودِ مِنْ «فِي»، نَحْوُ: «صَلَّيْتُ فِي الْمَسْجِدِ»،**

---

بدە: وشەی «اَلْيَوْمَ» پێی دەگوترێت: «ظَرْفُ الزَّمانِ الْمُعَيَّنِ» لە هەمان کاتدا «مَنْصُوبْ» بووە و بۆتە «مَفْعُولُ فِيهِ»، **(وَمُبْهَمَهُ)** هەم «ظَرْفُ الزَّمانِ الْمُبْهَمِ»کە هەموو ئەو وشانە دەگرێتەوە کە دەلالەت لەسەر زەمانێکی نادیار دەکەن **(نَحْوُ)** وەکوو **(أَتَيْتُهُ بُكْرَةً، وَذاتَ لَيْلَةٍ)** هەروەها هەردوو وشەی «بُكْرَةً» و «ذاتَ لَيْلَةٍ» پێیان دەگوترێت: «ظَرْفُ الزَّمانِ الْمُبْهَم» لە هەمان کاتدا «مَنْصُوبْ» بوونە و بوونەتە «مَفْعُولُ فِيهِ». **(وَذاتَ زَائِدَةٌ)** ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: وشەی «ذاتَ» زیادەیە لەم نموونەیەدا، بۆیە ڕستەکە وای لێ دێتەوە: **(أَيْ: فِي لَيْلَةٍ)** واتە: «أَتَيْتُهُ فِي لَيْلَةٍ» واتە: من شەوێک لە شەوان سەردانی ئەوم کرد **(وَيَجُوزُ أَنْ تَكونَ بِمَعْنى «صَاحِبَةٍ»)**[1] هەروەها دروستە وشەی «ذات» لەم نموونەیەدا زیادە نەبێت و بەڵکوو بە مانای وشەی «صاحِبَة» بێت **(أَيْ: فِي سَاعَةٍ)** ئەو کاتە وای لێ دێتەوە: من لە کاتێکدا چووم بۆ لای ئەو **(هِيَ صَاحِبَةُ هَذا اللَّفظِ)** کە ئەو کاتە خاوەنی ئەم وشەیە بوو **(وَهُوَ لَيْلَةٌ)** کە بریتییە لە شەوەکە.

**(وَظَرْفُ الْمَكانِ لا يُنْصَبُ مِنْهُ إِلّا الْمُبْهَمُ)** بەڵام: «ظَرْفُ الْمَكان» بە هەردوو بەشەکەیەوە «مَنْصُوبْ» نابێت، بەڵکوو تەنها بەشە «مُبْهَم»ـەکەی «مَنْصُوبْ» دەبێت **(نَحْوُ:)** وەکوو **(قُمْتُ أَمامَكَ)**، سەرنج بدە: وشەی «أَمَامَ» پێی دەگوترێت «ظَرْفُ الْمَكان الْمُبْهَمْ» لە هەمان کاتدا «مَنْصُوبْ» بووە و بۆتە «مَفْعُولُ فِيهِ»، **(وَلَا بُدَّ لِظَرْفِ الْمَكانِ الْمَحْدُودِ مِنْ فِي)** بەڵام پێویستە بۆ هەر وشەیەک کە «ظَرْفُ الْمَكان الْمَحْدُود» بێت حەرفی «في» بچێتە سەری و مەجرووری بکات **(نَحْوُ:)** وەکوو **(صَلَّيْتُ فِي الْمَسْجِدِ)**،

---

١. وشەی «ذاتَ»، یەکێکە لەم زەرفانەی کە «غَيْرُ الْمُتَصَرِّف»ـە، چونکە جگە لە «مَنْصُوب» بە هیچ جۆرێکیتر بەکار نایەت. بڕوانە: الفوائد والقواعد، (٢٧٠) و شرح المفصل: (١٧١/٢).

**فَلَا يُقَالُ: «صَلَّيْتُ الْمَسْجِدَ».**

**وَ إِنَّمَا يَنْصِبُ الْفِعْلُ الْمُعَيَّنَ مِنَ الزَّمَانِ دُونَ الْمَكَانِ، لِأَنَّهُ يَدُلُّ عَلَى الزَّمَانِ الْمُعَيَّنِ، كَ «ضَرَبَ»، فَإِنَّهُ دَالٌّ عَلَى الزَّمَانِ الْمَاضِي وَلَا يَدُلُّ عَلَى الْمَكَانِ الْمُعَيَّنِ.**

**وَالْمَكَانُ الْمُبْهَمُ هُوَ الْجِهَاتُ السِّتُّ، وَهِيَ: فَوْقٌ وَتَحْتٌ**

---

**سەرنج بدە:** وشەی «أَمَامَ» پێی دەگوترێت «ظَرْفُ الْمَكانِ الْمُبْهَم» لە هەمان کاتدا بە حەرفی «في» مەجروور بووە، هەروەها لە «في محلّ النّصب» بۆتە «مَفْعُولُ فِيهِ» **(فَلا يُقالُ)** کەواتە: دروست نییە بگوترێت: **(صَلّيْتُ الْمَسْجِدَ)** واتە: وشەی «في» «حذف» بکرێت، چونکە ماناکەی وای لێ دێتەوە کە بڵێیت: من نوێژم بە مزگەوتێ کرد، ئەوەش بە هیچ جۆرێک دروست نییە، بەڵکوو دەبێت بڵێی: من نوێژم لەناو مزگەوتێ کرد.

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: **(وَ إِنَّمَا يَنْصِبُ الْفِعْلُ الْمُعَيَّنَ مِنَ الزَّمانِ)** بۆچی «فِعْل» دەتوانێت «ظَرْفُ الزَّمانِ الْمُعَيَّنِ» «مَنصوب» بکات **(دُونَ الْمَكانِ)** بەڵام ناتوانێت «ظَرْفُ الْمَكان الْمُعَيَّنِ» «مَنصوب» بکات؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: **(لأَنَّهُ يَدُلُّ عَلَى الزَّمانِ الْمُعَيَّنِ)** چونکە «فِعْل» بە زاتی خۆی دەلالەت دەکات لەسەر کاتێکی دیاریکراو **(كَ)** وەکوو وشەی **(ضَرَبَ)** کە «فِعْلُ الْماضِي»ـیە **(فَإِنَّهُ دَالٌّ عَلَى الزَّمانِ الْماضِي)**، **سەرنج بدە:** ئەم وشەیە دەلالەت دەکات لەسەر لێدانێک کە لە زەمانی ڕابوردوو ئەنجام درابێت. **(وَلَا يَدُلُّ عَلَى الْمَكانِ الْمُعَيَّنِ)** بەڵام دەلالەت لەسەر جێگا و شوێنی لێدانەکە ناکات، بۆیە فیعلەکە دەتوانێت «ظَرْفُ الزَّمانِ الْمُعَيَّنِ» «مَنصوب» بکات، بەڵام ناتوانێت «ظَرْفُ الْمَكان الْمُعَيَّنِ» «مَنصوب» بکات.

**(وَ)** ئینجا مامۆستا پێناسەی «ظَرْفُ **(الْمَكان الْمُبْهَم)**» دەکات و دەفەرموێت: **(هُوَ الْجِهاتُ السِّتُّ)** بریتین لەم شەش ڕووەی کە دەوری هەموو شتێک دەدەن، **(وَهِيَ:)** کە بریتین لە وشەی **(فَوْقٌ)** کە دەلالەت لەسەر لای سەرەوەی هەموو شتێک دەکات، **(وَ)** هەروەها وشەی **(تَحْتٌ)** کە دەلالەت لەسەر لای خوارەوەی هەموو

**وَيَمِينٌ وَشِمَالٌ وَأَمَامٌ وَخَلْفٌ. وَالْمَكَانُ الْمُعَيَّنُ، نَحْوُ: «الْمَسْجِدِ وَالدَّارِ وَالسُّوقِ».**

شتێک دەکات، (وَ) هەروەها وشەی (يَمِينٌ) کە دەلاڵەت لەسەر لای ڕاستی هەموو شتێک دەکات، (وَ) هەروەها وشەی (شِمالٌ) کە دەلاڵەت لەسەر لای چەپی هەموو شتێک دەکات، (وَ) هەروەها وشەی (أَمامٌ) کە دەلاڵەت لەسەر لای پێشەوەی هەموو شتێک دەکات، (وَ) هەروەها وشەی (خَلْفٌ) کە دەلاڵەت لەسەر لای پشتەوەی هەموو شتێک دەکات، هەموو ئەم وشانە دەلاڵەت لەسەر شوێنێکی «مُبْهَمْ» دەکەن، چونکە کە تۆ دەڵێیت: «قُمْتُ أَمامَكَ» من لە پێشەوەی تۆ ڕاوەستام، وشەی پێشەوە شوێنێکی دیاریکراو و سنوورێکی شوورەکراو نییە.

(وَ) ئینجا مامۆستا پێناسەی «ظَرْفُ (الْمَكانُ الْمُعَيَّنُ)» دەکات و دەفەرموێت: هەموو ئەو وشانە دەگرێتەوە کە دەلاڵەت لەسەر شوێنێکی دیاریکراو و سنوورێکی شوورەکراو دەکەن (نَحْوُ:) وەکوو وشەی (الْمَسْجِد) مزگەوت، (وَ) هەروەها وشەی (الدَّار) خانوو (وَ)هەروەها وشەی (السُّوقِ) بازار، یاخود نەخۆشخانە و قاوەخانە...




* ◌ *

# الْمَفْعُولُ مَعَهُ

**قَالَ: وَالْمَفْعُولُ مَعَهُ، نَحْوُ: «مَا صَنَعْتَ وَأَبَاكَ» وَ «مَا شَأْنُكَ وَزَيْداً»، وَلَا بُدَّ لَهُ مِنْ فِعْلٍ أَوْ مَعْنَاهُ.**

**أَقُولُ: الضَّرْبُ الرَّابِعُ مِنْ ضُرُوبِ الْمَفَاعِيلِ، الْمَفْعُولُ مَعَهُ، وَهُوَ: مَا وَقَعَ بَعْدَ «وَاوٍ» بِمَعْنَىٰ «مَعَ»، وَلِذٰلِكَ يُسَمَّى بِالْمَفْعُولِ مَعَهُ،**

---

## وانەی چلەم: باسی «اَلْمَفْعُولُ مَعَهُ»

**(قالَ:)** مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: **(وَ)** یەکێکی‌تر لەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوب» دەبێت **(الْمَفْعُولُ مَعَهُ)** بریتییە لە «مَفْعُولُ مَعَهُ» **(نَحْوُ:)** وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: **(مَا صَنَعْتَ وَ أَباكَ)** واتە: تۆ چیت کرد لەگەڵ باوکت؟ **(وَ)** هەروەها وەکوو **(مَا شَأْنُكَ وَ زَيْداً)** واتە: تۆ لەگەڵ زەید چ کارەی؟ **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «أَباكَ» هەروەها وشەی «زَيْداً» هەردووکیان لەدوای واوێک هاتوون کە بە مانای «مَعَ»یە بۆیە هەردوکیان بوونەتە «مَفْعُولُ مَعَهُ»؛ ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: **(وَلَا بُدَّ لَهُ مِنْ فِعْلٍ)** پێویستە عامیلێک هەبێت کە کار لە «مَفْعُولُ مَعَهُ»دا بکات و «مَنْصُوب»ـی بکات، جیاوازی نییە عامیلەکە «فِعْل» بێت وەکوو نموونەی یەکەم، یاخود «شِبْهُ الْفِعْل» بێت **(أَوْ مَعْنَاهُ)** یاخود «مَعْنَى الْفِعْل» بێت وەکوو نموونەی دووەم.

**(أَقُولُ)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(الضَّرْبُ الرّابِعُ مِنْ ضُروبِ الْمَفاعِيل)** بەشی چوارەم لەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوب» دەبن و پێیان دەگوترێت «مَفْعُول»، **(الْمَفْعُولُ مَعَهُ)** بریتییە لە «مَفْعُولُ مَعَهُ»؛ ئینجا مامۆستا پێناسەی دەکات و دەفەرموێت: **(وَهُوَ: مَا)** «مَفْعُولُ مَعَهُ» بریتییە لە ئیسمێک **(وَقَعَ بَعْدَ وَاوٍ)** کە لەدوای واوێک هاتبێت **(بِمَعْنَى «مَعَ»)** کە مانای لەگەڵ «مَعَ» دەبەخشێت **(وَلِذَلِكَ يُسَمَّى بِالْمَفْعُولِ مَعَهُ)** هەر بۆیەش پێی دەگوترێت «مَفْعُولُ

**نَحْوُ: «مَا صَنَعْتَ وَأَبَاكَ»، أَيْ: مَعَ أَبِيكَ؛ وَ «مَا شَأْنُكَ وَزَيْداً» أَيْ: مَعَ زَيْدٍ.**

**وَلَا بُدَّ لِلْمَفْعُولِ مَعَهُ مِنْ عَامِلٍ يَعْمَلُ فِيهِ وَهُوَ إِمَّا فِعْلٌ كَالْمِثَالِ الْأَوَّلِ، أَوْ مَعْنَى الْفِعْلِ، كَالْمِثَالِ الثَّانِي، فَإِنَّ مَعْنَىٰ «مَا شَأْنُكَ وَزَيْداً»، أَيْ: مَا تَصْنَعُ مَعَ زَيْدٍ، فَلِذٰلِكَ مَثَّلَ بِمِثَالَيْنِ.**

---

مَعَـهُ» چونکـە واوەکـە مانـای «مَعِيَّـة» دەبەخشـێ. (نَحْوُ:) وەکـوو ئـەم نموونەیـەی کە دەڵێـت: (مَا صَنَعْتَ وَ أَبَاكَ) واتـە: تـۆ چیـت کـرد لەگـەڵ باوکـت؟ (أَيْ: مَعَ أَبِيكَ)، سـەرنج بـدە: ئـەم «واو»ە مانـای «مَعَ» دەبەخشـێ، (وَ) هەروەهـا وەکـوو (مَا شَأْنُكَ وَ زَيْداً) واتـە: تـۆ لەگـەڵ زەیـد چ کارەی؟ (أَيْ: مَعَ زَيْدٍ)، سـەرنج بـدە: ئەم واوەش بە هەمـان شـێوەی ڕابوردوو مانای «مَعَ» دەبەخشـێ؛ سـەرنج بدە: لـەم دوو نموونەیەدا وشەی «أَبَاكَ» هەروەها وشەی «زَيْداً» هەردووکیان لەدوای «واو»ێک هاتوون کە بە مانای «مَعَ»یە بۆیە هەردووکیان بوونەتە «مَفْعُولُ مَعَهُ».

ئینجا مامۆسـتا دەفەرموێت: (وَلَا بُدَّ لِلْمَفْعُولِ مَعَهُ مِنْ عَامِلٍ يَعْمَلُ فِيهِ) پێویسـتە لەبـۆ «مَفْعُـولُ مَعَـهُ» کـە عامیلێـک هەبێـت کاری تێـدا بـکات و «مَنْصُوب»ـی بـکات (وَهُوَ إِمَّا فِعْلٌ كَالْمِثَالِ الأَوَّلِ) ئینجـا جیـاوازی نییـە عامیلەکـە «فِعْـل» بێـت وەکـوو نموونەی یەکەم، یاخود «شِبْهُ الْفِعْل» بێت (أَوْ مَعْنَىَ الْفِعْلِ، كَالْمِثَالِ الثَّانِي) یاخود «مَعْنَـى الْفِعْـل» بێـت وەکـوو نموونـەی دووەم. (فَإِنَّ مَعْنَى) چونکە ئەم ڕستەیەی کە دەفەرموێت: (مَا شَأْنُكَ وَزَيْداً، أَيْ:) واتاکەی ئاوای لێ دێتەوە: (مَا تَصْنَعُ مَعَ زَيْدٍ؟) واتـە: تۆ لەگـەڵ زەید چ کارێک ئەنجـام دەدەیت؟ (فَلِذَلِكَ مَثَّلَ بِمِثَالَيْنِ)[1] هەر لەبەر ئـەوەش دوو نموونـەی پـێ هێنایـەوە، لە نموونـەی یەکەمدا عامیلەکـە «فِعْل» بوو، لە نموونەی دووەمدا عامیلەکە «مَعْنَى الْفِعْل» بوو...

* ◌ *

---

١. بڕوانە ئەم سـەرچاوانە: شـرح شـژور الزهـب: (٢١٥) والإنصاف فی مسـائل الخلاف: (٢٢٦/١) وشـرح ابن العقیل: (١٦٠/٢)

# الْمَفْعُولُ لَهُ

**قَالَ: وَالْمَفْعُولُ لَهُ، نَحْوُ: «ضَرَبْتُهُ تَأْدِيباً لَهُ»، وَكَذٰلِكَ كُلُّ مَا كَانَ عِلَّةً لِلْفِعْلِ.**

**أَقُولُ: الضَّرْبُ الْخَامِسُ مِنْ ضُرُوبِ الْمَفَاعِيلِ، الْمَفْعُولُ لَهُ.**

---

## وانەی چل‌ویەکەم: باسی «اَلْمَفْعُولُ لَهُ»

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: (وَالْمَفْعُولُ لَهُ) یەکێکی‌تر لەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوب» دەبێت بریتییە لە «مَفْعُولُ لَهُ» (نَحْوُ:) وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: (ضَرَبْتُهُ تَأْدِيباً لَهُ) واتە: من لە زەیدم دا بۆ ئەوەی فێری ئەدەب بێت، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «تَأْدِيباً» بۆتە «مَفْعُولُ لَهُ» چونکە لێدانەکە لەبەر خاتری فێربوونی ئەدەب و ڕەوشت ئەنجام دراوە؛ ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: (وَكَذا كُلُّ مَاكَانَ عِلَّةً لِلْفِعْلِ) هەروەها هەر وشەیەک ببێتە هۆی ئەنجامدانی کارێک (فیعلێک) ئەم وشەیەش پێی دەگوترێت «مَفْعُولُ لَهُ» (نَحْوُ:) وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: (جِئْتُكَ لِلسَّمْنِ) واتە: من بۆ دەستکەوتنی ڕۆن هاتوومەتە لای تۆ، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «لِلسَّمْنِ» لە «مَحَلِّ النَّصْبِ» دەبێتە «مَفْعُولُ لَهُ»[1] چونکە سەردانەکە (مَجِيء) لەبەر خاتری دەستکەوتنی ڕۆن (السَّمْن) ئەنجام دراوە، بۆیە دەبێتە «مَفْعُولُ لَهُ»، هەروەها هەر وشەیەک بە هۆی «لام» کە «حَرْفُ الْجَرّ»ە مەجروور بێت یاخود بە هۆی حەرفێک کە بە مانای «لام» بێت وەکوو «كَيْما عَصَيْتَ» ئەویش «فِي مَحَلِّ النَّصْبِ» دەبێتە «مَفْعُولُ لَهُ».

(أَقُولُ) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (الضَّرْبُ الْخامِسُ مِنْ ضُروبِ الْمَفاعِيل) بەشی پێنجەم لەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوب» دەبن و پێیان دەگوترێت «مَفْعُول» بریتییە لە (الْمَفْعُولُ لَهُ). ئینجا مامۆستا دێتە سەر

---

١. بڕوانە: شرح المفصل: (٤٥٠/١) وشرح ابن عقيل: (٢/ ١٩٢) ومعاني النحو: (١٩٢/٢)

**وَهُوَ مَا فَعَلَ الْفَاعِلُ فِعْلَهُ لِأَجْلِهِ، وَلِذٰلِكَ سُمِّيَ بِالْمَفْعُولِ لَهُ، نَحْوُ: «ضَرَبْتُهُ تَأْدِيباً لَهُ»، أَيْ: لِتَأْدِيبِهِ. وَكَذَا كُلُّ شَيْءٍ كَانَ عِلَّةً لِلْفِعْلِ، فَإِنَّهُ يَكُونُ مَفْعُولاً لَهُ، نَحْوُ: «السَّمْنِ» فِي قَوْلِكَ: «جِئْتُكَ لِلسَّمْنِ».**

---

پێناسەکەی و دەفەرموێت: (**وَهُوَ:**) «مَفْعُولُ لَهُ» بریتییە (**مَا فَعَلَ الْفاعِلُ فِعْلَهُ لأَجْلِهِ**) لەو وشەیەی کە فاعیلی فیعلەکە لەبەر خاتری ئەو کارەکەی ئەنجام داوە، ئەگەر ئەو نەبا کارەکەی ئەنجام نەدەدا (**وَلِذلِكَ سُمِّيَ بِالْمَفْعُولِ لَهُ**) هەر لەبەر ئەوەش پێی دەگوترێت «مَفْعُولُ لَهُ»، چونکە کارەکە لەبەر خاتری ئەو ئەنجام دراوە (**نَحْوُ:**) وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: (**ضَرَبْتُهُ تَأْدِيباً لَهُ**) واتە: من لە زەیدم دا بۆ ئەوەی فێری ئەدەب بێت، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «تَأْدِيباً» بۆتە «مَفْعُولُ لَهُ» (**أَيْ: لِتَأْدِيبِهِ**) واتە: لێدانەکە لەبەر خاتری فێربوونی ئەدەب و ڕەوشت ئەنجام دراوە.

ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: (**وَكَذا كُلُّ شَيْءٍ كَانَ عِلَّةً لِلْفِعْلِ**) هەروەها هەر وشەیەک ببێتە هۆی ئەنجامدانی کارێک (فیعلێک) (**فَإِنَّهُ يَكُونُ مَفْعُولاً لَهُ**) ئەو وشەیەش دەبێتە «مَفْعُولُ لَهُ» (**نَحْوُ: السَّمْنِ**) وەکوو وشەی «السَّمْن» کە بەمانای ڕۆن دێت (**فِي قَوْلِكَ**) لەم نموونەیەی کە دەڵێت: (**جِئْتُكَ لِلسَّمْنِ**) واتە: من بۆ دەستکەوتنی ڕۆن هاتوومە لای تۆ، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «لِلسَّمْنِ» لە «مَحَلِّ النَّصْبِ» دەبێتە «مَفْعُولُ لَهُ»[1]، چونکە سەردانەکە (مَجِيء) لەبەر خاتری دەستکەوتنی ڕۆن (السَّمْن) ئەنجام دراوە هەر بۆیە دەبێتە «مَفْعُولُ لَهُ».

* ◌ *

---

[1] بڕوانە: شرح كافية ابن الحاجب: (٢/ ٣٠).


أنواع المفاعل
المفعول المطلق
مثل:
ضربت ضرباً
المفعول به
مثل:
ضربت
زيداً
المفعول فيه
مثل:
صمت شهراً
المفعول له
مثل:
ضربت زيداً
تأديباً له
المفعول معه
مثل:
ما صَنَعتَ و
أَباكَ

**قَالَ: وَالْمُلْحَقُ بِهِ سَبْعَةُ أَضْرُبٍ: الْحَالُ، وَهِيَ بَيَانُ هَيْئَةِ الْفَاعِلِ أَوِ الْمَفْعُولِ بِهِ، نَحْوُ: «ضَرَبْتُ زَيْداً قَائِماً».**
**أَقُولُ: لَمَّا فَرَغَ مِنَ الْأَصْلِ فِي الْمَنْصُوبَاتِ، أَعْنِي: الْمَفَاعِيلَ، شَرَعَ فِي الْمُلْحَقِ بِالْأَصْلِ، وَهِيَ سَبْعَةُ أَضْرُبٍ:**

## المُلحَقات

**(قالَ:)** مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: **(وَالْمُلْحَقُ بِهِ)** ئەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوبٌ» دەبن و مولحەقن بە مەفعوولان **(سَبعَةُ أَضْرُبٍ)** حەوت بەشیان هەیە؛ **بەشی یەکەم: (اَلْحالُ)** بریتییە لەو ئیسمەی کە پێی دەگوترێت «الحال» **(وَهِيَ)** پێناسەکەی بریتییە لەو ئیسمەی **(بَيانُ هَيْئَةِ الْفاعِلِ)** کە ڕوونکردنەوەی شێوازی «فاعل» لە کاتی ئەنجامدانی کارەکەی دەکات **(أَوِ الْمَفْعُولِ بِهِ)** یاخود ڕوونکردنەوەی شێوازی «مَفْعُولُ بِهِ» لە کاتی ئەنجامدانی ڕووداوەکە دەکات **(نَحْوُ:)** وەکوو **(ضَرَبْتُ زَيْداً قَائِماً)** واتە: من لە زەیدم دا بە پێوە، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «قَائِماً» پێی دەگوترێت: «حال» چونکە شێوازی «فاعل» لە کاتی ئەنجامدانی کارەکەی ـ کە لێدانە ـ ڕوون دەکاتەوە، واتە: ئەو کاتەی من لە زەیدم دا بە پێوە بووم، ئەگەر بێت وشەی «قَائِماً» ببێتە «حال» لە فاعیل، یاخود شێوازی «مَفْعُولُ بِهِ» ڕوون دەکاتەوە ئەگەر بێت وشەی «قَائِماً» ببێتە «حال» لە «مَفْعُولُ بِهِ» واتە: ئەو کاتەی من لە زەیدم دا، ئەو بە پێوە بوو.

**(أَقُولُ)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(لَمَّا فَرَغَ مِنَ الأَصْلِ فِي الْمَنْصُوباتِ)** پاش ئەوەی مامۆستا تەواو بوو لە باسکردنی ئەو ئیسمانەی کە «أَصْل» بوون لە «مَنْصُوبات» **(أَعْنِي الْمَفاعِيلَ)** مەبەستم باسکردنی هەر پێنج مەفعوولەکانە **(شَرَعَ فِي الْمُلْحَقِ بِالأَصْلِ)** ئینجا مامۆستا دەستی کرد بە باسکردنی ئەو ئیسمانەی کە مولحەقن بە «مَنْصُوبات»ـەکان **(وَهِيَ سَبْعَةُ أَضْرُبٍ)** کە بریتین لە حەوت بەشی تایبەت و جیاواز.

# الْحَالُ

**الضَّرْبُ الْأَوَّلُ مِنْهَا: الْحَالُ، وَهِيَ: بَيَانُ هَيْئَةِ الْفَاعِلِ أَوِ الْمَفْعُولِ بِهِ، نَحْوُ: «ضَرَبْتُ زَيْداً قَائِماً»، فَإِنَّ «قَائِماً» حَالٌ، إِمَّا مِنَ التَّاءِ فِي «ضَرَبْتُ»، وَالْمَعْنَىٰ: ضَرَبْتُ حَالَ كَوْنِي عَلَىٰ هَيْئَةِ الْقِيَامِ زَيْداً؛ وَإِمَّا مِنْ «زَيْدٍ»، وَالْمَعْنَىٰ: «ضَرَبْتُ زَيْداً حَالَ كَوْنِهِ عَلَىٰ هَيْئَةِ الْقِيَامِ»؛ وَإِمَّا مِنَ الْفَاعِلِ وَالْمَفْعُولِ بِهِ مَعاً،**

## وانەی چلودووهەم: باسی «اَلْحال»

(**اَلضَّرْبُ الأَوَّلُ مِنْها**) **بەشی یەكەم:** لەو حەوت بەشانەی كە «مُلْحَق»ـن بە مەفعوولان (**اَلْحالُ**) بریتییە لەو ئیسمەی كە پێی دەگوترێت «الحال». (**وَهِيَ**) پێناسەی «حال» بریتییە (**بَيانُ هَيْئَةِ الْفاعِلِ**) لەو ئیسمەی كە بەیانی شێوازی فاعیلەكە دەكات لە كاتی ئەنجامدانی كارەكەی (**أَوِ الْمَفْعُولِ بِهِ**) یاخود بەیانی شێوازی «مَفْعُولُ بِهِ» دەكات لە كاتی ئەنجامدانی ڕووداوەكە، (**نَحْوُ:**) وەكوو (**ضَرَبْتُ زَيْداً قَائِماً**) واتە: من لە زەیدم دا بە پێوە، (**فَإِنَّ قَائِماً حَالٌ**)، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «قَائِماً» پێی دەگوترێت: «حال» (**إِمَّا مِنَ التَّاءِ فِي «ضَرَبْتُ»**)یاخود «حال»ـە لە فاعیل كە بریتییە لە «تاء»ـی وشەی «ضَرَبْتُ» واتە: شێوازی «فاعل» ڕوون دەكاتەوە لە كاتی ئەنجامدانی كارەكەی كە لێدانە، (**وَالْمَعْنىَ**) ئەو كاتە مانای وای لێ دێتەوە: (**ضَرَبْتُ حَالَ كَوْنِي عَلَى هَيْئَةِ الْقِيامِ زَيْداً**)[1] واتە: ئەو كاتەی من لە زەیدم دا بە پێوە ڕاوەستابووم، (**وَإِمَّا مِنْ زَيْدٍ**) یاخود «حال»ـە لە «مَفْعُولُ بِهِ» كە بریتییە لە وشەی «زَيْداً» واتە: شێوازی «مَفْعُولُ بِهِ» ڕوون دەكاتەوە، (**وَالْمَعْنَى**) ئەو كاتە مانای وای لێ دێتەوە: (**ضَرَبْتُ زَيْداً**) من لە زیدم دا (**حَالَ كَوْنِهِ عَلَى هَيْئَةِ الْقِيامِ**) لە كاتی لێدانەكە زەید بە پێوە ڕاوەستابوو، ئەگەر بێت و وشەی «قَائِماً» ببێتە «حال» لە «مَفْعُولُ بِهِ» ماناكە بەم شێوەی دەبێت.

---

١. بڕوانە: شرح المفصل: ٨/٤.

**نَحْوُ: «ضَرَبْتُ زَيْداً قائِمَيْنِ». وَ إِنَّمَا أُلْحِقَ الْحَالُ بِالْمَفَاعِيلِ لِأَنَّهَا زَائِدَةٌ فِي الْكَلَامِ كَالْمَفْعُولِ.**

---

**(وَ إِمَّا مِنَ الْفاعِلِ وَالْمَفْعُولِ بِهِ مَعاً)** یاخود «حال» بەیانی هەیئەتی «فاعِل» و «مَفْعُولُ بِهِ» دەکات و بەیەکەوە ڕوونیان دەکاتەوە **(نَحْوُ:)** وەکوو ئەم نموونەیە: **(ضَرَبْتُ زَيْداً قائِمَيْنِ)** واتە: من لە زەیدم دا لەکاتی لێدانەکە هەردووکمان بە پێوە بووین، **سەرنج بدە:** وشەی «قائِمَيْنِ» بۆتە حاڵ و بەیانی هەیئەتی «فاعِل» و «مَفْعُولُ بِهِ» بەیەکەوە کردووە.

**ئینجا بزانە:** ئەمە لە کاتێکدایە کە هیچ قەرینەیەک نەبێت، واتە: ئەم وشەیەی بۆتە «حال» بگونجێت کە بەیانی هەیئەتی «فاعِل» و «مَفْعُولُ بِهِ» بکات، بەڵام ئەگەر قەرینەیەک هەبوو کە دەلالەتی دەکرد کە ئەم وشەیەی بۆتە «حال» بەیانی هەیئەتی «فاعِل» دەکات وەکوو «ضَرَبْتُ فَاطِمَةَ قَائِماً» ئەوکات هیچ پەیوەندی بە «مَفْعُولُ بِهِ»ـیەوە نابێت، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «قَائِماً» دروست نییە ببێتە «حال» لە «مَفْعُولُ بِهِ»، چونکە بە سیغەی «مُذَكّر» هاتووە، یاخود ئەگەر قەرینەیەک هەبوو کە دەلالەتی دەکرد کە ئەم وشەیەی بۆتە «حال» و بەیانی هەیئەتی «مَفْعُولُ بِهِ» دەکات وەکوو «ضَرَبْتُ فَاطِمَةَ قَائِمَةً» ئەوکات هیچ پەیوەندی بە فاعیلەوە نامێنێت، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «قَائِمَةً» دروست نییە ببێتە حاڵ لە فاعیل، چونکە بە سیغەی «مُؤَنَّث» هاتووە.

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: **(وَ إِنَّمَا أُلْحِقَ الْحالُ بِالْمَفاعِيلِ)** بۆچی «حال» لکێندراوە و مولحەقە بە مەفعوولەکان؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: **(لأَنَّها زائِدَةٌ فِي الْكَلَامِ كَالْمَفْعُولِ)** چونکە ئەم وشەیەی دەبێتە حال زیادەیە لە نێو ڕستەدا وەکوو مەفعوولەکان، واتە: ئەگەر لەوێش نەبێت ڕستەکە هەر پێی دەگوترێت «كَلام» و مانا دەبەخشێت.

* ◌ *

**قَالَ: وَحَقُّهَا التَّنْكِيرُ؛ وَحَقُّ ذِي الْحَالِ التَّعْرِيفُ. فَإِنْ تَقَدَّمَ الْحَالُ عَلَيْهِ جَازَ تَنْكِيرُهُ، نَحْوُ: «جَاءَنِي رَاكِباً رَجُلٌ».**

**أَقُولُ: حَقُّ الْحَالِ أَنْ تَكُونَ نَكِرَةً، لِأَنَّهَا لَوْ كَانَتْ مَعْرِفَةً لَالْتَبَسَتْ بِالصِّفَةِ فِي مِثْلِ: «ضَرَبْتُ زَيْداً الرَّاكِبَ».**

---

## وانەی چل‌وسێهەم: باسی «أَحْكَامُ اَلْحال»

(قالَ:) مامۆستا «جار اللّٰه» زەمەخشـەری دەفەرموێت: (وَحَقُّها: اَلتَّنْكِيرُ) واتـە: پێویستە و ئەسڵ وایە کـە «حـال» هەموو کاتێک ئیسـمێکی «نَكِرَة» بێـت (وَحَقُّ ذِي الْحالِ: اَلتَّعْرِيفُ) هەروەها پێویستە و ئەسڵ وایە کە «ذي الحال» هەموو کاتێک ئیسمێکی «مَعْرِفَة» بێت وەکوو (جَاءَنِي زَيْدٌ رَاكِباً)، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی (رَاكِباً) پێـی دەگوترێـت «حـال»، لە هەمان کاتدا ئیسـمێکی «نَكِرَة»یە، هەروەها وشـەی «زَيْدٌ» پێی دەگوترێت «ذي الحال» لە هەمان کاتدا ئیسمێکی «مَعْرِفَة»یە، (فَإِنَّ تَقَدَّمَ الْحالُ عَلَيْهِ) بەڵام ئەگەر ئەو وشـەیەی بۆتە «حال» وەپێش کەوت لەسـەر ئەو وشـەیەی کە بۆتە «ذي الحال» (جَازَ تَنْكِيرُهُ) ئەو کاتە دروستە وشەی «ذي الحال»ـیش ئیسمێکی «نَكِرَة» بێت (نَحْوُ:) وەکوو (جَاءَنِي رَاكِباً رَجُلٌ)، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «رَاكِباً» پێـی دەگوترێـت: «حـال» لەسـەر وشـەی «ذي الحـال» کە «رَجُلٌ»ـە وەپێش کەوتووە، بۆیە دروستە وشەی «ذي الحال»ـیش ئیسمێکی «نَكِرَة» بێت.

(أَقُولُ) مامۆستا «عبدالغنـي» ئەردەبیلـی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (حَقُّ الْحالِ أَنْ تَكونَ نَكِرَةً) واتە: پێویستە و ئەسڵ وایە کە «حال» هەموو کاتێک ئیسمێکی «نَكِرَة» بێت (لأَنَّها لَوْ كَانَتْ مَعْرِفَةً) چونکە ئەگەر بێتو «حال» ئیسمێکی «مَعْرِفَة» بێ (لَالْتَبَسَتْ بِالصِّفَةِ) ئەوکاتـە تێکهـەڵ دەبێـت لەگـەڵ «صِفَـة» (فِي مِثْلِ) لـە وێنەی ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: (ضَرَبْتُ زَيْداً الرَّاكِبَ)، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «الرَّاكِب» چونکە ئیسمێکی «مَعْرِفَة»یە «اِلْتِباس»ـی بووە بە «صِفَة» و پێی ناگوترێت «حال».

◦ ◦

**وَحَقُّ ذِي الْحَالِ أَنْ يَكُونَ مَعْرِفَةً؛ لِأَنَّهُ لَوْ كَانَ نَكِرَةً لَالْتَبَسَتْ بِهَا أَيْضاً فِي مِثْلِ: «ضَرَبْتُ رَجُلاً قَائِماً». وَ إِنْ تَقَدَّمَ الْحَالُ عَلَىٰ ذِي الْحَالِ، جَازَ تَنْكِيرُ ذِي الْحَالِ، نَحْوُ: «جَاءَنِي رَاكِباً رَجُلٌ» لِعَدَمِ الِالْتِبَاسِ حِينَئِذٍ، فَإِنَّ الصِّفَةَ لَا تَتَقَدَّمُ عَلَى الْمَوْصُوفِ.**

**وَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا بُدَّ لِلْحَالِ مِنْ عَامِلٍ،**

---

(**وَحَقُّ ذِي الْحَالِ: أَنْ تَكونَ مَعْرِفَةً**) هەروەها پێویستە و ئەسڵ وایە کە «ذي الحال» هەموو کاتێک ئیسمێکی «مَعْرِفَة» بێت (**لأَنَّه لَوْ كَانَتْ نَكِرَةً**) چونکە ئەگەر بێتو «ذي الحال» ئیسمێکی «نَكِرَة» بێ (**لَالْتَبَسَتْ بِها أَيْضاً**) دووبارە تێکهەڵ دەبێت لەگەڵ «صِفَة» (**فِي مِثْلِ**) لە وێنەی ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: (**ضَرَبْتُ رَجُلاً قَائِماً**)، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «رَجُلاً» چونکە ئیسمێکی «نَكِرَة»یە «اِلْتِباس»ـی بووە بە «صِفَة» و پێی ناگوترێت «ذي الحال».

(**فَإِنْ تَقَدَّمَ الْحالُ عَلَى ذِي الْحالِ**)[1] بەڵام ئەگەر ئەو وشەیەی بۆتە «حال» وەپێش کەوت لەسەرئەو وشەیەی کە بووە بە «ذي الحال» (**جَازَ جَازَ تَنْكِيرُ ذِي الْحالِ**) ئەو کاتە دروستە وشەی «ذي حال»ـیش ئیسمێکی «نَكِرَة» بێت (**نَحْوُ:**) وەکوو (**جَاءَنِي رَاكِباً رَجُلٌ**)، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «رَاكِباً» پێی دەگوترێت «حال» و لەسەر وشەی «ذي الحال» ـکە «رَجُلٌ»ـە- وەپێش کەوتووە بۆیە دروستە وشەی «ذي الحال»ـیش ئیسمێکی «نَكِرَة» بێت، (**لِعَدَمِ الاِلْتِباسِ حِينَئِذٍ**) چونکە لەم کاتەدا تێکهەڵی (**اِلْتِباس**) دروست نابێت (**فَإِنَّ الصِفَةَ لا تَتَقَدَّمُ عَلَى الْمَوصوفِ**) لەبەر ئەوەی «صِفَة» لەسەر «مَوْصُوف» پێش ناکەوێت.

پاشان مامۆستا دەفەرموێت: (**وَاعْلَمْ:**) ئینجا بزانە ئەی قوتابی ڕێزدار (**أَنَّهُ لا بُدَّ لِلْحالِ مِنْ عَامِلٍ**) پێویستە لەبۆ ئەم وشەیەی دەبێتە «حال» عامیلێک هەبێت

---

١. **ئینجا بزانە:** ئەی قوتابی خۆشەویست، هێندێک جار واجبە «حال» لەسەر «ذي الحال» وەپێش بکەوێت: هەروەها هێندێک جاریش واجبە، «ذي الحال» لەسەر «حال» وەپێش بکەوێت، بەڵام من بۆیە ئەم بابەتەم باس نەکرد، چونکە لە کتێبە گەورەکان بە درێژی ئەم بابەتانە باس کراون و تۆ لێرەدا تەنها «قاعدة» گشتییەکە لەبەر بکە و خۆت سەرقاڵی بابەتەکانی‌تر مەکە، ئەگەر خوای گەورە تەمەنی پێ‌بەخشیت ئەو دەمەش دێت و ئەوکات بە باشی لەبەریان بکە.

**وَهُوَ إِمَّا فِعْلٌ كَمَا مَرَّ أَوْ شِبْهُ فِعْلٍ، نَحْوُ: «زَيْدٌ ضَارِبٌ عَمْراً قَائِماً»؛ أَوْ مَعْنَىٰ فِعْلٍ، نَحْوُ: «هٰذَا عَمْرٌو مُنْطَلِقاً»، فَإِنَّ مَعْنَاهُ: أُشِيرُ إِلَىٰ عَمْرٍو مُنْطَلِقاً.**

**وَقَدْ يُحْذَفُ الْعَامِلُ إِذَا دَلَّ عَلَيْهِ قَرِينَةٌ، كَقَوْلِكَ لِلْمُرْتَحِلِ: «رَاشِداً مَهْدِيّاً»**

---

کە کاری تێدا بکات و «مَنْصُوب»ـی بکات (وَهُوَ إِمَّا فِعْلٌ كَمَا مَرَّ) ئینجا جیاوازی نییە ئەم عامیلە «فِعْل» بێت هەروەکوو لە نموونەکانی ڕابوردوو باسمانکرد (أَوْ شِبْهُ فِعْلٍ) یاخود عامیلەکە «شِبْهُ الفِعْل» بێت وەکوو «اِسْمُ الْفاعِل» و «اسْمُ الْمَفْعُول» و «الصِّفَة الْمُشَبَّهَة» و «اِسْمُ التَّفْضِيل»... (نَحْوُ:) نموونەکەی وەکوو (زَيْدٌ ضَارِبٌ عَمْراً قَائِماً) واتە: زەید لە عەمری دا بە پێوە، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «قَائِماً» بۆتە «حال» و «مَنْصُوبٌ» بووە، بەڵام ئەم عامیلەی کە کاری تێدا کردووە «فِعْل» نییە، بەڵکوو «شِبْهُ الفِعْل»ـە کە «اِسْمُ الْفاعِل»ـە.

(أَوْ مَعْنَى فِعْلٍ) یاخود عامیلەکە «مَعْنَى الْفِعْل» بێت کە هەموو ئەو وشانە دەگرێتەوە کە مانای فیعلیان لێ وەردەگیرێت (نَحْوُ:) نموونەکەی وەکوو (هَذا عَمْرٌو مُنْطَلِقاً)، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «مُنْطَلِقاً» بۆتە «حال» و «مَنْصُوبٌ» بووە، بەڵام ئەم عامیلەی کە کاری تێدا کردووە «فِعْل» نییە، بەڵکوو «مَعْنَى الْفِعْل»ـە، (فَإِنَّ مَعْناهُ) چونکە مانای ڕستەکە وای لێ دێتەوە: (أُشِيرُ إِلَى عَمْرٍو مُنْطَلِقاً) لەبەر ئەوەی وشەی «هذا» لە دوو پیت پێک هاتووە: **یەکەم** «هاءُ التَّنْبِيه» کە دەکرێت مانای «أُنَبِّهُ»ی لێ وەربگیرێت؛ **دووەم** «ذا» کە «اِسْمُ الإِشارَة»ەیە و کە دەکرێت مانای «أُشِيرُ»ی لێ وەربگیرێت.

ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: بە زۆری وایە: ئەو عامیلەی کە «حال»ـی «مَنْصُوبٌ» کردووە باس دەکرێت وەکوو نموونەکانی ڕابردوو، بەڵام (وَقَدْ يُحْذَفُ الْعَامِلُ) هێندێک جاریش ئەو عامیلەی کە حاڵی «مَنصوب» کردووە «حذف» دەکرێت (إِذَا دَلَّ عَلَيْهِ قَرِينَةٌ) بەو مەرجەی نیشانەیەک هەبێت دەلالەت بکات کە عامیلەکە «حذف» کراوە (كَقَوْلِكَ لِلْمُرْتَحِلِ) وەکوو تۆ بە کەسێک دەڵێی کە نیازی گەشتکردنی هەیە: (راشِداً مَهْدِياً) بە خێر و بە خۆشی بێت... **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا هەردوو

**أَيْ: اِذْهَبْ رَاشِداً مَهْدِيّاً.**

وشەی «راشِداً مَهْدِياً» بوونەتە «حال» و عامیلەکەیان «حذف» کراوە (**أَيْ:**) واتە: ڕستەکە وای لێ دێتەوە: (**اِذْهَبْ رَاشِداً مَهْدِيّاً**).

ئینجا بزانە ئەم وشانەی مانای «مَعْنَى الْفِعْل» دەبەخشن جگە لە «ظَرْف» و «جَارُ الْمجرور» بریتین لە:

**یەکەم:** «الاِسْمُ الْمَنْسُوبُ» وەکوو دەڵێیت: «أَنَا كُرْدِيٌّ مُفْتَخِراً».

**دووەم:** «اِسْمُ الإشارة» وەکوو دەڵێیت: «ذا بَكْرٌ مُسافِراً».

**سێیەم:** «اِسْمُ الْفِعْلِ» وەکوو دەڵێیت: «عَلَيْكَ سَعْداً رَاكِباً».

**چوارەم:** «حروف النداء» وەکوو دەڵێیت: «يا رَبَّنا مُنْعِماً».

**پێنجەم:** «حُروفُ التَنْبِيهِ» وەکوو دەڵێیت: «ها أَنا مُحَمَّدٌ كَرِيماً».

**شەشەم:** «حُروفُ التَّشْبِيهِ» وەکوو دەڵێیت: «زَيْدٌ أَسَدٌ مُقْبِلاً»[1].

* ◌ *

---

١. بڕوانە: جامع الدروس العربية: (٤١٤) وشرح كافية ابن الحاجب الكوردي (٢/٥٥) وشرح التسهيل: (٢/٢٣٤).

# التَّمْيِيزُ

**قَالَ: وَالتَّمْيِيزُ وَهُوَ رَفْعُ الْإِبْهَامِ إِمَّا عَنِ الْجُمْلَةِ فِي قَوْلِكَ: «طَابَ زَيْدٌ نَفْساً» أَوْ عَنِ الْمُفْرَدِ فِي قَوْلِكَ: «عِنْدِي رَاقُودٌ خَلّاً، وَمَنَوَانِ سَمْناً، وَعِشْرُونَ دِرْهَماً، وَمِلْؤُهُ عَسَلاً».**

---

## وانەی چل‌وچوارەم: باسی «اَلتَّمْيِيزُ وَأَحْكامُهُ»

**(قالَ:)** مامۆستا «جار اللّه» زەمەخشەری دەفەرموێت: **(وَالتَّمْيِيزُ)** یەکێکی‌تر لەو ئیسمانەی کە مولحەقن بە «مَنْصُوبات» بریتییە لە «التَّمْيِيز»؛ ئینجا مامۆستا پێناسەی دەکات و دەفەرموێت: **(وَهُوَ رَفْعُ الإِبْهامِ)** پێناسەی «تَمْيِيز» بریتییە لە ئیسمێک کە ناڕوونی لادەبات و «غُمُوض» هەڵدەگرێت و نادیاری ناهێڵێت، لە دوو شوێن:

**یەکەم: (إِمَّا عَنِ الْجُمْلَةِ)** یاخود لە ڕستەیەک ناڕوونی و نادیاری لادەبات **(فِي قَوْلِكَ)** هەروەکوو تۆ دەڵێیت: **(طَابَ زَيْدٌ نَفْساً)** واتە: زەید پاک بوو لە ڕووی دڵ و دەروونەوە، **سەرنج بدە:** لەم وشەیەدا وشەی «نَفْساً» پێی دەگوترێت «تَمْيِيز» چونکە ناڕوونی و نادیاری لادەبات لە ڕستەی «طابَ زَيْدٌ»، چونکە کە تۆ دەڵێیت: زەید پاک بوو، زۆر شت دەگرێتەوە وەکوو جلوبەرگ و لاشەو... بۆیە ڕستەکە نادیاری تێ دەکەوێت، بەڵام کە گوتت «نَفْساً» ئەم نادیارییە نامێنێت و ڕوون دەبێتەوە.

**دووەم: (أَوْ عَنِ الْمُفْرَدِ)** یاخود لە وشەیەکی تاك (مفرد) ناڕوونی و نادیاری لادەبات **(فِي قَوْلِكَ)** لە کاتێکدا تۆ دەڵێیت: **(عِنْدِي رَاقُودٌ خَلاً)** واتە: من جامێکی پڕم لە لایە لە سرکە **(وَمَنَوانِ سَمْناً)** هەروەها دوو قاپی پڕم لە لایە لە ڕوون **(وَعِشْرُونَ دِرْهَماً)** هەروەها لە لای من هەیە بیست دانە درهەم **(وَمِلْؤُهُ عَسَلاً)** هەروەها لە لای من هەیە پڕ جامێک هەنگوین، **سەرنج بدە:** هەریەکە لە وشەی «رَاقُودٌ، مَنَوانِ، عِشْرُونَ، مِلْؤُهُ» تاکن (مُفْرَد)، لە هەمان کاتدا ناڕوونییان تێدایە، بەڵام هەریەکە لە وشەی «خَلاً، سَمْناً، دِرْهَماً، عَسَلاً» ئەم ناڕوونییە لادەبەن.

**أَقُولُ: الضَّرْبُ الثَّانِي مِنْ ضُرُوبِ الْمُلْحَقِ بِالْمَفْعُولِ التَّمْيِيزُ. وَ إِنَّمَا أُلْحِقَ بِهَا لِمَا مَرَّ فِي الْحَالِ. وَالتَّمْيِيزُ رَفْعُ الْإِبْهَامِ:**

**[أ] إِمَّا عَنِ الْجُمْلَةِ، نَحْوُ قَوْلِكَ: «طَابَ زَيْدٌ نَفْساً». فَإِنَّ «طَابَ زَيْدٌ» كَلَامٌ تَامٌّ لَا إِبْهَامَ فِي أَحَدِ طَرَفَيْهِ؛ إِلَّا أَنَّ نِسْبَةَ الطِّيبِ إِلَىٰ «زَيْدٍ» مُبْهَمَةٌ، فَإِنَّهَا تَحْتَمِلُ أَنْ تَكُونَ إِلَىٰ «زَيْدٍ» أَوْ إِلَىٰ مَا يَتَعَلَّقُ بِهِ مِنَ النَّفْسِ، وَالْقَلْبِ، وَغَيْرِ ذٰلِكَ. وَ «نَفْساً»**

---

(**أَقُولُ**) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرمووێت: منیش دەڵێم: (**الضَّرْبُ الثَّانِي مِنْ ضُروبِ الْمُلْحَقِ بِالْمَفْعُولِ:**) بەشی دووەم لەو حەوت بەشانەی کە مولحەقن بە «مَنْصُوبات» (**اَلتَّمْيِيزُ**) بریتییە لەو ئیسمەی کە پێی دەگوترێت «تَمْيِيز»؛ ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: (**وَ إِنَّمَا أُلْحِقَ بِهَا**) بۆچی «تَمْيِيز» مولحەقە بە مەفعوولان؟ مامۆستا دەفەرمووێت: (**لِما مَرَّ فِي الْحالِ**) لەبەر هەمان هۆکار کە باسمان کرد لە باسی «اَلْحال» کە گوتمان: هەردووکیان زیادەنە لە ڕستەدا وەکوو یەکتری.

## پێناسەی «التَّمْيِيز» و جۆرەکانی

(**وَالتَّمْيِيزُ: رَفْعُ الإِبْهامِ**) پێناسەی «تَمْيِيز» بریتییە لە ئیسمێک کە ناڕوونی لادەبات و «غُمُوض» هەڵدەگرێت و نادیاری ناهێڵێت، لە دوو شوێن:

**یەکەم:** (**إِمَّا عَنِ الْجُمْلَةِ**) یاخود لە ڕستەیەک ناڕوونی و نادیاری لادەبات (**فِي قَوْلِكَ**) لە کاتێکدا تۆ دەڵێیت: (**طَابَ زَيْدٌ نَفْساً**) واتە: زەید پاک بوو لە ڕووی دڵ و دەروونەوە، (**فَإِنَّ طَابَ زَيْدٌ**) سەرنج بدە: ئەم ڕستەیە (**كَلامٌ تَامٌّ**) کەلامێکی تەواوە (**لَا إِبْهامَ فِي أَحَدِ طَرَفَيْهِ**) هیچ ناڕوونی و نادیارییەکی تێدا نییە، نە لە وشەی «طَابَ» و نە لە وشەی «زَيْدٌ» (**إِلّا أَنْ نِسْبَةَ الطِّيبِ زَيْدٍ إِلَى مُبْهَمَةٌ**) تەنها پاڵدان و نیسبەتی وشەی «طَابَ» بۆ لای «زَيْدٌ» نادیارە، چونکە زۆر شت هەڵدەگرێت. (**فَإِنَّهَا تَحْتَمِلُ إِلَى زَيْدٍ أَوْ إِلَى ما يَتَعَلَّقُ بِهِ، مِنَ النَّفْسِ وَالْقَلْبِ وَغَيْرِ ذَلِكَ**) چونکە کە تۆ دەڵێیت: زەید پاک بوو، زۆر شت دەگرێتەوە وەکوو جلوبەرگ و لاشەو... بۆیە ڕستەکە نادیاری تێ دەکەوێت، بەڵام کە گوتت «نَفْساً» ئەم نادیارییە نامێنیت و ڕوون دەبێتەوە (**وَنَفْساً**

**تَرْفَعُ ذٰلِكَ الْإِبْهَامَ، وَتُمَيِّزُ مَا هُوَ الْمَنْسُوبُ إِلَيْهِ فِي الْحَقِيقَةِ عَنْ غَيْرِهِ، فَالْمَعْنَىٰ: «طَابَ نَفْسُ زَيْدٍ». وَإِنَّمَا عُدِلَ عَنْ تِلْكَ الْعِبَارَةِ إِلَىٰ هٰذِهِ لِلتَّأْكِيدِ وَالْمُبَالَغَةِ؛ فَإِنَّ ذِكْرَ الشَّيْءِ مُبْهَماً ثُمَّ مُفَسَّراً أَوْقَعُ فِي النُّفُوسِ مِنْ أَنْ يُفَسَّرَ أَوَّلاً؛ فَالتَّمْيِيزُ فِعْلُ الْمُتَكَلِّمِ فِي الْحَقِيقَةِ، لٰكِنْ سُمِّيَ الِاسْمُ الَّذِي يَرْفَعُ الْإِبْهَامَ بِهِ تَمْيِيزاً مَجَازاً.**

---

(**تَرْفَعُ ذَلِكَ الإِبْهَامَ**) وشەی «نَفْساً» ئەم ناڕوونی و نادیارییە لادەبات لە ڕستەی «طابَ زَيْدٌ» بۆیە پێی دەگوترێت «تَمْيِيز» (**وَتُمَيِّزُ مَا هُوَ الْمَنْسُوبُ إِلَيْهِ فِي الْحَقِيقَةِ عَنْ غَيْرِهِ**) هەروەها ئەم وشەیە جیا دەکاتەوە کە لە ڕاستیدا نیسبەت و ئیسنادی وشەی «طَابَ»ی بۆ لا دراوە لە وشەکانی‌تر، (**فَالْمَعْنَى:**) مانای ئەم ڕستەی «طَابَ زَيْدٌ نَفْساً»ـە وای لێ دێتەوە: (**طَابَ نَفْسُ زَيْدٍ**)[1]، ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: (**وَإِنَّمَا عُدِلَ عَنْ تِلْكَ الْعِبارَةِ إِلَى هَذِهِ**) ئەی بۆچی لە عیبارەتی «طَابَ نَفْسُ زَيْدٍ» لا دراوە بۆ ئەم عبارەتە: «طَابَ زَيْدٌ نَفْساً» (**لِلتَّأْكِيدِ وَالْمُبالَغَةِ**) بۆ زیاتر موبالەغە و تەئکیدکردنەوەیە (**فَإِنَّ ذِكْرَ الشَّيْءِ مُبْهَماً**) چونکە باسکردنی هەر شتێک بە نادیاری لە سەرەتادا (**ثُمَّ مُفَسَّراً**) پاشان ڕوونی بکەیتەوە و بەیانی بکەیت (**أَوْقَعُ فِي النُّفوسِ**) کاریگەری زیاتر دەبێت لەسەر دڵ و دەروون (**مِنْ أَنْ يُفَسَّرَ أَوَّلاً**) لەوەی هەر لە سەرەتادا بە ڕاستەوخۆ ئاماژەی پێ بدەیت.

(**فَالتَّمْيِيزُ:**) ئینجا ئەوەش بزانە کە «تَمْيِيز» (**فِعْلُ الْمُتَكَلِّمِ فِي الْحَقِيقَةِ**) لە ڕاستیدا بریتییە لە کار و قسەی ئەو کەسەی کە گفتوگۆ دەکات و ڕستەکە ڕوون دەکاتەوە (**لَكِنْ سُمِّيَ الِاسْمُ الَّذِي يَرْفَعُ بِهِ الإِبْهامَ تَمْيِيزاً مَجازاً**)[2] بەڵام ئەو وشەیەی کە ڕستەکە

---

١. ئینجا بزانە ئەی قوتابی بەڕێز: هێندێک جار «تَمْيِيز» لە فاعیل نەقل دەکرێت وەکوو «طَابَ زَيْدٌ نَفْساً» یاخود وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱشْتَعَلَ ٱلرَّأْسُ شَيْبًا﴾ بۆیە ئەم ڕستەیە وای لێ دێتەوە: «وَاشْتَعَلَ شَيْبُ الرَّأْسِ»؛ هەروەها هێندێک جار لە «مَفْعُولٌ بِهِ» نەقڵ دەکرێت وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَفَجَّرْنَا ٱلْأَرْضَ عُيُونًا﴾ بۆیە ئەم ڕستەیە وای لێ دێتەوە: «وَفَجَّرْنا عُيونَ الأَرْضِ»؛ هەروەها هێندێک جار لە «مُبْتَدَأ» و «خَبَر» نەقڵ دەکرێت وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَنَا۠ أَكْثَرُ مِنكَ مَالًا﴾ بۆیە ڕستەکە وای لێ دێتەوە: «مَالِي أَكْثَرُ مِنْ مَالِكَ». بڕوانە: شرح الأنموذج: (١١٥) و همع الهوامع: (٢٦٦/٢).

٢. «من باب تسمية الشّيء باسم سببه». (نووسەر).

[ب] وَإِمَّا عَنِ الْمُفْرَدِ. وَالْمُرَادُ بِالْمُفْرَدِ هَاهُنا كُلُّ اسْمٍ تَمَّ [١] بِالتَّنْوِينِ، نَحْوُ: «عِنْدِي رَاقُودٌ خَلّاً» أي: دَنٌّ طَوِيلُ الأَسْفَلِ مُقَيَّرُ الدَّاخِلِ؛ [٢] أَوْ بِنُونِ التَّثْنِيَةِ، نَحْوُ: «عِنْدِي مَنَوَانِ سَمْناً»؛

ڕوون دەکاتەوە و «إِبْهام»ـەکە لا دەبات بە مەجاز پێی دەگوترێت: «تَمْيِيز»، ئەگینا لە ڕاستیدا (فِي الْحَقِيقَةِ) ئەو وشەیە «تَمْيِيز» نییە.

دووەم: (أَوْ عَنِ الْمُفْرَدِ) یاخود «تَمْيِيز» لە وشەیەکی تاک ناڕوونی و نادیاری لادەبات (وَالْمُرادُ بِالْمُفْرَدِ هَاهُنا) مەبەست بە وشەی «مُفْرَد» لێرەدا (كُلُّ اِسْمٍ تَمَّ) هەر ئیسمێکە کە تەواو بووبێت بە یەکێک لەم شتانەی خوارەوە، مەبەست بە تەواوبوون ئەوەیە کە ئیسمەکە بە شێوازێکە تا بەم شێوەیە بێت دروست نییە «إِضافَة» بکرێت.

یەکەم: (بِالتَّنْوِينِ) واتە: مەبەستی ئیسمێکە کە تەواو بووبێت بە هۆی «تَنْوين»ـەوە (نَحْوُ) وەکوو (عِنْدِي رَاقُودٌ خَلاً) واتە: من کووپێکی پڕم لە لایە لە سرکە (أَيْ:) وشەی «راقُودٌ» واتە: (دَنٌّ طَوِيلُ الأَسْفَلِ مُقَيَّرُ الدَّاخِلِ) کووپێک کە لای خوارەوەی درێژە و ناوەوی بەرینە و سواق دراوە بە قیر، سەرنج بدە: کاتێک دەڵێیت: «عِنْدِي رَاقُودٌ» وشەی «رَاقُودٌ» نادیارە و «إِبْهام»ـی تێدایە، چونکە دەکرێت ئاو بێت یاخود دۆشاو بێت، بەڵام کاتێک گوتت «خَلّاً» ئەم نادیاری و ئیبهامە لادەچێت بە هۆی «تَمْييز»ەکەوە، هەروەها ئیسمەکە بە «تَنْوين» تەواو بووە، واتە: تاوەکوو ئیسمەکە ئەم تەنوینەی پێوە بێت دروست نییە «إِضافَة» بکرێت.

دووەم: (أَوْ بِنُونِ التَّثْنِيَةِ) یاخود مەبەست ئیسمێکە تەواو بووبێت بە هۆی «نُونُ التَّثْنِيَة»وە (نَحْوُ) وەکوو (عِنْدِي مَنَوانِ سَمْناً) لە لای من هەیە دوو قاپی پڕ لە ڕوون، سەرنج بدە: کاتێک دەڵێیت «عِنْدِي مَنَوانِ» وشەی «مَنَوانِ» نادیارە و ئیبهامی تێدایە، چونکە دەکرێت شیر بێت یاخود دۆشاو بێت... بەڵام کاتێک گوتت «سَمْناً» ئەم نادیاری و ئیبهامە لادەچێت بە هۆی «تَمْييز»ەکەوە، هەروەها ئیسمەکە بە «نُونُ التَّثْنِيَة» تەواو بووە، واتە: تاوەکوو ئیسمەکە ئەم نوونەی پێوە بێت دروست نییە «إِضافَة» بکرێت.

**[٣] أَوْ بِنُونِ شِبْهِ الْجَمْعِ، نَحْوُ: «عِنْدِي عِشْرُونَ دِرْهَماً»؛ [٤] أَوْ بِالْإِضَافَةِ، نَحْوُ: «عِنْدِي مِلْؤُهُ عَسَلاً» أَيْ: مِلْءُ الْإِنَاءِ عَسَلاً، فَإِنَّ «رَاقُودٌ» وَ «مَنَوَانِ» وَ «عِشْرُونَ» وَ «مِلْؤُهُ» مُبْهَمَةٌ، تَحْتَمِلُ أَشْيَاءَ مُخْتَلِفَةً، وَ «خَلّاً» وَ «عَسَلاً» وَ «دِرْهَماً» وَ «سَمْناً» تَرْفَعُ ذٰلِكَ الْإِبْهَامَ وَتُمَيِّزُ مَا هُوَ الْمَقْصُودَ عَنْ غَيْرِهِ.**

---

سێیەم: (**أَوْ بِنُونِ شِبْهِ الْجَمْعِ**) یاخود مەبەست ئیسمێکە تەواو بووبێت بە هۆی «نُونُ شِبْهُ الْجَمْعِ»ـەوە (**نَحْوُ**) وەکوو (**عِنْدِي عِشْرُونَ دِرْهَماً**) واتە: لە لای من هەیە بیست دانە درهەم، سەرنج بدە: کاتێک دەڵێیت: «عِنْدِي عِشْرُونَ» وشەی «عِشْرُونَ» نادیارە و ئیبهامی تێدایە، چونکە دەکرێت مەڕ بێت یاخود دینار بێت، بەڵام کاتێک گوتت «دِرْهَماً» ئەم نادیاری و «إِبْهام»ـە لادەچێت بە هۆی «تَمْیِیز»ەکەوە، هەروەها ئیسمەکە بە «نُونُ شِبْهُ الْجَمْعِ» تەواو بووە، واتە: تاوەکوو ئیسمەکە ئەم نوونەی پێوە بێت دروست نییە «إِضافَة» بکرێت.

چوارەم: (**أَوْ بِالإِضافَةِ**) یاخود مەبەست ئیسمێکە تەواو بووبێت بە هۆی «إِضافَة»کردنەوە (**نَحْوُ**) وەکوو (**عِنْدِي مِلْؤُهُ عَسَلاً**) واتە: لەلای من هەیە پڕ بەم جامە هەنگوین، (**أَيْ مِلْؤُ الإناءِ عَسَلاً**) سەرنج بدە: کاتێک دەڵێیت: «عِنْدِي مِلْؤُهُ» وشەی «مِلْؤُهُ» نادیارە و ئیبهامی تێدایە، چونکە دەکرێت شەربەت یاخود دۆ بێت، بەڵام کاتێک گوتت «عَسَلاً» ئەم نادیاری و ئیبهامە لادەچێت، هەروەها وشەی «مِلْؤُهُ» ئیسمێکە بە هۆی «إِضَافة»وە تەواو بووە واتە: تاوەکوو ئیسمەکە ئەم نوونەی پێوە بێت دروست نییە «إِضافَة» بکرێت.

(**فَإِنَّ**) سەرنج بدە: هەریەکە لە وشەی (**رَاقُودٌ، ومَنَوانِ، وعِشْرُونَ، ومِلْؤُهُ**) وشەی تاک و «مُفْرَد»ن (**مُبْهَمَةٌ تَحْتَمِل أَشْياءً مُخْتَلِفَةً**) لە هەمان کاتدا نادیارن و ناڕوونی لە ماناکانیاندا هەیە، بەڵام هەریەکە لە وشەی (**خَلّاً، سَمْناً، دِرْهَماً، عَسَلاً**) بوونەتە «تَمْیِیز» (**تَرْفَعُ ذَلِكَ الإِبْهامَ**) ئەم ناڕوونی و نادیارییە لادەبەن (**وَيُمَيِّزُ مَاهُوَ الْمَقْصُودُ عَنْ غَيْرِهِ**) هەروەها ئەم وشەیە جیا دەکاتەوە کە لە ڕاستیدا مەبەستی سەرەکییە لە وشەکانی تر.

**وَلَابُدَّ لِلتَّمْيِيزِ مِنْ عَامِلٍ يَعْمَلُ فِيهِ، وَهُوَ إِمَّا فِعْلٌ، نَحْوُ: «طَابَ»؛ وَ إِمَّا اسْمٌ، نَحْوُ: «عِشْرُونَ».**

**وَالتَّمْيِيزُ لَا يَتَقَدَّمُ عَلَىٰ عَامِلِهِ الِاسْمِ بِالِاتِّفَاقِ لِضَعْفِ الِاسْمِ فِي الْعَمَلِ، فَلَا يُقَالُ: «دِرْهَماً عِشْرُونَ»؛ وَفِي تَقْدِيمِهِ عَلَىٰ عَامِلِهِ الْفِعْلِ خِلَافٌ،**

---

ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: (وَلَا بُدَّ لِلتَّمْيِيزِ مِنْ عَامِلٍ يَعْمَلُ فِيهِ) پێویستە لەبۆ ئەم وشەیەی دەبێتە «تَمْيِيز» عامیلێک هەبێت کە کاری تێدا بکات و «مَنْصُوب»ـی بکات (وَهُوَ إِمَّا فِعْلٌ) ئینجا جیاوازی نییە ئەم عامیلە «فِعل» بێت (نَحْوُ: طَابَ) وەکوو وشەی «طاب» کە لە نموونەکانی ڕابوردوو باسمان‌کرد، یاخود عامیلەکە «شِبْهُ الفِعل» بێت وەکوو «اِسْمُ الْفاعِل» و «اسْمُ الْمَفْعُول» و «الصِّفَة الْمُشَبَّهَة» و «اِسْمُ التَّفْضِيلِ»...[1].

(وَ إِمَّا اِسْمٌ) یاخود عامیلەکە ئیسمێکی «مُفْرَد»ە کە کار لە «تَمْيِيز»ەکە دەکات (نَحْوُ:) وەکوو (عِشْرُونَ) یاخود وشەی «رَاقُودٌ» و «مَنَوانِ» و «مِلْؤُهُ».

ئینجا مامۆستا دێتە سەر بابەتێکی‌تر و دەفەرموێت: (وَالتَّمْيِيزُ لَا يَتَقَدَّمُ عَلَى عَامِلِهِ الِاسْمِ بِالاتِّفاقِ) واتە: ئەو وشەیەی کە بۆتە «تَمْيِيز» بە هیچ شێوەیەک لەسەر ئەو عامیلە وەپێش ناکەوێت کە ئیسمە، وەکوو وشەی «رَاقُودٌ» و «مَنَوانِ» و «عِشْرُونَ» و «مِلْؤُهُ» لەسەر ڕای تێکڕای زانایانی زانستی «نَحو»، لەبەر چی دروست نییە؟ (لِضُعْفِ الِاسْمِ فِي الْعَمَلِ) چونکە «اِسْم» لاواز و بێ‌هێزە لە کارکردندا و موشابەهەیەکی زۆر بێ‌هێزی هەیە لەگەڵ «فِعل»، بۆیە «مَعْمُول»ـەکەی لەسەر وەپێش ناکەوێت (فَلَا يُقالُ:) کەواتە: دروست نییە بگوترێت: (دِرْهَماً عِشْرُونَ) وشەی «دِرْهَماً» کە «تَمْيِيز»ە لەسەر عامیلی خۆی پێش بکەوێت، هەروەها دروست نییە هیچ نیوانێکیش (فَصْل) هەبێت لە نێوان «تَمْيِيز»[2] و ئەو عامیلەی کە ئیسمە.

(وَفِي تَقْدِيمِهِ عَلَى عَامِلِهِ الْفِعْلِ خِلافٌ) بەڵام سەبارەت بە وەپێشکەوتنی «تَمْيِيز»

---

١. بڕوانە: الانصاف فی مسائل الخلاف: (٣١٢) و شرح المفصل: ٢/ ٤١)

٢. بڕوانە: شرح كافية ابن الحاجب الكوردي: (١٠٧/٢)

**فَبَعْضُهُمْ جَوَّزَهُ لِقُوَّةِ الْفِعْلِ فِي الْعَمَلِ مُتَمَسِّكاً بِقَوْلِ الشَّاعِرِ:**

**أَتَهْجُرُ لَيْلَىٰ بِالْفِرَاقِ حَبِيبَهَا وَمَا كَادَ نَفْساً بِالْفِرَاقِ تَطِيبُ**

**فَإِنَّ «نَفْساً» قَدْ تَقَدَّمَ عَلَىٰ «تَطِيبُ». وَالْمُخْتَارُ**

---

لەسەر ئەو عاملەی کە فیعلە ڕاجیایی هەیە لە نێوان زانایان و مەداریسی «نَحْو»دا (فَبَعْضُهُمْ جَوَّزُوهُ) بەشێک لە زانایان وەکوو «مُبَرّد» و «مازني» و «کوفییەکان» بە دروستیان داناوە کە «تَمْییز» لەسەر ئەو عاملە وەپێش بکەوێت کە فیعلە (لِقُوَّةِ الْفِعْلِ فِي الْعَمَلِ) چونکە «فِعْل» بەهێزە لە کارکردندا بۆیە «مَعْمُول»ەکەی لەسەر وەپێش دەکەوێت، (مُتَمَسِّكاً بِقَوْلِ الشَّاعِرِ)[1] بەڵگەشیان بەم شیعرە هێناوەتەوە کە شاعیر دەڵێت:

(أَتَهْجُرُ لَيْلَى بِالْفِرَاقِ حَبِيبَهَا وَمَا كَادَ نَفْساً بِالْفِرَاقِ تَطِيبُ)[2]

(فَإِنَّ نَفْساً) سەرنج بدە: وشەی «نَفْساً» بۆتە «تَمْییز» (قَدْ تَقَدَّمَ عَلَى تَطِيبُ)[3] لەسەر عاملە فیعلەکەیشی وەپێش کەوتووە کە بریتییە لە وشەی «تَطِيبُ»؛ (وَالْمُخْتَارُ)

---

١. ئەم شیعرە: هێندێک دەفەرموون: هی «مُخَبَّل السَّعْدِي»ـیە هێندێکیش دەفەرموون: هی «أَعْشَى همدان» هێندێکیش دەفەرموون: هی «قَیْس بن مُلَوّح العَامِرِي»ـیە کە لە ڕاستیدا لە شیعرەکانی «مجنون» دەچێت. بڕوانە: لسان العرب: (٢/ ٢٨٣).

٢. واتە: ئایە خۆشەویستی من کە ناوی «لَيْلَى» بە دابڕان و کۆچکردن لە خۆشەویستەکەی خۆی دڵخۆش دەبێت؟! لە کاتێکدا کە هیچ کەسێک بە هیجران و جیابوونەوە لە ئەوینداری خۆی دڵخۆش و ئاسوودە نابێت.

٣. ئیعرابی شیعرەکە بەم شێوەیە: «أَتَهْجُرُ» الهمزة للاستفهام الإنكاري «تَهْجُرُ» فعل مضارع مرفوع، «لَيْلَى» في تقدير الرفع فاعل لـ«تَهْجُرُ» و«بِالْفِرَاقِ» جار ومجرور متعلقان بـ«تَهْجُرُ» و «حَبِيبَهَا» مفعول به وهو «مُضافٌ» الى الهاء، و«ها» مضاف إليه «وَمَا» الواو حالية، و «مَا» حرف نفي و«كَادَ» فعل ماض ناقص واسمها ضمير الشأن و«نفسا» تمييز منصوب مقدم على عامله، و هو تطيب و«بِالْفِرَاقِ» جار ومجرور متعلقان بـ (تَطِيبُ) و «تَطِيبُ» فعل مضارع مرفوع وفاعله ضمير مُسْتَتِرٌ فيه جوازا تقديره هي يرجع إلى لَيْلَى وَجُمْلة تطيب في محل النصب خبر «كاد» و جملة «وَمَا كَادَ.....» في محل النصب حال. بڕوانە: شرح ابن عقيل: (٢/٢٤٥) والانصاف فى مسائل الخلاف: (٣١٢) و شرح المفصل: ٢/ ٤١)

**عَدَمُ الْجَوَازِ؛ لِأَنَّ الْفِعْلَ وَ إِنْ كَانَ قَوِياً فِي الْعَمَلِ، لكِنَّ الْمَانِعَ مِنَ التَّقْدِيمِ عَلَيْهِ مَوْجُودٌ، وَهُوَ أَنَّ التَّمْيِيزَ فِي الْحَقِيقَةِ فَاعِلٌ كَمَا ذَكَرْنَا، وَالْفَاعِلُ لَا يَتَقَدَّمُ عَلَى الْفِعْلِ.**

**وَالْجَوَابُ عَنِ الْبَيْتِ أَنَّ الرِّوَايَةَ الْفَصِيحَةَ: وَمَا كَادَ نَفْسِي بِالْفِرَاقِ تَطِيبُ عَلَىٰ أَنَّ «نَفْسِي» اسْمُ كَادَ وَ «تَطِيبُ» خَبَرُهُ.**

---

بەڵام بەشێکی‌تر لە زانایان وەکوو «سِيبَوَيْهِ» و «اِبْنُ عُصْفُور» و «بەسرییەکان» بە دروستی نازانن کە «تَمْيِيز» لەسەر ئەو عامیلە وەپێش بکەوێت، تەنانەت ئەگەر فیعلیش بێت (**لأَنَّ الْفِعْلَ وَ إِنْ كَانَ قَوِياً فِي الْعَمَلِ**) چونکە «فِعْل» هەرچەندە بەهێز بێت لە کارکردندا (**لَكِنَّ الْمَانِعَ مِنَ التَّقْدِيمِ عَلَيْهِ مَوْجُودٌ**) بەڵام ئەوەی کە ڕێگرە لە وەپێشکەوتنی «تَمْيِيز» لەسەر عامیلە فیعلەکەی، شتێکی دیار و بەرچاوە، (**وَهُوَ أَنَّ التَّمْيِيزَ فِي الْحَقِيقَةِ فَاعِلٌ**) ئەویش بریتییە لەوەی کە «تَمْيِيز» لە ڕاستیدا «فَاعِل»ـە (**كَمَا ذَكَرْنَاهُ**) هەروەکوو کەمێک پێش ئێستا باسمانکرد، «فَاعِل»ـیش بە هیچ شێوەیەک وەپێش فیعلێ ناکەوێت. (**وَالْفاعِلُ لا يَتَقَدَّمُ عَلَى الْفِعْلِ**) شتێکی ڕوون و ئاشکراشە کە «فَاعِل» بە هیچ جۆرێک لەسەر فیعلی خۆی وەپێش ناکەوێت.

هێندیکی‌تریش لە زانایان دەفەرموون ئەگەر ڕیوایەتی یەکەم ڕاست و دروستیش بێت ئەوە لەبەر «ضَرُورَةُ الشِّعْر» ڕێگا دراوە، بەڵام لە شوێنەکانی‌تر دروست نییە.

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: (**وَالْجَوابُ عَنِ الْبَيْتِ**) ئەی چی لەم بەیتە شیعرە دەکەن و چۆن وەڵامی دەدەنەوە؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: (**أَنَّ الرِّوايَةَ الْفَصِيحَةَ**) ڕیوایەتی ڕاست و دروست بەم شێوەیە: (**وَمَا كَادَ نَفْسِي**) ئەو کاتە وشەی «نَفْس» نابێتە «تَمْيِيز» (**عَلَى أَنَّ نَفْسِي اِسْمُ كَادَ**) بەڵکوو وشەی «نَفْسِي» لە تەقدیری ڕەفعەدا دەبێتە «اِسْم» بۆ وشەی «كَادَ» کە «فِعْلُ الْمُقارَبَة»یە (**وَتَطِيبُ خَبَرُهُ**) هەروەها ڕستەی «تَطِيبُ»ش دەبێتە خەبەر بۆ وشەی «كَادَ».

## جیاوازی نێوان «حَال» و «تَمْيِيز»

**ئینجا بزانە:** ئەو وشەیەی دەبێت بە «حال» لەگەڵ ئەو وشەیەی دەبێت بە «تَمْيِيز» لە ڕووی ماناوە زۆر لە یەکتری نزیکن، چونکە هەردووکیان «مَنْصُوبْ»

............................................................................................................

دەبن، هەروەها هەردووكیان لە ڕستەدا زیادەن (فُضْلَة)، بەڵام لەم خاڵانەی خوارەوە لە یەكتری جیاوازن:

**یەكەم:** لە ڕووی ماناوە ئەو وشەیەی دەبێت بە «حال» بەیانی ئەو نادیارییە دەكات كە لە شێوازی هاتنی «فَاعِل» یاخود «مَفْعُولُ بِهِ»ـیدا دروست بووە، واتە: بەیانی «هَيْئَةِ الْفاعِلِ أَوْ الْمَفْعُولِ بِهِ» دەكات، هەروەكوو باسمان‌كرد.

**دووەم:** لە ڕووی «لَفْظ»ـەوە ئەو وشەیەی دەبێت بە «حال» بە زۆری وایە كە دەبێت ئیمسێكی «مُشْتَق» بێت، وەكوو «جَاءَني زَيْدٌ رَاكِباً، أَوْ ضَرَبْتُ زَيْداً قَائِماً» بەڵام ئەو وشەیەی دەبێت بە «تَمْيِيز» بە زۆری وایە كە دەبێت ئیسمێكی «جَامِد» بێت، وەكوو «طَابَ زَيْدٌ نَفْساً، أَوْ عِنْدِي عِشْرُونَ كِتاباً».

**سێیەم:** ئەو وشەیەی دەبێت بە «حال» هێندێك جار ئیسمێكی «مُفْرَدْ» دەبێت وەكوو «كَتَبْتُ الدَّرْسَ جَالِساً» وە هێندێك جاریش ڕستە (جُمْلَة) دەبێت وەكوو «تَكَلَّمْتُ مَعَ مُحَمَّدٍ وَهُوَ يَضْحَكُ»، بەڵام ئەو وشەیەی دەبێت بە «تَمْيِيز» هەمیشە تاك (مُفْرَد) دەبێت، هەرگیز ڕستە (جُمْلَة) نابێت.

**چوارەم:** زانایانی زانستی «نحو» یەكدەنگن: كە دروستە ئەو وشەیەی دەبێت بە «حال» لەسەر عامیلی خۆی پێش بكەوێت، جیاوازی نییە عامیلەكەی «فِعْل» بێت یاخود «اِسْم» بێت، وەكوو: «قَائِماً ضَرَبْتُ زَيْداً»؛ بەڵام زانایانی زانستی «نحو» یەكدەنگن كە دروست نییە ئەو وشەیەی دەبێت بە تەمییز لەسەر عامیلی خۆی پێش بكەوێت ئەگەر ئیسم بێت، چونكە ئیسم عامیلێكی بێ‌هێزە لە كاركردندا، هەروەها زۆربەی زانایانی بەسری و كووفی و پێشەوا «سیبویە» و «فَراء»... دەفەرموون: دروست نییە تەمییز لەسەر عامیلی خۆی پێش بكەوێت ئەگەر فیعلیش بێت، چونكە تەمییز لە «حَقِيقَة»دا فاعیلە و دروستیش نییە فاعیل لەسەر فیعلی خۆی پێش بكەوێت، بەم شێوەیەش بە ڕوونی جیاوازی نێوان «حال» لەگەڵ «تَمْییز» ئاشكرا بوو[1].

---

١. بڕوانە: شرح قطر النّدی: (٣٢٢) والانصاف فی مسائل الخلاف: (٣١٨)

## الْمُسْتَثْنَىٰ

**قَالَ: وَالْمُسْتَثْنَىٰ بِـ «إِلَّا» بَعْدَ كَلَامٍ مُوجَبٍ، نَحْوُ: «جَاءَنِي الْقَوْمُ إِلَّا زَيْداً»، أَوْ بَعْدَ كَلَامٍ غَيْرِ مُوجَبٍ، نَحْوُ: «مَا جَاءَنِي أَحَدٌ إِلَّا زَيْداً»، وَإِنْ كَانَ الْفَصِيحُ هُوَ الْبَدَلَ.**

---

## وانەی چل‌وپێنجەم: باسی «اَلْمُسْتَثْنَى وَأَنْوَاعُهُ»

**(قالَ:)** مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: **(وَالْمُسْتَثْنَى بِـ «إِلّا»)** یەکێکی‌تر لەو ئیسمانەی مولحەقە بە مەفعوولان بریتییە لەو ئیسمەی کە جیا دەکرێتەوە لە ڕستەی پێش خۆی بە هۆی ئامرازی «إِلّا»، ئینجا جیاوازی نییە **(بَعْدَ كَلامٍ مُوجَبٍ)**[1] ئەم «اَلْمُسْتَثْنَى»یە لەدوای ڕستەیەکی ئەرێ (موجب) هاتبێت ئەو کاتە بە واجبیی «مَنْصُوبٌ» دەبێت **(نَحْوُ:)** وەکوو ئەم نموونەیە: **(جَاءَنِي الْقَوْمُ إِلّا زَيْداً)** واتە: هەموو خەڵکی هاتە لای من تەنها زەید نەبێت، **سەرنج بدە:** وشەی «زَيْداً» لەم نموونەیەدا پێی دەگوترێت: «اَلْمُسْتَثْنَى بِإِلّا» هەروەها «واجِبُ النَّصْب»ـە، چونکە لەدوای ڕستەیەکی ئەرێ (مُوجَبٌ) هاتووە.

**(أَوْ)** یاخود ئەم «اَلْمُسْتَثْنَى»یە **(بَعْدَ كَلامٍ غَيْرِ مُوجَبٍ)** لەدوای ڕستەیەکی نەرێ (غَيْرَ مُوجَب) هاتبێت ئەو کاتەش «مَنْصُوبٌ» دەبێت، **(نَحْوُ:)** وەکوو ئەم نموونەیە: **(مَا جَاءَنِي أَحَدٌ إِلّا زَيْداً)** واتە: هیچ کەسێک نەهاتۆتە لای من تەنها زەید نەبێت، **سەرنج بدە:** وشەی «زَيْداً» لەم نموونەیە پێی دەگوترێت: «اَلْمُسْتَثْنَى بِإِلّا» لە هەمان کاتدا «مَنْصُوبٌ» بووە **(وَ إِنْ كَانَ الْفَصِيحُ فِيهِ هُوَ الْبَدَلَ)** هەرچەندە بۆچوونی ڕاستر ئەوەیە کە وشەی «زَيْد» بە مەرفووعی بخوێندرێتەوە و ببێتە «بَدَلٌ» لەبری وشەی «أَحَدٌ» چونکە لەدوای ڕستەیەکی نەرێ (مَنْفِي) هاتووە.

° °

---

١. بڕوانە: شرح كافية ابن الحاجب: ١٦٣/٢.

**أَقُولُ: الضَّرْبُ الثَّالِثُ مِنْ ضُرُوبِ الْمُلْحَقِ بِالْمَفْعُولِ، الْمُسْتَثْنَىٰ. وَ إِنَّمَا أُلْحِقَ بِهِ لِأَنَّهُ إِمَّا فَضْلَةٌ فِي الْكَلَامِ أَوْ مَفْعُولٌ فِي الْحَقِيقَةِ، كَمَا سَيَتَحَقَّقُ بُعَيْدَ هٰذَا.**

**وَالْمُسْتَثْنَىٰ إِمَّا بِـ «إِلَّا»، أَوْ بِغَيْرِ «إِلَّا». وَالثَّانِي هُوَ الْمُسْتَثْنَىٰ إِمَّا بِـ «مَا عَدَا» أَوْ بِـ «مَا خَلَا» أَوْ «لَيْسَ» أَوْ «لَا يَكُونُ»، نَحْوُ: «جَاءَنِي الْقَوْمُ مَا عَدَا زَيْداً وَ**

---

(**أَقُولُ**) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (**الضَّرْبُ الثَّالِثُ مِنْ ضُروبِ الْمُلْحَقِ بِالْمَفْعُولِ:**) **بەشی سێیەم:** لەو حەوت بەشانەی کە مولحەقن بە «مَنْصُوبات» (**اَلْمُسْتَثْنَى**) بریتییە لەو ئیسمەی کە پێی دەگوترێت «اَلْمُسْتَثْنَى»؛ ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: (**وَ إِنَّمَا أُلْحِقَ بِهِ**) بۆچی «اَلْمُسْتَثْنَى» مولحەقە بە مەفعوولان؟ (**لِأَنَّهُ**) مامۆستا دەفەرموێت: لەبەر دوو شتان: **یەکەم** (**إِمَّا فُضْلَةٌ فِي الْكَلَامِ**) یاخود لەبەر ئەوەیە کە هەردووکیان وەکوو یەکتر زیادەنە لە ڕستەدا، واتە: ڕستەکە بەبێ ئەوانیش هەر تەواوە؛ **دووەم** (**أَوْ مَفْعُولٌ فِي الْحَقِيقَةِ**) یاخود لە ڕاستیدا «اَلْمُسْتَثْنَى»ش هەر بە «مَفْعُولٌ» دادەندرێت: (**كَمَا سَيَتَحَقَّقُ بُعَيْدَ هَذا**) هەروەکوو پاش کەمێکی‌تر باشتر ڕوون دەبێتەوە.

## باسی جۆرەکانی «مُسْتَثْنَى»

ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: (**وَالْمُسْتَثْنَى**) ئەو ئیسمەی لە ڕستەی پێش خۆی جیا دەکرێتەوە (**إِمَّا بِ «إِلَّا»**) یاخود بە هۆی وشەی «إِلَّا» جیا دەکرێتەوە (**أَوْ بِغَيْرِ إِلَّا**) یاخود بە هۆی وشەیەکی‌تری جگە لە «إِلَّا» جیا دەکرێتەوە، (**وَالثَّانِي**) ئەوەی دووەمیان چەند بەشێکی سەرەکی هەیە:

## حوکمی «مُسْتَثْنَى» بە وشەی «مَاعَدَا» و «مَاخَلا» و «لَيْسَ» و «لَايَكُونُ»

**بەشی یەکەم:** (**هُوَ الْمُسْتَثْنَى**) بریتییە لەو ئیسمەی کە لە ڕستەی پێش خۆی جیا دەکرێتەوە بەم وشانەی خوارەوە: (**إِمَّا بِـ**) یا بە وشەی (**مَا عَدَا، أَوْ بِـ**) یا بە وشەی (**مَا خَلَا. أَوْ بِـ**) یاخود بە وشەی (**لَيْسَ، أَوْ**) یاخود بە وشەی (**لايَكُونُ. نَحْوُ:**) وەکوو ئەم نموونانەی خوارەوە: (**جَاءَنِي الْقَوْمُ مَاعَدَا زَيْداً. أَوْ**) یاخود وەکوو «**جَاءَنِي الْقَوْمُ**

**مَا خَلَا زَيْداً وَلَيْسَ زَيْداً وَلَايَكُونُ زَيْداً».**

**وَذٰلِكَ وَاجِبُ النَّصْبِ؛ لِأَنَّ هٰذِهِ الْكَلِمَاتِ أَفْعَالٌ أُضْمِرَ فَاعِلُوهَا، وَالتَّقْدِيرُ: «مَا عَدَا وَمَا خَلَا وَلَيْسَ وَلَا يَكُونُ بَعْضُهُمْ زَيْداً».**

**وَ إِمَّا بِـ «غَيْرٍ» وَ «سِوَىٰ» وَ**

---

**(مَاخَلا زَيْداً)**». **(أَوْ)** یاخود وەكوو «جَاءَنِي الْقَوْمُ **(لَيْسَ زَيْداً)**» یاخود وەكوو «جَاءَنِي الْقَوْمُ **(لَا يَكُونُ زَيْداً)**». ئینجا مامۆستا باسی حوكمی ئەم جۆرە «مُسْتَثْنَى»یە دەكات و دەفەرموێت: **(وَذٰلِكَ وَاجِبُ النَّصْبِ)** حوكمی «مُسْتَثْنَى» لەدوای ئەم چوار وشانە «وَاجِبُ النَّصْبَ»یە، واتە: هەر ئیسمێک لەدوای ئەم چوار وشانە بێت، جگە لە نەسبە دروست نییە بە هیچ جۆرێكی تر بخوێندرێتەوە، وەكوو ئەم نموونانەی كە باسمان كردن.

ئینجا ئەگەر كەسێک پرسیار بكات و بڵێت: لەبەر چی «مُسْتَثْنَى» لەدوای ئەم چوار وشانە «وَاجِبُ النَّصْب»ـەیە؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: **(لأَنَّ هَذهِ الْكَلِماتِ أَفْعالٌ)** چونكە ئەم وشانە لە ڕاستیدا فیعلن **(أُضْمِرَ فَاعِلُوها)** هەردوو وشەی «مَاعَدَا» و «مَاخَلا» فاعیلیان تێدا «مُسْتَتِر»ە و «راجِعٌ إِلَى الْبَعْضِ»، چونكە ئەم دوو وشەیە فیعلی «حقيقي»ـن و وشەی «ما الْمَصْدَرِيَّة»یان چۆتە سەر؛ هەروەها هەردوو وشەی «لَيْسَ» و «لَا يَكُونُ» ئیسمیان تێدا «مُسْتَتِر»ە و «راجِعٌ إِلَى الْبَعْضِ»، چونكە ئەم دوو وشەیە فیعلی «ناقِص»ـن، **(وَالتَّقْدِيرُ:)** بۆیە ئەم چوار وشەیە وایان لێ دێتەوە: «جَاءَنِي الْقَوْمُ **(مَاعَدَا)** بَعْضُهُمْ زَيْداً». **(أَوْ)** یاخود «جَاءَنِي الْقَوْمُ **(مَاخَلا)** بَعْضُهُمْ زَيْداً». **(أَوْ)** یاخود «جَاءَنِي الْقَوْمُ **(لَيْسَ)** بَعْضُهُمْ زَيْداً». **(أَوْ)** یاخود «جَاءَنِي الْقَوْمُ **(لَايَكُونُ بَعْضُهُمْ زَيْداً)** ئەوكاتە وشەی «زَيْداً» دەبێتە «مَفْعُول بِه» لە دوو نموونەی یەكەم و هەروەها دەبێتە «خَبَر» لە دوو نموونەی دووەم.

## حوكمی «مُسْتَثْنَى» بە وشەی «غَيْر» و «سِوَى» و «سَواء»

**(وَ)** بەشی دووەم: بریتییە لەو ئیسمەی كە لە ڕستەی پێش خۆی جیا دەكرێتەوە بەم وشانەی خوارەوە: **(إِمَّا بِـ)** یا بە وشەی **(غَيْرٍ، وَ)** هەروەها بە وشەی **(سِوَى، وَ)**

**«سَوَاءٍ»، نَحْوُ: «جَاءَنِي الْقَوْمُ غَيْرَ زَيْدٍ، وَ سِوَىٰ زَيْدٍ، وَسَوَاءَ زَيْدٍ». وَذٰلِكَ وَاجِبُ الْجَرِّ؛ لِأَنَّهُ مُضَافٌ إِلَيْهِ.**

**وَ إِمَّا بِـ «حَاشَا» وَ «خَلَا» وَ «عَدَا» وَ «لَا سِيَّمَا»، نَحْوُ: «جَاءَنِي الْقَوْمُ حَاشَا زَيْداً، وَخَلَا زَيْداً، وَعَدَا زَيْداً، وَلَا سِيَّمَا زَيْداً».**

---

هەروەها بە وشەی (سَواءٍ. نَحْوُ:) وەکوو ئەم نموونانەی خوارەوە: (جَاءَنِي الْقَوْمُ غَيْرَ زَيْدٍ. وَ) هەروەها وەکوو «جَاءَنِي الْقَوْمُ (سِوَى زَيْدٍ)». (وَ) هەروەها وەکوو «جَاءَنِي الْقَوْمُ (سَواءَ زَيْدٍ)».

ئینجا مامۆستا باسی حوکمی «مُسْتَثْنَى» بەم وشانە دەکات و دەفەرموێت: (وَذَلِكَ وَاجِبُ الْجَرِّ)[1] حوکمی «مُسْتَثْنَى» لەدوای ئەم سێ وشانە «وَاجِبُ الْجَرّ»ە، واتە: هەر ئیسمێک لە دوای ئەم سێ وشانە بێت جگە لە «جَرّ»ە دروست نییە بە هیچ جۆرێکی‌تر بخوێندرێتەوە، وەکوو ئەم نموونانەی کە باسمان‌کردن، ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: لەبەر چی «مُسْتَثْنَى» لەدوای ئەم چوار وشانە «وَاجِبُ الْجَرّ»ەیە؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: (لأَنَّهُ مُضافٌ إِلَيْهِ) چونکە ئەو «مُسْتَثْنَى»یەی دەکەوێتە دوای ئەم سێ وشانە، دەبێتە «مُضافٌ إِلَيْهِ»، هەر وشەیەکیش ببێتە «مُضافٌ إِلَيْهِ» واجبە بە مەجرووری بخوێندرێتەوە.

## حوکمی «مُسْتَثْنَى» بە وشەی «حَاشَا» و «عَدَا» و «خَلَا» و «لاسِيَّمَا»

**بەشی سێیەم:** بریتییە لەو ئیسمەی کە لە ڕستەی پێش خۆی جیا دەکرێتەوە بەم وشانەی خوارەوە: (إِمَّا بِـ) یاخود بە وشەی (حَاشَا، وَ) هەروەها بە وشەی (عَدَا، وَ) هەروەها بە وشەی (خَلَا، وَ) هەروەها بە وشەی (لاسِيَّمَا، نَحْوُ:) وەکوو ئەم نموونانەی خوارەوە: (جَاءَنِي الْقَوْمُ حَاشَا زَيْداً. وَ) هەروەها وەکوو «جَاءَنِي الْقَوْمُ (عَدَا زَيْداً)». (وَ) هەروەها وەکوو «جَاءَنِي الْقَوْمُ (خَلَا زَيْداً)». (وَ) هەروەها وەکوو «جَاءَنِي الْقَوْمُ (لاسِيَّمَا زَيْداً)»؛ ئینجا مامۆستا باسی حوکمی «مُسْتَثْنَى» بەم

---

١. بڕوانە: النحو الوافي: ١/٢٤٥.

**وَهٰذَا يَجُوزُ فِيهِ أَنْوَاعُ الْإِعْرَابِ. أَمَّا فِي حَاشَا وَعَدَا وَخَلَا، فَالرَّفْعُ عَلَى الْفَاعِلِيَّةِ بِنَاءً عَلَىٰ أَنَّهَا أَفْعَالٌ لَازِمَةٌ وَمَا بَعْدَهَا فَاعِلُوهَا؛ وَالنَّصْبُ عَلَىٰ الْمَفْعُولِيَّةِ بِنَاءً عَلَىٰ أَنَّهَا قَدِ اسْتُعْمِلَتْ مُتَعَدِّيَةً، يُقَالُ: «حَاشَاكَ وَعَدَاكَ وَخَلَاكَ»، أَيْ: تَجَاوَزَكَ؛ وَالْجَرُّ بِنَاءً عَلَىٰ أَنَّهَا حُرُوفُ الْجَرِّ.**

---

وشانە دەکات و دەفەرموێت: (وَهَذا يَجُوزُ فِيهِ أَنْواعُ الإِعْرابِ) ئەو وشەیەی دەبێتە «مُسْتَثْنَى» لەدوای ئەم چوار وشانە، هەرسێ جۆری ئیعرابی تێدا دروستن، واتە ڕەفعە و نەسبە و جەڕڕە.

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: بۆچی ئەم وشانە هەرسێ جۆری ئیعرابیان تێدا دروستە؟ مامۆستا بەم شێوەیە وەڵام دەداتەوە: (أَمَّا) سەبارەت بە وشەی (حَاشَا. وَ) هەروەها بە وشەی (عَدا. وَ) هەروەها بە وشەی (خَلَا) ئەم سێ وشانە (فَالرَّفْعُ عَلَى الْفَاعِلِيَّةِ) بۆیە دروستە ئەو ئیسمەی دەکەوێتە دوای ئەم سێ وشانە بە مەرفووعی بخوێندرێتەوە (بِناءً عَلَى أَنَّهَا أَفْعالٌ لازِمَةٌ) ئەم بۆچوونە لەسەر ئەوە بونیاد نراوە کە ئەم سێ وشەیە فیعلی «لازِم»ـن و تەنها پێویستیان بە فاعیل هەیە (وَمَا بَعْدَهَا فَاعِلُوهَا) وە ئەو ئیسمانەی دەکەونە دوای ئەم وشانە دەبن بە «فَاعِل» بۆ ئەم سێ وشانە.

(وَالنَّصْبُ عَلَى الْمَفْعُولِيَّةِ) هەروەها بۆیە دروستە ئەو ئیسمەی دەکەوێتە دوای ئەم سێ وشانە بە «مَنصوب»ی بخوێندرێنەوە (بِناءً أَنَّهَا قَدْ أُسْتُعْمِلَتْ مُتَعَدِيَّةً) ئەم بۆچوونە لەسەر ئەوە بونیاد نراوە کە ئەم سێ وشانە هێندێک جار بە «مُتَعَدِّي» بەکار هاتوون، جا کاتێ ئەم سێ وشانە فیعلی «مُتَعَدِّي» ین پێویستیان هەم بە «فاعِل» هەیە هەم بە «مَفْعُولُ بِهِ» (يُقالُ) دەگوترێت: (حَاشَاكَ وَعَداكَ وَخَلاكَ) لەو کاتەی کە موتەعەددین بۆیە ئەو ئیسمانەی دەکەونە دوای ئەم وشانە دەبن بە «مَفْعُولُ بِهِ» (أَيْ: تَجاوَزَكَ).

(وَالْجَرُّ عَلَى أَنَّها حُروفُ الْجَرِ) هەروەها بۆیە دروستە ئەو ئیسمانەی دەکەونە دوای ئەم سێ وشانە بە مەجرووری بخوێندرێنەوە، ئەم بۆچوونە لەسەر ئەوە بونیاد نراوە کە ئەم سێ وشە «حَرْفُ الْجَرّ»ن و ئەو ئیسمەی دوای خۆیان مەجروور دەکەن.

**وَأَمَّا فِي لَا سِيَّمَا، فَالرَّفْعُ عَلَىٰ أَنَّهُ مُرَكَّبٌ مِنْ «لَا» وَ «سِيَّ» وَ «مَا». و «سِيٌّ» بِمَعْنَى: الْمِثْلِ، وَأَصْلُهُ «سِوْيٌ» بِسُكُونِ الْوَاوِ، فَقُلِبَتِ الْوَاوُ يَاءً وَأُدْغِمَتْ فِيهِ؛ فَيَكُونُ «مَا» بِمَعْنَى: «شَيْءٍ»، وَأُضِيفَ إِلَيْهِ «سِيٌّ»، وَيَكُونُ «زَيْدٌ» مَرْفُوعاً عَلَىٰ أَنَّهُ خَبَرُ مُبْتَدَإٍ مَحْذُوفٍ، وَالتَّقْدِيرُ: «جَاءَنِي الْقَوْمُ لَا مِثْلَ شَيْءٍ هُوَ زَيْدٌ»، وَالنَّصْبُ عَلَىٰ أَنَّ «لَا سِيَّمَا» كَلِمَةٌ وَاحِدَةٌ بِمَعْنَىٰ إِلَّا، فَمَا بَعْدَهَا مُسْتَثْنَىٰ،**

---

(وَأَمَّا فِي لَاسِيَّمَا) هەروەها سەبارەت بە وشەی «لَاسِيَّمَا» (فَالرَّفْعُ) بۆیە دروستە ئەو ئیسمەی دەکەوێتە دوای ئەم وشەیە بە مەرفووعی بخوێندرێتەوە (عَلَى أَنَّهُ مُرَكَّبٌ مِنْ) ئەم بۆچوونە لەسەر ئەوە بونیاد نراوە کە «لَاسِيَّمَا» لە هەرسێ وشەی (لا، وَ) هەروەها وشەی (سِيَّ، وَ) هەروەها وشەی (مَا) لێکدراوە (وَالسِّيُّ) وە وشەی «سيّ» (بِمَعْنَى الْمِثْلِ) بە مانای هاووێنە (مِثْل) دێت (وَأَصْلُهُ) وە وشەی «سِيّ» لە ئەسڵدا (سِوْيٌ بِسُكُونِ الْواوِ) بووە، (فَقُلِبَتِ الْواوُ يَاءً) ئینجا پیتی واوەکە کراوە بە «یاء» و بووە «سِيْيَ» (وَأُدْغِمَتْ فِيهِ) پاشان هەردوو پیتی «یاء» تێکدا دەغم کراون و بووە بە «سِيّ»، (فَيَكُونُ «مَا») کەواتە: وشەی «ما» (بِمَعْنَى) بە مانای (شَيْءٍ) دێت (فَأُضِيفَ إِلَيْهِ «سِيُّ») ئینجا وشەی «سِيُّ» «إضافة» کراوە بۆ لای وشەی «ما» (وَيَكُونُ زَيْدٌ مَرْفُوعاً) ئینجا وشەی «زَيْدٌ» لەدوای ئەم وشەیە بە مەرفووعی دەخوێندرێتەوە (عَلَى أَنَّهُ خَبَرُ مُبْتَدَأٍ مَحْذُوفٍ) لەسەر ئەو ئەساسەی کە بووە بە «خَبَرْ» بۆ موبتەدایەکی «حذف»کراو، (وَالتَّقْدِيرُ) بۆیە ڕستەکە وای لێ دێتەوە: (جَاءَنِي الْقَوْمُ لا مِثْلَ شَيْءٍ هُوَ زَيْدٌ)[1].

(وَالنَّصْبُ) هەروەها بۆیە دروستە ئەو ئیسمەی دەکەوێتە دوای ئەم وشانە بە «مَنْصُوب»ـی بخوێندرێتەوە، (عَلَى أَنَّ لَاسِيَّمَا كَلِمَةٌ وَاحِدَةٌ) ئەم بۆچوونە لەسەر ئەو ئەساسە بونیاد نراوە کە وشەی «لَاسِيَّمَا» هەمووی بەیەکەوە بە یەک وشە حیساب دەکرێت: (بِمَعْنَى إِلّا) بە مانای «إِلّا» دێت (فَمَا بَعْدَهُ مُسْتَثْنَى) ئینجا ئەو وشەیەی

---

١. ئەو کاتە ئیعرابەکەی بەم شێوەیە: «جَاءَ» فعل ماض «وَالْيَاءُ» في محلّ النّصب مفعول به و «اَلْقَوْمُ:» فاعله، و «لا» نافية للجنس و«مِثْلَ» اسم «لا» مضاف إلى شيء وهو مضاف إليه و«هُوَ» في محلّ الرّفع مبتدأ و«زَيْدٌ» خبره والجملة في محل الرفع خبر (لا).

**وَالْجَرُّ عَلَىٰ أَنَّ «مَا» زَائِدَةٌ وَ «سِيَّ» مُضَافٌ إِلَىٰ «زَيْدٍ».**

**وَالْأَوَّلُ أَعْنِي: الْمُسْتَثْنَىٰ بِـ «إِلَّا» إِمَّا مُتَّصِلٌ وَهُوَ الْمُخْرَجُ مِنَ الْمُتَعَدِّدِ بِـ «إِلَّا»، أَوْ مُنْقَطِعٌ، وَهُوَ**

---

کە دەکەوێتە دوای وشەی «لَاسِيَّمَا» دەبێتە «مُسْتَثْنَى»، بۆیە «مَنْصُوبْ» دەبێت.

**(وَالْجَرُّ)** هەروەها بۆیە دروستە ئەو ئیسمەی دەکەوێتە دوای وشەی «لَاسِيَّمَا» بە مەجرووری بخوێندرێنەوە، **(عَلَى أَنَّ «مَا» زَائِدَةٌ)** ئەم بۆچوونە لەسەر ئەو ئەساسە بونیاد نراوە کە وشەی «ما» لە وشەی «لَاسِيَّمَا» زیادەیە و هیچ حیسابێکی بۆ ناکرێت، **(وَسِيُّ)** هەروەها وشەی «سِيُّ» **(مُضافٌ إِلَى زَيْدٍ)**[1] «إضافة» کراوە بۆ لای وشەی «زَيْدٍ» بۆیە بە مەجروور دەخوێندرێتەوە.

## باسی «مُسْتَثْنی» بە وشەی «إِلَّا» و جۆرەکانی

**(وَالأَوَّلُ)** بەشی یەکەم کە **(أَعْنِي: الْمُسْتَثْنَى بِـ«إِلَّا»)** مەبەستم لەو ئیسمەیە کە لە ڕستەی پێش خۆی جیا دەکرێتەوە بە وشەی «إِلَّا»؛ «مُسْتَثْنَى» بە «إِلَّا» چەند جۆرێکی سەرەکی هەیە. ئینجا مامۆستا ڕوونیان دەکاتەوە و دەفەرموێت: جۆرەکان ئەمانەن:

**(إِمَّا مُتَّصِلٌ)** یا پێی دەگوترێت: «مُسْتَثْنَى»ی «مُتَّصِل»؛ ئینجا مامۆستا پێناسەی دەکات و دەفەرموێت: **(وَهُوَ الْمُخْرَجُ مِنَ الْمُتَعَدِّدِ)** «مُسْتَثْنَى»ی «مُتَّصِل» بریتییە لە وشەیەک کە جیا کراوەتەوە لە شتێکی ژمێردراوی هاووێنەی خۆی **(بِإِلَّا)** بە وشەی «إِلَّا» وەکوو «جَاءَنِي الْقَوْمُ إِلَّا زَيْداً» واتە: هەموو خەڵک هاتە لای من تەنها زەید نەبێت، **سەرنج بدە:** وشەی «زَيْداً» پێی دەگوترێت: «مُسْتَثْنَى»ی «مُتَّصِل» چونکە جیا کراوەتەوە لە شتێکی ژمێردراوی هاووێنە و هاوڕەگەزی خۆی کە «اَلْقَوْم»ـە بە وشەی «إِلَّا».

**(وَ إِمَّا مُنْقَطِعٌ)** یاخود پێی دەگوترێت: «مُسْتَثْنَى»ی «مُنْقَطِعْ»؛ ئینجا مامۆستا پێناسەی دەکات و دەفەرموێت: **(وَهُوَ)** «مُسْتَثْنَى»ی «مُنْقَطِعْ» بریتییە لە وشەیەک

---

١. ئەم بۆچوونە بێهێزە، چونکە نابێت «فَصْل» هەبێت لە نێوان «مُضافٌ» و «مُضافٌ إِلَيْهِ». بڕوانە: أوضح المسالك: ٢٩٥/١،

**الْمَذْكُورُ بَعْدَ «إِلَّا» غَيْرُ مُخْرَجٍ مِنَ الْمُتَعَدِّدِ.**

**وَالْمُتَّصِلُ إِمَّا مُقَدَّمٌ عَلَى الْمُسْتَثْنَىٰ مِنْهُ، أَعْنِي: ذٰلِكَ الْمُتَعَدِّدَ، أَوْ مُؤَخَّرٌ عَنْهُ. وَالْمُؤَخَّرُ إِمَّا بَعْدَ كَلَامٍ مُوجَبٍ، أَيْ: غَيْرِ مَنْفِيٍّ، أَوْ بَعْدَ كَلَامٍ غَيْرِ مُوجَبٍ، أَيْ: مَنْفِيٍّ. فَهٰذِهِ أَرْبَعَةُ أَقْسَامٍ:**

---

**(الْمَذْكُورُ بَعْدَ إِلَّا)** کە لە دوای وشەی «إِلّا» باس کراوە، بەڵام **(غَيْرُ مُخْرَجٍ مِنَ الْمُتَعَدِّدِ)** جیا نەکراوەتەوە لە شتێکی ژمێردراوی هاووێنە و هاوەگەزی خۆی وەکوو «ماجَاءَنِي الْقَوْمُ إِلّا حِماراً» واتە: هیچ کەسێک نەهاتە لای من تەنها کەر نەبێت، **سەرنج بدە:** وشەی «حِماراً» پێی دەگوترێت: «مُسْتَثْنَى»ی «مُنْقَطِعْ» چونکە دوای وشەی «إِلّا» باس کراوە و جیا نەکراوەتەوە لە شتێکی ژمێردراوی هاووێنەی خۆی چونکە ڕەگەزی جینسی «اَلْقَوْم» و «حِمار» لە یەکتری جیاوازە.

**(وَالْمُتَّصِلُ)** هەروەها «مُسْتَثْنَى»ی «مُتَّصِل» **(إِمَّا مُقَدَّمٌ)** یاخود وەپێش کەوتووە **(عَلَى الْمُسْتَثْنَى مِنْهُ)** لەسەر «مُسْتَثْنَى مِنْهُ» **(أَعْنِي ذَلِكَ الْمُتَعَدِّدَ)** مەبەستم ئەوەیە لەسەر ئەو ژمێردراوەی کە «مُسْتَثْنَى»ی لێ جیا کراوەتەوە وەکوو «ما جَاءَنِي إِلّا زَيْداً اَلْقَوْمُ»، **سەرنج بدە:** وشەی «إِلّا زَيْداً» پێی دەگوترێت «اَلْمُسْتَثْنَى الْمُقَدَّمُ» چونکە لەسەر «مُسْتَثْنَى مِنْهُ» وەپێش کەوتووە کە بریتییە لە وشەی «اَلْقَوْمُ». **(أَوْ مُؤَخَّرٌ عَنْهُ)** یاخود «مُسْتَثْنَى»ی «مُتَّصِل» دوا کەوتووە لەسەر «مُسْتَثْنَى مِنْهُ» وەکوو «ما جَاءَنِي الْقَوْمُ إِلّا زَيْداً»، **سەرنج بدە:** وشەی «إِلّا زَيْداً» پێی دەگوترێت «اَلْمُسْتَثْنَى الْمُؤَخَّرُ» چونکە لەسەر «مُسْتَثْنَى مِنْهُ» وەپێش نەکەوتووە بەڵکوو لە دوای هاتووە.

ئینجا بزانە: **(وَالْمُؤَخَّرُ)** «مُسْتَثْنَى»ی «مُؤَخَّر» **(إِمَّا بَعْدَ كَلَامٍ مُوجَبٍ)** یا لەدوای ڕستەیەکی ئەرێنییە **(أَيْ: غَيْرَ مَنْفِيٍّ)** مەبەستم ئەوەیە کە ڕستەکە هیچ ئامرازێکی «نَفي» لە پێش نەهاتووە، **(أَوْ بَعْدَ كَلَامٍ غَيْرِ مُوجَبٍ)**[1] یاخود لەدوای ڕستەیەکی نەرێنییە **(أَيْ: مَنْفِي)** مەبەستم ئەوەیە کە ڕستەکە ئامرازێکی «نَفي»ـی لە پێش هاتووە، **(فَهَذِهِ أَرْبَعَةُ أَقْسَامٍ)** کەواتە: «مُسْتَثْنَى» بە «إِلّا» بوو بە چوار جۆری سەرەکی:

---

١. بڕوانە: شرح المفصل: ٥٩/٢، وعلل النحو: ٥٣٩.

**[١] الْمُسْتَثْنَى الْمُتَّصِلُ الْمُؤَخَّرُ بَعْدَ مُوجَبٍ، نَحْوُ: جَاءَنِي الْقَوْمُ إِلَّا زَيْداً.**
**[٢] وَالْمُسْتَثْنَى الْمُؤَخَّرُ بَعْدَ كَلامٍ مَنْفِيٍّ، نَحْوُ: مَا جَاءَنِي الْقَوْمُ إِلَّا زَيْداً.**
**[٣] وَالْمُسْتَثْنَى الْمُتَّصِلُ الْمُقَدَّمُ بَعْدَ الْمَنْفِيِّ، نَحْوُ: مَا جَاءَنِي إِلَّا زَيْداً أَحَدٌ.**
**[٤] وَالْمُسْتَثْنَى الْمُنْقَطِعُ، نَحْوُ: مَا جَاءَنِي أَحَدٌ إِلَّا حِمَاراً.**

---

**جۆری یەکەم:** پێی دەگوترێت **(اَلْمُسْتَثْنَى الْمُتَّصِلَ الْمُؤَخَّرُ بَعْدَ كَلامٍ مُوجَبٍ، نَحْوُ:)** وەکوو **(جَاءَنِي الْقَوْمُ إِلَا زَيْداً)**، **سەرنج بدە:** وشەی «زَيْداً» پێی دەگوترێت «مُسْتَثْنَى»ی «مُتَّصِل» چونکە جیا کراوەتەوە لە شتێکی ژمێردراوی هاووێنەی خۆی کە «اَلْقَوْم»ـە و لە هەمان کاتدا «مُؤَخَّر»ە، چونکە لە دوای «مُسْتَثْنَى مِنْهُ» هاتووە، هەروەها ڕستەکەش هیچ ئامرازی «نَفْي» لە پێش نییە.

**(وَ) جۆری دووەم:** پێی دەگوترێت **(الْمُسْتَثْنَىَ الْمُؤَخَّرُ بَعْدَ كَلامٍ مَنْفِيٍّ، نَحْوُ:)** وەکوو **(ما جَاءَنِي الْقَوْمُ إِلَا زَيْداً)** **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «زَيْداً» پێی دەگوترێت «مُسْتَثْنَى»ی «مُتَّصِل» چونکە جیا کراوەتەوە لە شتێکی ژمێردراوی هاووێنەی خۆی کە «اَلْقَوْم»ـە و لە هەمان کاتدا «مُؤَخَّر»ە، چونکە لەدوای «مُسْتَثْنَى مِنْهُ» هاتووە، هەروەها ڕستەکەش ئامرازی «نَفْي» لە پێش هاتووە.

**(وَ) جۆری سێیەم:** پێی دەگوترێت **(الْمُسْتَثْنَى الْمُتَّصِلُ الْمُقَدَّمُ بَعْدَ الْمَنْفِيِّ، نَحْوُ:)** وەکوو **(ما جَاءَنِي إِلَا زَيْداً اَلْقَوْمُ)**، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «زَيْداً» پێی دەگوترێت «اَلْمُسْتَثْنَى الْمُقَدَّمُ» چونکە لەسەر «مُسْتَثْنَى مِنْهُ» وەپێش کەوتووە کە بریتییە لە وشەی «اَلْقَوْم»، هەروەها ڕستەکەش ئامرازی «نَفْي» لە پێش هاتووە.

**(وَ) جۆری چوارەم:** پێی دەگوترێت **(الْمُسْتَثْنَى الْمُنْقَطِعُ، نَحْوُ:)** وەکوو **(ماجَاءَنِي الْقَوْمُ إِلَا حِماراً)** واتە: هیچ کەسێک نەهاتە لای من تەنها کەر نەبێت، **سەرنج بدە:** وشەی «حِماراً» پێی دەگوترێت «مُسْتَثْنَى»ی «مُنْقَطِعْ» چونکە دوای وشەی «إلّا» باس کراوە و جیا نەکراوەتەوە لە شتێکی ژمێردراوی هاووێنەی خۆی، چونکە ڕەگەزی جینسی «اَلْقَوْم» و «حِمار» لە یەکتری جیاوازە.

**ثَلَاثَةٌ مِنْهَا وَاجِبُ النَّصْبِ، وَوَاحِدٌ مِنْهَا يُخْتَارُ رَفْعُهُ.**

**فَقَوْلُهُ: وَ «الْمُسْتَثْنَىٰ» عَطْفٌ عَلَىٰ قَوْلِهِ: «وَالتَّمْيِيزُ»؛ وَالتَّقْدِيرُ: وَالْمُلْحَقُ بِهِ سَبْعَةُ أَضْرُبٍ: الْحَالُ وَالتَّمْيِيزُ وَالْمُسْتَثْنَىٰ. وَالْمَعْنَى: أَنَّ الْمُسْتَثْنَى الْمُتَّصِلَ الْمُؤَخَّرَ بَعْدَ كَلَامٍ مُوجَبٍ، نَحْوُ: «جَاءَنِي الْقَوْمُ إِلَّا زَيْداً» يَجِبُ نَصْبُهُ. وَقَوْلُهُ: بِـ «إِلَّا» احْتِرَازٌ عَنِ الْمُسْتَثْنَىٰ بِـ «حَاشَا وَعَدَا وَخَلَا» وَغَيْرِهَا،**

---

ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: (**ثَلاثَةٌ مِنْهَا**) سێ جۆر لەم جۆرانە (**وَاجِبُ النَّصْبِ**) بە واجبی «مَنْصُوبْ» دەبن (**وَواحِدٌ مِنْهَا**) وە جۆرێکیشیان لەم سێ جۆرانە (**مُخْتارٌ رَفْعُهُ**) هەرچەندە دروستە بە «مَنصوب»ـی بخوێندرێتەوە بەڵام وا باشترە کە بە مەرفووعی بخوێندرێتەوە.

(**فَقَوْلُهُ**) ئەم قسەیەی مامۆستا کە لە سەرەتای وانەکەدا گوتی: (**وَالْمُسْتَثْنَى، عَطْفٌ عَلَى قَوْلِهِ**) ئەم قسەیە «عطف»ـە بۆ سەر سەرەتای وانەی ڕابوردوو کە مامۆستا گوتی: (**وَالتَّمْيِيزُ**)؛ ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: (**وَالتَّقْدِيرُ**) ئەم ڕستەیە وای لێ دێتەوە (**وَالْمُلْحَقُ بِهِ سَبْعَةُ أَضْرُبٍ:**) ئەو ئیسمانەی مولحەقن بە مەفعوولان حەوت بەشیان هەیە: (**اَلْحَالُ**) بەشی یەکەم بریتییە لەو ئیسمەی کە پێی دەگوترێت «حال»؛ (**وَالتَّمْيِيزُ**) بەشی دووەم بریتییە لەو ئیسمەی کە پێی دەگوترێت «تَمْيِيز»؛ (**وَالْمُسْتَثْنَى**) بەشی سێیەم بریتییە لەو ئیسمەی کە پێی دەگوترێت «مُسْتَثْنَى»؛ (**وَالْمَعْنَى**) ئەم ڕستەیە مانای وایە: (**أَنَّ الْمُسْتَثْنَى الْمُتَّصِلَ الْمُؤَخَّرَ**) ئەم وشەیەی بووە بە «مُسْتَثْنَى»ی «مُتَّصِل» لەدوای «مُسْتَثْنَى مِنْهُ» هاتووە (**بَعْدَ كَلَامٍ مُوجِبٍ**) هەروەها ڕستەکەش هیچ ئامرازێکی «نَفْي» لە پێش نەهاتووە (**نَحْوُ:**) وەکوو (**جَاءَنِي الْقَوْمُ إِلَّا زَيْداً، يَجِبُ نَصْبُهُ**)[1] ئەم جۆرە «مُسْتَثْنَى»یە واجبە بە «مَنصوب»ـی بخوێندرێتەوە.

(**فَقَوْلُهُ: بِـ «إِلَّا»**) ئەم قسەیەی مامۆستا کە گوتی «مُسْتَثْنَى» بە «إِلَّا» واجبە «مَنْصُوب» بێت (**اِحْتِرازٌ عَنْ الْمُسْتَثْنَى بِـ «حَاشَا» وَغَيْرِهَا**) ئەم قسەیە بۆ خۆ پاراستن بوو لەو ئیسمەی کە «مُسْتَثْنَى»یە (بِـ «حاشا») بە وشەی «حَاشَا» و بە

---

١. والنحو الوافي: (٢٦٥/٢) وشرح كافية ابن الحاجب الكوردي: (٢١٥/٢) و معاني النحو: (٢٠١/٢)

**مِمَّا يَجُوزُ فِيهِ غَيْرُ النَّصْبِ. وَقَوْلُهُ: «بَعْدَ كَلَامٍ مُوجَبٍ» احْتِرَازٌ عَنِ الْقِسْمِ الثَّانِي الَّذِي أَشَارَ إِلَيْهِ بِقَوْلِهِ: «أَوْ بَعْدَ كَلَامٍ غَيْرِ مُوجَبٍ»، نَحْوُ: «مَا جَاءَنِي أَحَدٌ إِلَّا زَيْدٌ» وَيَجُوزُ فِيهِ الرَّفْعُ وَالنَّصْبُ.**

**وَنَبَّهَ بِقَوْلِهِ: «وَإِنْ كَانَ الْفَصِيحُ هُوَ الْبَدَلَ»، عَلَىٰ جَوَازِ النَّصْبِ فِيهِ مَعَ أَنَّ الْفَصِيحَ هُوَ الرَّفْعُ عَلَى الْبَدَلِيَّةِ مِنْ «أَحَدٍ».**

---

وشەی «سِوَى» و بە وشەی «عَدَا» **(لأَنَّهُ يَجُوزُ فِيهِ غَيْرُ النَّصْبِ)** چونکە ئەوان هێندێکیان هەر دروست نەبوو بە «مَنصوب»ـی بخوێندرێنەوە، هێندێکیشیان جگە لە «مَنصوب»ی دروست بوو بە مەجرووری یاخود بە مەرفووعیش بخوێندرێنەوە.

**(وَقَوْلُهُ:)** هەروەها ئەم قسەیەی مامۆستا کە گوتی: **(بَعْدَ كَلَامٍ مُوجَبٍ)** ئەو کاتە «مُسْتَثْنَى» بە «إِلَّا» واجبە «مَنْصُوبْ» بێت کە لە دوای ڕستەیەک بێت کە «ما»ی نەفی لە دوا نەهاتبێت، **(إِحْتِرازٌ عَنِ الْقِسْمِ الثَّانِي)** ئەم قسەیە بۆ خۆپاراستن بوو لە بەشی دووەم کە **(الَّذِي أَشارَ إِلَيْهِ بِقَوْلِهِ:)** مامۆستا بەخۆشی ئاماژەی بۆ کرد و گوتی: **(أَوْ بَعْدَ كَلامٍ غَيْرِ مُوجَبٍ)** ئەو «مُسْتَثْنَى»یەی کە دەکەوێتە دوای ڕستەیەک کە «ما»ی نەفی لە سەرەتادا هاتبێت **(نَحْوُ:)** وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: **(مَا جَاءَنِي أَحَدٌ إِلَّا زَيْداً)** مامۆستا گوتی: **(وَيَجُوزُ فِيهِ الرَّفْعُ وَالنَّصْبُ)** ئەم جۆرە «مُسْتَثْنَى»یە هەم دروستە بە مەرفووعی هەم دروستە بە «مَنصوب»ـی بخوێندرێنەوە.

**(وَنَبَّهَ بِقَوْلِهِ)** ئینجا مامۆستا هەموو لایەکی ئاگادار کردەوە کە گوتی: **(وَإِنْ كَانَ الْفَصِيحُ هُوَ الْبَدَلُ)** هەرچەندە زاراوەی ڕاستتر ئەوەیە کە ئەم جۆرە «مُسْتَثْنَى»یە بە مەرفووعی بخوێندرێنەوە **(عَلَى جَوازِ النَّصْبِ فِيهِ)** دروستە بە «مَنْصُوب»ـیش بخوێندرێنەوە **(مَعَ أَنَّ الْفَصِيحَ هُوَ الرَّفْعُ عَلَى الْبَدَلِيَّةِ مِنْ أَحَدٍ)** هەرچەندە زاراوەی ڕاستتر ئەوەیە کە ئەم جۆرە «مُسْتَثْنَى»یە بە مەرفووعی بخوێندرێنەوە و وشەی «زَيْدٌ» ببێتە «بَدَلْ» لەبری وشەی «أَحَدٌ».

○ ○

**وَإِنَّمَا قُلْنَا أَنَّ الْمَعْنَىٰ: الْمُسْتَثْنَى الْمُتَّصِلُ الْمُؤَخَّرُ بَعْدَ كَلَامٍ مُوجَبٍ، يَجِبُ نَصْبُهُ لِدَلَالَةِ قَوْلِهِ بَعْدَ هٰذَا: «وَالْمُسْتَثْنَى الْمُقَدَّمُ وَالْمُسْتَثْنَى الْمُنْقَطِعُ» عَلَىٰ ذٰلِكَ.**

**وَإِنَّمَا لَمْ يَجُزِ الرَّفْعُ فِي الْأَوَّلِ عَلَى الْبَدَلِيَّةِ، لِأَنَّ الْمُبْدَلَ مِنْهُ فِي حُكْمِ السُّقُوطِ كَمَا سَيَجِيءُ. فَلَوْ رُفِعَ الْأَوَّلُ عَلَى الْبَدَلِيَّةِ لَصَارَ تَقْدِيرُهُ: «جَاءَنِي إِلَّا زَيْدٌ»،**

---

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: **(وَإِنَّمَا قُلْنا)** بۆچی ئێمە گوتمان **(أَنَّ الْمَعْنَى الْمُسْتَثْنَى الْمُتَّصِلَ الْمُؤَخَّرَ بَعْدَ كَلَامٍ مُوجَبٍ)** ئەم وشەیەی دەبێت بە «مُسْتَثْنَى»ی «مُتَّصِل» لەدوای «مُسْتَثْنَى مِنْهُ» هاتووە، هەروەها ڕستەکەش هیچ ئامرازێکی «نَفْي» لە پێش نەهاتووە **(يَجِبُ نَصْبُهُ)** واجبە بە «مَنصوب»ی بخوێندرێتەوە؟ **(لِدَلالَةِ قَوْلِهِ:)** چونکە ئەم قسەیەی مامۆستا **(بَعْدَ هَذا)** کە لە سەرەتای وانەی داهاتوو ئاماژەی پێ دەدات و دەفەرموێت: **(وَالْمُسْتَثْنَى الْمُقَدَّمُ)** ئەو وشەیەی کە بووە بە «مُسْتَثْنَى» و لەسەر «مُسْتَثْنَى مِنْهُ» وەپێش کەوتووە **(وَالْمُسْتَثْنَى الْمُنْقَطِعُ)** هەروەها «مُسْتَثْنَى»ی «مُنْقَطِعْ» **(عَلَى ذَلِكَ)** وەکوو ئەم بەشە واجبە تەنها بە «مَنْصُوب»ی بخوێندرێتەوە، ئەو قسەیە دەلالەت دەکات کە «اَلْمُسْتَثْنَى الْمُتَّصِلَ الْمُؤَخَّرَ بَعْدَ كَلامٍ مُوجَبٍ» جگە لە نەسبە دروست نییە بە هیچ جۆرێکیتر بخوێندرێتەوە.

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: **(وَإِنَّمَا لَمْ يَجُزْ الرَّفْعُ فِي الأَوَّلِ)** بۆچی دروست نەبوو لە «اَلْمُسْتَثْنَى الْمُتَّصِلَ الْمُؤَخَّرَ بَعْدَ كَلامٍ مُوجَبٍ» وەکوو «جَاءَنِي الْقَوْمُ إِلَّا زَيْداً» وشەی «زَيْداً» بە مەرفووعی بخوێندرێتەوە و **(عَلَى الْبَدَلِيَّةِ)** ببێتە «بَدَلْ» لەبری وشەی «اَلْقَوْمُ»؟ مامۆستا دەفەرموێت: **(لأَنَّ الْمُبْدَلَ مِنْهُ فِي حُكْمِ السُّقُوطِ)** چونکە هەرکاتێک «بَدَلْ» هات وشەی «مُبْدَلُ مِنْهُ» هیچ حیسابێکی بۆ ناکرێت لە ڕووی ماناوە **(كَمَا سَيَجِيءُ)** هەروەکوو دواتر باسی دەکەین؛ **(فَلَوْ رُفِعَ الأَوَّلُ عَلَى الْبَدَلِيَّةِ)** کەواتە: ئەگەر وشەی «زَيْداً» بە مەرفووعی بخوێندرێتەوە و ببێتە «بَدَلْ» لەبری وشەی «اَلْقَوْمُ» **(لَصارَ تَقْدِيرُهُ)** ئەوکاتە ئەم ڕستەی «جَاءَنِي الْقَوْمُ إِلَّا زَيْداً» وای لێ دەهاتەوە **(جَاءَنِي إِلَّا زَيْدٌ)** واتە هەموو خەڵکی هاتن بۆ لای

**فَيَلْزَمُ مَجِيءُ جَميعِ الْعَالَمِ سِوَىٰ زَيْدٍ وَذٰلِكَ مُحَالٌ، بِخِلَافِ الثَّانِي فَإِنَّهُ يَسْتَقِيمُ ذٰلِكَ فِيهِ، إِذْ تَقْدِيرُهُ: «مَا جَاءَنِي إِلَّا زَيْدٌ»، وَالْمَعْنَىٰ: «مَا جَاءَنِي مِنَ الْعَالَمِ سِوَىٰ زَيْدٍ»، وَذٰلِكَ مُمْكِنٌ.**

---

مـن جگـە لـە زەیـد نەبێت، ئەوکاتە ماناکەی تێک دەچوو (فَيَلْزَمُ مَجِيءُ جَميعِ الْعَالَمِ سِوَى زَيْدٍ) چونکـە ئـەو کاتـە مانای ڕستەکە وای لێ دێتـەوە کە هەموو خەڵکی هاتبن بـۆ لای تـۆ جگـە لە زەیـد نەبێت (وَذَلِكَ مُحالٌ) ئەمەش شـتێکی ئەسـتەمە کە هەموو خەڵکی هاتبن بۆ لای تۆ تەنها کەسێک نەبێت.

(بِخِلافِ الثَّانِي) بـە پێچەوانـەی نموونـەی دووەم «مَا جَاءَنِي أَحَدٌ إِلّا زَيْداً» (فَإِنَّهُ يَسْتَقِيمُ ذَلِكَ فِيهِ) چونکە ئەگەر وشـەی «زَيْداً» بە مەرفووعی بخوێندرێتەوە و ببێتە «بَـدَلٌ» لەبری وشـەی «أَحَدٌ» ماناکـەی ڕێـک دەکەوێـت و هیچ گرفتێکـی نابێت (إِذْ تَقْدِيرُهُ)[1] چونکە ئەوکاتە ئەم ڕستەیە وای لێ دێتەوە: (مَا جَاءَنِي إلاّ زَيْدٌ) واتە: جگە لە زەید هیچ کەسێکیتر نەهاتۆتە لای من، ئەو کاتە ماناکەی هیچ گرفتێکی نابێت.

*○*

---

١. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە سوودم لەم سـەرچاوانە بینیوە: شـرح المفصل: (٥٨/٢)، والنحو الوافي: (٢٦٥/٢) وشرح كافية ابن الحاجب الكوردي: (٢١٥/٢) و معاني النحو: (٢٠١/٢) و أوضح المسالك: (٣٠٠/١)




**بـ ما عدا، ما خلا، ليس، لا يكون، و ذلک واجب النصب**

نحو: جاءنى القوم ماعدا زيداً

**بـ غير و سوىٰ، و سواء، و ذلک واجب الجرّ**

نحو: جاءنى القوم غيرَ زيدٍ

**بـ حاشا و عدا، و خلا، ولاسيما و هذا يجوز فيه أنواع الإعراب**

نحو: جاءنى القوم عدا زيداً ، زيدٍ، زيدٌ

**قَالَ: وَالْمُسْتَثْنَى الْمُقَدَّمُ، نَحْوُ: «مَا جَاءَنِي إِلَّا زَيْداً أَحَدٌ» وَالْمُسْتَثْنَى الْمُنْقَطِعُ، نَحْوُ: «مَا جَاءَنِي أَحَدٌ إِلَّا حِمَاراً».**

**أَقُولُ: هٰذَا هُوَ الْقِسْمُ الثَّالِثُ وَالرَّابِعُ، وَلَا يَجُوزُ فِيهِمَا الْبَدَلُ. أَمَّا فِي الْأَوَّلِ فَلِعَدَمِ جَوَازِ تَقَدُّمِ الْبَدَلِ عَلَى الْمُبْدَلِ مِنْهُ؛ وَأَمَّا فِي الثَّانِي فَلِعَدَمِ الْجِنْسِيَّةِ بَيْنَ «أَحَدٍ»**

## وانەی چلوشەشەم: باسی «اَلْمُسْتَثْنَى الْمُقَدَّمُ» و «الْمُسْتَثْنَى الْمُنْقَطِعُ»

(قالَ:) مامۆستا «جار اللّٰه» زەمەخشەری دەفەرموێت: (**وَالْمُسْتَثْنَى الْمُقَدَّمُ**) یەکێکی‌تر لەو ئیسمانەی کە بە واجبی «مَنْصُوب» دەبێت بریتییە لە «الْمُسْتَثْنَى الْمُقَدَّمُ» (**نَحْوُ:**) وەکوو (**مَا جَاءَنِي إِلَّا زَيْداً أَحَدٌ**)، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «زَيْداً» موستەسنایە و لەسەر «مُسْتَثْنَى مِنْهُ» پێش کەوتووە بۆیە پێی دەگوترێت: «الْمُسْتَثْنَى الْمُقَدَّمُ».

(**وَالْمُسْتَثْنَى الْمُنْقَطِعُ**) هەروەها یەکێکی‌تر لەو ئیسمانەی کە بە واجبی «مَنْصُوب» دەبێت بریتییە لە «اَلْمُسْتَثْنَى الْمُنْقَطِعُ» (**نَحْوُ:**) وەکوو (**مَا جَاءَنِي أَحَدٌ إِلَّا حِماراً**) سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا «حِماراً» پێی دەگوترێت: (**الْمُسْتَثْنَى الْمُنْقَطِعُ**) «مَنْصُوب» بووە.

(**أَقُولُ**) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (**هَذا هُوَ الْقِسْمُ الثَّالِثُ وَالرَّابِعُ**) ئەمە بەشی سێیەم و بەشی چوارەمە لە بەشەکانی «اَلْمُسْتَثْنَى» بە «إلّا» کە (**وَلا يَجُوزُ فِيهِمَا الْبَدَلُ**) کە لەم دوو بەشەدا دروست نییە ئەو وشەیەی بووە بە «مُسْتَثْنَى» ببێتە «بَدَلْ» لەبری «مُسْتَثْنَى مِنْهُ» و بە مەرفووعی بخوێندرێتەوە؛ ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: بۆچی دروست نییە؟ مامۆستا دەفەرموێت: (**أَمَّا فِي الأَوَّلِ**) سەبارەت بە «الْمُسْتَثْنَى الْمُقَدَّمُ» (**فَلِعَدَمِ جَوازِ تَقَدُّمِ الْبَدَلِ عَلَى الْمُبْدَلِ مِنْهُ**) چونکە دروست نییە ئەو ئیسمەی کە بووە بە «بَدَلْ» لەسەر «مُبْدَلْ مِنْهُ» وەپێش بکەوێت.

(**وَأَمَّا فِي الثَّانِي**) سەبارەت بە «اَلْمُسْتَثْنَى الْمُنْقَطِع» (**فَلِعَدَمِ الْجِنْسِيَّةِ بَيْنَ أَحَدٍ**

**وَ «حِمَارٍ». وَإِنَّمَا أَتَىٰ بِمِثَالَيْنِ فِي الْمَنْفِيِّ، لِيُعْلَمَ أَنَّ امْتِنَاعَ الْبَدَلِ فِي مُوجَبِهِمَا بِالطَّرِيقِ الْأَوْلَىٰ، لِأَنَّهُ إِذَا كَانَ تَقَدُّمُ الْمُسْتَثْنَىٰ وَانْقِطَاعُهُ مَانِعَيْنِ مِنَ الْبَدَلِيَّةِ مَعَ النَّفْيِ الَّذِي هُوَ شَرْطُهَا، فَمَعَ الْإِيجَابِ يَكُونُ بِالطَّرِيقِ الْأَوْلَى.**

**(وَحِمارٍ)** چونکە هەردوو وشـەی «أَحَد» وشـەی «حِمار» ڕەگەزیان لە یەکتری جیاوازە و ناکرێت ببن بە «بَدَل» و بە «مُبْدَل مِنْهُ» لەبری یەکتری.

ئینجا ئەگـەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: **(وَإِنَّمَا أَتَى بِمِثالَيْنِ فِي النَّفْيِ)** بۆچی مامۆستا دوو نموونـەی هێنانـەوە هەردووکیـان «مَنْفِـي» بوون؟ واتـە: ئامرازی «نَفْي»ـیان لە سـەرەتادا هاتبوو؟ مامۆستا دەفەرموێت: **(لِيُعْلَمَ)** بۆ ئەوەی بزاندرێت **(أَنَّ امْتِناعَ الْبَدَلِ)** کە قەدەغەبوونی «بَدَلِيَّة» واتە: ئەو ئیسـمەی بووە بە «مُسْـتَثْنَى» ببێتـە «بَـدَل» لەبری ئـەو «مُسْـتَثْنَى مِنْـهُ» **(فِي مُوجَبِهِمَا)** لەم نموونانـەی کە ئامرازی «نَفْي»ـیان لە سەرەتادا نەهاتووە **(بِالطَّرِيقِ الأَوْلَى)** شایەنتر و ئەولاترە، **(لأَنَّهُ إذاكَانَ تَقَدُّمُ الْمُسْتَثْنَى)** چونکـە ئەگـەر بێـت «الْمُسْـتَثْنَى الْمُقَـدَّمُ» **(وَانْقِطاعُهُ)** هەروەهـا «اَلْمُسْـتَثْنَى الْمُنْقَطِع» **(مَانِعَيْنِ مِنَ الْبَدَلِيَّةِ)** هەردووکیـان ڕێگـر بـن لـە «بَدَلِيَّـة» واتە: دروسـت نەبێت ببنە «بَدَل» لەبری «مُسْتَثْنَى مِنْهُ» **(مَعَ النَّفْيِ)** لەگەڵ ئەوەی ئامـرازی «نَفْي»ـیان لـە سـەرەتادا هاتـووە **(الَّذِي هُوَ شَرْطُهَا)** کـە ئامـرازی «نَفْـي» مەرجی دروسـتبوونی «بَدَلِيَّـة» **(فَمَعَ الإِيجابِ)** ئەگـەر بێـت و «الْمُسْـتَثْنَى الْمُقَـدَّمُ» و «اَلْمُسْـتَثْنَى الْمُنْقَطِع» ئامرازی «نَفْي»ـیان لە سـەرەتادا نەهاتبووە **(يَكُونُ بِالطَّرِيقِ الأَوْلَى)**[1] ئەو کاتە دروستنەبوونی «بَدَلِيَّة» شـایەنتر و ئەولاترە کە دروست نەبێت، کەواتە: بۆت ڕوون بوویەوە کە ئەم دوو جۆرە «مُسْتَثْنَى»یە بە هیچ جۆرێک دروست نییە بە مەرفووعی بخوێندرێنەوە.

° °

---

١. بڕوانـە: شـرح جمـل الزجاجـي: (٢/ ٣٩٨، والنحـو الوافـي: (٢/٢٦٥) وشـرح كافيـة ابـن الحاجـب الكوردي: (٢/٢١٥)

**قَالَ: وَحُكْمُ «غَيْرٍ» كَحُكْمِ الِاسْمِ الْوَاقِعِ بَعْدَ «إِلَّا»، تَقُولُ: «جَاءَنِي الْقَوْمُ غَيْرَ زَيْدٍ، وَمَا جَاءَنِي أَحَدٌ غَيْرَ زَيْدٍ وَغَيْرُ زَيْدٍ».**

**أَقُولُ: قَدْ عَرَفْتَ أَنَّ الْمُسْتَثْنَىٰ بِـ «غَيْرٍ» وَاجِبُ الْجَرِّ، وَأَمَّا نَفْسُ «غَيْرٍ» فَحُكْمُهُ حُكْمُ الِاسْمِ الْوَاقِعِ بَعْدَ «إِلَّا»، فَفِي كُلِّ مَوْضِعٍ كَانَ الْمُسْتَثْنَىٰ بِـ «إِلَّا» وَاجِبَ النَّصْبِ،**

## وانەی چل‌وحەوتەم: باسی «حُكْمُ كَلِمَةِ غَيْرٍ»

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» زەمەخشەری دەفەرموێت: (وَحُكْمُ غَيْرٍ) حوكمی وشەی «غَيْرٍ» لە ڕووی خوێندنەوە (كَحُكْمِ الِاسْمِ الوَاقِعِ بَعْدَ إِلَّا) وەکوو حوکمی ئەم ئیسمە وایە کە لەدوای وشەی «إِلّا» دێت، واتە: وەکوو حوکمی «مُسْتَثْنَى» بە «إِلّا»یە (تَقُولُ:) وەکوو تۆ دەڵێیت: (جَاءَنِي الْقَوْمُ غَيْرَ زَيْدٍ) سەرنج بدە: وشەی «غَيْر» لێرەدا پێویستە بە «مَنصوب»ـی بخوێندرێتەوە چونکە «مُسْتَثْنَى مُتَّصِلْ» «وَاجِبُ النَّصْبَ» بوو، بۆیە وشەی «غَيْر»یش بە هەمان شێوە «وَاجِبُ النَّصْب»ـە، (وَ) هەروەها وەکوو (مَا جَاءَنِي أَحَدٌ غَيْرَ زَيْدٍ وَغَيْرُ زَيْدٍ)، سەرنج بدە: وشەی «غَيْر» لێرەدا هەم بە «مَنصوب»ـی هەم بە مەرفووعی دەخوێندرێتەوە، چونکە «مُسْتَثْنَى مُتَّصِلْ» لەدوای ڕستەیەکی «مَنْفِي» «جَائِزُ النَّصْب» بوو، هەروەها «مُخْتَارُ الرَّفْعَ» بوو بۆیە وشەی «غَيْر»یش بە هەمان شێوەیە.

(أَقُولُ) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (قَدْ عَرَفْتَ أَنَّ الْمُسْتَثْنَى بِـ «غَيْرٍ» وَاجِبُ الْجَرِّ) تۆ لە دەرسی ڕابوردوو زانیت کە ئەم وشەیەی دەکەوێتە دوای وشەی «غَيْر» (مُسْتَثْنَى بِغَيْر) پێویستە بە مەجرووری بخوێندرێتەوە، (وَأَمَّا نَفْسُ «غَيْرٍ») بەڵام سەبارەت بە وشەی «غَيْـر» (فَحُكْمُهُ حُكْمُ الِاسْمِ الْوَاقِعِ بَعْدَ إِلّا) شێوازی خوێندنەوەی وشەی «غیر» وەکوو شێوازی خوێندنەوەی ئەم ئیسمەیە کە لەدوای وشەی «إِلّا» دێت، واتە: وەکوو حوکمی «مُسْتَثْنَى» بە «إِلّا»یە، لە هەرچوار جۆرەکەیدا بێ هیچ جیاوازییەک.

(فَفِي كُلِ مَوْضِعٍ كَانَ الْمُسْتَثْنَى بِـ إِلّا) لە هەر شوێنێ «مُسْتَثْنَى» بە «إِلّا» (وَاجِبُ النَصْب)

**يَكُونُ «غَيْرٌ» وَاجِبَ النَّصْبِ أَيْضاً، وَحَيْثُمَا كَانَ جَائِزَ النَّصْبِ يَكُونُ «غَيْرٌ» كَذٰلِكَ، فَتَقُولُ: «جَاءَنِي الْقَوْمُ غَيْرَ زَيْدٍ» بِالنَّصْبِ، كَمَا قُلْتَ: «جَاءَنِي الْقَوْمُ إِلَّا زَيْداً»؛ وَتَقُولُ: «مَا جَاءَنِي أَحَدٌ غَيْرَ زَيْدٍ وَغَيْرُ زَيْدٍ» بِالنَّصْبِ وَالرَّفْعِ، كَمَا قُلْتَ: «مَا جَاءَنِي أَحَدٌ إِلَّا زَيْداً وَ إِلَّا زَيْدٌ»؛ وَتَقُولُ: «مَا جَاءَنِي غَيْرَ زَيْدٍ أَحَدٌ» بِالنَّصْبِ، كَمَا قُلْتَ: «مَا جَاءَنِي إِلَّا زَيْداً أَحَدٌ»؛ وَتَقُولُ: «مَا جَاءَنِي أَحَدٌ غَيْرَ حِمَارٍ» بِالنَّصْبِ أَيْضاً،**

---

بێت (يَكونُ «غَيْرٌ» وَاجِبَ النَّصْبِ أَيْضاً) وشەی «غَیْر»یش بە هەمان شێوە «وَاجِبُ النَّصب»ـە (وَحَيْثُمَا كَانَ جَائِزَ النَّصْب) لە هەر شوێنێ «مُسْتَثْنَى» بە «إِلّا» «جَائِزُ النَّصب» بێت (يَكُونُ غَيْرٌ كَذَلِكَ) وشەی «غَیْر»یش بە هەمان شێوە «جَائِزُ النَّصب»ـە (فتَقُولُ:) کەواتە تۆ دەڵێیت: (جَاءَنِي الْقَوْمُ غَيْرَ زَيْدٍ بِالنَّصْبِ) سەرنج بدە: وشەی «غَیْر» لێرەدا پێویستە بە «مَنْصُوب»ـی بخوێندرێتەوە، چونکە «مُسْتَثْنَى مُتَّصِلٌ» «وَاجِبُ النَّصب» بوو بۆیە وشەی «غَیْر»یش بە هەمان شێوە «وَاجِبُ النَّصب»ـە (كَمَا قُلْتَ) هەروەکوو دەتگوت: (جَاءَنِي الْقَوْمُ إِلّا زَيْداً).

(وَ) هەروەها وەکوو: (مَا جَاءَنِي أَحَدٌ غَيْرَ زَيْدٍ وَغَيْرُ زَيْدٍ بِالنَّصْبِ وَالرَّفْعِ) سەرنج بدە: وشەی «غَیْر» لێرەدا هەم بە «مَنصوب»ـی هەم بە مەرفووعی دەخوێندرێتەوە، چونکە «مُسْتَثْنَى مُتَّصِلٌ» لەدوای ڕستەیەکی «مَنْفِي» «جَائِزُ النَّصب»ـە بوو، هەروەها «مُخْتارُ الرَّفْع» بوو، بۆیە وشەی «غَیْر»یش بە هەمان شێوە، دەخوێندرێتەوە (كَمَا قُلْتَ) هەروەکوو دەتگوت: (مَا جَاءَنِي أَحَدٌ إِلّا زَيْداً وَ إِلّا زَيْدٌ) کە بە «مَنصوب»ـی هەم بە مەرفووعی دەخوێندرایەوە.

(وتَقُولُ:) هەروەها تۆ دەڵێیت: (مَا جَاءَنِي غَيْرَ زَيْدٍ أَحَدٌ بِالنَّصْبِ) سەرنج بدە: وشەی «غَیْر» لێرەدا پێویستە بە «مَنصوب»ـی بخوێندرێتەوە، چونکە «مُسْتَثْنَى مُقَدَّم» پێویست بوو بە «مَنصوب»ـی بخوێندرێتەوە و «وَاجِبُ النَّصب» بوو، بۆیە وشەی «غَیْر»یش بە هەمان شێوە «وَاجِبُ النَّصب»ـە (كَمَا قُلْتَ) هەروەکوو دەتگوت: (مَا جَاءَنِي إِلّا زَيْداً أَحَدٌ).

(وتَقُولُ:) هەروەها تۆ دەڵێیت: (مَا جَاءَنِي أَحَدٌ غَيْرَ حِمارٍ بِالنَّصْبِ أَيْضاً)

**كَمَا قُلْتَ: «مَا جَاءَنِي أَحَدٌ إِلَّا حِمَاراً».**

**سەرنج بدە:** وشەی «غَيْر» لێرەدا پێویستە بە «مَنْصُوب»ـی بخوێندرێتەوە وەکوو نموونەکانی‌تر، چونکە «مُسْتَثْنَى مُنْقَطِعْ» «وَاجِبُ النَّصْب» بوو، بۆیە وشەی «غَيْر»یش بە هەمان شێوە «وَاجِبُ النَّصْب»ـە **(كَمَا قُلْتَ)** هەروەکوو دەتگوت: **(مَا جَاءَنِي أَحَدٌ إِلَّا حِماراً)**[1].

* ◌ *

١. بەشێک لە زانایان دەفەرموون:

## الْخَبَرُ فِي بَابِ كَانَ

**قَالَ: وَالْخَبَرُ فِي بَابِ «كَانَ»، نَحْوُ: «كَانَ زَيْدٌ مُنْطَلِقاً».**

**أَقُولُ: الضَّرْبُ الرَّابِعُ مِنْ ضُرُوبِ الْمُلْحَقِ بِالْمَفْعُولِ، الْخَبَرُ فِي بَابِ كَانَ، أَي: الْمَنْصُوبُ بِـ «كَانَ» وَأَخَوَاتِهَا، أَعْنِي: الْأَفْعَالَ النَّاقِصَةَ، نَحْوُ: «مُنْطَلِقاً» فِي: «كَانَ زَيْدٌ مُنْطَلِقاً». وَ إِنَّمَا أُلْحِقَ بِالْمَفْعُولِ لِمَجِيئِهِ بَعْدَ الفِعْلِ وَالْفَاعِلِ كَالْمَفْعُولِ.**

---

## وانەی چل‌وهەشتەم: باسی «خَبَرُ بَابِ كَانَ»

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» دەفەرموێت: (وَالْخَبَرُ فِي بَابِ كَانَ) یەکێکی‌تر لەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوبْ» دەبێت و مولحەقە بە مەفعوولان بریتییە لە «خَبَرُ بَابِ كانَ» (نَحْوُ) وەکوو (كَانَ زَيْدٌ مُنْطَلِقاً) سەرنج بدە: وشەی «مُنْطَلِقاً» بووە بە «خَبَر» بۆ «كانَ» بۆیە «مَنْصُوبْ» بووە.

(أَقُولُ) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (أَقُولُ: اَلضَّرْبُ الرَّابِعُ مِنْ ضُروبِ الْمُلْحَقِ بِالْمَفْعُولِ) بەشی چوارەم لەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوبْ» دەبێت و مولحەقە بە مەفعوولان (اَلْخَبَرُ فِي بَابِ كَانَ) بریتییە لە «خَبَرُ بَابِ كانَ» (أَيْ: اَلْمَنْصُوبُ بِـ«كَانَ وَأَخَواتِهَا») واتە: ئەو ئیسمەی کە بەم فیعلانە «مَنْصُوبْ» بووە (أَعْنِي: اَلأَفْعالَ النَّاقِصَةَ) مەبەستم پێی «أَفْعالُ النَّاقِصَةَ»نە، (نَحْوُ) وەکوو وشەی (مُنْطَلِقاً) لەم نموونەیەی کە دەڵێت: (كَانَ زَيْدٌ مُنْطَلِقاً) سەرنج بدە: وشەی «مُنْطَلِقاً» بووە بە «خَبَر» بۆ «كانَ» کە یەکێکە لە «أَفْعالُ النَّاقِصَة»، بۆیە «مَنْصُوبْ» بووە. ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: (وَ إِنَّمَا أُلْحِقَ بِالْمَفْعُولِ) بۆچی «خَبَرُ بَابِ كانَ» مولحەقە بە مەفعوولان؟ (لِمَجِيئِهِ بَعْدَ الْفِعْلِ وَالْفَاعِلِ) چونکە خەبەری بابی «كانَ» لەدوای فیعل و فاعیلان دێت (كَالْمَفْعُولِ) هەروەکوو چۆن «مَفْعُولُ بِهِ» لەدوای «فِعْل» و «فَاعِلْ» دێت.

* ◌ *

## الِاسْمُ فِي بَابِ «إِنَّ»

**قَالَ: وَالِاسْمُ فِي بَابِ «إِنَّ»، نَحْوُ: «إِنَّ زَيْداً قَائِمٌ».**

**أَقُولُ: الضَّرْبُ الْخَامِسُ مِنْ ضُرُوبِ الْمُلْحَقِ بِالْمَفْعُولِ، الِاسْمُ فِي بَابِ «إِنَّ»، أَي: الْمَنْصُوبُ بِالْحُرُوفِ الْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْلِ، نَحْوُ: «زَيْداً» فِي: «إِنَّ زَيْداً قَائِمٌ». وَإِنَّمَا أُلْحِقَ بِالْمَفْعُولِ، لِأَنَّ كُلّاً مِنْ هٰذِهِ الْحُرُوفِ مُتَضَمِّنَةٌ مَعْنَى الْفِعْلِ، كَمَا سَيَجِيءُ فِي بَابِ الْحَرْفِ، فَأَسْمَاؤُهَا مَفَاعِيلُ فِي الْحَقِيقَةِ.**

---

## وانەی چل‌ونۆهەم: باسی «اِسْمُ بَابِ إِنَّ»

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» دەفەرموێت: (وَالِاسْمُ فِي بَابِ «إِنَّ») یەکێکی‌تر لەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوبٌ» دەبێت و مولحەقە بە مەفعوولان بریتییە لە «الاسْمُ فِي بَابِ إِنَّ» (نَحْوُ) وەکوو (إِنَّ زَيْداً مُنْطَلِقٌ) سەرنج بدە: وشەی «زَيْداً» بووە بە «اِسْم» بۆ «إِنَّ» بۆیە «مَنْصُوبٌ» بووە.

(أَقُولُ) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (أَقُولُ: اَلضَّرْبُ الْخَامِسُ مِنْ ضُروبِ الْمُلْحَقِ بِالْمَفْعُولِ) بەشی پێنجەم لەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوبٌ» دەبێت و مولحەقە بە مەفعوولان (اَلِاسْمُ فِي بَابِ إِنّ) بریتییە لە «اِسْمُ بَابِ إِنّ» (أَيْ: الْمَنْصُوبُ بِالْحُروفِ الْمُشَبَّهَةِ بِالْفِعْلِ) واتە: ئەو ئیسمەی کە بە حەرفی «مُشَبَّهَةٌ بِالْفِعْلِ» «مَنْصُوبٌ» بووە (نَحْوُ) وەکوو وشەی (زَيْداً، فِي) لەم نموونەیەی کە دەڵێت: (إِنَّ زَيْداً قَائِمٌ) سەرنج بدە: وشەی «زَيْداً» بووە بە «اِسْم» بۆ «إِنَّ» کە یەکێکە لە «حُرُوفُ مُشَبَّهَةِ بِالْفِعْل» بۆیە «مَنْصُوبٌ» بووە، ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: (وَ إِنَّمَا أُلْحِقَ بِالْمَفْعُولِ) بۆچی «حُرُوفُ مُشَبَّهَةِ بِالْفِعْلِ» مولحەقە بە مەفعوولان؟ (لأَنَّ كُلاً مِنْ هَذِهِ الْحُروفِ مُتَضَمِنَةٌ مَعْنَى الْفِعْلِ) چونکە هەریەکە لەم حەرفانە مانای فیعلیان لەناو خۆدا گرتووە (كَمَا سَيَجِيءُ فِي بَابِ الْحَرْفِ) هەروەکوو لە «بَابُ الْحَرْفِ» باسیان دەکەین (فَأَسْمَاؤُهَا) کەواتە ئیسمی «حُرُوفُ مُشَبَّهَةِ بِالْفِعْلِ» (مَفَاعِيلُ فِي الْحَقِيقَةِ) لە ڕاستیدا مەفعوولن.

# اسْمُ لَا النَّافِيَةِ لِلْجِنْسِ

**قَالَ: وَاسْمُ لَا لِنَفْيِ الْجِنْسِ إِذَا كَانَ مُضَافاً، نَحْوُ: «لَا غُلَامَ رَجُلٍ عِنْدَكَ»، أَوْ مُضَارِعاً لَهُ، نَحْوُ: «لَا خَيْراً مِنْكَ عِنْدَنَا».**

**أَقُولُ: الضَّرْبُ السَّادِسُ مِنْ ضُرُوبِ الْمُلْحَقِ بِالْمَفْعُولِ، اسْمُ لَا لِنَفْيِ الْجِنسِ،**

---

## وانەی پەنجا: باسی «اِسْمُ لَا لِنَفْيِ الْجِنْسِ»

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» دەفەرموێت: (وَاِسْمُ لَا لِنَفْيِ الْجِنسِ) یەکێکی تر لەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوبْ» دەبێت و مولحەقە بە مەفعوولان بریتییە لە «اِسْمُ لَا، لِنَفْيِ الْجِنْسِ» بەکار دێت (إِذَا كَانَ مُضافاً) بەو مەرجەی «إِضافَة» کرابێت (نَحْوُ) وەکوو (لَا غُلامَ رَجُلٍ عِنْدَكَ) سەرنج بدە: وشەی «غُلامَ» بووە بە «اِسْم» بۆ وشەی «لا» کە بۆ «نَفْيُ صِفَةِ الْجِنْس»ـە، هەروەها «إِضافَة» کراوە بۆ لای وشەی «رَجُلٍ» بۆیە «مَنْصُوبْ» بووە، (أَوْ) یاخود ئیسمەکە «مُضاف» نەبوو بەڵکوو (مُضارِعاً لَهُ) بەڵکوو دەشوبهایە «مُضاف»ـێ (نَحْوُ:) وەکوو (لَا خَيْراً مِنْكَ عِنْدَنا)، سەرنج بدە: وشەی «خَيْراً» بووە بە «اِسْم» بۆ وشەی «لا» کە بۆ «نَفْيُ الْجِنْس»ـە و دەشوبهێتە «مُضاف»ـێ، چونکە چۆن وشەی «مُضاف» بەبێ «مُضافُ إِلَيْهِ» مانای تەواو نابێت، بە هەمان شێوە وشەی «خَيْراً» بەبێ وشەی «مِنْ زَيْدٍ» مانای تەواو نابێت بۆیە «مَنْصُوبْ» بووە.

(أَقُولُ) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (اَلضَّرْبُ السَّادِسُ مِنْ ضُروبِ الْمُلْحَقِ بِالْمَفْعُولِ) بەشی شەشەم لەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوبْ» دەبن و مولحەقە بە مەفعوولان (اِسْمُ لَا لِنَفْيِ الْجِنسِ) بریتییە لە «اِسْمُ لَا» کە لە ڕووی ماناوە «لِنَفْيِ» بۆ نەفیکردنی «صِفَة»ی «الْجِنْس» بەکار دێت، ئەویش بە سێ مەرج ئیسمی خۆی «مَنْصُوبْ» دەکات[1]:

---

١. مامۆستا لەم وانەیەدا تەنها ئاماژەی بۆ دوو مەرج کردووە، بەڵام لە زۆربەی پەرتووکەکانی ﷺ

**إِذَا كَانَ مُضَافاً، نَحْوُ: «غُلَامَ» فِي: «لَا غُلَامَ رَجُلٍ عِنْدَكَ»؛ أَوْ مُضَارِعاً لَهُ، أَيْ: مُشَابِهاً لِلْمُضَافِ، نَحْوُ: «خَيْراً» فِي: «لَا خَيْراً مِنْكَ عِنْدَنَا».**

**وَ إِنَّمَا أُلْحِقَ بِالْمَفْعُولِ، لِأَنَّ «لَا» بِمَعْنَى أَنْفِي، فَمَا بَعْدَهَا فِي مَعْنَى الْمَفْعُولِ.**

---

**مەرجی یەکەم: (إِذَا كَانَ مُضافاً)** بەو مەرجەی ئیسمەکە «إِضافَة» کرابێت **(نَحْوُ)** وەکوو وشەی **(غُلامَ فِي)** لەم نموونەیەی کە دەڵێت: **(لَا غُلامَ رَجُلٍ عِنْدَكَ) سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «غُلامَ» بووە بە «اِسْم» بۆ وشەی «لا» کە بۆ «نَفْيُ الْجِنْس»ـە، هەروەها «إِضافَة» کراوە بۆ لای وشەی «رَجُلٍ» بۆیە «مَنْصُوبْ» بووە.

**مەرجی دووەم: (أَوْ)** یاخود ئیسمەکە «مُضاف» نەبوو بەڵکوو **(مُضارِعاً لَهُ)** دەشوبهایە «مُضاف»ـێ **(نَحْوُ)** وەکوو **(خَيْراً فِي)** لەم نموونەیەی دەڵێت: **(لَا خَيْراً مِنْكَ عِنْدَنا) سەرنج بدە:** وشەی «خَيْراً» بووە بە «اِسْم» بۆ وشەی «لا» کە بۆ «نَفْيُ الْجِنْس»ـە، دەشوبهێتە «مُضاف»ـێ چونکە چۆن وشەی «مُضاف» بەبێ «مُضاف إِلَيْهِ» مانای تەواو نابێت، بە هەمان شێوە وشەی «خَيْراً» بەبێ وشەی «مِنْ زَيْدٍ» مانای تەواو نابێت، بۆیە «مَنْصُوبْ» بووە. ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: **(وَ إِنَّمَا أُلْحِقَ بِالْمَفْعُولِ)** بۆچی «اِسْمُ لَا لِنَفْيِ الْجِنْسِ» مولحەقە بە مەفعوولان؟ مامۆستا دەفەرموێت: **(لِأَنَّ)** چونکە وشەی **(«لَا» بِمَعْنَى)** بە مانای **(أَنْفِي)** دێت کە «فِعْلُ الْمُضارِع»ـە و فاعیلی تێدا «مُسْتَتِر»ە بە «أَنا» **(فَمَا بَعْدَهَا)** کەواتە: ئەو ئیسمەی لەدوای وشەی «لا» دێت **(فِي حُكْمِ الْمَفْعُولِ)**[1] لە حوکمێ «مَفْعُولُ بِهِ»ـدایە بۆیە «مَنْصُوبْ» دەبێت.

**مەرجی سێیەم:** دەبێت ئەو وشەیەی دەبێتە ئیسمی «لَا» نادیار (نَكِرَةَ) بێت، چونکە «لا»ی «نَفْيُ الْجِنْس» ناچێتە سەر ئیسمێک کە «مَعْرِفَة» بێت، مەگەر «تَأْوِيلْ» بکرێت بە «مَعْرِفَة».

---

☞ زانستی «نحو» ئاماژە بە هەرسێ مەرجەکە کراوە، بۆیە منیش لە کۆتایی ئەم بابەتە ئاماژەی بۆ دەکەم.

١. بڕوانە: علل النحو: ١/٢٠٥.

**قَالَ: وَأَمَّا الْمُفْرَدُ فَمَفْتُوحٌ، نَحْوُ: «لَا غُلَامَ لَكَ عِنْدَنَا».**

**أَقُولُ: اسْمُ لَا لِنَفْيِ الْجِنْسِ إِنَّمَا يَكُونُ مَنْصُوباً إِذَا كَانَ مُضَافاً أَوْ مُضَارِعاً لَهُ كَمَا مَرَّ، وَأَمَّا الْمُفْرَدُ ـ أَعْنِي: غَيْرَ الْمُضَافِ وَالْمُضَارِعَ لَهُ ـ فَمَفْتُوحٌ، أَي: يَجِبُ أَنْ يُبْنَىٰ عَلَى الْفَتْحِ، نَحْوُ: «لَا غُلَامَ لَكَ».**

**أَمَّا الْبِنَاءُ فَلِأَنَّهُ جَوَابٌ عَنْ سُؤَالٍ مُقَدَّرٍ،**

---

## وانەی پەنجاویەکەم: باسی «اِسْمُ لَا لِنَفْيِ الْجِنْسِ الْمُفْرَدِ»

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» دەفەرموێت: (وَأَمَّا الْمُفْرَدُ) بەڵام ئەگەر ئیسمی «لا» «مُضاف» نەبوو هەروەها «شِبْهُ الْمُضاف»ـیش نەبوو (فَمَفْتُوحٌ) ئەوکاتە «مَفْتوح» دەبێت (نَحْوُ:) وەکوو (لَا غُلامَ لَكَ عِنْدَنا)، سەرنج بدە: وشەی «غُلامَ» بووە بە «اِسْم» بۆ وشەی «لا» کە بۆ «نَفْيُ الْجِنْس»ـە، هەروەها «مُفْرَد»ە بۆیە «مَفْتُوحْ» بووە.

(أَقُولُ) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (اِسْمُ «لَا» لِنَفْيِ الْجِنْسِ) ئیسمی «لا» کە بۆ «نَفْيُ الْجِنْس»ـە (إِنَّمَا يَكُونُ مَنْصُوباً) ئەوکاتە «مَنْصُوبْ» دەبێت (إِذَا كَانَ مُضافاً) بەو مەرجەی ئیسمەکە «مُضاف» بێت (أَوْ مُضارِعاً لَهُ) یاخود «شِبْهُ الْمُضاف» بێت (كَمَا مَرَّ) هەروەکوو لە وانەی ڕابوردوو باسمانکرد، (وَأَمَّا الْمُفْرَدُ) بەڵام ئەگەر ئیسمی «لا» موفرەد بوو (أَعْنِي) مەبەستم بە وشەی «مُفْرَدْ» ئەوەیە (غَيْرَ الْمُضافِ وَالْمُضارِعِ لَهُ)[1] کە ئیسمی لا «مُضاف» نەبێت هەروەها «شِبْهُ الْمُضاف» نەبێت (فَمَفْتُوحٌ) ئەوکاتە «مَفْتُوح» دەبێت (أَيْ: يَجِبُ أَنْ يُبْنَى عَلَى الْفَتْحِ) واتە: ئەوکاتە واجبە بکرێت بە «مَبْنِي» لەسەر «فَتْحة» (نَحْوُ:) وەکوو (لَا غُلامَ لَكَ عِنْدَنا) سەرنج بدە: وشەی «غُلامَ» بووە بە «اِسْم» بۆ وشەی «لا» کە بۆ «نَفْيُ الْجِنْس»ـە، هەروەها موفرەدە بۆیە واجبە «مَفْتُوحْ» بێت.

(أَمَّا الْبِناءُ) ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: بۆچی ئیسمی «لا»ی «مَبْنِي»ـیە؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: (فَلأَنَّهُ جَوابٌ عَنْ سُؤالٍ مُقَدَّرٍ)

---

١. بڕوانە: همع الهوامع: ٤٦٢/١، وعلل النحو: ٢٠٨/١.

**كَأَنَّ سَائِلاً قَالَ: «هَلْ مِنْ غُلَامٍ لِي عِنْدَكَ؟» فَقِيلَ فِي جَوَابِهِ: «لَا غُلَامَ لَكَ عِنْدَنَا»، وَكَانَ مِنَ الْوَاجِبِ أَنْ يُقَالَ: «لَا مِنْ غُلَامٍ لَكَ عِنْدَنَا» بِزِيَادَةِ «مِنْ» لِيُطَابِقَ السُّؤَالُ الْجَوَابَ؛ لٰكِنَّهُمْ حَذَفُوهَا مِنَ الْجَوَابِ بِقَرِينَةِ السُّؤَالِ، فَتَضَمَّنَهَا الْجَوَابُ وَاحْتَاجَ إِلَيْهَا، وَأَشْبَهَ بِذٰلِكَ الْحَرْفَ.**

**وَأَمَّا الْبِنَاءُ عَلَى الْحَرَكَةِ فَلِلْفَرْقِ بَيْنَ الْبِنَاءِ اللَّازِمِ وَالْعَارِضِ.**

---

چونکە لەو کاتەدا «اِسْمُ لَا» دەبێتە وەڵامی پرسیارێکی «مُقَدَّر»ە **(كَأَنَّ سَائِلاً قَالَ)** وەک بڵێیت کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: **(هَلْ مِنْ غُلامٍ لِي عِنْدَكَ؟)** ئایە هیچ خزمەتکارێکی من لە لای تۆیە؟ **(فَقِيلَ فِي جَوابِهِ)** ئینجا لە وەڵامی ئەو کەسەدا دەگوترێت: **(لَا غُلامَ لَكَ عِنْدَنا)** واتە: هیچ خزمەتکارێکی تۆ لە لای ئێمە نییە، **(وَكَانَ مِنَ الْوَاجِبِ أَنْ يُقَالَ:)** کەچی «واجب» بوو بەم شێوەیە بگوترێت: **(لَا مِنْ غُلامٍ لَكَ عِنْدَنَا)** واتە: دەبوو **(بِزِيادَةِ «مِنْ»)** وشەی «مِنْ»ـی لە وەڵامەکەی زیاد بکردایە **(لِيُطابِقَ الْجَوابُ السُّؤالَ)** بۆ ئەوەی وەڵامەکە وەکوو پرسیارەکە بایە **(لَكِنَّهُمْ حَذَفُوها مِنَ الْجَوابِ)** بەڵام لە زمانی عەرەبیدا وشەی «مِنْ»ـیان لە وەڵامەکە «حَذْف» کردووە **(بِقَرِينَةِ السُّؤالِ)** بە بەڵگەی ئەوەی وشەی «مِنْ» لە پرسیارەکە هاتووە بۆیە لە وەڵامەکەی دووبارەیان نەکردەوە.

**(فَتَضَمَّنَهَا الْجَوابُ)** ئینجا جەوابەکە وشەی «مِنْ»ـی لە نێوخۆدا گرتووە **(وَاحْتاجَ إِلَيْهَا)** هەروەها پێویستیشی بە وشەی «مِنْ» هەیە بۆ مانابەخشین، **(وَأَشْبَهَ بِذلِكَ الْحَرْفَ)** بۆیە بەم هۆیەوە وێکچوون «مُشابَه»ی پەیدا بوو لەگەڵ «حَرْف»، چونکە هەموو حەرفێک بۆ مانابەخشین پێویستی بە غەیری خۆ هەیە، بۆیە ئیسمی «لا» بوو بە «مَبْنِي»، چونکە «حَرْف» مەبنییە، هەر شتێکیش بشوبهێتە «حَرْف» ـ واتە: وەکوو ئەو بێت ـ ئەویش دەبێتە «مَبْنِي».

**(وَأَمَّا الْبِناءُ عَلَى الْحَرَكَةِ)** ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: بۆچی ئیسمی «لا» مەبنییە لەسەر «حَرَكَة»؟ خۆ «أَصْل» وایە ئیسمی مەبنی «سُكُون»ـی هەبێت، مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: **(فَلِلْفَرْقِ بَيْنَ بِناءِ اللّازِمِ وَالْعَارِضِ)**

**وَأَمَّا الْبِنَاءُ عَلَى الْفَتْحِ فَلِخِفَّةِ الْفَتْحَةِ، وَقَدْ يُحْذَفُ اسْمُ «لَا» إِذَا كَانَ مَعْلُوماً، نَحْوُ: «لَا عَلَيْكَ» أَيْ: لَا بَأْسَ عَلَيْكَ.**

---

بۆ ئەوەی جیاوازی هەبێت لە نیوان وشەیەک کە «مَبْنِيُّ الأَصْل»ـە لەگەڵ وشەیەک کە «مَبْنِيُّ العَارِض»ـە.

**(وَأَمَّا الْبِناءُ عَلَى الْفَتْحَةِ)** پاشان ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: بۆچی ئیسمی «لا» مەبنییە لەسەر «فَتْحَة»؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: **(فَلِلْخِفَّةِ)** چونکە «فَتْحَة» لە هەموو حەرەکەتەکان سووکترە، بۆیە ئەو هەڵبژێردراوە.

ئینجا مامۆستا دێتە سەر بابەتێکی تر و دەفەرموێت: **(وَقَدْ يُحْذَفُ اِسْمُ لا)** هێندێک جار ئەو وشەیەی دەبێتە ئیسمی «لا» «حذف» دەکرێت بەڵام **(إذا كَانَ مَعْلُوماً)** بەو مەرجەی ئیسمەکە لەدوای «حذف»ـکردنیش هەر ڕوون و ئاشکرا بێت **(نَحْوُ:)** وەکوو ئەم نموونەی دەڵێت: **(لَا عَلَيْكَ)** واتە: بابەتەکە لەسەر تۆ نییە، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا ئیسمی «لا» «حذف» کراوە کە بریتییە لە وشەی «بَأْس»، بە تەنها خەبەرەکە ماوەتەوە **(أَيْ:)** ڕستەکە وای لێ دێتەوە **(لَا بَأْسَ عَلَيْكَ)**، بەڵام ئەگەر ڕستەکە مانای ڕوون و ئاشکرا نەبوو، ئەوە دروست نییە بە هیچ شێوەیەک ئیسمی «لا» «حذف» بکرێت.

* ◌ *

## خَبَرُ «مَا» وَ «لَا» بِمَعْنَى لَيْسَ

**قَالَ: وَخَبَرُ «مَا» وَ «لَا» بِمَعْنَىٰ لَيْسَ، وَهِيَ اللُّغَةُ الْحِجَازِيَّةُ، وَالتَّمِيمِيَّةُ رَفْعُهُمَا عَلَى الِابْتِدَاءِ.**

**أَقُولُ: الضَّرْبُ السَّابِعُ مِنْ ضُرُوبِ الْمُلْحَقِ بِالْمَفْعُولِ خَبَرُ «مَا» وَ «لَا» بِمَعْنَىٰ لَيْسَ، أَي: الْمَنْصُوبُ بِهِمَا، نَحْوُ: «مَا زَيْدٌ مُنْطَلِقاً وَلَا رَجُلٌ أَفْضَلَ مِنْكَ»، وَهِيَ -أَي: هٰذِهِ اللُّغَةُ-**

---

## وانەی پەنجاودووهەم: باسی «خَبَرُ مَا وَ لَا بِمَعْنَىٰ لَيْسَ»

(قالَ:) مامۆستا «جار اللّٰه» دەفەرموێت: (وَخَبَرُ مَا وَلَا بِمَعْنَى لَيْسَ) یەکێکی تر لەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوبْ» دەبێت و مولحەقە بە مەفعوولان بریتییە لەو ئیسمەی کە دەبێتە «خَبَر» بۆ وشەی «مَا» و «لَا» کە بە مانای «لَيْسَ» دێن (وَهِيَ اللُّغَةُ الْحِجازِيَّةُ) ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: کارکردنی «مَا» و «لَا» لە خەبەرێ لەسەر ڕا و زاراوەی خەڵکی حیجازە، (وَالتَّمِيمِيَّةُ، رَفْعُهُمَا عَلَى الإبْتِداءِ) بەڵام لە زاراوەی تەمیمییەکان ئەم دوو ئیسمەی کە دەکەونە دوای وشەی «مَا» و وشەی «لَا» هەردووکیان بە مەڕفووعی دەخوێندرێنەوە و ئەوەی یەکەم دەبێتە «مُبْتَدَأ» ئەوەی دووەم دەبێتە «خَبَرْ».

(أَقُولُ) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (اَلضَّرْبُ السَّابِعُ مِنْ ضُروبِ الْمُلْحَقِ بِالْمَفْعُولِ) بەشی حەوتەم لەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوبْ» دەبن و مولحەقە بە مەفعوولان (خَبَرُ مَا وَلَا) بریتییە لەو ئیسمەی کە دەبێتە «خَبَر» بۆ وشەی «مَا» و بۆ وشەی «لَا» (بِمَعْنَى لَيْسَ) کە بە مانای «لَيْسَ»نە (أَيْ: الْمَنْصُوبُ بِهِمَا) واتە: ئەو ئیسمەی کە «مَنْصُوبْ» دەبێت بە وشەی «مَا» و«لَا» (نَحْوُ) وەکوو (مَا زَيْدٌ مُنْطَلِقاً. وَ) هەروەها وەکوو (لَا رَجُلٌ أَفْضَلَ مِنْكَ) سەرنج بدە: لەم دوو نموونەیەدا هەردوو وشەی «مُنْطَلِقاً، أَفْضَلَ» بوونەتە «خَبَرْ» بۆ وشەی «مَا» و «لَا» بۆیە هەردووکیان «مَنْصُوبْ» بوون.

(وَهِيَ أَيْ: هَذِهِ اللّغَةُ) ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: کارکردنی ئەم دوو وشەیە

**أَعْنِي: النَّصْبَ بِـ «مَا» وَ «لَا» اللُّغَةُ الْحِجَازِيَّةُ. وَاللُّغَةُ التَّمِيمِيَّةُ رَفْعُهُمَا عَلَى الِابْتِدَاءِ، أَيْ: رَفْعُ الِاسْمَيْنِ الْوَاقِعَيْنِ بَعْدَ «مَا» وَ «لَا» عَلَىٰ أَنَّ الْأَوَّلَ مُبْتَدَأٌ وَالثَّانِيَ خَبَرُهُ. وَدَلِيلُ الْحِجَازِيَّةِ قَوْلُهُ تَعَالَىٰ: ﴿مَا هَٰذَا بَشَرًا﴾ وَ﴿مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمْ﴾. وَدَلِيلُ التَّمِيمِيَّةِ دُخُولُهُمَا عَلَى الْقَبِيلَتَيْنِ، أَعْنِي: الْأَسْمَاءَ وَالْأَفْعَالَ؛ فَإِنَّ الْعَامِلَ يَجِبُ أَنْ يَخْتَصَّ بِأَحَدِهِمَا.**

---

(**أَعْنِي: اَلنَّصْبَ بِـ مَا وَلَا**) مەبەستم ئەوەیە کە وشەی «مَـا» و وشـەی «لَا» خەبـەرێ خۆ «مَنْصُوبْ» بکـەن (**اللُّغَةُ الْحِجَازِيَّةُ**) لەسـەر ڕا و زاراوەی خەڵکی حیجازە (**وَاللُّغَةُ التَّمِيمِيَّةُ، رَفْعُهُمَا عَلَى الِابْتِدَاءِ**) بـەڵام تەمیمییـەکان دەفەرمـوون: ئـەو دوو ئیسـمەی کـە دەکەونـە دوای وشـەی «مَـا» و «لَا» مەرفـووع دەبـن (**أَيْ: عَلَى رَفْعِ الِاسْمَيْنِ الْوَاقِعَيْنِ بَعْدَ مَا وَلَا**) واتـە: هەردووکیـان بـە «مَرْفُوعْ» دەخوێندرێنەوە (**عَلَى أَنَّ الْأَوَّلَ مُبْتَدَأٌ وَالثَّانِي خَبَرُهُ**) ئـەوەی یەکـەم دەبێتـە «مُبْتَدَأ» و ئـەوەی دووەم دەبێتە «خَبَرْ»، (**وَدَلِيلُ الْحِجَازِيَّةِ**) بەڵگـەی زانایانـی ئەهلـی حیجاز لەسـەر کارکردنی وشـەی «مَا» و وشـەی «لَا» (**قَوْلُهُ تَعَالَى**) ئـەم دوو فەرمایشـتەی خـوای گەورەیـە: یەکـەم (﴿مَا هَٰذَا بَشَرًا﴾) [سـورة یوسـف: الآیـة: ٣١]، سـەرنج بـدە: لـەم ئایەتـەدا وشـەی «بَشَـراً» بۆتـە «خَبَـرْ» بـۆ وشـەی «ما» و «مَنْصُـوبْ» بووە. (**وَ**) دووەم (﴿مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمْ﴾) [سـورة المجادلـە: الآیـة: ٢]، هەروەهـا لـەم ئایەتـەدا وشـەی «أُمَّهَـاتِ» بۆتـە «خَبَرْ» بۆ وشـەی «مـا» و «مَنْصُـوبْ» بـووە، بـەڵام چونکـە وشـەی «أُمَّهَـاتِ» «جَمْعُ الْمُؤَنَّث السّالِم»ـە بۆیە «نَصْب»ـەی بە «كَسْرَة»یە. (**وَدَلِيلُ التَّمِيمِيَّةِ**) هەروەها بەڵگەی خەڵکی تەمیمی لەسەر کارنەکردنی وشەی«مَا» و وشەی «لَا» بریتییە لەوەی کە ئەوان (**دُخُولُهُمَا عَلَى الْقَبِيلَتَيْنِ، أَعْنِي: اَلْأَسْمَاءَ وَالْأَفْعَالَ**) دەڵێن: وشـەی «مَا» و وشـەی «لَا» دەچنە سـەر «اِسْم» و دەچنە سەر فیعلان (**فَإِنَّ الْعَامِلَ يَجِبُ أَنْ يَخْتَصَّ بِأَحَدِهِمَا**) چونکە دەبێت «عَامِلْ» تایبەت بێت یان بە ئیسمان یاخود بە فیعلان.

* ◌ *

**قَالَ: وَإِذَا تَقَدَّمَ الْخَبَرُ أَوِ انْتَقَضَ النَّفْيُ بِ «إِلَّا»، فَالرَّفْعُ لَازِمٌ، نَحْوُ: «مَا مُنْطَلِقٌ زَيْدٌ، وَمَا زَيْدٌ إِلَّا مُنْطَلِقٌ».**

**أَقُولُ: إِذَا تَقَدَّمَ خَبَرُ «مَا» وَ «لَا» عَلَى اسْمِهِمَا أَوِ انْتَقَضَ نَفْيُهُمَا بِـ «إِلَّا» أَيْ: بَطَلَ عَمَلُهُمَا، بِأَنْ يَقَعَ خَبَرُهُمَا بَعْدَ «إِلَّا»، فَالرَّفْعُ لَازِمٌ، نَحْوُ: «مَا مُنْطَلِقٌ زَيْدٌ»؛**

## وانەی پەنجاوسێهەم: باسی مەرجەکانی کارکردنی «مَا» و «لَا»

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» دەفەرمووێت: (وَإِذَا تَقَدَّمَ الْخَبَرُ) هەرکاتێک خەبەری وشەی «ما» و «لا» لەسەر ئیسمی وەپێش بکەوێت (أَوِ) یاخود (انْتَقَضَ النَّفْيُ بِـ (إِلّا) «نَفْي»ـیەکەیان تێک چوو و هەڵوەشایەوە بە هۆی زیادکردنی وشەی «إِلّا» لەدوای ئیسمی «ما» و «لا» (فَالرَّفْعُ لازِمٌ) ئەوە لەم دوو حاڵەتەدا واجبە هەردوو ئیسمەکان بە مەرفووعی بخوێندرێنەوە (نَحْوُ:) وەکوو (مَا مُنْطَلِقٌ زَيْدٌ) یا خود وەکوو «لا قَائِمٌ رَجُلٌ»، سەرنج بدە: لەم دوو نموونەیەدا وشەی «ما» و «لا» کار ناکەن، بەڵکوو لە نموونەی یەکەم وشەی «مُنْطَلِقٌ» دەبێتە «خَبَر مُقَدَّم» و هەروەها وشەی «زَيْدٌ» دەبێتە «مُبْتَدَأ مُؤَخَّر»، نموونەی دووەمیش بە هەمان شێوە؛ (وَ) هەروەها وەکوو (مَا زَيْدٌ إِلّا مُنْطَلِقٌ) سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «ما» کاری نەکردووە چونکە «نَفْي» وشەی «ما» هەڵوەشاوەتەوە بە هۆی زیادکردنی وشەی «إِلّا».

(أَقُولُ) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرمووێت: منیش دەڵێم: (إِذَا تَقَدَّمَ خَبَرُ مَا وَلَا عَلَى اِسْمِهِمَا) هەرکاتێک خەبەری وشەی «ما» و «لا» لەسەر ئیسمی وەپێش بکەوێت (أَوِ انْتَقَضَ نَفْيُهُما بِـ إِلّا) یاخود «نَفْي»ـیەکەیان تێک بچێت و هەڵبوەشێتەوە (بَطَلَ عَمَلُهُمَا) کارکردنی وشەی «ما» و «لا» تێک دەچێت (بِأَنْ يَقَعَ خَبَرُهُمَا بَعْدَ إِلّا) بەم شێوەیەی کە خەبەری وشەی «ما» و «لا» دوای وشەی «إِلّا» بێت (فَالرَّفْعُ لازِمٌ) لەم دوو حاڵەتەدا واجبە هەردوو ئیسمەکان بە مەرفووعی بخوێندرێنەوە. (نَحْوُ:) وەکوو (مَا مُنْطَلِقٌ زَيْدٌ) یاخود وەکوو «لا قَائِمٌ رَجُلٌ»، سەرنج بدە: لەم دوو نموونەیەدا وشەی «ما» و «لا» کار ناکەن، بەڵکوو لە نموونەی یەکەم وشەی «مُنْطَلِقٌ» دەبێتە «خَبَر مُقَدَّم» و هەروەها وشەی «زَيْدٌ» دەبێتە «مُبْتَدَأ

**وَ «مَا زَيْدٌ إِلَّا مُنْطَلِقٌ». وَلَا يَجُوزُ نَصْبُ «مُنْطَلِقٌ»؛ لِأَنَّ «مَا» وَ «لَا» إِنَّمَا عَمِلَتَا لِمُشَابَهَتِهِمَا بِلَيْسَ مِنْ جِهَةِ النَّفْيِ فَيَبْطُلُ عَمَلُهُمَا بِتَقْدِيمِ الْخَبَرِ عَلَى الِاسْمِ لِضَعْفِهِمَا فِي الْعَمَلِ، وَكَذَا بِانْتِقَاضِ نَفْيِهِمَا بِـ «إِلَّا» لِانْتِفَاءِ وَجْهِ الشَّبَهِ بَيْنَهُمَا وَبَيْنَ لَيْسَ حِينَئِذٍ،**

---

مُؤَخَّر»، لە نموونەی دووەمیش بە هەمان شێوە؛ **(وَ)** هەروەها وەکوو **(مَا زَيْدٌ إِلَّا مُنْطَلِقٌ)** **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «ما» کاری نەکردووە، چونکە «نَفْي» وشەی «ما» هەڵوەشاوەتەوە بە هۆی زیادکردنی وشەی «إِلّا».

**(وَلَا يَجُوزُ نَصْبُ «مُنْطَلِقٌ»)** دروست نییە وشەی «مُنْطَلِقٌ» بە «مَنصوب»ـی بخوێندرێتەوە **(لأَنَّ مَا وَلَا إِنَّمَا عَمِلَتَا)** چونکە وشەی «ما» و «لا» بۆیە کار دەکەن چونکە **(لِمُشابَهَتِهِمَا بِـ لَيْسَ)** چونکە لە ڕووی ماناوە دەشوبهێنە «لَيْسَ» **(مِنْ جِهَةِ النَّفْيِ)** کە هەردووکیان بۆ «نَفْيِ» بەکار دێن **(فَيَبْطُلُ عَمَلُهُمَا)** کەواتە: کارکردن و «عَمَل»ـی وشەی «ما» و «لا» تێک دەچێت **(بِتَقْدِيمِ الْخَبَرِ عَلَى الِاسْمِ)** ئەگەر خەبەری وشەی «ما» و «لا» لەسەر ئیسمی وەپێش بکەوێت **(لِضَعْفِهِمَا فِي الْعَمَلِ)** چونکە وشەی «ما» و«لا» بێ‌هێزن لە کارکردندا.

**(وَكَذا بِانْتِقاضِ نَفْيِهِمَا بِـ إِلّا)** هەروەها بە هەمان شێوە ئەگەر «نَفْي»ـیەکەیان تێک چوو بە هۆی هاتنی وشەی «إِلّا» **(لِانْتِفاءِ وَجْهِ الشَّبَهِ بَيْنَهُمَا وَبَيْنَ لَيْسَ حِينَئِذٍ)** چونکە بێگومان ئەوکاتە «مُشابَهَة» کە تێکدەچێ لە نێوانیاندا بۆیە لەم حاڵەتەشدا وشەی «ما» و «لا» کار ناکەن، بەڵکوو ئەم دوو ئیسمەی لە دوایان دێن دەبن بە «مُبْتَدَأ» و بە «خَبَر».

وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَآ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا﴾ [1] یاخود وەکوو ﴿وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ﴾ [2] **سەرنج بدە:** لەم دوو نموونەیەدا وشەی «ما» و «لا» کاریان نەکردووە [3].

---

١. سورة يس: الآية: ١٥.

٢. سورة الأحقاف: الآية: ٩.

٣. بڕوانە: شرح قطر النّدى وبلّ الصّدى: (٢٣٢) وشرح ابن العقيل: (٣٠٣/١) وشرح كافيه ☜

**وَكَذٰلِكَ يَبْطُلُ عَمَلُ «مَا» بِزِيَادَةِ «إِنْ» مَعَهَا، نَحْوُ: «مَا إِنْ زَيْدٌ مُنْطَلِقٌ»، لِضَعْفِهِمَا فِي العَمَلِ بِالفَاصِلَة.**

*** * ***

**(وَكَذَلِكَ يَبْطُلُ عَمَلُ «مَا» بِزِيادَةِ «إِنْ» مَعَها)** هەروەها دەبێت وشەی «ما» ڕاستەوخۆ بچێتە سەر ئیسمی خۆی، چونکە ئەگەر هاتوو وشەی «إِنْ» یاخود وشەیەکیتر کەوتە نێوانیان، ئەوکاتە وشەی «ما» کار (عَمَلْ) ناکات **(نَحْوُ)** وەکوو ئەم نموونەیە: **(مَا إِنْ زَيْدٌ مُنْطَلِقٌ لِضَعْفِهِمَا فِي العَمَلِ بِالفَاصِلَة)**[1]، سەرنج بدە: لێرەدا وشەی «ما» کاری نەکردووە چونکە وشەی «إِنْ» کەوتۆتە نێوانیان، بەڵکوو ئەم دوو ئیسمی لە دوایەوە هاتوون دەبن بە «مُبْتَدَأ» و بە «خَبَر».

* ◌ *

☞ ابن الحاجب الكوردي: (٢٥٨/١) والقوعد والفوائد: (١٦٣) والإظهار (٢٧)

١. ئەو کاتە وشەی «إِنْ» بە «زَائِدَة» هەژمار دەکرێت، لە لای زانایانی «بَصْرِي»، بەڵام «کوفییەکان» دەفەرموون: لەم کاتەدا وشەی «إِنْ» پێی دەگوترێت «اَلْعازِلَةُ» یاخود «نافِيَةٌ مُؤَكِدَةٌ».

# بَابُ الْمَجْرُورَات

**قَالَ: الْمَجْرُورَاتُ عَلَىٰ ضَرْبَيْنِ: مَجْرُورٍ بِالْإِضَافَةِ وَمَجْرُورٍ بِحَرْفِ الْجَرِّ، كَقَوْلِكَ: «غُلَامُ زَيْدٍ» وَ «سِرْتُ مِنَ الْبَصْرَةِ إِلَى الْكُوفَةِ».**

**أَقُولُ: لَمَّا فَرَغَ مِنَ الْقِسْمِ الثَّانِي مِنْ أَقْسَامِ الْمُعْرَبِ وَهُوَ الْمَنْصُوبَاتُ، شَرَعَ فِي الْقِسْمِ الثَّالِثِ، أَعْنِي: الْمَجْرُورَاتِ، فَقَالَ مَا قَالَ.**

---

## وانەی پەنجاوچوارەم: باسی ئەو ئیسمانەی کە «مَجْرُورْ» دەبن

**(قالَ:)** مامۆستا «جار الله» دەفەرموێت: **(اَلْمَجْرُوراتُ عَلَى ضَرْبَيْنِ)** ئەو ئیسمانەی کە «مَجْرُورْ» دەبن دوو جۆریان هەیە:

**جۆری یەکەم: (مَجْرُورٌ بِالإِضافَةِ)** بریتییە لەو ئیسمەی کە بە هۆی ئەوەی دەبێتە «مُضافُ إِلَيْهِ» مەجروور دەبێت.

**جۆری دووەم: (وَمَجْرُورٌ بِحَرْفِ الْجَرِّ)** بریتییە لەو ئیسمەی کە بەهۆی یەکێک لە «حُروفُ الْجَرّ» مەجروور دەبێت **(كَقَوْلِكَ)** وەکوو تۆ دەڵێیت: **(هذا غُلامُ زَيْدٍ)** **سەرنج بدە:** وشەی «زَيْدٍ» لەم نموونەیەدا بە هۆی ئەوەی دەبێتە «مُضافُ إِلَيْهِ» مەجروور دەبێت؛ **(وَ)** هەروەها وەکوو **(سِرْتُ مِنَ الْبَصْرَةِ إِلَى الْكُوفَةِ)** **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «اَلْبَصْرَة» هەروەها وشەی «اَلْكُوفَة» بە هۆی یەکێک لە «حُروفُ الْجَرّ» مەجروور بوونە.

**(أَقُولُ)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(لَمّا فَرَغَ مِنَ الْقِسْمِ الثَّانِي مِنْ أَقْسامِ الْمُعْرَبِ)** لە کاتێک مامۆستا باسی بەشی یەکەمی تەواو کرد لە بەشەکانی ئیسمی «مُعْرَب» **(وَهُوَالْمَنْصُوباتُ)** کە بریتیبوو لە باسکردنی ئەو ئیسمانەی کە «مَنْصُوبْ» دەبوون، ئینجا مامۆستا **(شَرَعَ فِي الْقِسْمِ الثَّالِثِ)** دەستی کرد بە باسکردنی بەشی سێیەم **(أَعْنِي: الْمَجْرُوراتِ)** مەبەستم باسکردنی ئەو ئیسمانەیە کە «مَجْرُورْ» دەبن **(فَقَالَ)** ئینجا مامۆستا فەرمووی **(مَا قَالَ)** ئەوەی کە فەرمووی «اَلْمَجْرُوراتُ عَلَى ضَرْبَيْنِ».

**وَقَوْلُهُ: «مَجْرُورٍ بِالْإِضَافَةِ» مُجْمَلٌ لَا يُعْلَمُ مِنْهُ أَنَّ الْعَامِلَ فِي الْمُضَافِ إِلَيْهِ هُوَ الْمُضَافُ أَوْ حَرْفُ الْجَرِّ الْمُقَدَّرُ أَوْ كِلَاهُمَا، وَلِكُلٍّ قَائِلٌ.**

**(وَقَوْلُهُ)** ئەو قسەیەی كە مامۆستا گوتی: **(مَجْرورٌ بِالإِضافَةِ)** قسەیە **(مُجْمَلٌ)**ـە و لە ڕووی ماناوە نادیار و كورتە، وە هیچ «تَفاصِیل»ـێكی تێدا نییە، بۆیە **(لَا يُعْلَمُ مِنْهُ)** لەم قسەیە نازاندرێت **(أَنَّ الْعَامِلَ فِي الْمُضافِ إِلَيْهِ)** ئەو عامیلەی كە كار لە «مُضافُ إِلَيْـهِ» دەكات بـە دیاریكـراوی نازاندرێت ئاخـۆ **(هُوَ الْمُضافُ)** وشـەی «مُضاف»ـە بـە تەنها **(أَوْ حَرْفُ الْجَرِّ الْمُقَدَّرُ)** یاخـود «حَـرْفُ الْجَرّ»ێكـی «مُقَـدَّر»ە بـە تەنهـا **(أَوْ كِلاهُمَا)** یاخـود هەردووكیـان بـە یەكـەوەن **(وَلِكُلِّ قَائِلٌ)** بـۆ هەریـەک لـەم بۆچوونانـە كۆمەڵێک زانا ڕەئی خۆیان دەربڕیوە.

* ◌ *

# الْإِضَافَةُ الْمَعْنَوِيَّةُ

**قَالَ: وَالْإِضَافَةُ عَلَىٰ ضَرْبَيْنِ: مَعْنَوِيَّةٍ، وَهِيَ الَّتِي بِمَعْنَىٰ «اللَّامِ»، أَوْ بِمَعْنَىٰ «مِنْ»، كَقَوْلِكَ: «غُلَامُ زَيْدٍ» وَ «خَاتَمُ فِضَّةٍ».**

**أَقُولُ: الْإِضَافَةُ بِمَعْنَى اللَّامِ إِنَّمَا تَكُونُ إِذَا لَمْ يَكُنِ الْمُضَافُ إِلَيْهِ جِنْسَ الْمُضَافِ وَلَا ظَرْفَهُ، نَحْوُ: «غُلَامُ زَيْدٍ»،**

---

## وانەی پەنجاو پێنجەم: باسی «الإِضَافَةُ اَلْمَعْنَوِيَّةُ»

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» دەفەرموێت: (وَالإِضافَةُ عَلَى ضَرْبَيْنِ) ئەو ئیسمانەی کە «إِضَافَة» دەکرێن بۆ لای «مُضاف إِلَيْهِ»، «إضافة»کردنەکە دەبێت بە دوو جۆر، جۆری یەکەم: (مَعْنَوِيَّةٌ) پێی دەگوترێت: «الإِضَافَةُ اَلْمَعْنَوِيَّةُ» کە مامۆستا پێناسەی دەکات و دەفەرموێت: (وَهِيَ الَّتِي بِمَعْنَى اللَّامِ) بریتییە لەو «إِضَافَة»یەی کە مانای «لام»ـی حەرفی «جَرّ» دەبەخشێت (أَوْ بِمَعْنَى مِنْ) یاخود مانای «مِنْ» دەبەخشێت (كَقَوْلِكَ) وەکوو تۆ دەڵێیت: (غُلامُ زَيْدٍ)، سەرنج بدە: لێرەدا ئەم «إِضَافَة»یە بە مانای «لام»ـە «أَيْ: غُلامٌ لِزَيْدٍ»، (وَ) هەروەها وەکوو (خَاتَمُ فِضَّةٍ) سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا ئەم «إضافة»یە بە مانای «مِنْ»ـە «أَيْ: خَاتَمٌ مِنْ فِضَّةٍ».

(أَقُولُ) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (اَلإِضَافَةُ بِمَعْنَى اللَّامِ إِنَّمَا تَكُونُ) «إضافة»کردن ئەو کاتە بە مانای «لام» دێت (إِذَا لَمْ يَكُنِ الْمُضافُ إِلَيْهِ جِنْسَ الْمُضافِ) ئەگەر بێت و ئەو ئیسمەی بووە بە «مُضافُ إِلَيْه» پێکهاتەی سەرەکی «مُضاف» نەبوو، واتە: وشەی «مُضاف» لە «مُضافُ إِلَيْهِ» دروست نەکرابوو (وَلَا ظَرْفَهُ) هەروەها ئەگەر بێت ئەو ئیسمەی بووە بە «مُضافُ إِلَيْه»، «ظَرْفُ الزَّمَانْ» نەبوو بۆ وشەی «مُضاف»، واتە: وشەی «مُضاف إِلَيْهِ» ئەو زەمەنە نەبوو کە «مُضاف»ـی تێدا ئەنجام دراوە (نَحْوُ) وەکوو (غُلامُ زَيْدٍ)، سەرنج بدە: لەم نموونەدا وشەی «غُلام» «إضافة» کراوە بۆ لای وشەی «زَيْد»، لە هەمان کاتدا «إِضَافَة»ـەکە بە

**أَيْ: غُلَامٌ لِزَيْدٍ، وَبِمَعْنَىٰ «مِنْ» إِنَّمَا تَكُونُ إِذَا كَانَ الْمُضَافُ إِلَيْهِ مِنْ جِنْسِ الْمُضَافِ، نَحْوُ: «خَاتَمُ فِضَّةٍ»، أَيْ خَاتَمٌ مِنْ فِضَّةٍ، وَ «ثَوْبُ قُطْنٍ»، أَيْ: ثَوْبٌ مِنْ قُطْنٍ.**

**وَقَدْ تَكُونُ بِمَعْنَىٰ «فِي»، وَذٰلِكَ إِذَا كَانَ الْمُضَافُ إِلَيْهِ ظَرْفَ الْمُضَافِ، نَحْوُ: «ضَرْبُ الْيَوْمِ»،**

---

مانای «لام»ــە **(أَيْ: غُلَامُ لِزَيْدٍ)** چونکە وشەی «مُضاف» لە «مُضاف إِلَيْهِ» دروست نەکراوە و پێکهاتەی سەرەکی ئەو نییە، یاخود وەکوو «عَيْنُ زَيْدٍ، وَيَدُ بَكْرٍ»[1].

**(وَبِمَعْنَى مِنْ)** هەروەها ئەوکاتە «إضافة»کردنەکە بە مانای «مِنْ» دێت **(إِنَّمَا تَكُونُ إِذَا كَانَ الْمُضافُ إِلَيْهِ مِنْ جِنْسِ الْمُضافِ)** ئەگەر بێت و ئەو ئیسمەی بووە بە «مُضاف إِلَيه» پێکهاتەی سەرەکی «مُضاف» بوو، واتە: وشەی «مُضاف» لە «مُضاف إِلَيْهِ» دروست کرابوو **(نَحْوُ)** وەکوو **(خَاتَمُ فِضَّةٍ)**، **سەرنج بدە:** لەم نموونەدا وشەی «خَاتَمُ» «إضافة» کراوە بۆ لای وشەی «فِضَّةٌ» لە هەمان کاتدا «إضافة»کە بە مانای «مِنْ»ــە **(أَيْ: خَاتَمٌ مِنْ فِضَّةٍ)** چونکە وشەی «مُضاف» لە «مُضاف إِلَيْهِ» دروست کراوە و پێکهاتەی سەرەکی ئەوە، هەروەها وەکوو **(ثَوْبُ قُطْنٍ)**، **سەرنج بدە:** لەم نموونەدا وشەی «ثَوْبُ» «إضافة» کراوە بۆ لای وشەی «قُطْنٍ» لە هەمان کاتدا «إضافة»کە بە مانای «من»ــە **(أَيْ: ثَوْبٌ مِنْ قُطْنٍ)** چونکە وشەی «مُضاف» لە «مُضاف إِلَيْهِ» دروست کراوە و پێکهاتەی سەرەکی ئەوە، بە هەمان شێوەی نموونەی ڕابوردوو.

**(وَقَدْ تَكُونُ بِمَعْنَى فِي)** هەروەها هێندێک جار «إضافة»کردنەکە بە مانای «فِي» دێت **(وَذَلِكَ إِذَا كَانَ الْمُضافُ إِلَيْهِ ظَرْفَ الْمُضافِ)**[2] ئەگەر بێت و ئەو ئیسمەی بووە بە «مُضافُ إِلَيە»، «ظَرْفُ الزَّمَانْ» بوو یاخود «ظَرْفُ الْمَكان» بوو بۆ وشەی «مُضاف»، واتە: وشەی «مُضاف إِلَيْهِ» ئەو زەمەنە بوو، یاخود ئەو شوێنە بوو کە وشەی «مُضاف»ــی تێدا ئەنجام دراوە **(نَحْوُ)** وەکوو **(ضَرْبُ الْيَوْمِ)**، **سەرنج بدە:**

---

١. بڕوانە: شرح المفصل: (١٢٥/٢)، وشرح كافية ابن الحاجب الكوردي: (٢٣٨/٢) و (شرح التسهيل: (٨٨/٣).

٢. بڕوانە: شرح المفصل: ١٢٥/٢، والمشكل في النّحو: ١٧٣.

**أَيْ: ضَرْبٌ فِي الْيَوْمِ، وَكَقَوْلِهِ تَعَالَىٰ: ﴿بَلْ مَكْرُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ﴾ [سبأ: ٣٢]. أَيْ: مَكْرٌ فِي اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ، وَلَمْ يَتَعَرَّضْ لَهَا لِقِلَّتِهَا.**

لەم نموونەدا وشەی «ضَرْبُ» «إضافة» کراوە بۆ لای وشەی «اَلْيَوْمِ»، لە هەمان کاتدا «إضافة»کە بە مانای «فِي»ـیە (أَيْ: ضَرْبٌ فِي الْيَوْمِ) واتە: وشەی «مُضاف إِلَيْهِ» زەمەن و کاتی لێدانەکەیە، یاخود وەکوو «ضَرْبُ السُّوقِ» سەرنج بدە: لەم نموونەدا وشەی «ضَرْبُ» «إضافة» کراوە بۆ لای وشەی «اَلْسُّوقِ» لە هەمان کاتدا «إضافة»کە بە مانای «فِي»ـیە «أَيْ: ضَرْبٌ فِي الْسُّوقِ» واتە: وشەی «مُضاف إِلَيْهِ» شوێن و جێگای لێدانەکەیە. (وَكَقَوْلِهِ تَعَالَىٰ) هەروەها وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: (﴿بَلْ مَكْرُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ﴾)[1] سەرنج بدە: لەم نموونەدا وشەی «مَكْرُ» «إضافة» کراوە بۆ لای وشەی «اَللَّيْلِ» لە هەمان کاتدا «إضافة»کە بە مانای «فِي»ـیە (أَيْ: مَكْرٌ فِي اللَّيْلِ وَالنَّهارِ) چونکە وشەی «مُضاف إِلَيْهِ» زەمەن و کاتی فێڵ و تەڵەکەبازییەکەیە. (وَلَمْ يَتَعَرَّضْ لَهَا الْمُصَنِّفُ)[2] هەروەها بۆیە مامۆستا ئەم بەشەی باس نەکرد واتە: «إضافة»ی بە مانای «فِي» (لِقِلَّتِها) چونکە ئەم جۆرە «إضافة»یە کەمترە لە زمانی عەرەبیدا لە هەردوو بەشەکەی‌تر، هەر بۆیەش مامۆستا لە سەرەتای وانەکەدا ئاماژەی بۆ نەکرد.

* ◌ *

١. سورة سبأ الآية: (٣٣)

٢. بڕوانە: الأوصول في النحو: (٥/٢) وشرح المفصل: (١٢٥/٢)، وكشف المشكل في النّحو: (١٧٠) وشرح كافية ابن الحاجب الكوردي: (٢٣٨/٢) و (شرح التسهيل: (٨٨/٣).

# الْإِضَافَةُ اللَّفْظِيَّةُ

**قَالَ: وَلَفْظِيَّةٍ، وَهِيَ إِضَافَةُ اسْمِ الْفَاعِلِ إِلَىٰ مَعْمُولِهِ، نَحْوُ: «ضَارِبُ زَيْدٍ» أَوِ الصِّفَةِ الْمُشَبَّهَةِ إِلَىٰ فَاعِلِهَا، كَقَوْلِكَ: «حَسَنُ الْوَجْهِ».**

**أَقُولُ: يَعْنِي: بِالْمَعْمُولِ، الْمَفْعُولَ الَّذِي لَوْ لَمْ يَكُنْ مَجْرُوراً بِالْإِضَافَةِ لَكَانَ مَنْصُوباً عَلَى الْمَفْعُولِيَّةِ؛ وَذٰلِكَ إِنَّمَا يَكُونُ**

---

## وانەی پەنجاوشەشەم: باسی «الإِضَافَةُ اَللَّفْظِيَّة»

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» دەفەرموێت: (وَلَفْظِيَّة) **جۆری دووەم:** پێی دەگوترێت: «الإِضَافَةُ اَللَّفْظِيَّةُ» کە مامۆستا پێناسەی دەکات و دەفەرموێت: سێ بەشی هەیە:

**بەشی یەکەم:** (وَهِيَ إِضَافَةُ اِسْمِ الْفَاعِلِ إِلَى مَعْمُولِهِ) کە بریتییە لە «إضافة»کردنی «اِسْمُ الْفاعِل» بۆ لای مەفعولی خۆی (نَحو) وەکوو (ضَارِبُ زَيْدٍ) سەرنج بدە: وشەی «ضَارِبٌ» «اِسْمُ الْفاعِل»ـە و «إضافة» کراوە بۆ لای «زَيْدٍ» کە «مَفْعُول بِهِ»ی خۆیەتی، بۆیە پێی دەگوترێت «الإِضَافَةُ اَللَّفْظِيَّةُ». **بەشی دووەم:** (أَوِ) یاخود (الصِّفَة الْمُشَبَّهَةِ إِلَى فَاعِلِهَا) بریتییە لە «إضافة»کردنی «الصِّفَة الْمُشَبَّهَة» بۆ لای فاعیلی خۆی (كَقَوْلِكَ:)وەکوو تۆ دەڵێیت: (حَسَنُ الْوَجْهِ) سەرنج بدە: وشەی «حَسَنٌ» «الصِّفَة الْمُشَبَّهَة»یە و «إضافة» کراوە بۆ لای وشەی «الوَجْهِ» کە فاعیلی خۆیەتی لە ئەسڵدا بۆیە پێی دەگوترێت: «الإِضَافَةُ اَللَّفْظِيَّةُ».

(أَقُولُ) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (يَعْنِي بِالْمَعْمُولِ:) مەبەست بە وشەی «مَعْمُولٌ» کە مامۆستا باسی دەکات بریتییە لە (اَلْمَفْعُولُ الَّذِي) لە «مَفْعُول بِهِ»ـیەی کە (لَوْ لَمْ يَكُنْ مَجْرُوراً بِالإِضَافَةِ)[1] ئەگەر بە هۆی «إضافة»کردن «مَجْرُورٌ» نەبوایە (لَكانَ مَنْصُوباً عَلَى الْمَفْعُولِيَّةِ) ئەو کاتە دەبوو بە «مَفْعُول بِهِ» و «مَنْصُوبٌ» دەبوو (وَذَلِكَ إِنَّمَا يَكُونُ) ئەمەش لە کاتێکدا دەبێت

---

١. بڕوانە: الأصول في النحو: ٢/٥.

**إِذَا كَانَ اسْمُ الْفَاعِلِ عَامِلاً، بِأَنْ يَكُونَ بِمَعْنَى الْحَالِ أَوِ الِاسْتِقْبَالِ، نَحْوُ: «زَيْدٌ ضَارِبُ عَمْرٍو الْآنَ أَوْ غداً»، فَإِنَّ «عَمْراً» هٰهُنَا لَوْ لَمْ يَكُنْ مَجْرُوراً بِالْإِضَافَةِ لَكَانَ مَنْصُوباً عَلَى الْمَفْعُولِيَّةِ.**

**وَأَمَّا إِذَا لَمْ يَكُنْ عَامِلاً، بِأَنْ كَانَ بِمَعْنَى الْمَاضِي، نَحْوُ: «زَيْدٌ ضَارِبُ عَمْرٍو أَمْسِ». فَلَا تَكُونُ الْإِضَافَةُ حِينَئِذٍ لَفْظِيَّةً بَلْ مَعْنَوِيَّةً؛ لِأَنَّ اسْمَ الْفَاعِلِ لَا يَعْمَلُ النَّصْبَ إِذَا كَانَ بِمَعْنَى الْمَاضِي، كَمَا سَيَجِيءُ.**

---

(إِذَا كَانَ اِسْمُ الْفَاعِلِ عَامِلاً) ئەگەر بێت و «اِسْمُ الْفَاعِل» كار بكات (بِأَنْ يَكُونَ بِمَعْنَى الْحَالِ أَوْ الاِسْتِقْبالِ) بە جۆرێک کە ئەم وشەیەی بووە بە «اِسْمُ الْفَاعِل» دەلالەت لەسەر دەمی ئێستا یاخود دەمی داهاتوو بكات (نَحْوُ) وەكوو (زَيْدٌ ضَارِبُ عَمْرٍو اَلآنَ أَوْ غَداً) واتە: زەید لە عەمری دەدات ئێستا یاخود لە داهاتوو، **سەرنج بدە:** وشەی «ضَارِبٌ» «اِسْمُ الْفاعِل»ـە و «إضافة» كراوە بۆ لای «عَمْرو» کە «مَفْعُول بِهِ»ی خۆیەتی، بۆیە پێی دەگوترێت «الإِضَافَةُ اَللَّفْظِيَّةُ» (فَإِنَّ عَمْراً هٰهُنَا) **سەرنج بدە:** وشەی «عَمْرو» لەم نموونەیەدا (لَوْ لَمْ يَكُنْ مَجْرُوراً بِالإِضَافَةِ) ئەگەر بە هۆی «إضافة»كردن «مَجْرُورْ» نەبوایە (لَكَانَ مَنْصُوباً عَلَى الْمَفْعُولِيَّةِ)[1] ئەو كاتە دەبوو بە «مَفْعُول بِهِ» و «مَنْصُوبْ» دەبوو.

(وَأَمَّا إِذَا لَمْ يَكُنْ عَامِلاً) بەڵام ئەگەر بێت و «اِسْمُ الْفَاعِل» كار نەكات (بِأَنْ كَانَ بِمَعْنَى الْمَاضِي) بە جۆرێک کە ئەم وشەیەی بووە بە «اِسْمُ الْفَاعِل» دەلالەت لەسەر دەمی ڕابوردوو بكات (نَحْوُ) وەكوو (زَيْدٌ ضَارِبُ عَمْرٍو أَمْسِ) واتە: زەید دوێنێ لە عەمری دا، **سەرنج بدە:** وشەی «ضَارِبٌ» «اِسْمُ الْفاعِل»ـە و «إضافة» كراوە بۆ لای «عَمْرو» (فَلَا تَكُونُ الإِضَافَةُ حِينَئِذٍ لَفْظِيَّة) «إضافة»کە پێی ناگوترێت: «الإِضَافَةُ اَللَّفْظِيَّةُ» (بَلْ مَعْنَوِيَّةً) بەڵكوو پێی دەگوترێت «الإِضَافَةُ اَلْمَعْنَوِيَّة» (لأَنَّ اِسْمَ الْفَاعِلِ لَايَعْمَلُ النَّصْبَ إِذَا كَانَ بِمَعْنَى الماضِي) چونكە ئەگەر «اِسْمُ الْفَاعِل» بە مانای ڕابوردوو بوو كار ناكات (كَمَا سَيَجِيءُ) هەروەک باسی دەكەین.

---

١. بڕوانە: شرح التسهيل: ٣/ ٨٨.

**وَمِنَ الْإِضَافَةِ اللَّفْظِيَّةِ إِضَافَةُ اسْمِ الْمَفْعُولِ إِلَىٰ مَعْمُولِهِ، نَحْوُ: «زَيْدٌ مَعْمُورُ الدَّارِ» ذَكَرَهُ الْمُصَنِّفُ فِي الْمُفَصَّلِ.**

**بەشی سێیەم:** بریتییە لە «إضافة»کردنی «اِسْمِ الْمَفْعُولِ» هەروەکوو مامۆستا دەفەرموێت: **(وَمِنَ الإِضَافَةِ اللَّفْظِيَّةِ:)** هەر بە بەشێک لە «الإِضَافَةِ اللَّفْظِيَّةِ» دادەندرێت **(إِضَافَةُ اِسْمِ الْمَفْعُولِ إِلَى مَعْمُولِهِ)** «إضافة»کردنی «اِسْمِ الْمَفْعُول» بۆ لای «نَائِبُ الْفَاعِل»ـی خۆی **(نَحْو)** وەکوو **(زَيْدٌ مَعْمُورُ الدَّارِ)** واتە: ماڵی زەید ئاوەدانە، **سەرنج بدە:** وشەی «مَعْمُورُ» «اِسْمُ الْمَفْعُول»ـە و «إضافة» کراوە بۆ لای وشەی «الدَّارِ» کە «نَائِبُ الْفَاعِل»ـی خۆیەتی بۆیە پێی دەگوترێت: «الإِضَافَةُ اَللَّفْظِيَّةُ» چونکە ئەم نموونەیە لە ئەسڵدا بەم شێوەیە بووە: «زَيْدٌ مَعْمُورٌ دَارُهُ» **(ذَكَرَهُ الْمُصَنِّفُ فِي الْمُفَصَّلِ)** هەروەکوو مامۆستا «جاراللّٰه»ی زەمەخشەری بە درێژی باسی کردووە لە کتێبی «اَلْمفصّل» کە شاکارێکی مەزنە لە زانستی «النحو»دا.

* ◌ *

## تَجْرِيدُ الْمُضَافِ عَنِ التَّعْرِيفِ

**قَالَ: وَلَا بُدَّ فِي الْمَعْنَوِيَّةِ مِنْ تَجْرِيدِ الْمُضَافِ عَنِ التَّعْرِيفِ.**

**أَقُولُ: وَلَا بُدَّ مِنْ أَنْ يَكُونَ الْمُضَافُ فِي الْإِضَافَةِ الْمَعْنَوِيَّةِ نَكِرَةً؛ لِأَنَّ الْغَرَضَ مِنْهَا إِمَّا تَعْرِيفُ الْمُضَافِ، وَذٰلِكَ إِذَا كَانَ الْمُضَافُ إِلَيْهِ مَعْرِفَةً، أَوْ تَخْصِيصُهُ، وَذٰلِكَ إِذَا كَانَ الْمُضَافُ إِلَيْهِ نَكِرَةً؛**

---

## وانەی پەنجاوحەوتەم: باسی «فَائِدَةُ الإِضَافَةِ الْمَعْنَوِيَّةِ»

(قالَ:) ماموستا «جار الله» دەفەرموێت: (وَلا بُدَّ فِي الْمَعْنَوِيَّةِ) پێویستە لە کاتی ئیسمێک «إِضَافَة» دەکەیت بۆ لای ئیسمێکی‌تر و جۆری «إضافة»کەش «مَعْنَوِي»ـە (مِنْ تَجْرِيدِ الْمُضافِ عَنِ التَّعْريفِ) کە وشەی «مُضاف» خاڵی بکرێت و ڕووت بکرێتەوە لە ئامرازی ناساندن «التَّعْرِيف» چونکە ئەگەر ئیسمێک «مَعْرِفَة» بوو دروست نییە «إِضَافَة» بکرێت.

(أَقُولُ) ماموستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: (وَلا بُدَّ مِنْ أَنْ يَكُونَ الْمُضافُ فِي الإِضَافَةِ الْمَعْنَوِيَّةِ) پێویستە کاتێ ئیسمێک «إِضَافَة» دەکرێت بۆ لای ئیسمێکی‌تر و جۆری «إضافة»کەش «مَعْنَوِي»ـە، کە وشەی «مُضاف» (نَكِرَةً) ناوێکی نەناسراو بێت، لەبەر چی؟ (لأَنَّ الْغَرَضَ مِنْهَا) چونکە ئامانج لە «إِضَافَة»ی «مَعْنَوِي» دوو شتی سەرەکییە:

**یەکەم:** (إِمَّا تَعْرِيفُ الْمُضافِ) یاخود ناساندنی ئیسمی «مُضاف»ـە (وَذَلِكَ) ئەمەش لە کاتێکدایە (إِذَا كَانَ الْمُضافُ إِلَيْهِ مَعرِفَةً) ئەگەر بێت و ئەم وشەیەی بووە بە «مُضاف إِلَيْهِ» ناوێکی دیار و ناسراو بوو (مَعرِفَة) وەکوو «غُلامُ زَيْدٍ» واتە: خزمەتکاری زەید، **سەرنج بدە:** وشەی «غُلام» ناوێکی نەناسراوە (نَكِرَة) بەڵام بەهۆی «إضافة»کردن بۆ لای وشەی «زَيْد» بووە بە «مَعْرِفَة».

**دووەم:** (أَوْ تَخْصِيصُهُ) یاخود مەبەست لە «إضافة»ی مەعنەوی بریتییە لە تایبەتکردنی ئیسمی «مُضاف» (وَذَلِكَ) ئەمەش لە کاتێکدایە (إِذَا كَانَ الْمُضافُ إِلَيْهِ

**فَالْمُضَافُ إِنْ كَانَ مَعْرِفَةً فَإِمَّا أَنْ يُضَافَ إِلَىٰ مَعْرِفَةٍ أَوْ إِلَىٰ نَكِرَةٍ، فَ الْأَوَّلُ: يَسْتَلْزِمُ اجْتِمَاعَ التَّعْرِيفَيْنِ: التَّعْرِيفِ الذَّاتِيِّ وَالْمُكْتَسَبِ مِنَ الْمُضَافِ إِلَيْهِ؛ وَالثَّانِي: يَسْتَلْزِمُ تَخْصِيصَ الْأَخَصِّ بِالْأَعَمِّ وَهُوَ مُحَالٌ، فَلَا يُقَالُ: «الْغُلَامُ زَيْدٍ»**

---

**نَكِرَةً)** ئەگەر بێت و ئەم وشەیەی بووە بە «مُضاف إِلَيْهِ» ناوێکی نادیار و نەناسراو (نَكِرَة) بوو وەکوو «غُلامُ رَجُلٍ» واتە: خزمەتکاری پیاو، **سەرنج بدە:** وشەی «غُلام» ناوێکی نەناسراو و «نَكِرَة»یە و بە خزمەتکاری پیاو و ئافرەتان دەگوترێت، بەڵام بەهۆی «إضافة»کردن بۆ لای وشەی «رَجُل»، «تَخْصِيص» بووە و ئێستا تەنها بە خزمەتکاری پیاوان دەگوترێت.

**(فَالْمُضافُ إِذَاكَانَ مَعْرِفَةً)** ئەو ئیسمەی کە «إِضافَة» دەکرێت، ئەگەر بێت و ناوێکی دیار و ناسراو بوو دوو حاڵەتی هەیە، **حاڵەتی یەکەم: (فَإِمَّا أَنْ يُضافَ إِلَى مَعْرِفَةٍ)** یاخود «إِضافَة» دەکرێت، بۆ لای ناوێکی دیار و ناسراو (مَعرِفَةً) وەکوو خۆی؛ **حاڵەتی دووەم: (أَوْ إِلَى نَكِرَةٍ)** یاخود «إِضافَة» دەکرێت، بۆ لای ناوێکی نادیار و نەناسراوی (نَكِرَة) **(فَالأَوَّلُ يَسْتَلْزِمُ اِجْتِماعَ التَّعْرِيفَيْنِ)** حاڵەتی یەکەم دروست نابێت، چونکە دوو ئامرازی «تَعْرِيف» بەیەکەوە لەسەر یەک وشەدا کۆ دەبنەوە: **(اَلتَّعْرِيفُ الذَّاتِيُّ)**[1] یەکەم: ئەو «تَعْرِيف»ـەی کە وشەکە لە زاتی خۆیدا هەیەتی بە هۆی «عَلَمِيَّة» یاخود بەهۆی «أَداةُ التَّعْرِيف» **(وَالْمُكْتَسَبُ مِنَ الْمُضافِ إِلَيْهِ)** دووەم: ئەو «تَعْرِيف»ـەی کە وشەکە لە «مُضاف إِلَيْهِ» وەری دەگرێت، کۆبوونەوەی دوو تەعریفیش لەسەر یەک وشە بە هیچ جۆرێک دروست نییە. **(وَالثَّانِي)** حاڵەتی دووەم: بۆیە دروست نییە **(يَسْتَلْزِمُ تَخْصِيصَ الأَخَصِّ بِالأَعَمِّ)** دە قەزا دەخوازێت کە تۆ وشەیەکی تایبەتتر (اَلأَخَصِّ) بە وشەیەکی گشتیتر تایبەت بکەیت **(وَهُوَ مُحَالٌ)** ئەمەش شتێکی ئەستەمە، چونکە دەبێت وشەیەکی گشتیی (عام) بە وشەیەکی تایبەت «تَخْصِيص» بکرێت نەک بە پێچەوانەوە کە لە ڕووی ماناوە بە هیچ جۆرێک ڕێک ناکەوێت؛ **(فَلَا**

---

١. بڕوانە: شرح المفصل: (١٢٨/٢. وأوضح المسالك: ٣٦٢/١، وشرح قطر النّدى: ٣٤٤، وشرح التصريح: ٦٨٠/١، والنحو الوافي: ١٨٠/٣.

**وَلَا «الْغُلَامُ رَجُلٍ» وَلَا «الْخَاتَمُ فِضَّةٍ» وَلَا «الضَّرْبُ الْيَوْمِ». وَالْكُوفِيُّونَ جَوَّزُوا ذٰلِكَ فِي أَسْمَاءِ الْعَدَدِ، نَحْوُ: «الثَّلَاثَةُ الْأَثْوَابِ» وَ «الْخَمْسَةُ الدَّرَاهِمِ»؛ وَهُوَ ضَعِيفٌ لِخُرُوجِهِ عَنِ الْقِيَاسِ وَاسْتِعْمَالِ الْفُصَحَاءِ.**

---

**يُقَالُ)** کەواتە دروست نییە بگوترێت **(اَلْغُلامُ زَيْدٍ)** چونکە دوو نیشانەی «**تَعْرِيفْ**» لەسەر یەک ئیسم کۆ دەبنەوە **(وَلَا)** هەروەها دروست نییە بگوترێت **(اَلْغُلامُ رَجُلٍ؛ وَلَا)** هەروەها ئەم نموونەیەش دروست نییە **(اَلْخَاتَمُ فِضَّةٍ)** چونکە ئەو کاتە وای لێ دێت کە تۆ وشەیەکی تایبەتتر (اَلأَخَصِّ) بە وشەیەکی گشتیی (عام) تایبەت بکەیت، ئەمەش ئەستەمە و دروست نییە بگوترێت؛ **(ولا اَلضَّرْبُ الْيَوْمِ)** هەروەها ئەم نموونەیەش دروست نییە، چونکە دوو نیشانەی «**تَعْرِيفْ**» لەسەر یەک ئیسم کۆ دەبنەوە، ئەمەش دروست نییە.

**(وَالْكُوفِيُّونَ)** بەڵام زانایانی کووفی **(جَوَّزُوا ذَلِكَ)** بە دروستی دەزانن کە وشەی «**مُضاف**» و «**مُضاف إِلَيْهِ**» هەردووکیان «**مَعْرِفَة**» بن بەڵام تەنها **(فِي الأَسْماءِ الْعَدَدِ)** لەو ئیسمانەی کە بۆ شت ژماردن بەکار دێن **(نَحْوُ)** وەکوو ئەم دوو نمونانە **(الثَّلاثَةُ الأَثْوابِ؛ وَ)** هەروەها وەکوو **(الْخَمْسَةَ الدَّراهِمِ)** لەم دوو نموونەیەدا وشەی «**مُضاف**» و «**مُضاف إِلَيْهِ**» هەردووکیان مەعریفەنە **(وَهُوَ ضَعِيفٌ)** بەڵام ئەمە بۆچوونێکی بێهێزە **(لِخُروجِهِ عَنْ الْقِياسِ)** چونکە ئەم بۆچوونە دەرچوونە لە یاسا باوەکان **(وَاسْتِعْمالِ الْفُصَحاءِ)** وە بەکارهێنانی زانا ڕەوانبێژەکان.

* ◌ *

## عَدَمُ اشْتِرَاطِ تَجْرِيدِ التَّعْرِيفِ فِي الْإِضَافَةِ اللَّفْظِيَّةِ

**قَالَ: وَتَقُولُ فِي اللَّفْظِيَّةِ: «الضَّارِبَا زَيْدٍ» وَ «الضَّارِبُو زَيْدٍ» وَ «الضَّارِبُ الرَّجُلِ»، وَلَا يَجُوزُ «الضَّارِبُ زَيْدٍ».**

**أَقُولُ: لَمَّا شَرَطَ تَجْرِيدَ الْمُضَافِ عَنِ التَّعْرِيفِ فِي الْإِضَافَةِ الْمَعْنَوِيَّةِ،**

---

## وانەی پەنجاوهەشتەم: باسی «فَائِدَةُ الإِضَافَةِ اللَفْظِيَّةِ»

پاش ئەوەی زانیت کە پێویستە لە کاتی «إِضَافَة»ی «مَعْنَوِيَّة» وشەی «مُضاف» خاڵی بکرێت و ڕووت بکرێتەوە لە ئامرازی ناساندن (التَّعْرِيف) ئینجا **(قالَ:)** مامۆستا «جار الله» دەفەرموێت: **(وَتَقُولُ فِي اللَفْظِيَّةِ:)** لە «إضافة»ی «لَفْظِي»ـدا بە مەرج نەگیراوە وشەی «مُضاف» خاڵی بکرێت و ڕووت بکرێتەوە لە ئامرازی ناساندن (التَّعْرِيف) بۆیە دەڵێیت: **(اَلضَارِبَا زَيْدٍ)** سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا هەردوو وشەی «مُضاف» و «مُضاف إِلَيْهِ» هەردووکیان مەعریفەنە چونکە وشەی «اَلضَّارِبَا» ئیسمی فاعیلە و «تَثْنِيَة»یە، **(وَ)** هەروەها دەڵێیت: **(الضَّارِبُو زَيْدٍ)** لەم نموونەیەشدا هەردوو وشەی «مُضاف» و «مُضاف إِلَيْهِ» هەردووکیان مەعریفەنە چونکە وشەی «اَلضَّارِبُ» ئیسمی فاعیلە و «جَمْع»ـە، **(وَ)** هەروەها دەڵێیت: **(الضَّارِبُ الرَّجُلِ)** لەم نموونەیەشدا هەردوو وشەی «مُضاف» و «مُضاف إِلَيْهِ» هەردووکیان مەعریفەنە چونکە وشەی «اَلضَّارِبو» ئیسمی فاعیلە و «مُفْرَد»ە، لەم سێ نموونەیەدا بە هۆی «إضافة»کردنەوە «تَخْفِيف» دروست بووە، **(وَلَا يَجُوزُ)** بەڵام دروست نییە بگوترێت: **(اَلضَّارِبُ زَيْدٍ)** چونکە لەم نموونەیەدا بە هۆی «إضافة»کردنەوە هیچ جۆرە تەخفیفێک دروست نەبووە.

**(أَقُولُ)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(لَمَّا شَرَطَ تَجْرِيدَ الْمُضافِ عَنْ التَّعْرِيفِ فِي الإضافَةِ الْمَعْنَوِيَّةِ)** پاش ئەوەی مامۆستا باسی کرد کە بە مەرج گیراوە لە کاتی «إضافة»ی «مَعْنَوِيَّة» وشەی «مُضاف» خاڵی بکرێت و

**أَرَادَ أَنْ يَذْكُرَ أَنَّهُ لَا يُشْتَرَطُ فِي اللَّفْظِيَّةِ، لِأَنَّ الْغَرَضَ مِنْهَا التَّخْفِيفُ، وَهُوَ يَحْصُلُ مَعَ تَعْرِيفِ الْمُضَافِ وَتَنْكِيرِهِ، فَتَقُولُ: «الضَّارِبَا زَيْدٍ» وَ «الضَّارِبُو زَيْدٍ»، لِحُصُولِ التَّخْفِيفِ فِيهِمَا بِحَذْفِ النُّونِ. وَتَقُولُ أَيْضاً: «الضَّارِبُ الرَّجُلِ»، لِأَنَّهُ يُشْبِهُ قَوْلَنَا:**

ڕووت بكرێتەوە لە ئامرازی ناساندن (التَّعْرِيف) **(أَرادَ أَنْ يَذْكُرَ أَنَّهُ)** مامۆستا ویستی باسی ئەوەت بۆ بكات كە ئەمە **(لَا يُشْتَرَطُ فِي اللَّفْظِيَّةِ)** لە «إِضَافَة»ی «لَفْظِي» بە مەرج نەگیراوە وشەی «مُضاف» خاڵی بكرێت و ڕووت بكرێتەوە لە ئامرازی ناساندن، لەبەر چی؟ **(لأَنَّ الْغَرَضَ مِنْهَا التَّخْفِيفُ)** چونكە مەبەست لە «إضافة»ی «لَفْظِي» بریتییە لە (تَخْفِيف) سووككردنی وشەی «مُضاف» بە «حذف»ـكردنی «تَنْوِين» یاخود بە لابردنی «نُونُ التَّثْنِيَةِ وَالْجَمْعِ» **(وَهُوَ يَحْصُلُ)** ئەم سووككردنە پەیدا دەبێت و دەست دەكەوێت **(مَعَ تَعْرِيفِ الْمُضافِ وَتَنْكِيرِهِ)** لە هەردوو حاڵەتدا، حاڵەتی یەكەم: ئەگەر وشەی «مُضَاف» «مَعْرِفَة» بێت، حاڵەتی دووەم: یاخود «نَكِرَة» بێت «تَخْفِيف»ـەكە هەر دروست دەبێت لە كاتی «إضافة»ی «لَفْظِي»ـدا.

**(فَتَقُولُ:)** كەواتە تۆ دەڵێیت: **(اَلضَارِبَا زَيْدٍ)** سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا هەردوو وشەی «مُضاف» و «مُضاف إِلَيْهِ» هەردووكیان مەعریفەنە، چونكە وشەی «اَلضَّارِبَا» ئیسمی فاعلیە و «تَثْنِيَة»یە، **(وَ)** هەروەها دەڵێیت: **(الضَّارِبُو زَيْدٍ)** لەم نموونەیەشدا هەردوو وشەی «مُضاف» و «مُضاف إِلَيْهِ» هەردووكیان مەعریفەنە چونكە وشەی «اَلضَّارِبو» ئیسمی فاعیلە و «جَمْع»ـە **(لِحُصُولِ التَّخْفِيفِ فِيهِمَا)** چونكە لە هەردوو نموونەكان «تَخْفِيف» و سووككردن دروست بووە **(بِحَذْفِ النُّونِ)** بە هۆی «حذف»ـكردنی «نُون»ـێ لە كۆتایی وشەی «اَلضَّارِبَا» و «اَلضَّارِبُو»؛ **(وَتَقُولُ أَيْضاً)** هەروەها تۆدەڵێیت: **(اَلضَّارِبُ الرَّجُلِ)** لەم نموونەیەشدا هەردوو وشەی «مُضاف» و «مُضاف إِلَيْهِ» هەردووكیان مەعریفەنە چونكە وشەی «اَلضَّارِبُ» ئیسمی فاعیلە و «مُفْرَد»ە. ئینجا ئەگەر كەسێک بڵێت: ئەم نموونە بۆچی دروستە خۆ هیچ تەخفیفی تێدا نییە؟ مامۆستا دەفەرموێت: بۆیە دروستە **(لأَنَّهُ يُشْبِهُ قَوْلَنَا)** چونكە ئەم نموونەیە دەشوبهێتە ئەم ڕستەیەی كە «الصِّفَة الْمُشَبَّهَة» «إضافة» كراوە بۆ لای فاعیلی خۆی

**«اَلْحَسَنُ الْوَجْهِ»، مِنْ حَيْثُ إِنَّ الْمُضَافَ فِي الصُّورَتَيْنِ صِفَةٌ مُعَرَّفَةٌ بِاللَّامِ، وَالْمُضَافَ إِلَيْهِ أَيْضاً مُعَرَّفٌ بِاللَّامِ. وَلَا يَجُوزُ أَنْ يُقَالَ: «الضَّارِبُ زَيْدٍ» لِانْتِفَاءِ هٰذِهِ الْمُشَابَهَةِ مَعَ عَدَمِ التَّخْفِيفِ. وَإِنَّمَا جَازَ: «اَلْحَسَنُ الْوَجْهِ»؛ لِأَنَّ أَصْلَهُ «اَلْحَسَنُ وَجْهُهُ» فَحُذِفَ الضَّمِيرُ وَجِيءَ بِاللَّامِ، فَفِيهِ نَوْعُ خِفَّةٍ لأَنَّ الضَّمِيرَ اِسْمٌ وَالأَلِفَ وَاللَّامُ حَرْفٌ وَلَا شَكَّ أَنَّ الْحَرْفَ أَخَفُّ مِنَ الإِسْمِ.**

---

کە دەڵێین (اَلْحَسَنُ الْوَجْهِ، مِنْ حَيْثُ أَنَّ الْمُضافَ فِي الصُّورَتَيْنِ) لەم ڕووەی کە لە هەردوو نموونەکەدا ئەو وشەی کە دەبێتە «مُضاف» (صِفَةٌ مُعَرَّفَةٌ بِاللّامِ) «صِفَة»ـە و ئەلیف و لامی لەسەرە، چونکە لە نموونەی یەکەم ئیسمی فاعیلە و لە نموونەی دووەم «صِفَةُ الْمُشَبَّهَة»یە، (وَالْمُضافُ إِلَيْهِ أَيْضاً مُعَرَّفٌ بِاللّامِ) لە هەمان کاتدا وشەی «مُضاف إِلَيْهِ» وەکوو وشەی «مُضاف» ئەلیف و لامی لەسەرە لە هەردوو نموونەکاندا (وَلا يَجُوزُ أَنْ يُقالَ) بەڵام دروست نییە بگوترێت: (اَلضَّارِبُ زَيْدٍ، لِإِنْتِفاءِ هَذِهِ الْمُشَابَهَةِ) چونکە ئەم نموونە هیچ «مُشابَهَة»یەکی نییە لەگەڵ «اَلْحَسَنُ الْوَجْهِ» (مَعَ عَدَمِ التَّخْفِيفِ) هەروەها هیچ جۆرە تەخفیفێکیشی تێدا نییە، نە «حذف»ـکردنی «تَنْوِينْ» نە لابردنی ئەلیف و لام «أَلْ».

ئینجا ئەگەر کەسێک بڵێت: (وَإِنَّمَا جَازَ الْحَسَنُ الْوَجْهِ) ئەی بۆچی نموونە «اَلْحَسَنُ الْوَجْهِ» دروست بوو؟ (لأَنَّ أَصْلَهُ:) چونکە ئەم نموونەیە لە ئەسڵدا پێش ئەوەی «إِضافَة» بکرێت (اَلْحَسَنُ وَجْهُهُ) بووە (فَحُذِفَ الضَّمِيرُ) «ضَمِير»ەکەی کە بە وشەی «وَجْهُهُ»وەیە «حذف»ـکراوە (وَجِيءَ بِاللّامِ) پاشان ئەلیف و لامێکی لە جێگەدا داندراوە و ئینجا وشەی «اَلْحَسَن» «إضافة» کراوە بۆ لای وشەی «اَلْوَجْهِ» (فَفِيهِ نَوْعُ خِفَّةٍ) کەواتە جۆرە «تَخْفِيف»ـێک دروست بووە، لەبەر چی؟ (لأَنَّ الضَّمِيرَ اِسْمٌ) چونکە ئەو «ضَمِير»ەی «حذف» کراوە ئیسمە (وَالأَلِفَ وَاللّامُ حَرْفٌ) ئەو ئەلیف و لامەی لە جێگایدا داندراوە حەرفن (وَلَا شَكَّ أَنَّ الْحَرْفَ) گومانیشی تێدا نییە کە «حَرْف» (أَخَفُّ مِنَ الإِسْمِ)[1] لە «اِسْم» سووکترە لە ڕووی مانا و «مَدْلُول»ـەوە.

---

١. بڕوانە: شرح المفصل: (١٢٨/٢. وأوضح المسالك: ٣٦٢/١، وشرح قطر النّدى: ٣٤٤، وشرح التصريح: ٦٨٠/١، والنحو الوافي: ١٨٠/٣.


الإضافة
معنوية
لفظية
بمعنى اللام
بمعنى (من)
بمعنى (فى)
نحو: ضاربا زيدٍ
نحو: غلام زيدٍ
نحو: خاتم فضة
نحو: مكر الليل


فائدة الإضافة
المعنوية
اللفظية
التعريف
التخصيص
التخفيف
نحو: غلام زيد
نحو: غلامُ رجلٍ
نحو: ضاربو زيدٍ

**قَالَ: وَالْمَعْنَوِيَّةُ تُعَرِّفُ كُلَّ مُضَافٍ إِلَىٰ مَعْرِفَةٍ؛ إِلَّا نَحْوَ: «غَيْرٍ» وَ «مِثْلٍ» وَ «شِبْهٍ»، تَقُولُ: «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ غَيْرِكَ، وَمِثْلِكَ، وَشِبْهِكَ».**

**أَقُولُ: الْإِضَافَةُ الْمَعْنَوِيَّةُ تَجْعَلُ كُلَّ مُضَافٍ إِلَى الْمَعْرِفَةِ، مَعْرِفَةً، نَحْوُ: «غُلَامُ زَيْدٍ»، فَإِنَّ «الْغُلَامَ» قَبْلَ الْإِضَافَةِ نَكِرَةٌ عَامَّةٌ، وَبَعْدَهَا يَصِيرُ مَعْرِفَةً خَاصَّةً؛**

## وانەی پەنجاونۆهەم: باسی «اِكْتِسابُ التَّعْرِيفِ»

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» دەفەرموێت:(وَالْمَعْنَوِيَّةُ: تُعَرِّفُ كُلَّ مُضافٍ إِلَى مَعْرِفَةٍ) هەر ئیسمێکی «نَكِرَة» «إضافة» بکرێت بۆ لای ئیسمێکی «مَعْرِفَة» «إضافة»کەش «مَعْنَوِي» بێت، وشەی «مُضاف»یش دەبێت بە «مَعْرِفَة» وەکوو «غُلامُ زَيْدٍ»(إِلّا) تەنها (نَحْوَ) ئەم وشانە نەبێت، یەکەم: وشەی(غَيْرٍ، وَ) دووەم: وشەی(مِثْلٍ، وَ) سێیەم: وشەی(شِبْهٍ) یاخود هەر وشەیەکی‌تر کە لە ڕووی ماناوە وەکوو ئەم وشانە بێت (تَقُولُ) هەروەکوو تۆ دەڵێیت:(مَرَرْتُ بِرَجُلٍ غَيرِكَ) ، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «غَيْر» «إضافة» کراوە بۆ لای ئیسمێکی «مَعْرِفَة» کە «كَافُ الْخِطاب»ـە، بەڵام هەر نەبووە بە «مَعْرِفَة»؛(وَ) هەروەها وەکوو «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ(مِثْلِكَ) »؛(وَ) هەروەها وەکوو «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ(شِبْهِكَ) »، لەم دوو نموونەیەشدا وشەی «مِثْل» و وشەی «شِبْه» «إضافة» کراون بۆ لای ئیسمێکی «مَعْرِفَة» کە «كَافُ الْخِطاب»ـە، بەڵام هەر نەبووە بە «مَعْرِفَة».

(أَقُولُ) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم:(اَلإِضافَةُ الْمَعْنَوِيَّةُ، تَجْعَلُ كُلَّ مُضافٍ إِلَى الْمَعْرِفَةِ مَعْرِفَةً) هەر ئیسمێکی «نَكِرَة» «إضافة» بکرێت بۆ لای ئیسمێکی «مَعْرِفَة» و «إضافة»کەش «مَعْنَوِي» بێت، وشەی «مُضاف» دەکاتە «مَعْرِفَة» (نَحْوُ) وەکوو (غُلامُ زَيْدٍ) واتە: خزمەتکاری زەید، (فَإِنَّ الْغُلامَ قَبْلَ الإِضافَةِ نَكِرَةٌ عَامَّةٌ) سەرنج بدە: وشەی «غُلام» پێش «إضافة»کردن ناوێکی نەناسراو (نَكِرَة) بوو و بە هەموو خزمەتکارێک دەگوترا(وَبَعْدَهَا يَصِيرُ مَعْرِفَةً خاصَّةً) بەڵام دوای «إضافة»کردن بۆ لای وشەی «زَيْد» دەبێتە مەعریفەیەکی تایبەت، چونکە تەنها بە خزمەتکاری زەید دەگوترێت.

**إِلَّا نَحْوَ: «غَيْرٍ وَمِثْلٍ وَشِبْهٍ» مِنَ الْأَسْمَاءِ الَّتِي تَوَغَّلَتْ فِي الْإِبْهَامِ، فَإِنَّهَا لَا تَصِيرُ مَعْرِفَةً بِالْإِضَافَةِ إِلَى الْمَعْرِفَةِ، لِأَنَّهَا لَا تَخْتَصُّ بِسَبَبِهَا، فَإِنَّكَ تَقُولُ: «جَاءَنِي رَجُلٌ غَيْرُ زَيْدٍ»، وَلَمْ يُعْلَمْ أَنَّ مَنْ هُوَ غَيْرُ زَيْدٍ أَيُّ رَجُلٍ مِنَ الرِّجَالِ؟ وَالدَّلِيلُ عَلَىٰ أَنَّ هٰذِهِ الْأَسْمَاءَ لَا تَصِيرُ مَعْرِفَةً بِالْإِضَافَةِ إِلَى الْمَعْرِفَةِ، أَنَّهَا تَقَعُ صِفَةً لِلنَّكِرَةِ مَعَ وُجُودِ هٰذِهِ الْإِضَافَةِ،**

---

(**إِلَّا**) تەنها (**نَحْوَ**) ئەو وشانە نەبێت، یەکەم: وشەی (**غَيْرٍ، وَ**) دووەم: وشەی (**مِثْلٍ**، (**وَ**) سێیەم: وشەی (**شِبْهٍ**) یاخود هەر وشەیەکی‌تر کە لە ڕووی ماناوە وەکوو ئەم وشانە بێت، وەکوو وشەی «نَظِير...» (**مِنَ الْأَسْمَاءِ الَّتِي تَوَغَّلَتْ فِي الْإِبْهَامِ**) لەو ئیسمانەی کە لە نادیاریدا (إبْهام) ڕوچووینە خوارێ (**فَإِنَّهَا لَا تَصِيرُ مَعْرِفَةً بِالْإِضَافَةِ إِلَى الْمَعْرِفَةِ**) چونکە ئەم جۆرە ئیسمانە نابن بە «مَعْرِفَة» ئەگەر بێت و «إضافة»ش بکرێن بۆ لای ئیسمێکی «مَعْرِفَة» (**لِأَنَّهَا لَا تَخْتَصُّ بِسَبَبِهَا**)[1] چونکە بە هۆی ئەم «إضافة»کردنەوە ناناسرێن و تایبەت نابن بە کەسێک یا خود شتێکی دیاریکراو. (**فَإِنَّكَ تَقُولُ**) چونکە تۆ دەڵێیت: (**جَاءَنِي رَجُلٌ غَيْرُ زَيْدٍ**) واتە: پیاوێک هاتە لای من جگە لە زەید، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «غَيْر» «إضافة» کراوە بۆ لای ئیسمێکی «مَعْرِفَة» کە «كَافُ الْخِطاب»ـە بەڵام هەر نەبووە بە «مَعْرِفَة» (**وَلَمْ يُعْلَمْ أَنَّ مَنْ هُوَ غَيْرُ زَيْدٍ**) چونکە نازاندرێت ئەو پیاوەی جگە لە زەیدە (**أَيُّ رَجُلٍ مِنَ الرِّجَالِ؟**) کامە پیاوە لە نێو پیاواندا، هەروەکوو خۆی بە نادیاری دەمێنێتەوە و نابێت بە «مَعْرِفَة».

(**وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ هَذِهِ الأَسْمَاءَ لَا تَصِيرُ مَعْرِفَةً بِالإِضافَةِ إِلَى الْمَعْرِفَةِ**) بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئەم جۆرە ئیسمانە و ئەم وشانە نابن بە «مَعْرِفَة» ئەگەر بێت و «إضافة»ش بکرێن بۆ لای ئیسمێکی «مَعْرِفَة» (**أَنَّهَا تَقَعُ صِفَةً لِلنَّكِرَةِ**) بریتییە لەوەی کە ئەم ئیسمانە دەبن بە «صِفَة» بۆ ئیسمێکی «نَكِرَة» (**مَعَ وُجودِ هَذِهِ الإِضافَةِ**) لەگەڵ ئەوەی کە «إضافة»ش کراون بۆ لای «مَعْرِفَة»، چونکە ئەگەر ئەم ئیسمانە ببان بە «مَعْرِفَة» دروست نەبوو ببن بە «صِفَة» بۆ ئیسمێکی «نَكِرَة» لە حاڵەتی ئیزفەکردندا، چونکە

---

١. بڕوانە: شرح المفصل: (١٢٨/٢. وأوضح المسالك: ٣٦٢/١، وشرح القطر النّدى: ٣٤٤، وشرح التصريح: ٦٨٠/١، والنحو الوافي: ١٨٠/٣.

**فَإِنَّكَ، تَقُولُ: «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ غَيْرِكَ وَمِثْلِكَ وَشِبْهِكَ».**

پێویستە «صِفَة» و «مَوْصُوف» وەکوو یەک بن (فَإِنَّكَ تَقُولُ) چونکە تۆ دەڵێیت: (مَرَرْتُ بِرَجُلٍ غَيْرِكَ، وَمِثْلِكَ، وَشِبْهِكَ) سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا هەرسێ وشەی «غَيْرِكَ، مِثْلِكَ، شِبْهِكَ» بوون بە «صِفَة» بۆ ئیسمێکی «نَكِرَة» کە «رَجُل»ـە، ئەگەر ئەم ئیسمانە ببان بە «مَعْرِفَة» بە هۆی «إِضَافَة» بۆ لای ئیسمێکی «مَعْرِفَة»، دروست نەبوو ببن بە «صِفَة» بۆ ئیسمێکی «نَكِرَة»، چونکە واجبە کە «صِفَة» و «مَوْصُوف» وەکوو یەک بن.

* ◌ *

## حَذْفُ الْمُضَافِ

**قَالَ: وَقَدْ يُحْذَفُ الْمُضَافُ وَيُقَامُ الْمُضَافُ إِلَيْهِ مُقَامَهُ كَمَا فِي قَوْلِهِ تَعَالَىٰ:** ﴿وَسْـَٔلِ ٱلْقَرْيَةَ﴾ [يوسف: ٨٢].

**أَقُولُ: يَجُوزُ أَنْ يُحْذَفَ الْمُضَافُ وَيُقَامَ الْمُضَافُ إِلَيْهِ مُقَامَهُ، أَي: يُعْرَبُ بِإِعْرَابِهِ إِذَا دَلَّ عَلَيْهِ قَرِينَةٌ، كَمَا فِي الْآيَةِ، فَإِنَّ قَوْلَهُ تَعَالَىٰ:**

---

## وانەی شەستەم: باسی «حَذْفُ الْمُضافِ»

**(قالَ:)** مامۆستا «جار اللّه» دەفەرموێت: **(وَقَدْ يُحْذَفُ الْمُضافُ)** هێندێک جار ئەو وشەیەی بووە بە «مُضاف»، لە «لَفْظ»ـدا «حَذْف» دەکرێت، بەڵام لە نیەتدا هەر دەمێنێت **(وَيُقامُ الْمُضافُ إِلَيْهِ مُقامَهُ)** هەروەها وشەی «مُضاف إِلَيْهِ» لە جێگایدا دادەنیشێت هەمان و «إِعْراب»ـی ئەو وەردەگرێت **(كَمَا فِي قَوْلِهِ تَعالَى)** هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (﴿وَسْـَٔلِ ٱلْقَرْيَةَ﴾)[1] سەرنج بدە: لەم ئایەتەدا وشەی «مُضاف» لە «لَفْظ»ـدا «حذف» کراوە کە بریتییە لە وشەی «أَهْلَ» هەروەها وشەی «مُضاف إِلَيْهِ» لە جێگایدا دانیشتووە کە بریتییە لە وشەی «اَلْقَرْيَة» و هەمان ئیعرابی ئەوی وەرگرتووە.

**(أَقُولُ)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(يَجُوزُ أَنْ يُحْذَفَ الْمُضافُ)** هێندێک جار دروستە ئەو وشەیەی دەبێتە «مُضاف»، لە «لَفْظ»ـدا «حذف» بکرێت، بەڵام لە نیەتدا هەر دەمێنێت **(وَيُقامَ الْمُضافُ إِلَيْهِ مُقَامَهُ)** هەروەها وشەی «مُضاف إِلَيْهِ» لە جێگایدا دادەنیشێت **(أَيْ: يُعْرَبُ بِإِعْرابِهِ)** مەبەستم ئەوەیە کە هەمان ئیعرابی ئەو وەردەگرێت **(إِذَا دَلَّ عَلَيْهِ قَرِينَةٌ)** بە مەرجێک شتێک هەبێت دەلالەت بکات کە وشەی «مُضاف» «حذف» کراوە لە نێو ڕستەکەدا **(كَمَا فِي الآيَةِ)** هەروەکوو لەو ئایەتەدا ئاماژەمان پێ کرد **(فَإِنَّ قَوْلَهُ تَعالَى)** ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە

---

١. سورة يوسف: الآية: ٨٢.

**﴿وَسۡـَٔلِ ٱلۡقَرۡيَةَ﴾، يَدُلُّ عَلَى أَنَّ الْمُضافَ مَحْذُوفٌ وَالتَّقْدِيرَ: «وَاسْأَلْ أَهْلَ الْقَرْيَةِ»، لِأَنَّ السُّؤَالَ مِنَ الْقَرْيَةِ غَيْرُ مَعْقُولٍ. وَأَمَّا إِذَا لَمْ يَدُلَّ عَلَيْهِ قَرِينَةٌ فَلَا يَجُوزُ حَذْفُهُ، فَلَا يُقَالُ: «رَأَيْتُ هِنْداً»، إِذَا كَانَ الْمُرَادُ «غُلَامَ هِنْدٍ».**

---

کە دەفەرموێت: (**﴿وَسۡـَٔلِ ٱلۡقَرۡيَةَ﴾ يَدُلُّ عَلَى أَنَّ الْمُضافَ مَحْذُوفٌ**) دەلاڵەت دەکات کە وشەی «مُضاف» لەم ئایەتەدا «حذف» کراوە لە نێو ئەم ڕستەیەدا (**وَالتَّقْدِيرُ**) ئایەتەکە وای لێ دێتەوە (**وَاسْئَلْ أَهْلَ الْقَرْيَةِ**) واتە: پرسیار لە خەڵکی گوند بکەن، بۆچی وای لێ دێتەوە؟ (**لأَنَّ السُّؤال مِنَ الْقَرْيَةِ غَيْرُ مَعْقُولٍ**) چونکە پرسیارکردن لە گوند شتێکی ئەستەم و پێچەوانەی ژیرییە، کەواتە: لەم ئایەتەدا وشەی «مُضاف» کە بریتییە لە وشەی «أَهْلَ» «حذف» کراوە، هەروەها وشەی «مُضاف إِلَيْهِ» لە جێگایدا دانیشتووە کە بریتییە لە وشەی «ٱلۡقَرۡيَةَ» و هەمان ئیعرابی ئەوی وەرگرتووە.

(**وَأَمَّا إِذَا لَمْ يَدُلَّ عَلَيْهِ قَرِينَةٌ**) بەڵام ئەگەر هیچ بەڵگەیەک نەبوو کە دەلالەت بکات لەو ڕستەیەدا شتێک «حذف» کراوە (**فَلَا يَجُوزُ حَذْفُهُ**) لەم حاڵەتەدا دروست نییە وشەی «مُضاف» «حذف» بکرێت (**فَلَا يُقالُ**) کەواتە: دروست نییە بگوترێت (**رَأَيْتُ هِنْداً**) واتە: ئافرەتێکم بینی لە هەمان کاتدا (**إِذَا كَانَ الْمُرادُ غُلامَ هِنْدٍ**) لە هەمان کاتدا مەبەستت خزمەتکاری ئافرەتەکە بێت، چونکە هیچ بەڵگەیەکی تێدا نییە کە مەبەست «غُلام»ـی «هِنْد» بێت، چونکە بینینی ئافرەت شتێکی ئاساییە بەڵام پرسیارکردن لە گوند شتێکی «مَعْقُول» و ئاسایی نییە.

* ◌ *

# التَّوَابِعُ

**قَالَ: وَالتَّوابِعُ كُلُّ ثَانٍ مُعْرَبٍ بِإِعْرابِ سَابِقِهِ مِنْ جِهَةٍ وَاحِدَةٍ، وَهِيَ خَمْسَةٌ: التَّأْكِيدُ، نَحْوُ: «جَاءَنِي زَيْدٌ نَفْسُهُ وَالرَّجُلَانِ كِلَاهُمَا وَالْقَوْمُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ»،**

---

## وانەی شەستویەکەم: باسی «التَّوابِعِ»

پاش ئەوەی باسی بەشە سەرەکییەکانی «مُعْرَبْ» تەواو بوو، ئینجا مامۆستا دێتە سەر بەیانکردنی ئەو ئیسمانەی تابیعی «مُعرَب»ـن (قالَ:) مامۆستا «جار اللّه» دەفەرموێت: (وَالتَّوابِعُ) ئەو ئیسمانەی کە تابیعی موعرەبن، پێناسەکەیان بریتییە لە: (كُلُّ ثَانٍ) هەر ئیسمێک کە لە پلەی دووەم بێت (مُعْرَبٍ بِإِعْرابِ سَابِقِهِ) ئیعرابدار کرا بێت بە ئیعرابی ئیسمی پێش خۆی، واتە: ئەگەر ئیسمی پێش خۆی «مَرْفُوعْ» بێت ئەویش مەرفووع دەبێت، وە ئەگەر ئیسمی پێش خۆی «مَنْصُوبْ» بێت ئەویش «مَنصوب» دەبێت، هەروەها ئەگەر ئیسمی پێش خۆی «مَجْرُورْ» بێت ئەویش مەجروور دەبێت (مِنْ جِهَةٍ وَاحِدَةٍ) لە یەک جیهەتەوە، واتە: دەبێت سەرچاوەی هەردوو ئیعرابەکە لە یەک جیهەتەوە بێت کە «فَاعِلِيَّة»ـە یاخود «مَفْعُولِيَّة»ـە یا «إِضَافِيَّة»ـە، نابێت جیهەتی ئیعرابەکە لە یەکتری جیاواز بێت وەکوو ئەوەی یەکیان «آخِذ» و ئەویتریان «مَأْخُوذ» بێت (وَهِيَ خَمْسَةٌ:) ئەو ئیسمانەی کە تابعی موعرەبن ژمارەیان پێنج بەشە:

**بەشی یەکەم:** پێی دەگوترێت: (التَّأْكِيدُ) کە بە چەند وشەیەکی تایبەت دەکرێت (نَحْوُ) وەکوو (جَاءَنِي زَيْدٌ نَفْسُهُ) سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «نَفْسُهُ» پێی دەگوترێت «تَأْكِيد» چونکە ئیعرابی وەکوو وشەی پێش خۆیەتی، (وَ) هەروەها «جَاءَنِي (الرَّجُلانِ كِلاهُمَا)» سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «كِلاهُما» پێی دەگوترێت «تَأْكِيد» چونکە ئیعرابەکەی وەکوو ئیعرابی وشەی پێش خۆیەتی کە هەردووکیان مەرفووعن. (وَ) هەروەها وەکوو «جَاءَنِي (الْقَوْمُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ)»

**وَلَا تُؤَكَّدُ بِهَا النَّكِرَاتُ.**

**أَقُولُ: لَمَّا فَرَغَ مِنْ مَبَاحِثِ الْمُعْرَبِ شَرَعَ فِي تَوَابِعِهِ، وَهِيَ خَمْسَةُ أَقْسَامٍ:**

## التَّأْكِيدُ

**الْأَوَّلُ: التَّأْكِيدُ، وَهُوَ عَلَىٰ ضَرْبَيْنِ: لَفْظِيٍّ وَمَعْنَوِيٍّ.**

---

**سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «كُلّ» و وشەی «أَجْمَعونَ» پێیان دەگوترێت: «تَأْكِيد» چونكە ئیعرابی وەكوو ئیعرابی وشەی پێش خۆیەتی كە وشەی «اَلْقَوْم»ـە، هەروەها هەردووكیان «مَرْفُوع» بوون **(وَلَا تُؤَكَّدُ بِهَا النَّكِراتُ)** **ئینجا بزانە:** ئەم جۆرە وشانە نابن بە «تَأْكِيد» بۆ ئیسمێک كە «نَكِرَة» بێت چونكە ئەم وشانە هەموویان مەعریفەنە.

**(أَقُولُ)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(لَمّا فَرَغَ مِنْ مَباحِثِ الْمُعْرَبِ)** پاش ئەوەی مامۆستا باسی بەشە سەرەكییەكانی «مُعْرَب»ـی كرد **(شَرَعَ فِي تَوابِعِهِ)** دەستی كرد بە بەیانكردنی ئەو ئیسمانەی كە تابیعی موعرەبن **(وَهِيَ خَمْسَةُ أَقْسامٍ)** ئەو ئیسمانەی كە تابعی «مُعْرَب»ـن ژمارەیان پێنج بەشە:

## باسی «التَّأْكِيد»

**(الأَوَّلُ) بەشی یەكەم:** پێی دەگوترێت **(التَّأْكِيدُ)** كە بە چەند وشەیەكی تایبەت دەكرێت و ئەو وشانە دووپاتی مانای وشەی پێش خۆ دەكەنەوە. **(وَهُوَ عَلَى ضَرْبَيْنِ)**[1] ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: «تَأْكِيد» دوو بەشی هەیە: **(لَفْظِيٌّ) بەشی یەكەم** پێی دەگوترێت «التَّأْكِيدُ اللَّفْظِيُّ» **(وَمَعْنَوِيٌّ) بەشی دووەم** پێی دەگوترێت «التَّأْكِيدُ الْمَعْنَوِيُّ».

° °

---

١. بڕوانە: شرح المفصل: ١٩٥/٢. والفوائد والقواعد: ٣٦٠.

**فَاللَّفظِيُّ: تَكْرِيرُ اللَّفظِ الْأَوَّلِ بِهِ، أَوْ بِمُرَادِفِهِ. وَيَجْرِي ذٰلِكَ فِي الِاسْمِ، نَحْوُ: «جَاءَنِي زَيْدٌ زَيْدٌ»؛ وَفِي الْفِعْلِ، نَحْوُ: «ضَرَبَ ضَرَبَ زَيْدٌ»؛ وَفِي الْحَرْفِ، نَحْوُ: «إِنَّ إِنَّ زَيْداً قَائِمٌ»؛ وَفِي الْجُمْلَةِ، نَحْوُ: «قَامَ زَيْدٌ قَامَ زَيْدٌ»؛ وَفِي الضَّمِيرِ، نَحْوُ: «مَا ضَرَبَنِي إِلَّا أَنْتَ أَنْتَ».**

---

## پێناسەی «التَّأْكِيدُ اللَفظِيُّ»

(**فَاللَفظِيُّ**) پێناسەی «التَّأْكِيدُ اللَفظِيّ» بریتییە لە (**تَكْرِيرُ اللَّفظِ الأَوَّلِ**) دووبارە کردنەوەی وشەی یەکەم (**بِهِ**) بە هەمان «شِكْل» و شێوازی وشەی یەکەم (**أَوْ**) یاخود دووبارەکردنەوەی وشەی یەکەم (**بِمُرادِفِهِ**) بە وشەیەک کە هاومانای وشەی یەکەم بێت، هەرچەندە پیتەکانیشیان لە یەکتری جیاواز بن (**وَيَجْرِي ذَلِكَ فِي الِاسْمِ**) ئینجا ئەم جۆرە «تَأْكِيد»ە لە ئیسمان وارد دەبێت (**نَحْوُ**) وەکوو (**جَاءَنِي زَيْدٌ زَيْدٌ**) سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «زَيْد»ی دووەم بووە بە تەئکیدی زەیدی یەکەم و هەمان ئیعرابی ئەویشی وەرگرتووە.

(**وَفِي الْفِعْلِ**) هەروەها ئەم جۆرە «تَأْكِيد»ە لە فیعلانیش وارد دەبێت (**نَحْوُ**) وەکوو (**ضَرَبَ ضَرَبَ زَيْدٌ**) سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «ضَرَبَ»ی دووەم بووە بەتەئکیدی «ضَرَبَ»ی یەکەم و وەکوو ئەویش«مَبْنِي»ـیە لەسەر «فَتْحَة».

(**وَفِي الْحَرْفِ**) هەروەها ئەم جۆرە «تَأْكِيد»ە لە حەرفانیش وارد دەبیت (**نَحْوُ**) وەکوو (**إِنَّ إِنَّ زَيْداً قَائِمٌ**) سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «إِنَّ»ی دووەم بووە بە تەئکیدی «إِنَّ»ی یەکەم بە هەمان «شِكْلُ»ی شێوەی یەکەم.

(**وَفِي الْجُمْلَةِ**) هەروەها ئەم جۆرە «تَأْكِيد»ە لە جوملانیش وارد دەبیت، جیاوازی نییە «جُمْلَة»کە «فِعْلِي» بێت یاخود «اِسْمِي» (**نَحْوُ**) وەکوو (**قَامَ زَيْدٌ قَامَ زَيْدٌ**) سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا ڕستەی «قَامَ زَيْدٌ»ی دووەم بووە بە تەئکیدی «قَامَ زَيْدٌ»ی یەکەم، بە هەمان شکڵی شێوەی یەکەم.

(**وَفِي الضَّمِيرِ**) هەروەها ئەم جۆرە «تَأْكِيد»ە لە «ضمير»یش وارد دەبێت (**نَحْوُ**) وەکوو (**مَاضَرَبَنِي إِلَّا أَنْتَ أَنْتَ**) سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «أَنْتَ»ی دووەم

وَ «مَرَرْتُ بِكَ أَنْتَ».

**وَالْمَعْنَوِيُّ: إِنَّمَا يَكُونُ بِأَلْفَاظٍ مَخْصُوصَةٍ، وَهِيَ: النَّفْسُ، وَالْعَيْنُ، وَكِلَا، وَكِلْتَا، وَكُلٌّ، وَأَجْمَعُ، وَأَكْتَعُ، وَأَبْتَعُ، وَأَبْصَعُ.**

**فَالْأَوَّلَانِ: أَعْنِي: النَّفْسَ وَالْعَيْنَ، إِنَّمَا يُؤَكَّدُ بِهِمَا الْمُفْرَدُ وَالْمُثَنَّى وَالْمَجْمُوعُ مِنَ الْمُذَكَّرِ وَالْمُؤَنَّثِ؛**

---

ـکە «ضَمِیر»ە- بووە بە تەئکیدی «أَنْتَ»ی یەکەم، بە هەمان شکڵی شێوەی یەکەم، (وَ) هەروەها وەکوو (مَرَرْتُ بِكَ أَنْتَ) سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «أَنْتَ»ی دووەم ـکە «ضَمِیرَ»ە- بووە بە تەئکیدی «کاف الخطاب» کە بە وشەی «بِكَ»وەیە، چونکە بە هەمان مانا دێت.

## پێناسەی «التَّأْکِیدُ الْمَعْنَوِيُّ»

(**وَالْمَعْنَوِيُّ**) بەشی دووەم پێی دەگوترێت «التَّأْکِیدُ الْمَعْنَوِيُّ» (**إِنَّمَا يَكُونُ بِأَلْفَاظٍ مَخْصُوصَةٍ**) کە ئەم بەشە بە چەند وشەیەکی تایبەت و دیاریکراو ئەنجام دەدرێت (**وَهِيَ**) وشەکانیش بریتین لە وشەی (**النَّفْسُ، وَالْعَيْنُ، وَ**) هەروەها وشەی (**كِلَا، وَكِلْتَا، وَ**) هەروەها وشەی (**كُلُّ، وَأَجْمَعُ، وَ**) هەروەها ئەم سێ وشەیە: (**أَكْتَعُ، وَأَبْتَعُ، وَأَبْصَعُ**) کە بۆ «تَأْکِید» بەکار دێن، بەڵام بە تەنها بەکار نایەن، بەڵکوو لەدوای وشەی «أَجْمَعُ» بەکار دێن. ئینجا مامۆستا یەک‌بەیەکی وشەکان شی دەکاتەوە و دەفەرموێت: (**فَالْأَوَّلَانِ**) هەردوو وشەی یەکەم (**أَعْنِي**) مەبەستم وشەی (**النَّفْسَ وَ**) هەروەها وشەی (**الْعَيْنَ، إِنَّمَا يُؤَكَّدُ بِهِمَا**) ئەم دوو وشانە دەبنە «تَأْکِید» بۆ (**الْمُفْرَدُ**) وشەیەک کە تاک بێت (**وَالْمُثَنَّى**) هەروەها وشەیەک کە «تَثْنِیَة» بێت (**وَالْمَجْمُوعُ**) هەروەها وشەیەک کە کۆ (جَمْع) بێت (**مِنَ الْمُذَكَّرِ وَالْمُؤَنَّثِ**) جیاوازی نییە وشەکە بۆ ڕەگەزی نێر بەکار بێت یاخود ڕەگەزی مێ.

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: ئەی چۆن بزانین کە ئەم دوو وشەیە بۆ تاک یاخود بۆ کۆ، بۆ پیاو یاخود بۆ ئافرەت بەکار دێن؟ مامۆستا دەفەرموێت:

**وَيُمَيَّزُ بَيْنَ نَوْعٍ وَنَوْعٍ آخَرَ بِاخْتِلَافِ صِيغَتِهِمَا وَضَمِيرِهِمَا، نَحْوُ: «جَاءَنِي زَيْدٌ نَفْسُهُ وَعَيْنُهُ، وَهِنْدٌ نَفْسُهَا وَعَيْنُهَا، وَالزَّيْدَانِ أَنْفُسُهُمَا وَأَعْيُنُهُمَا وَالْهِنْدَانِ أَنْفُسُهُمَا وَأَعْيُنُهُمَا، وَالزَّيْدُونَ أَنْفُسُهُمْ وَأَعْيُنُهُمْ، وَالْهِنْدَاتُ أَنْفُسُهُنَّ وَأَعْيُنُهُنَّ».**

**وَ إِنَّمَا جُمِعَتِ الصِّيغَةُ فِي الْمُثَنَّىٰ؛ لِأَنَّهَا مُضَافَةٌ إِلَىٰ ضَمِيرِ التَّثْنِيَةِ.**

---

**(وَيُمَيَّزُ بَيْنَ نَوْعٍ وَنَوْعٍ آخَرَ)** جیاكاری دەكرێت لە نێوان تاك و كۆ یاخود «مُذَكّر» و «مُؤَنَّث» **(بِاخْتِلافِ صِيغَتِهِمَا)** بە هۆی «صیغة»ی وشەكان **(وَضَمِيرِهِمَا)** هەروەها بە هۆی «ضَمِیر»ی وشەكان **(نَحْوُ)** وەكوو ئەم نموونانە: **(جَاءَنِي زَيْدٌ نَفْسُهُ وَعَيْنُهُ)** سەرنج بدە: هەردوو وشەی «نَفْسُهُ» و «عَيْنُهُ» بوون بە «تَأْكِيد» بۆ وشەی «زَيْدٌ»، **(وَ)** هەروەها وەكوو «جَاءَتْنِي **(هِنْدُ نَفْسُهَا وَعَيْنُهَا)**» سەرنج بدە: هەردوو وشەی «نَفْسُها» و «عَيْنُها» بوون بە «تَأْكِيد» بۆ وشەی «هِنْد»، لەم دوو نموونەیەدا جیاوازیی لە نێوان «صیغة»ی «مُذَكّر» و «مُؤَنَّث» بە هۆی «ضَمِیر»ەكەوە كراوە. **(وَ)** هەروەها وەكوو «جاءني **(الزَّيْدانِ أَنْفُسُهُمَا وَأَعْيُنُهُمَا)**» سەرنج بدە: هەردوو وشەی «أَنْفُسُهُما» و «أَعْيُنُهُمَا» بوون بە «تَأْكِيد» بۆ وشەی «الزّيدان»؛ **(وَ)** هەروەها وەكوو «جاءتني **(الْهِنْدانِ أَنْفُسُهُمَا وَأَعْيُنُهُمَا)**» لێرەشدا هەردوو وشەی «أَنْفُسُهُما» و «أَعْيُنُهُمَا» بوون بە «تَأْكِيد» بۆ وشەی «اَلْهِنْدانِ» و جیاوازیی لە نێوان «صیغة»ی «مُفْرَد» و «تَثْنِيَة» بە هۆی «صیغة» و «ضَمِیر»ی «مُثَنَّى» كراوە، **(وَ)** هەروەها وەكوو «جاءني **(الزَّيْدُونَ أَنْفُسُهُمْ وَأَعْيُنُهُمْ)** سەرنج بدە: هەردوو وشەی «أَنْفُسُهُمْ» و «أَعْيُنُهُمْ» بوون بە «تَأْكِيد» بۆ وشەی «الزّيدون»؛ **(وَ)** هەروەها وەكوو «جَاءَتْنِي **(الْهِنْداتُ أَنْفُسُهُنَّ وَأَعْيُنُهُنَّ)** سەرنج بدە: هەردوو وشەی «أَنْفُسُهُنَّ» و «أَعْيُنُهُنَّ» بوون بە «تَأْكِيد» بۆ وشەی «اَلْهِنْدات» و جیاوازیی لە نێوان «صیغة»ی «مُذَكّر» و «مُؤَنَّث» بە هۆی «ضَمِیر»ی وشەكان كراوە.

ئینجا ئەگەر كەسێک پرسیار بكات و بڵێت: **(وَ إِنَّمَا جُمِعَتِ الصِّيغَةُ فِي الْمُثَنَّى)** بۆچی لە نموونەی «مُثَنَّى» سیغەكەی كرابوو بە «جَمْع»؟ مامۆستا دەفەرموێت: **(لأَنَّهَا مُضافَةٌ إِلَى ضَمِيرِ التَّثْنِيَةِ)** چونكە وشەكە «إِضافَة» كرابوو بۆ لای «ضَمِیر»ێک كە

**وَالْمُثَنَّىٰ إِذَا أُضِيفَ إِلَىٰ مِثْلِهِ يَجُوزُ أَنْ يُجْمَعَ لِلْأَمْنِ عَنِ اللَّبْسِ، كَقَوْلِهِ تَعَالَىٰ: ﴿فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا﴾.**

**وَالثَّالِثُ وَالرَّابِعُ: أَعْنِي: كِلَا وَكِلْتَا، لَا يُؤَكَّدُ بِهِمَا إِلَّا الْمُثَنَّىٰ، فَيُقَالُ: «جَاءَنِي الرَّجُلَانِ كِلَاهُمَا، وَالْمَرْأَتَانِ كِلْتَاهُمَا».**

**وَالْبَوَاقِي: إِنَّمَا يُؤَكَّدُ بِهَا غَيْرُ الْمُثَنَّىٰ، أَعْنِي: الْمُفْرَدَ وَالْمَجْمُوعَ**

---

«رَاجِعْ» بوو بۆ لای ناوێکی «مُثَنَّی» **(وَالْمُثَنَّى)** هەر ناوێکیش کە «تثنية» بوو **(إِذَا أُضِيفَ إِلَى مِثْلِهِ)** ئەگەر «إِضافَة» بکرێت بۆ لای «مُثَنَّی» **(يَجُوزُ أَنْ يُجْمَعَ)** دروستە صیغەکەی بکرێت بە «جَمْع» **(للأَمْنِ مِنَ اللَّبْسِ)** چونکە لەم کاتەدا دڵنیا دەبین کە سیغەی «مُثَنَّی» و سیغەی «جَمْع» تێکهەڵ بە یەکتر نابن **(كَقَوْلِهِ تَعالَى)** هەروەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: (﴿فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا﴾) **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «قُلُوبُ» کراوە بە «جَمْع» هەرچەندە «خِطاب»ـەکە لەگەڵ دوو خێزانی پێغەمبەرە، بەڵام چونکە «إضافة» کراوە بۆ لای «ضَمِيرُ الْمُثَنَّى» ـواتە: وشەی «كُمَا»ـ بۆیە «اِلْتِباس» دروست نەبووە.

**(وَالثَّالِثُ وَالرَّابِعُ)** وشەی سێیەم و چوارەم **(أَعْنِي)** مەبەستم وشەی **(كِلَا وَ)** هەروەها وشەی **(كِلْتَا)**یە، **(لَا يُؤَكَّدُ بِهِمَا إِلَّا الْمُثَنَّى)** ناتواندرێت هیچ وشەیەکی پێ «تَأْكِيد» بکرێت تەنها «مُثَنَّی» نەبێت، **(فَيُقالُ)** بۆیە دەگوترێت: **(جَاءَنِي الرَّجُلانِ كِلاهُمَا)** **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «كِلاهُمَا» بووە بە «تَأْكِيد» بۆ وشەی «الرَّجُلانِ» کە «تَثْنِيَة»یە **(وَ)** هەروەها وەکو«جَاءَتْنِي **(الْمَرْأَتانِ، كِلْتاهُمَا)**» **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «كِلْتاهُمَا» بوو بە «تَأْكِيد» بۆ وشەی «الرَّجُلانِ» کە «تَثْنِيَة»یە.

**(وَالْبَواقِي)** وشەی پێنجەم و شەشەم ـکە بریتین لە وشەی «كُلّ» و لە وشەی «أَجْمَعُ»ـ **(إِنَّمَا يُؤَكَّدُ بِهَا غَيْرُ الْمُثَنَّى)** دەبن بە «تَأْكِيدْ» بۆ هەموو جۆرە ئیسمێک تەنها «مُثَنَّی» نەبێت **(أَعْنِي:)** مەبەستم ئەوەیە کە وشەی «كُلّ» و وشەی «أَجْمَعُ» دەبن بە «تَأْكِيدْ» بۆ وشەیەک کە **(الْمُفْرَدَ)** کە تاک (مُفْرَدْ) بێت **(وَالْمَجْمُوعَ)** هەروەها

**مِنَ الْمُذَكَّرِ وَالْمُؤَنَّثِ. وَيُمَيَّزُ فِي كُلٍّ بِاخْتِلَافِ الضَّمِيرِ، نَحْوُ: «اشْتَرَيْتُ الْعَبْدَ كُلَّهُ، وَالْجَارِيَةَ كُلَّهَا، وَجَاءَنِي الْقَوْمُ كُلُّهُمْ، وَالنِّسْوَةُ كُلُّهُنَّ».**

**وَفِي الْبَوَاقِي: بِاخْتِلَافِ الصِّيغَةِ، نَحْوُ: «اشْتَرَيْتُ الْعَبْدَ أَجْمَعَ أَكْتَعَ أَبْتَعَ أَبْصَعَ، وَالْجَارِيَةَ جَمْعَاءَ كَتْعَاءَ بَتْعَاءَ بَصْعَاءَ،**

---

بۆ وشەیەک کە کۆ (جَمْع) بێت **(مِنَ الْمُذَكَّرِ وَالْمُؤَنَّثِ)** جیاوازی نییە وشەکە بۆ ڕەگەزی «نێر» یا خود بۆ ڕەگەزی «مێ» بەکار بێت.

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: ئەی چۆن بزانین کە ئەم دوو وشەیە بۆ تاک یاخود بۆ کۆ، بۆ پیاو یاخود بۆ ئافرەت بەکار دێن؟ مامۆستا دەفەرموێت: **(وَيُمَيَّزُ فِي كُلٍّ بِاخْتِلافِ الضَّمِيرِ)** جیاکاری دەکرێت لە نێوان تاک و کۆ یاخود «مُذَكّر» و «مُؤَنَّث» بە هۆی «ضَمِير»ی وشەکان **(نَحْوُ)** وەکوو ئەم نموونانە: **(اِشْتَرَيْتُ الْعَبْدَ كُلَّهُ)** سەرنج بدە: وشەی «كُلَّهُ» بووە بە «تَأْكِيد» بۆ وشەی «اَلْعَبْدَ» **(وَ)** هەروەها وەکوو «اِشْتَرَيْتُ **(الْجَارِيَةَ كُلَّها)** » سەرنج بدە: وشەی «كُلّها» بووە بە «تَأْكِيد» بۆ وشەی «اَلْجَارِيَةَ»، لەم دوو نموونەیەدا جیاوازیی لەنێوان سیغەی «مُذَكّر» و «مُؤَنَّث» بە هۆی «ضَمِير»ەوە کراوە. **(وَ)** هەروەها وەکوو **(جَاءَنِي الْقَوْمُ كُلّهُمْ)** سەرنج بدە: وشەی «كُلّهُم» بووە بە «تَأْكِيد» بۆ وشەی «اَلْقَوْمَ» **(وَ)** هەروەها وەکوو «جَاءَتْنِي **(النِّسْوَةُ كُلُّهُنَّ)** » وشەی «كُلّهُنّ» بووە بە «تَأْكِيد» بۆ وشەی «اَلنِّسْوَةُ»، لەم دوو نموونەیەدا جیاوازیی لەنێوان سیغەی «مُذَكّر» و «مُؤَنَّث» بە هۆی «ضَمِير»ەوە کراوە.

**(وَفِي الْبَوَاقِي)** هەروەها ئەو وشانەی کە لەدوای وشەی «أَجْمَعُ» دێن ـ کە بریتین لە وشەی «أَكْتَعَ، أَبْتَعَ، أَبْصَعَ»ـ جیاکاری دەکرێت لە نێوان «مُذَكّر» و «مُؤَنَّث» **(بِاخْتِلافِ الصِّيغَةِ)** بە هۆی سیغەی وشەکان **(نَحْوُ)** وەکوو ئەم نموونانە: **(اِشْتَرَيْتُ الْعَبْدَ أَجْمَعَ، أَكْتَعَ، أَبْتَعَ، أَبْصَعَ)** سەرنج بدە: وشەی «أَكْتَعَ، أَبْتَعَ، أَبْصَعَ» لەدوای وشەی «أَجْمَعُ» هاتوون و بوون بە «تَأْكِيد» بۆ وشەی «اَلْعَبْدَ» **(وَ)** هەروەها وەکوو «اِشْتَرَيْتُ **(الْجَارِيَةَ جَمْعاءَ، كَتْعاءَ، بَتْعاءَ، بَصْعاءَ)** سەرنج بدە: وشەی «كَتْعاءَ، بَتْعاءَ، بَصْعاءَ» لەدوای وشەی «جَمْعاءَ» هاتوون و بوون بە «تَأْكِيد» بۆ وشەی «اَلْجَارِيَةَ»،

**وَجَاءَنِي الْقَوْمُ أَجْمَعُونَ أَكْتَعُونَ أَبْتَعُونَ أَبْصَعُونَ، وَالنِّسْوَةُ جُمَعُ كُتَعُ بُتَعُ بُصَعُ».**

**وَ إِنَّمَا لَمْ يَذْكُرِ الْمُصَنِّفُ التَّأْكِيدَ اللَّفْظِيَّ، لِأَنَّ التَّأْكِيدَ الْحَقِيقِيَّ هُوَ الْمَعْنَوِيُّ. وَ إِنَّمَا ذَكَرَ مِنْ أَلْفَاظِ الْمَعْنَوِيِّ بَعْضَهَا لِلِاخْتِصَارِ، وَاكْتَفَىٰ بِـ «النَّفْسِ» عَنِ «الْعَيْنِ»، لِاشْتِرَاكِهِمَا فِي جَمِيعِ الْأَحْكَامِ؛**

لەم دوو نموونەیەدا جیاوازیی لەنێوان سیغەی «مُذَکّر» و «مُؤَنَّث» بە هۆی سیغەی وشەکان کراوە، چونکە سیغەی «أَجْمَعَ» بۆ «مُذَّکر» بەکار دێت لە بەرامبەردا سیغەی «جَمْعاءَ» بۆ «مُؤَنَّث» بەکار دێت. (وَ) هەروەها وەکوو (**جَاءَنِي الْقَوْمُ أَجْمَعُونَ، أَكْتَعُونَ، أَبْتَعُونَ، أَبْصَعُونَ**) سەرنج بدە: وشەی «أَكْتَعَونَ، أَبْتَعَونَ، أَبْصَعَونَ» لەدوای وشەی «أَجْمَعُونَ» هاتوون و بوون بە «تَأْكِيد» بۆ وشەی «اَلْقَوْمُ»، (وَ) هەروەها وەکوو «جَاءَتْنِي (**النِّسْوَةُ جُمَعُ، بُتَعُ، كُتَعُ، بُصَعُ**)[1] سەرنج بدە: وشەی «بُتَعُ، كُتَعُ، بُصَعُ» لەدوای وشەی «جُمَعُ» هاتوون و بوون بە «تَأْكِيد» بۆ وشەی «اَلْنِّسْوَةُ»، لەم دوو نموونەیەدا جیاوازیی لەنێوان سیغەی «مُذَکّر» و «مُؤَنَّث» بە هۆی سیغەی وشەکان کراوە، چونکە وشەی «أَجْمَعُونُ، أَكْتَعُونَ، أَبْتَعُونَ، أَبْصَعُونَ» بۆ سیغەی «مُذَّکر» بەکار دێن، بەڵام وشەی «جُمَعُ، كُتَعُ، بُتَعُ، بُصَعُ» بۆ سیغەی «مُؤَنَّث» بەکار دێن.

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: (**وَ إِنَّمَا لَمْ يَذْكُرِ الْمُصَنِّفُ التَّأْكِيدَ اللَّفْظِيَّ**) بۆچی مامۆستای زەمەخشەری باسی «تَأْكِيد»ی «لَفْظِي» نەکرد؟ مامۆستا دەفەرموێت: (**لِأَنَّ التَّأْكِيدَ الْحَقِيقِيَّ**) چونکە تەئکیدی ڕاستەقینە کە لە کتێبەکانی زانستی «نَحْو» باسی دەکرێت (**هُوَ الْمَعْنَوِيُّ**) بریتییە لە تەئکیدی «مَعْنَوِي».

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: (**وَ إِنَّمَا ذَكَرَ مِنْ أَلْفَاظِ الْمَعْنَوِيِّ بَعْضَها**) ئەی بۆچی مامۆستا تەنها هێندێک وشەی باس کردن لە وشەکانی تەئکیدی «مَعْنَوِي»؟ مامۆستا دەفەرموێت: (**لِلِاخْتِصارِ**) بۆ ئەوەی بابەتەکە درێژ نەبێتەوە (**فَاكْتَفَى بِالنَّفْسِ عَنِ الْعَيْنِ**) سەرنج بدە: مامۆستا وشەی «نَفْس»ـی باس کرد لەجیاتی وشەی «عَيْن» (**لِاشْتِراكِهِمَا فِي جَمِيعِ الأَحْكامِ**) چونکە ئەم دوو وشانە لە

١. بڕوانە: شرح كافية ابن حاجب الكوردي: ٣٨٩/٢، وشرح المفصل: ١٢٨/٢. وأوضح المسالك: ٣٦٢/١.

**وَبِـ «كِلَا» عَنْ «كِلْتَا»، لِاشْتِرَاكِهِمَا فِي تَأْكِيدِ التَّثْنِيَةِ؛ وَذَكَرَ «الْكُلَّ»، لِاخْتِصَاصِهِ بِاخْتِلَافِ الضَّمِيرِ مِنْ بَيْنِ أَخَوَاتِهِ. وَاكْتَفَىٰ بِـ «أَجْمَعِينَ» عَنْ بَقِيَّةِ الْأَلْفَاظِ، لِاشْتِرَاكِهِمَا فِي جَمِيعِ الْأَحْكَامِ.**

**وَقَوْلُهُ: «لَا تُؤَكَّدُ بِهَا النَّكِرَاتُ»، يَعْنِي: بِالتَّأْكِيدِ الْمَعْنَوِيِّ؛ لِأَنَّ الْبَحْثَ فِيهِ. وَسَبَبُهُ أَنَّ هٰذِهِ الْأَلْفَاظَ مَعْرِفَةٌ، فَلَوْ وَقَعَتْ تَأْكِيداً لِلنَّكِرَةِ لَتَنَاقَضَ الْكَلَامُ، إِذِ الْمُؤَكَّدُ حِينَئِذٍ يَقْتَضِي الْعُمُومَ،**

---

هەموو حوکمەکان یەکسانن **(وَ بِـكِلا عَنْ كِلْتَا)** هەروەها وشەی «كِلَا»ی باس کرد لەجیاتی وشەی «كِلْتَا» **(لِاشْتِراكِهِمَا فِي تَأْكِيدِ التَّثْنِيَةِ)** چونکە وشەی «كِلَا» لەگەڵ وشەی «كِلْتَا»ی یەکسانن لەوەی هەردووکیان دەبن بە «تَأْكِيد» بۆ وشەیەک کە «مُثَنَّى» بێت **(وَذَكَرَ الْـكُلَّ)** هەروەها بۆیە باسی وشەی «كُلّ»ـی کرد؟ **(لِاخْتِصاصِهِ بِاخْتِلافِ الضَّمِيرِ مِنْ بَيْنِ أَخَواتِهِ)** چونکە ئەو بە تەنها بە هۆی «ضَمير» جیا دەکرێتەوە واتە: هیچ گۆڕانکارییەک بەسەر سیغەکەیدا نایەت، بە پێچەوانەی وشەکانی‌تر کە گۆڕانکاری هەم بەسەر سیغەکەیاندا و هەم بەسەر «ضَمير»ەکەیاندا دێت. **(وَاكْتَفَى بِـ أَجْمَعِينَ عَنْ بَقِيَّةِ الأَلْفاظِ)** مامۆستا وشەی «أَجْمَعِينَ»ی باس کرد و وشەی «أَكْتَع، أَبْتَعَ، أَبْصَعَ»ی باس نەکرد **(لِاشْتِراكِهِمَا فَي جَمِيعِ الأَحْكامِ)** چونکە ئەم سێ وشانە لە هەموو حوکمەکان لەگەڵ وشەی «أَجْمَعَ» یەکسانن **(أَيْضاً)** وەکوو وشەکانی‌تر.

**(وَقَوْلُهُ:)** ئەم قسەیەی کە مامۆستا گوتی: **(وَلَا تُؤَكَّدُ بِهَا النَّكِراتُ)** ئەم وشانە نابن بە «تَأْكِيد» بۆ ئیسمێک کە «نَكِرَة» بێت چونکە ئەم وشانە هەموویان مەعریفەنە **(يَعْنِي:)** مەبەستی بەم قسەیە **(بِالتَّأْكِيدِ الْمَعْنَوِيِّ)** تەنها تەئکیدی «مَعْنَوِي» بوو، بە هیچ جۆرێک تەئکیدی «لَفْظِي» ناگرێتەوە، لەبەر چی؟ **(لأَنَّ الْبَحْثَ فِيهِ)** چونکە باسەکە باسی تەئکیدی «مَعْنَوِي»ـیە **(وَسَبَبُهُ)** هۆکارەکەشی ئەوەیە: **(أَنَّ هذِهِ الأَلْفاظَ مَعْرِفَةٌ)** کە ئەم وشانە هەموویان ناسراون بە «مَعْرِفَة» **(فَلَوْ وَقَعَتْ تَأْكِيداً لِلنَّكِرَةِ)** ئەگەر ئەم وشانە ببن بە «تَأْكِيد» بۆ ئیسمێکی نەناسراو و «نَكِرَة» **(لَتَناقَضَ الْكَلامُ)** ئەو کاتە ڕستەکە ماناکەی پێچەوانە دەبێتەوە **(إِذْ الْمُؤَكَّدُ حِينَئِذٍ يَقْتَضِي الْعُمُومَ)**

**وَالْمُؤَكَّدُ الْخُصُوصَ.**

**وَاعْلَمْ: أَنَّ أَكْتَعَ وَأَبْتَعَ وَأَبْصَعَ كُلَّهَا بِمَعْنَىٰ «أَجْمَعَ»؛ وَأَنَّهَا لَا تُذْكَرُ بِدُونِ «أَجْمَعَ» إِلَّا عَلَىٰ ضَعْفٍ، وَلَا تَتَقَدَّمُ عَلَيْهِ.**

**وَفَائِدَةُ التَّأْكِيدِ: أَمْنُ الْمُتَكَلِّمِ عَنْ فَوَاتِ مَقْصُودِهِ؛**

---

چونکە لەم کاتەدا ئەو وشەیەی کە «تأكيد» کراوە دەقەزا دەخوازێت کە وشەیەکە «عام» و گشتگیر بێت لە ڕووی ماناوە (**وَالْمُؤَكَّدُ الْخُصُوصَ**) وە ئەو وشەیەی کە بووە بە «تأكيد» دەقەزا دەخوازێت کە وشەیەکە «خاص» و تایبەت بێت، کەواتە: لە ڕووی ماناوە لەگەڵ یەکتری ناگونجێن، بۆیە «تَناقُضْ» دروست دەبێت لە نێوانیاندا، بۆیە دروست نییە بگوترێت: «جَاءَنِي رَجُلٌ نَفْسُهُ، وَ رَأَيْتُ رَجُلاً نَفْسَهُ، وَمَرَرْتُ بِرَجُلٍ نَفْسِهِ» چونکە وشەی «رَجُل» گشتگیر و «عامّ»ـە، بەڵام وشەی «نَفْسە» تایبەت و «خاصّ»ـە.

پاشان مامۆستا دەفەرموێت: (**وَاعْلَمْ:**) ئەی قوتابی خۆشەویست ئەم سێ خاڵە سەرەکییە بزانە: **خاڵی یەکەم** (**أَنَّ أَكْتَعَ، وَأَبْتَعَ، وَأَبْصَعَ**) ئەم سێ وشانە (**كُلّهَا بِمَعْنَى أَجْمَعَ**) هەرسێکیان لە ڕووی ناوەڕۆکەوە بە مانای «أَجْمَعَ» دێن -بێ زیاد و کەم-، **خاڵی دووەم** (**وَأَنَّهَا**) ئەم سێ وشانە بە دڵنیایی (**لَا تُذْكَرُ بِدُونِ أَجْمَعَ**) لە هیچ شوێنێک باس ناکرێن و ناکەونە نێو ڕستە بەبێ وشەی «أَجْمَعَ» (**إِلَّا عَلَى ضُعْفٍ**) تەنها لەسەر ڕایەکی زۆر بێهێز نەبێت، **خاڵی سێیەم** (**وَلَا يَتَقَدَّمُ عَلَيْهِ**) هەروەها ئەم سێ وشانە بە هیچ جۆرێک لەسەر وشەی «أَجْمَعَ» وەپێش ناکەون و دروست نییە لە سەرەتادا یاخود لە ناوەڕاستدا بێن.

## سوود و قازانجی «تَأْكِيد»

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: سوود و قازانجی «تَأْكِيد» چییە؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: (**وَفَائِدَةُ التَّأْكِيدِ**) سوود و قازانجی «تَأْكِيد» بریتییە لە (**أَمْنُ الْمُتَكَلِّمِ عَنْ فَوَاتِ مَقْصُودِهِ**) لە دڵنیابوونی ئەو کەسەی کە قسە

**أَمَّا فِي اللَّفظِيِّ، فَلِأَنَّهُ إِذَا قَالَ: «جَاءَنِي زَيْدٌ» مَثَلاً، فَرُبَّمَا لَا يَسْمَعُهُ الْمُخَاطَبُ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَيَفُوتُ مَقْصُودُهُ؛ فَإِذَا أَكَّدَ، أَمِنَ عَنْ ذٰلِكَ.**

**وَأَمَّا فِي الْمَعْنَوِيِّ، فَلِأَنَّهُ إِذَا قَالَ: «مَرَرْتُ بِزَيْدٍ» مَثَلاً، فَرُبَّمَا يَتَوَهَّمُ السَّامِعُ أَنَّهُ إِنَّمَا مَرَّ بِمَنْزِلِهِ وَقَالَ: «مَرَرْتُ بِزَيْدٍ» مَجَازاً؛ فَإِذَا أَكَّدَهُ بِـ «نَفْسِهِ»، يَعْلَمُ أَنَّهُ أَرَادَ الْحَقِيقَةَ لَا الْمَجَازَ، وَيَحْصُلُ الْمَقْصُودُ بِهِ.**

---

دەكات لە فەوتانی ئامانج و مەبەستەكەی لە هەردوو بەشەكەی «تَأْكِيد» (**أَمَّا فِي اللَّفظِيِّ**) سەبارەت بە تەئكیدی «لَفظِي» (**فَلِأَنَّهُ إِذَا قَالَ**) چونكە ئەگەر كەسێک بڵێت: (**جَاءَنِي زَيْدٌ**) بەبێ «تَأْكِيد» (**مَثَلاً**) بە نموونە (**فَرُبَّمَا لَا يَسْمَعُهُ الْمُخاطَبُ أَوَّلَ مَرَّةٍ**) ڕەنگە یەكەم جار گوێی لێ نەبێت، (**فَيَفُوتُ مَقْصُودُهُ**) كەواتە مەبەستەكەی دەفەوتێت، بەڵام (**فَإِذَا أَكَّدَ**) ئەگەر تەئكیدی كردەوە و گوتی: «جَاءَنِي زَيدٌ زَيدٌ» (**أَمِنَ عَنْ ذَلِكَ**) دڵنیا دەبێت كە مەبەستەكەی نەفەوتاوە بە هۆی تەئكیدكردنەوە.

(**وَأَمَّا فِي الْمَعْنَوِيِّ**) هەروەها سەبارەت بە تەئكیدی «مَعْنَوِي» (**فَلِأَنَّهُ إِذَا قَالَ**) چونكە ئەگەر كەسێک گوتی: (**مَرَرْتُ بِزَيْدٍ**) بەبێ «تَأْكِيد» (**مَثَلاً**) بە نموونە (**فَرُبَّمَا يَتَوَهَّمُ السَّامِعُ**) ڕەنگە یەكەم جار ئەو كەسەی گوێی لە قسەكە دەبێت ئاوا گومان بەرێت (**أَنَّهُ إِنَّمَا مَرَّ بِمَنْزِلِهِ**) كە كەسەكە بە بەر دەرگای ماڵی «زيد»دا ڕۆویشتووە (**وَقَالَ**) ئینجا گوتوویەتی (**مَرَرْتُ بِزَيْدٍ**) بەلای ماڵی «زيد»دا ڕۆویشتووم (**مَجازاً**) مەبەستی پێی مەجاز بێت نەک حەقیقەت (**فَإِذَا أَكَّدَهُ بِنَفْسِهِ**) بەڵام هەركاتێک ڕستەكەی «تَأْكِيد» كردەوە و گوتی: (**بِنَفْسِهِ**) واتە: بەلای خودی «زيد»دا ڕۆویشتووم، (**يَعْلَمُ أَنَّهُ أَرادَ الْحَقِيقَةَ**) كەسی گوێگر دەزانێت كە مەبەستی ئەو كەسەی قسە دەكات حەقیقەتە (**لَا الْمَجازَ**) نەک مەجاز (**وَيَحْصُلُ الْمَقْصُودُ بِهِ**)[1] هەروەها مەبەستەكەشی دێتەجێ و هیچ گومان لە ڕستەكەدا نامێنێت.

* ◌ *

---

١. بڕوانە: شرح جمل الزجاجي: ١/٢٣٦.

# الصِّفَةُ

**قَالَ: وَالصِّفَةُ نَحْوُ: «جَاءَنِي رَجُلٌ ضَارِبٌ وَمَضْرُوبٌ وَكَرِيمٌ وَهَاشِمِيٌّ وَعَدْلٌ وَذُو مَالٍ».**

**أَقُولُ: الثَّانِي مِنَ التَّوَابِعِ الصِّفَةُ، وَيُقَالُ لَهُ: «الْوَصْفُ»**

---

## وانەی شەستودووهەم: باسی «الصِّفَة»

پاش ئەوەی باسی «التَّوْكِيد» و بەشە سەرەکییەکانی تەواو کرد، ئینجا مامۆستا دێتە سەر بەیانکردنی «الصِّفَة» **(قَالَ:)** مامۆستا «جار الله» دەفەرموێت: **(وَالصِّفَة)** واتە: یەکێکیتر لەو ئیسمانەی کە تابیعی «مُعْرَب»ـن پێی دەگوترێت: «الصِّفَة» کە چەند جۆرێکی هەیە، یەکەم: «اِسْمُ الْفَاعِلِ» **(نَحْوُ:)** وەکوو **(جَاءَنِي رَجُلٌ ضَارِبٌ)**، **سەرنج بدە:** وشەی «ضَارِبٌ» بووە بە «صِفَة» بۆ وشەی «رَجُلٌ» لە هەموو حوکمەکانیش وەکوو ئەوە، **(وَ)** **دووەم:** «اِسْمُ الْمَفْعُول» وەکوو: «جَاءَنِي رَجُلٌ **(مَضْرُوبٌ)**»، **سەرنج بدە:** وشەی «مَضْرُوبٌ» بووە بە «صِفَة» بۆ وشەی «رَجُلٌ» لە هەموو حوکمەکان وەکوو ئەوە. **(وَ)** **سێیەم:** «الصِّفَة الْمُشَبَّهَةُ» وەکوو «جَاءَنِي رَجُلٌ **(كَرِيمٌ)**»، **سەرنج بدە:** وشەی «كَرِيمٌ» بووە بە «صِفَة» بۆ وشەی «رَجُلٌ» لە هەموو حوکمەکان وەکوو یەکترن. **(وَ)** **چوارەم:** «الِاسْمُ الْمَنْسُوبُ» وەکوو: «جَاءَنِي رَجُلٌ **(هَاشِمِيٌّ)**» **سەرنج بدە:** وشەی «هَاشِمِيٌّ» بووە بە «صِفَة» بۆ وشەی «رَجُلٌ» لە هەموو حوکمەکانیش وەکوو یەکترن. **(وَ)** **پێنجەم:** «الِاسْمُ فِي مَعْنَى الْمُشْتَقِّ» وەکوو: «جَاءَنِي رَجُلٌ **(ذُو مَالٍ)**»، **سەرنج بدە:** وشەی «ذُو مَالٍ» بۆتە «صِفَة» بۆ وشەی «رَجُلٌ» لە هەموو حوکمەکان وەکوو یەکترن، چونکە وشەی «ذو» بە مانای «صَاحِب» دێت.

**(أَقُولُ)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(الثَّانِي مِنَ التَّوابِعِ: الصِّفَة)** بەشی دووەم لەو ئیسمانەی کە تابیعی موعرەبن پێی دەگوترێت: «الصِّفَة» **(وَيُقَالُ: لَهُ)** هەروەها پێشی دەگوترێت: **(الْوَصْفُ)** لە لای زانایانی

**وَ«النَّعْتُ». وَهُوَ إِمَّا مُشْتَقٌّ أَوْ مَا فِي مَعْنَاهُ.**

**وَالْمُشْتَقُّ، إِمَّا اسْمُ فَاعِلٍ، نَحْوُ: «رَجُلٌ ضَارِبٌ»؛ أَوِ اسْمُ مَفْعُولٍ، نَحْوُ: «رَجُلٌ مَضْرُوبٌ»؛ أَوْ صِفَةٌ مُشَبَّهَةٌ، نَحْوُ: «رَجُلٌ كَرِيمٌ».**

**وَمَا فِي مَعْنَى الْمُشْتَقِّ، إِمَّا مُفْرَدٌ**

---

«بَصْرِي»، **(وَ)** هەروەها پێشی دەگوترێت: **(النَّعْتُ)**[1] لە لای زانایانی «كُوفِي».

ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: **(وَهُوَ)** سیفەت دوو جۆری هەیە، **یەکەم: (إِمَّا مُشْتَقٌّ)** یاخود لە ئیسمێکی‌تر وەرگیراوە **(أَوْ مَا فِي مَعْنَاهُ)** یاخود بە مانای شتێکە کە ئەو لە ئیسمێکی‌تر وەرگیراوە، **(وَالْمُشْتَقُّ)** ئەو سیفەتەی کە لە ئیسمێکی‌تر وەرگیراوە چەند جۆرێکی هەیە، **یەکەم: (إما)** یاخود **(اِسْمُ فَاعِلٍ)**ـە **(نَحْوُ:)** وەکوو **(جَاءَنِي رَجُلٌ ضَارِبٌ)**، **سەرنج بدە:** وشەی «ضَارِبٌ» بووە بە «صِفَة» بۆ وشەی «رَجُلٌ» لە هەموو حوکمەکان وەکوو ئەوە، وە لە وشەی «يَضْرِبُ» وەرگیراوە؛ **دووەم: (أَوْ)** یاخود **(اِسْمُ مَفْعُولٍ)**ـە **(نَحْوُ:)** وەکوو: «جَاءَنِي **(رَجُلٌ مَضْرُوبٌ)**» **سەرنج بدە:** وشەی «مَضْرُوبٌ» بووە «صِفَة» بۆ وشەی «رَجُلٌ» لە هەموو حوکمەکان وەکوو ئەوە، وە لە وشەی «يُضْرَبُ» وەرگیراوە. **(وَ) سێیەم: (الصِّفَةَ الْمُشَبَّهَة، نَحْوُ:)** وەکوو «جَاءَنِي **(رَجُلٌ كَرِيمٌ)** **سەرنج بدە:** وشەی «كَرِيمٌ» بووە بە «صِفَة» بۆ وشەی «رَجُلٌ» لە هەموو حوکمەکان وەکوو یەکترن.

**(وَمَا فِي مَعْنَى الْمُشْتَقِّ)** ئەو ئیسمانەی مانای شتێک دەبەخشن کە ئەوان لە ئیسمێکی‌تر وەرگیراون دوو جۆریان هەیە، یەکەم: **(إِمَّا مُفْرَدٌ)** یاخود تاک و «مُفْرَد»ن

---

١. جیاوازی نێوان «النَّعْت» و «الصِّفَة» بریتییە لەم خاڵانەی خوارەوە: **یەکەم:** «صِفَة» زاراوەی زانایانی بەسرییە بەڵام «نَعْت» زاراوەی زانایانی کوفییە. **دووەم:** «صِفَة» بە سیفەتێکی خاریجی دەگوترێت، وەکوو «ضَارِب» و «ناصِر» بەڵام «نَعْت» بە سیفەتی زاتی دەگوترێت وەکوو «قَصِير، طَوِيل». **سێیەم:** وشەی «صِفَة» بۆ «مَدْح» و هەروەها بۆ «ذَمّ» بەکار دێت بەڵام وشەی «نَعْت» تەنها بۆ «مَدْح» بەکار دێت. **چوارەم:** سیفەت بۆ شتێک بەکار دێت کە گۆڕانکاری بەسەردا نایەت، بەڵام «نَعْت» بۆ شتێک بەکار دێت کە گۆڕانکاری بەسەردا دێت، بۆیە دەگوترێت: «صِفَةُ اللّهِ» بەڵام ناگوترێت: «نَعْتُ اللّهِ». بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: التعريفات: ل، ١٣٦، ٢٣٥، وشرح المفصل: ٢٣٢/٢، و شرح الأنموذج: ١٢٢.

**أَوْ مُرَكَّبٌ. وَالْمُرَكَّبُ إِمَّا إِضَافِيٌّ، أَوْ غَيْرُ إِضَافِيٍّ.**

**فَالْمُرَكَّبُ الْغَيْرُ الْإِضَافِيُّ، نَحْوُ: «رَجُلٌ هَاشِمِيٌّ»، أَيْ: مَنْسُوبٌ إِلَىٰ هَاشِمٍ؛ وَالْمُفْرَدُ، نَحْوُ: رَجُلٌ عَدْلٌ، أَيْ: عَادِلٌ؛ وَالْمُرَكَّبُ الْإِضَافِيُّ، نَحْوُ: «رَجُلٌ ذُو مَالٍ»، أَيْ: مُتَمَوِّلٌ.**

**وَفَائِدَةُ الصِّفَةِ: فِي الْمَعَارِفِ التَّوْضِيحُ، نَحْوُ: «جَاءَنِي زَيْدٌ الظَّرِيفُ»،**

---

(**أَوْ مُرَكَّبٌ**) یاخود «مُرَكّب» و لێکدراون لەگەڵ وشەیەکی‌تر، ئینجا(**وَالْمُرَكّبُ**) بەشی دووەمیش دوو جۆری هەیە، یەکەم:(**إِمَّا إِضافِيٌّ**) یاخود مورەککەبێکی «إِضَافِي»ـیە (**أَوْ غَيْرُهُ**) یاخود مورەککەبێکی «غَيْرُ إِضَافِي»ـیە(**فَالْمُرَكّبُ الْغَيْرُ الإِضافِيُّ**) نموونەی مورەککەبی «غَيْـرُ الإِضَافِي»(**نَحْوُ**) وەکوو «جَاءَنِي(**رَجُلٌ هَاشِمِيٌّ، أَيْ مَنْسُوبٌ إِلَى هَاشِمٍ**) واتە: من پیاوێکم هاتە لا کە سیفەتی وابوو هاشمی بوو(**وَالْمُفْرَدُ**) نموونەی «مُفْرَد»ێ کە بە مانای ئیسمێکی «مُشْتَقّ»ـە(**نَحْوُ**) وەکوو «جَاءَنِي(**رَجُلٌ عَدْلٌ**) سەرنج بدە: ئەم وشەیە «مَصْدَر»ە، بەڵام بە مانای وشەیەکی «مُشْتَقّ»ـە بۆیە دەفەرموێت: (**أَيْ: عَادِلٌ. وَالْمُرَكّبُ الإِضافِيُّ**) نموونەی «مركّب»ـی «إِضَافِـي» (**نَحْوُ**) وەکوو «جَاءَنِي(**رَجُلٌ ذُو مَالٍ**) سەرنج بدە: وشەی «ذومال» «مركّب»ـێکی «إِضَافِي»ـیە و بە مانای ئیسمێکی «مُضاف»ـە(**أَيْ: مُتَمَوِّلٌ**) واتە: خاوەن سەرووەت و سامانە، هەروەها دەکرێت بڵێین وشەی «ذُو» بە مانای «صَاحِب» دێت.

## سوود و قازانجی «صِفَة»

ئینجا مامۆستا دێتە سەر باسی سوود و قازانجی «صِفَة» لە نێو ڕستەدا و دەفەرموێت:(**وَفَائِدَةُ الصِّفَة**) سوود و قازانجی «صِفَة» لە نێو ڕستەدا بریتییە لەم چەند خاڵانەی خوارەوە.

**یەکەم:** «لِلتَّوْضِيح»(**فِي الْمَعارِفِ**) ئەگەر «صِفَة» لەدوای ئیسمێکی «مَعْرِفَة» هات، سوود و قازانجی «صِفَة» بریتییە لە(**التَّوْضِيحُ**) ڕوونکردنەوە(**نَحْوُ**) وەکوو (**جَاءَنِي زَيْدٌ الظَّرِيفُ**) .

**وَفِي النَّكِرَاتِ التَّخْصِيصُ، نَحْوُ: «جَاءَنِي رَجُلٌ عَالِمٌ».**

---

**دووەم:** (وَفِي النَّكِراتِ)ئەگەر «صِفَة» لەدوای ئیسمێکی «نَكِرَة» هات، سوود و قازانجی «صِفَـة» بریتییـە لـە (التَّخْصِيصُ) تایبەتـکردن (نَحْوُ) وەکوو (جَاءَنِي رَجُلٌ عَالِمٌ) واتە: پیاوێکی زانا هاتە لای من، سەرنج بدە: بەر لە هاتنی سیفەتەکە ئەگەری هەبوو پیاوەکە کەسێکی جاهیل بێت، بەڵام دوای هاتنی وشەی «عالم» ئەم ڕستەیە تایبەت بوو[1].

**سێیەم:** «لِلْمَـدْحِ» هێندێـک جـار سـیفەتەکە بـۆ «مَـدْح» دێـت وەکـوو ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾.

**چـوارەم:** «للـذّمّ» هێندێـک جـار سـیفەتەکە بـۆ «ذم» دێـت وەکوو «أعوذ بـالله مِنَ الشّيْطان الرّجيم».

**پێنجەم:** «لِلتَّأْكِيدِ» هێندێک جار سیفەتەکە بۆ «تَأْكِيد» دێت وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَا تَتَّخِذُوٓاْ إِلَٰهَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ﴾[2].

* ◌ *

---

١. بۆ زانیاری زیاتر تەماشـای ئەم سـەر چاوانە بکە: شـرح السـيوطي: ٢/ ٥٣، شـرح التسـهيل: ٣/ ١٦٨، النحو الوافي: ٥٣٦/٤، جامع الدروس العربية: ٤٩٥، شرح التصريح: ١١٧/٢.

٢. سورة النحل: الأية: ١٨

**قَالَ: وَتُوصَفُ النَّكِرَاتُ بِالْجُمَلِ، نَحْوُ: «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ وَجْهُهُ حَسَنٌ»، وَ «رَأَيْتُ رَجُلاً أَعْجَبَنِي كَرَمُهُ».**

**أَقُولُ: يَجُوزُ وَصْفُ النَّكِرَةِ: بِالْجُمْلَةِ الاِسْمِيَّةِ، نَحْوُ: «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ وَجْهُهُ حَسَنٌ». فَإِنَّ «وَجْهُهُ حَسَنٌ» مُبْتَدَأٌ وَخَبَرٌ، صِفَةٌ لِـ «رَجُلٍ»؛ أَوِ الْفِعْلِيَّةِ، نَحْوُ: «رَأَيْتُ رَجُلاً أَعْجَبَنِي كَرَمُهُ»، فَإِنَّ «أَعْجَبَنِي كَرَمُهُ» فِعْلٌ وَفَاعِلٌ،**

## وانەی شەستوسێهەم: باسی «وَصْفُ النَّكِرَةِ بِالْجُمَلِ»

**(قالَ:)** مامۆستا «جار الله» دەفەرموێت: **(وَتُوصَفُ النَّكِراتُ بِالْجُمَلِ)** دروستە ئیسمێکی «نَكِرَة» وەسفدار بکرێت بە «جُمْلَة» جیاوازی نییە جوملەکە «اِسْمِيّة» بێت **(نَحْوُ)** وەکوو **(مَرَرْتُ بِرَجُلٍ وَجْهُهُ حَسَنٌ)**، سەرنج بدە: ڕستەی «وَجْهُهُ حَسَنٌ» بووە بە «صِفَة» بۆ وشەی «رَجُل» لە هەمان کاتدا جوملەیەکی «اِسْمِيّة»یە؛ **(وَ)** هەروەها یاخود جوملەکە «فِعْلِيّة» بێت وەکوو **(رَأَيْتُ رَجُلاً أَعْجَبَنِي كَرَمُهُ)**، سەرنج بدە: ڕستەی «أَعْجَبَنِي كَرَمُهُ» بووە بە «صِفَة» بۆ وشەی «رَجُلاً» لە هەمان کاتدا جوملەیەکی «فِعْلِيَّة»یە.

**(أَقُولُ)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(وَيَجُوزُ وَصْفُ النَّكِرَةِ بِالْجُمْلَةِ الاِسْمِيَّةِ)** دروستە ئیسمێکی «نَكِرَة» وەسفدار بکرێت بە «جُمْلَة» جیاوازی نییە جوملەکە «اِسْمِيّة» بێت **(نَحْوُ)** وەکوو **(مَرَرْتُ بِرَجُلٍ وَجْهُهُ حَسَنٌ)**، سەرنج بدە: **(فَإِنَّ وَجْهُهُ حَسَنٌ)** ڕستەی «وَجْهُهُ حَسَنٌ» جوملەیەکی «اِسْمِيّة»یە **(مُبْتَدَأٌ وَخَبَرٌ)** کە پێک هاتووە لە «مُبْتَدَأ» و لە «خَبَر» **(صِفَةٌ لِـ رَجُلٍ)**[1] هەروەها «فِي مَحَلِّ الْجَرِّ» بووە بە «صِفَة» بۆ وشەی «رَجُل».

**(أَوِ الْفِعْلِيَّةِ)** یاخود جوملەکە «فِعْلِيّة» بێت **(نَحْوُ)** وەکوو **(رَأَيْتُ رَجُلاً أَعْجَبَنِي كَرَمُهُ)** سەرنج بدە: ڕستەی **(فَإِنَّ أَعْجَبَنِي كَرَمُهُ)** پێک هاتووە لە جوملەیەکی «فِعْلِيَّة»یە **(فِعْلٌ وَ فَاعِلٌ)** چونکە پێک هاتووە لە «فِعْل» و «فَاعِل» و لە «مَفْعُول

---

١. بڕوانە: شرح كافية ابن الحاجب: ٣٩٥/٢.

**صِفَةٌ لـ«رَجُلٍ»؛ أَوِ الشَّرْطِيَّةِ، نَحْوُ: «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ إِنْ قَامَ أَبُوهُ قُمْتُ»؛ أَوِ الظَّرْفِيَّةِ، نَحْوُ: «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ فِي الدَّارِ أَبُوهُ».**

**وَيُشْتَرَطُ أَنْ تَكُونَ الْجُمْلَةُ خَبرِيَّةً، أَيْ: مُحْتَمِلَةً لِلصِّدْقِ وَالْكَذِبِ، لِأَنَّ الصِّفَةَ فِي الْحَقِيقَةِ خَبَرٌ عَنِ الْمَوْصُوفِ.**

---

بِهِ»، هەروەها بووە بە (صِفَةٌ لِـ رَجُلٍ) «صِفَة» بۆ وشەی «رَجُلاً».

(أَوِ الشَّرْطِيَّةِ) یاخود جوملەکە «شَرْطِيّة» بێت (نَحْوُ) وەکوو (مَرَرْتُ بِرَجُلٍ إِنْ قَامَ أَبُوهُ قُمْتُ)، سەرنج بدە: ڕستەی «إِنْ قَامَ أَبُوهُ قُمْتُ» پێک هاتووە لە جوملەیەکی «شَرْطِيّة» چونکە پێک هاتووە لە «فِعْلُ الشَّرْط» و لە «جَزاءُ الشَّرْط»، هەروەها بووە بە «صِفَة» بۆ وشەی «رَجُلٍ».

(أَوِ الظَّرْفِيَّةِ) یاخود جوملەکە «ظَرْفِيَّة» بێت (نَحْوُ) وەکوو (مَرَرْتُ بِرَجُلٍ فِي الدَّارِ أَبُوهُ)، سەرنج بدە: ڕستەی «فِي الدَّارِ أَبُوهُ» پێک هاتووە لە جوملەیەکی «ظَرْفِيَّة»، هەروەها بووە بە «صِفَة» بۆ وشەی «رَجُلٍ».

ئینجا بزانە: ئەی قوتابی بەڕێز، بە شێوەیەکی گشتی «جُمْلَة» دوو جۆری سەرەکی هەیە: یەکەم پێی دەگوترێت «اَلْجُمْلَةُ الإِنْشائِيَّةُ»، دووەم پێی دەگوترێت «اَلْجُمْلَةُ الْخَبَرِيَّةُ» ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: پێویستە ئەم ڕستەیەی کە دەبێتە «خَبَرْ» بۆ ئیسمێکی «نَكِرَة» دوو مەرجی تێدا بێت:

**مەرجی یەکەم:** (وَيُشْتَرَطُ) بە مەرج دادەندرێت بۆ ئەم ڕستەیەی کە دەبێتە «خَبَرْ» بۆ ئیسمێکی «نَكِرَة» (أَنْ تَكُونَ الْجُمْلَةُ خَبَرِيَّةً) کە دەبێت ڕستەیەکی خەبەری بێت و باسی شتێک بکات و هەواڵێکی پێ بدرێت (أَيْ:) واتە: ئەم ڕستەیە (مُحْتَمِلَةً لِلْصِّدْقِ وَالْكَذِبِ) ئەگەری ڕاستکردن و درۆکردنی هەبێت. ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: لەبەر چی دەبێت ڕستەکە خەبەری بێت؟ مامۆستا دەفەرموێت: (لأَنَّ الصِّفَةَ فِي الْحَقِيقَةِ خَبَرٌ عَنِ الْمَوْصُوفِ) چونکە لە ڕاستیدا «صِفَة» خەبەردانە لەبری «مَوْصُوف»، ڕستەی «إِنْشَائِي»ـیش هیچ جۆرە خەبەرێکی تێدا نییە بۆیە دروست نییە ببێتە «صِفَة» بۆ ئیسمێکی «نَكِرَة». ئینجا ئەگەر کەسێك پرسیار بکات و بڵێت:

**وَ إِنَّمَا لَمْ يَتَعَرَّضِ الْمُصَنِّفُ لِذٰلِكَ اعْتِمَاداً عَلَى الْمِثَالِ.**

**وَلَا يَجُوزُ وَصْفُ الْمَعَارِفِ بِالْجُمَلِ؛ لِأَنَّ الْجُمَلَ نَكِرَاتٌ، وَالصِّفَةَ يَجِبُ أَنْ تُوَافِقَ الْمَوْصُوفَ فِي التَّعْرِيفِ وَالتَّنْكِيرِ. وَلَا بُدَّ فِي الْجُمْلَةِ الْوَاقِعَةِ صِفَةً مِنْ ضَمِيرٍ يَرْجِعُ إِلَى الْمَوْصُوفِ، كَـ «هَاءِ» «وَجْهِهِ» وَ «كَرَمِهِ».**

---

(**وَ إِنَّمَا لَمْ يَتَعَرَّضِ الْمُصَنِّفُ لِذَلِكَ**) لەبەر چی مامۆستا لە سەرەتای وانەکەدا ئاماژەی بۆ ئەم مەرجە نەکرد؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت: (**اِعْتِماداً عَلَى الْمِثالِ**) مامۆستا بۆ بەیانکردنی ئەم مەرجە ئیعتیمادی کردە سەر نموونەکان، چونکە زۆر جار زانا گەورەکان لە نێو نموونەکان ئاماژە بە کۆمەڵێک مەرج دەدەن کە تەنها خەڵکی زانا و شارەزا لە بابەتەکە هەستی پێ دەکەن، هەر بۆیە دروست نییە ڕستەی «الطَّلَبِيَّة وَالإِنْشائِيَّة» ببێتە «صِفَة»، بۆیە ناگوترێت: «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ اِضْرِبْهُ، أَوْ لَا تَضْرِبْهُ».

(وَ) هەروەها (**لَا يَجُوزُ وَصْفُ الْمَعارِفِ بِالْجُمَلِ**) دروست نییە ئیسمێکی «مَعْرِفَة» وەسفدار بکرێت بە هیچ جوملەیەک (**لأَنَّ الْجُمَلَ نَكِراتٌ**) چونکە «جُمْلَة» حیسابی ئیسمێکی «نَكِرَة»ی بۆ دەکرێت (**وَالصِّفَة يَجِبُ أَنْ تُوافِقَ الْمَوْصُوفَ**) پێویستە «صِفَة»ـیش لەگەڵ «مَوْصُوف»ـی خۆی وەکوو یەک بن (**فِي التَّعْرِيفِ وَالتَّنْكِيرِ**) لە «تَعْرِيف» و لە «تَنْكِير»دا.

مەرجی دووەم: (**وَلَا بُدَّ فِي الْجُمْلَةِ الْوَاقِعَةِ صِفَة**) هەروەها پێویستە بۆ ئەم ڕستەیەی کە دەبێتە «صِفَة» بۆ ئیسمێکی «نَكِرَة» (**مِنْ ضَمِيرٍ يَرْجِعُ إِلَى الْمَوْصُوفِ**) «ضَمِير»ێکی تێدا بێت و ڕستەکە بگێڕێتەوە بۆ لای «مَوْصُوف»ـەکەی خۆی، چونکە «جُمْلَة» ئەگەر بێت و هیچ «ضَمِير»ێکی تێدا نەبێت بیگێڕێتەوە بۆ لای «مَوْصُوف»ـەکەی خۆی جوملەکە سەربەخۆ دەبێت و هیچ پەیوەندییەکی نابێت لەگەڵ پێش خۆی، هەر وەکوو لە باسی ئەو جوملانەی دەبنە «خَبَر» بۆ «مُبْتَدَأ» باسمان کرد (**كَـ هَاءِ**) نموونەکەی وەکوو ئەم «هاءَ»ی کە بە وشەی (**وَجْهِهِ**)ـیەوە بوو لە نموونەی «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ وَجْهُهُ حَسَنٌ»؛ (**وَ**) هەروەها ئەم «هاء»ـە کە بە وشەی (**كَرَمِهِ**)ـیەوە بوو لە نموونەی «رَأَيْتُ رَجُلاً أَعْجَبَنِي كَرَمُهُ». هەروەها پێویستە ئەم

............................................................

«ضَمِیر»ەی کە بە جوملەکەوەیە لەگەڵ «مَوْصُوف»ـەکەی خۆی یەکسان بێت لە «إِفْراد...»[١] و لە «تَذْكِير....»دا.

**ئاگاداری:** هەرکاتێک ئیسمێکی «مَعْرِفَة» وەسفدار بکرێت بە جوملەیەک، لەم حاڵەتەدا جوملەکە «فِي مَحَلِّ النَّصْبِ» دەبێتە «حال» نابێت بە «صِفَة» وەکوو «جَاءَنِي بَكْرٌ يَضْحَكُ»، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «يَضْحَكُ» لە «مَحَلِّ النَّصْبِ» دەبێتە «حال» چونکە زانایانی زانستی «نَحْو» دەفەرموون: «اَلْجُمَلُ بَعْدَ النَّكِراتِ صِفاتٌ، وَبَعْدَ الْمَعارِفِ أَحْوالٌ»[٢].

* ◌ *

١. بڕوانە: شرح كافية ابن الحاجب الكوردي: ٣٢٢/٢، والنحو الوافي: ٣٣٤/٣، وجامع الدروس العربية: ٤٩٦.

٢. بڕوانە: النحو الوافي: ٣٣٤/٣.

**قَالَ: وَالصِّفَةُ تُوَافِقُ الْمَوْصُوفَ فِي إِعْرَابِهِ وَإِفْرَادِهِ وَتَثْنِيَتِهِ وَجَمْعِهِ وَتَعْرِيفِهِ وَتَنْكِيرِهِ وَتَذْكِيرِهِ وَتَأْنِيثِهِ.**

**أَقُولُ: الصِّفَةُ إِمَّا فِعْلُ الْمَوْصُوفِ أَوْ فِعْلُ مُسَبَّبِهِ، وَالثَّانِي سَيَجِيءُ.**

## وانەی شەستوچوارەم: باسی «مُوافَقَةُ الصِّفَة لِلْمَوْصُوفِ فِي عَشْرَةِ أَشْياءَ»

**(قالَ:)** مامۆستا «جار الله» دەفەرموێت: **(وَالصِفَة تُوافِقُ الْمَوْصُوفَ)** پێویستە «صِفَة» لەگەڵ «مَوْصُوف»ـی خۆی وەکوو یەک بن لەم دە شتانەی خوارەوە، **یەکەم: (فِي إِعْرابِهِ)** لە یەکێک لە سێ ئیعرابەکە کە بریتین لە «رَفْع»ـە و «نَصْب»ـە و «جَرّ»ە؛ **چوارەم: (وَ إِفْرادِهِ)** واتە: ئەگەر «مَوْصُوف»ـەکە «مُفْرَدْ» بوو دەبێت سیفەتەکەش «مُفْرَدْ» بێت؛ **پێنجەم: (وَتَثْنِيَتِهِ)** هەروەها ئەگەر «مَوْصُوف»ـەکە «تَثْنِيَة» بوو دەبێت سیفەتەکەش «تَثْنِيَة»بێت، **شەشەم: (وَجَمْعِهِ)** هەروەها ئەگەر «مَوْصُوف»ـەکە «جَمْع» بوو دەبێت سیفەتەکەش «جَمْع» بێت؛ **حەوتەم: (وَتَعْرِيفِهِ)** هەروەها ئەگەر «مَوْصُوف»ـەکە ئیسمێکی «مَعْرِفَة» بوو دەبێت سیفەتەکەش ئیسمێکی «مَعْرِفَة» بێت؛ **هەشتەم: (وَتَنْكِيرِهِ)** هەروەها ئەگەر «مَوْصُوف»ـەکە ئیسمێکی «نَكِرَة» بوو دەبێت سیفەتەکەش ئیسمێکی «نَكِرَة» بێت، **نۆیەم: (وَتَذْكِيرِهِ)** هەروەها ئەگەر «مَوْصُوف»ـەکە ئیسمێکی «مُذَكَّر» بوو دەبێت سیفەتەکەش ئیسمێکی «مُذَكَّر» بێت، **دەیەم: (وَتَأْنِيثِهِ)** هەروەها ئەگەر «مَوْصُوف»ـەکە ئیسمێکی «مُؤَنَّث» بوو دەبێت «صِفَة»ـەکەش ئیسمێکی «مُؤَنَّثْ» بێت.

**(أَقُولُ)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(الصِفَة)** ئەو وشەیەی کە دەبێتە «صِفَة» **(إِمَّا فِعْلُ الْمَوْصُوفِ)** یاخود ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە «مَوْصُوف»ـەکەوەیە **(أَوْ فِعْلُ مُسَبَّبِهِ)** یاخود پەیوەندی لەگەڵ وشەیەکی‌تر هەیە، کە ئەم وشەیە پەیوەندی لەگەڵ «مَوْصُوف»ـەکە هەیە **(وَالثَّانِي سَيَجِيءُ)** بەشی دووەم لە وانەی داهاتوودا باس دەکەین.

**وَالْأَوَّلُ: يَجِبُ أَنْ يُوافِقَ الْمَوْصُوفَ فِي عَشَرَةِ أَشْيَاءَ. وَهِيَ الَّتِي ذُكِرَتْ فِي الْكِتَابِ، أَيْ: إِذَا وُجِدَ شَيْءٌ مِنْهَا فِي الْمَوْصُوفِ يَجِبُ أَنْ يُوجَدَ فِي الصِّفَةِ أَيْضاً.**

**وَهٰذِهِ الْعَشَرَةُ بَعْضُهَا مُمْكِنُ الِاجْتِمَاعِ وَبَعْضُهَا غَيْرُ مُمْكِنِ الِاجْتِمَاعِ؛ أَمَّا الثَّانِي فَكَالْإِعْرَابِ الثَّلَاثَةِ، فَإِنَّهُ لَا يُمْكِنُ أَنْ يَجْتَمِعَ بَعْضُهُ مَعَ الْبَعْضِ الْآخَرِ؛ وَكَالْإِفْرَادِ وَالتَّثْنِيَةِ وَالْجَمْعِ، فَإِنَّهُ لَا يُمْكِنُ أَيْضاً أَنْ يَجْتَمِعَ بَعْضُ هٰذِهِ الثَّلَاثَةِ مَعَ الْبَعْضِ الْآخَرِ؛**

---

(**وَالأَوَّلُ:**) بەشی یەکەم: سیفەتەکە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە «مَوْصُوف»ـەوە بێت لەدوای ئەو هاتبێت (**يَجِبُ أَنْ يُوافِقَ الْمَوْصُوفَ فِي عَشْرَةِ أَشْياءَ**) پێویستە سیفەتەکە لەگەڵ «مَوْصُوف»ـی خۆی وەکوو یەک بن لەم دە شتانەی خوارەوە (**وَهِيَ الَّتِي ذُكِرَتْ فِي الْكِتابِ**) کە ئەم دە شتانە لەم کتێبەدا باس کراون و ڕوون کراونەتەوە (**أَيْ:**) واتە: (**إِذَا وُجِدَ شَيْءٌ مِنْها فِي الْمَوْصُوفِ**) ئەگەر بێت و یەکێک لەم دە شتانە لە نێو «مَوْصُوف»ـەکەدا هەبوو (**يَجِبُ أَنْ يُوجَدَ فِي الصِّفَة أَيْضاً**) پێویستە بە هەمان شێوە لە نێو سیفەتەکەشدا هەبێت بۆ ئەوەی «مُطابَقَة» لە نێوان «صِفَة» و «مَوْصُوف» دروست بێت لە هەموو ڕوویێکەوە.

(**وَهَذِهِ الْعَشْرَةُ**) ئەم دە شتەی کە پێویستە سیفەتەکە لەگەڵ مەوسووفی خۆی وەکوو یەک بن، دەبن بە دوو جۆر: **جۆری یەکەم** بریتین لەم شتانەی (**بَعْضُهَا مُمْكِنُ الإِجْتِماعِ**) کە دەکرێت لەگەڵ یەکتر کۆ ببنەوە لەسەر یەک «إِسْم» و لە یەک حاڵەتدا، (**وَ**) هەروەها **جۆری دووەم** بریتین لەم شتانەی کە (**بَعْضُهَا غَيْرُ مُمْكِنِ الإِجْتِماعِ**) ناگونجێت لەگەڵ یەکتر کۆ ببنەوە لەسەر یەک «إِسْم» و لە یەک حاڵەتدا، (**أَمَّا الثَّانِي:**) جۆری دووەم (**فَكَالإِعْرابِ الثَّلاثَةِ**) وەکوو «رَفْع»ـە و «نَصْب»ـە و «جَرّ»ە (**فَإِنَّهُ لَا يُمْكِنُ أَنْ يَجْتَمِعَ بَعْضُهُ مَعَ الْبَعْضِ الآخَرِ**) سەرنج بدە: ناگونجێت ئەم سێ شتە لەگەڵ یەکتر کۆ ببنەوە لەسەر یەک «إِسْم»، چونکە ناکرێت لە یەک حاڵەتدا ئیسمێک هەبێت هەم «مَرْفُوعْ» بێت هەم «مَنْصُوبْ» بێت هەم «مَجْرُورْ» بێت.
(**وَكَالإِفْرادِ وَالتَّثْنِيَةِ وَالْجَمْعِ**) هەروەها وەکوو «مُفْرَد» و «تَثْنِيَة» و «جَمْع» (**فَإِنَّهُ لا يُمْكِنُ أَيْضاً أَنْ يَجْتَمِعَ بَعْضُ هَذِهِ الثَّلاثَةِ مَعَ الْبَعْضِ الآخَرِ**) چونکە ناگونجێت ئەم

**وَكَالتَّعْرِيفِ وَالتَّنْكِيرِ وَالتَّذْكِيرِ وَالتَّأْنِيث، فَإِنَّهُ لَا يُمْكِنُ أَيْضاً أَنْ يُوجَدَ إِلَّا وَاحِدٌ مِنَ الْمُتَقَابِلَيْن.**

**وَأَمَّا الْأَوَّلُ، أَعْنِي: مُمْكِنَ الاِجْتِمَاعِ؛ فَيَنْتَهِي إِلَىٰ أَرْبَعَةٍ: [١] وَاحِدٍ مِنَ الْإِعْرَابِ الثَّلَاثَةِ، [٢] وَوَاحِدٍ مِنَ الْإِفْرَادِ وَالتَّثْنِيَةِ وَالْجَمْعِ، [٣] وَوَاحِدٍ مِنَ التَّعْرِيفِ وَالتَّنْكِيرِ، [٤] وَوَاحِدٍ مِنَ التَّذْكِيرِ وَالتَّأْنِيث،**

---

سێ شتە لەگەڵ یەكتر كۆ ببنەوە لەسەر یەک «اِسْم»، چونكە ناكرێت لە یەک حاڵەتدا ئیسمێک هەبێت هەم «مُفْرَد» بێت و هەم «تَثْنِيَة» بێت هەم «جَمْع» بێت، كەواتە: ئەم سێ شتە بەیەكەوە ناگونجێن. **(وَكَالتَّعْرِيفِ وَالتَّنْكِيرِ)** هەروەها وەكوو «تَعْرِيف» و «تَنْكِير»، ئەوانیش ناگونجێت لەگەڵ یەكتر كۆ ببنەوە لەسەر یەک «اِسْم»، چونكە ناكرێت لە یەک حاڵەتدا ئیسمێک هەبێت هەم «مَعْرِفَة» بێت و هەم «نَكِرَة» بێت. **(وَالتَّذْكِيرِ وَالتَّأْنِيث)** هەروەها وەكوو «تَذْكِير» و «تَأْنِيثْ» **(فَإِنَّهُ لَا يُمْكِنُ أَيْضاً)** ئەم دووانەش وەكوو ئەوانەی پێشتر ناگونجێت **(أَنْ يُوجَدَ إِلَّا وَاحِدٌ مِنَ الْمُتَقَابِلَيْنِ)** لەگەڵ یەكتر كۆ ببنەوە و لەسەر یەک «اِسْم» دەست بكەون تەنها یەكێكیان نەبێت، چونكە ناكرێت لە یەک حاڵەتدا ئیسمێک هەبێت هەم «مُذَكَّرْ» بێت و هەم «مُؤَنَّثْ» بێت.

**(وَأَمَّا الأَوَّلُ:)** سەبارەت بە جۆری یەكەم **(أَعْنِي: مُمْكِنَ الاِجْتِمَاعِ)** مەبەستم ئەو شتانەیە كە لەگەڵ یەكتر كۆ دەبنەوە لەسەر یەک «اِسْم» و لە یەک حاڵەتدا **(فَيَنْتَهِي إِلَى أَرْبَعَةٍ)** لەم دە شتانە لە چواران تێناپەڕێت، **(وَاحِدٍ مِنَ الإِعْرَابِ الثَّلَاثَةِ)** لە هەرسێ ئیعرابەكە كە بریتین لە «رَفْع»ـە و «نَصْب»ـە و «جَرّ»ـە یەكێكیان وەردەگرین، **(وَ)** هەروەها **(وَاحِدٍ مِنَ الإِفْرَادِ وَالتَّثْنِيَةِ وَالْجَمْعِ)** یەكێكیش لە حاڵەتەكانی «إِفْرَاد» و «تَثْنِيَة» و «جَمْع» وەردەگرن، **(وَ)** هەروەها **(وَاحِدٍ مِنَ التَّعْرِيفِ وَالتَّنْكِيرِ)** یەكێكیش لە حاڵەتەكانی «تَعْرِيف» و «تَنْكِير» وەردەگرن، **(وَ)** هەروەها **(وَاحِدٍ مِنَ التَّذْكِيرِ وَالتَّأْنِيث)** یەكێكیش لە حاڵەتەكانی «تَذْكِير» و «تَأْنِيثْ» وەردەگرن، كەواتە ژمارەیان بوو بە چوار دانە، بۆیە واجبە هەموو سیفەتێک لەگەڵ مەوسووفەكەی

**نَحْوُ: «جَاءَنِي رَجُلٌ عَالِمٌ»، فَإِنَّ الصِّفَةَ وَالْمَوْصُوفَ مُتَوَافِقَانِ فِي أَرْبَعَةِ أَشْيَاءَ مِنَ الْعَشَرَةِ: فِي الْإِعْرَابِ وَالتَّنْكِيرِ وَالْإِفْرَادِ وَالتَّذْكِيرِ.**

**وَإِذَا قِيلَ: «رَأَيْتُ رَجُلاً أَوْ مَرَرْتُ بِرَجُلٍ»، فَالْوَاجِبُ «عَالِماً» أَوْ «عَالِمٍ»، وَإِذَا قِيلَ: «رَجُلَانِ» أَوْ «رِجَالٌ»، فَالْوَاجِبُ «عَالِمَانِ» أَوْ «عَالِمُونَ»،**

---

خۆی لە چوار شتان وەکوو یەک بن، **(نَحْوُ:)** وەکوو ئەم نموونەیە کە دەفەرموێت: **(جَاءَنِي رَجُلٌ عَالِمٌ؛ فَإِنَّ الصِّفَةَ)** سەرنج بدە: سیفەتەکە بریتییە لە وشەی «عَالِمٌ» **(وَالْمَوْصُوفَ)** لەگەڵ مەوسووفەکەی خۆی کە بریتییە لە وشەی «رَجُلٌ» **(مُتَوَافِقَانِ فِي أَرْبَعَةِ أَشْيَاءَ مِنَ الْعَشْرَةِ)** لە چوار شتان وەکوو یەکن لەو دە شتەی کە باسمان‌کردن، **یەکەم: (فِي الإِعْرابِ)** ئیعرابی هەردوو وشەکە وەکوو یەکە کە «رَفْع»ـەیە، **دووەم: (وَالتَّنْكِيرِ)** هەروەها هەردوو وشەکە وەکوو یەک «نَكِرَة» بن، **سێیەم: (وَالإِفْرادِ)** هەروەها هەردوو وشەکە وەکوو یەک «مُفْرَد» بن، **چوارەم: (وَالتَّذْكِيرِ)** هەروەها هەردوو وشەکە وەکوو یەک «مُذَكَّر» بن.

**(وَإِذَا قِيلَ)** ئەگەر ئەو نموونەی ڕابووردوو بگۆڕین و بڵێین **(رَأَيْتُ رَجُلاً)** واتە: وشەی «رَجُلاً» بە «مَنْصُوب»ـی بخوێنینەوە **(أَوْ)** یاخود بڵێین **(مَرَرْتُ بِرَجُلٍ)** واتە: وشەی «رَجُلٍ»بە «مَجْرُور»ی بخوێنینەوە **(فَالْواجِبُ)** ئەو کاتە پێویستە وشەی «عَالِماً» لە نموونەی یەکەم بە «مَنْصُوب»ـی بخوێنینەوە بڵێین «رَأَيْتُ رَجُلاً عَالِماً» **(أَوْ)** یاخود وشەی **(عَالِمٍ)** لە نموونەی دووەمیش بە «مَجْرُور»ی بخوێنینەوە و بڵێین «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ عَالِمٍ».

**(وَإِذَا قِيلَ:)** وە ئەگەر ئەو نموونەی ڕابووردوو بگۆڕین و بڵێین «جاءني **(رَجُلانِ)**» واتە: وشەی «رَجُلان» بە «تَثْنِيَة» بخوێنینەوە **(أَوْ)** یاخود بڵێین «جاءني **(رِجالٌ)**» واتە: وشەی «رِجال» بە «جَمْعُ التَّكْسِير» بخوێنینەوە **(فَالْواجِبُ)** ئەو کاتە پێویستە وشەی **(عَالِمان)** لە نموونەی یەکەم بە «تَثْنِيَة» بخوێنینەوە و بڵێین «جاءني رَجُلانِ عَالِمانِ» **(أَوْ)** یاخود وشەی **(عَالِمُونَ)** لە نموونەی دووەم بە «جَمْع» بخوێنینەوە و بڵێین «جَاءَنِي رِجالٌ عَالِمُونَ».

**وَإِذَا قِيلَ: «الرَّجُلُ» فَالْوَاجِبُ «الْعَالِمُ»، وَإِذَا قِيلَ: «امْرَأَةٌ» فَالْوَاجِبُ «عَالِمَةٌ»، وَعَلَىٰ هٰذَا الْقِيَاس.**

**قَالَ: وَيُوصَفُ الشَّيْءُ بِفِعْلِ مَا هُوَ مِنْ مُسَبَّبِهِ، نَحْوُ: «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ مَنِيعٍ جَارُهُ، وَرَحْبٍ فِنَاؤُهُ،**

---

**(وَإِذَا قِيلَ:)** هەروەها ئەگەر بڵێین «جاءني **(الرَّجُلُ)**» واتە: وشەی «الرَّجُلُ» بە «مَعْرِفَة» بخوێنینەوە **(فَالْواجِبُ)** ئەو کاتە پێویستە وشەی **(اَلْعَالِمُ)** ش بە «مَعْرِفَة» بخوێنینەوە و بڵێین «جَاءَنِي الرَّجُلُ العَالِمُ».

**(وَإِذَا قِيلَ)** هەروەها ئەگەر بڵێین «جَاءَتْنِي **(إِمْرَأَةٌ)**» واتە: وشەی «فاعل» بە «مُؤَنَّث»ی بخوێنینەوە **(فَالْواجِبُ)** ئەو کاتە پێویستە وشەی **(عَالِمَةٌ)** بە «مُؤَنَّث»ی بخوێنینەوە و بڵێین «جَاءَتْنِي إِمْرَأَةٌ عَالِمَةٌ» **(وَعَلَى هَذا الْقِيَاسُ)** ئینجا بەم شێوەیە قیاس بکە و بەردەوام بە، بە هیچ جۆرێک هەڵە ناکەیت.

## وانەی شەستوپێنجەم: باسی «وَيُوصَفُ الشَّيْءُ بِفِعْلِ مَا هُوَ مِنْ مُسَبَّبِهِ»

**(قالَ:)** مامۆستا «جار الله» دەفەرموێت: **(وَيُوصَفُ الشَّيْءُ)** هێندێک جار ئیسمێک وەسفدار دەکرێت بەڵام بە سیفەتێکی ڕاستەوخۆ نا، بەڵکوو **(بِفِعْلِ مَا)** بە کار و کردەوەی شتێکی تر کە **(هُوَ مِنْ مُسَبَّبِهِ)** ئەو ئیسمەی یەکەم بۆتە «سَبَب» بۆ هاتنی ئیسمی دووەم **(نَحْوُ:)** وەکوو **(مَرَرْتُ بِرَجُلٍ مَنِيعٍ جَارُهُ)** واتە: من بەلای پیاوێکدا ڕۆویشتم دراوسێکەی ڕێگری دەکرد لە ڕۆویشتنم، سەرنج بدە: وشەی «مَنِيعٍ» لە «لَفْظ»ـدا بووە بە «صِفَة» بۆ وشەی «رَجُلٍ»، کەچی ئەویش کارەکەی نەکردووە بەڵکوو ئەوەی ڕێگری کردووە جیرانەکەیەتی ـواتە: وشەی «جَارُهُ»ەـ، بۆیە وشەی«مَنِيعٍ» لە لەفزدا بە سیفەتی «رَجُلٍ» دادەندرێت بەڵام لە مەعنادا بە سیفەتی «جَارُهُ» دادەندرێت.(وَ) هەروەها وەکوو «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ **(رَحْبٍ فِنَاؤُهُ)**» واتە: من بەلای پیاوێکدا ڕۆویشتم کە حەوشەیان فراوان بوو، سەرنج بدە: وشەی «رَحْبٍ»

**وَمُؤَدَّبٍ خُدَّامُهُ».**

**أَقُولُ: هٰذَا هُوَ الْقِسْمُ الثَّانِي مِنْ قِسْمَيِ الصِّفَةِ، أَعْنِي: صِفَةَ الشَّيْءِ بِفِعْلِ مُسَبَّبِهِ، أَيْ: يُوصَفُ الشَّيْءُ بِفِعْلِ شَيْءٍ آخَرَ يَكُونُ ذٰلِكَ الشَّيْءُ ـ أَعْنِي: الشَّيْءَ الثَّانِيَ ـ حَاصِلاً بِسَبَبِ الشَّيْءِ الْأَوَّلِ، نَحْوُ: «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ مَنِيعٍ جَارُهُ، أَيْ: مَانِعٍ جَارُهُ؛ وَرَحْبٍ فِنَاؤُهُ**

---

له لەفزدا بووە بە «صِفَة» بۆ وشەی «رَجُلٍ» کەچی وشەکە لە ڕووی ماناوە پەیوەندی بە «رَجُل»ـەوە نییە، بەڵکوو پەیوەندی بە وشەی «فِناؤُهُ»وە هەیە، واتە: وشەی «رَحْبٍ» لە لەفزدا بە سیفەتی «رَجُلٍ» دادەندرێت، بەڵام لە مەعنادا بە سیفەتی «فِناؤُهُ» دادەندرێت.(**وَ**) هەروەها وەکوو «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ (**مُؤَدَّبٍ خُدّامُهُ**) واتە: من بەلای پیاوێکدا ڕۆویشتم کە خزمەتکارەکەی بەڕێز بوو، لەم نموونەیەشدا وشەی «مُؤَدَّبٍ» لە «لَفْظ»ـدا بووە بە «صِفَة» بۆ وشەی «رَجُلٍ» کەچی وشەکە لە ڕووی ماناوە پەیوەندی بە «رَجُل»ـەوە نییە، بەڵکوو پەیوەندی بە وشەی «خُدّامُهُ»وەیە هەیە، واتە: وشەی «مُؤَدَّبٍ» لە لەفزدا بووە بە سیفەتی «رَجُلٍ» بەڵام لە «مَعْنى»دا بە سیفەتی «خُدّامُهُ» دادەندرێت.

(**أَقُولُ**) مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم:(**هَذَا هُوَ الْقِسْمُ الثَّانِي مِنْ قِسْمَيِ الصِّفَة**) ئەمە بەشی دووەمە لە هەردوو بەشەکەی «صِفَة» (**أَعْنِي: صِفَةَ الشَّيْءِ بِفِعْلِ مُسَبَّبِهِ**) مەبەستم ئەوەیە ئیسمێک وەسفدار بکرێت بە کرداری خۆی نا، بەڵکوو بە کرداری شتێک کە ئەو بۆتە «مُسَبَّب»ـی (**أَيْ: يُوصَفُ الشَّيْءُ**) واتە: ئیسمێک وەسفدار بکرێت(**بِفِعْلِ شَيْءٍ آخَرَ**) بە کردەوەی شتێکی‌تر کە ئەو بۆتە «مُسَبَّب»ـی(**يَكُونُ ذَلِكَ الشَّيْءُ**) ئەم شتە پەیدا بووە(**أَعْنِي:الشَّيْءَ الثَّانِيَ**) مەبەستم شتەکەی دووەمە(**حَاصِلاً بِسَبَبِ الشَّيْءِ الأَوَّلِ**) پەیدا بووبێت بە هۆی ئیسمی یەکەمەوە(**نَحْوُ:**) وەکوو(**مَرَرْتُ بِرَجُلٍ مَنِيعٍ جَارُهُ**) من بەلای پیاوێکدا ڕۆویشتم دراوسێکە ڕێگری دەکرد لە ڕۆویشتنم(**أَيْ**) واتە: وشەی «مَنِيعٍ» بە مانای (**مَانِعٍ جَارُهُ**) دێت؛(**وَ**) هەروەها وەکوو «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ(**رَحْبٍ فِناؤُهُ**) »[1] واتە من

---

١. وشەی «فِناء» دەبێت بە «کَسْرَة»ی «فَاءْ» بخوێندرێتەوە، چونکە «فَناء» بە مانای ☜

**ـأَي: وَاسِعٍ ـ فِنَاؤُهُ، وَمُؤَدَّبٍ خُدَّامُهُ»، فَإِنَّ «الْمَنْعَ وَالْوُسْعَةَ وَالتَّأْدِيبَ» لَيْسَ شَيْءٌ مِنْهَا فِعْلاً لِـ «رَجُلٍ»؛ وَ إِنَّمَا هِيَ أَفْعَالُ «جَارُهُ وَفِنَائُهُ وَخُدَّامُهُ»، إِلَّا أَنَّ الْجَارَ وَالْفِنَاءَ وَالْخُدَّامَ لَمَّا كَانَتْ مُتَعَلِّقاً بِهِ مُضَافاً إِلَىٰ ضَمِيرِهِ، صَارَ كُلٌّ مِنَ الثَّلَاثَةِ مُسَبَّباً لَهُ؛ لِأَنَّهُ إِذَا تَعَلَّقَ شَيْءٌ بِشَيْءٍ فَالْمُتَعَلَّقُ بِهِ**

---

بەلای پیاوێکدا ڕۆویشتم کە حەوشەیان فراوان بوو، (أَيْ:) واتە: وشەی «رَحْبٍ» بە مانای (وَاسِعٍ فِنَاؤُهُ) دێت؛ (وَ) هەروەها وەکوو «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ (مُؤَدَّبٍ خُدّامُهُ) واتە: من بەلای پیاوێکدا ڕۆویشتم کە خزمەتکارەکەی بەڕێز بوو.

(فَإِنَّ الْمَنْعَ وَالْوِسْعَةَ وَالتَّأْدِيبَ) سەرنجی مانای هەر سێ ڕستەکە بدە وشەی «مَنيع» و وشەی «وِسْعَة» و وشەی «مُؤَدَّبْ» (لَيْسَ شَيْءٌ مِنْهَا فِعْلاً لِرَجُلٍ) هیچیان کار و کردەوە و سیفەتی «رَجُلْ» نین لەناو ئەم نموونانەدا لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، (وَ إِنَّمَا هِيَ أَفْعالُ) بەڵکوو لە ڕاستیدا کار و کردەوە و سیفەتی وشەیەکی‌ترن، بۆ نموونە: ڕێگرییەکە سیفەتی (جَارُهُ) جیرانی پیاوەکەیە، (وَ) هەروەها فراوانییەکە سیفەتی (فِناؤُهُ) حەوشەی پیاوەکەیە، (وَ) هەروەها ڕێزدارییەکە سیفەتی (خُدَّامُهُ) خزمەتکاری پیاوەکەیە (إِلَّا أَنَّ الْجَارَ) بەڵام وشەی جیران (وَ) هەروەها وشەی (الْفِناءَ) حەوشە (وَ) هەروەها وشەی (الْخُدَّامَ) خزمەتکار (لَمَّا كَانَ مُتَعَلِّقاً بِهِ) لە کاتێکدا کە پەیوەندییان هەیە لەگەڵ وشەی «رَجُلْ» لە ڕووی ماناوە، چونکە بەدوای ئەودا هاتوون (مُضافاً إِلَى ضَمِيرِهِ) هەروەها ئەم سێ وشەیە «إضافة» کراون بۆ لای «ضَمِير»ێک کە ڕاجیعە بۆ لای وشەی «رَجُلْ»، بۆیە (صَارَ كُلٌّ مِنَ الثَّلَاثَةِ مُسَبَّباً لَهُ) هەرسێ وشەکە بوون بە «مُسَبَّبْ» بۆ وشەی «رَجُلْ»، ئەویش بووە بە «سَبَبْ» (لِأَنَّهُ إِذَا تَعَلَّقَ شَيْءٌ بِشَيْءٍ) چونکە ئەگەر شتێک پەیوەندی بە شتێکی‌ترەوە بەست و بەیەکەوە گرێ دران (فَالْمُتَعَلَّقُ بِهِ) ئەو وشەیەی کە پەیوەندی لەگەڵ بەستراوە

---

☜ نەمان (زَوال) دێت نەک حەوشە، کە بەداخەوە چەندین ساڵە ئەم وشەیە بە هەڵە دەخوێندرێتەوە، لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبی بەم شێوەیە «فَنـاءُ الإنْسـانِ: أَيْ: زَوَالُـهُ، وَهَلاكُهُ وَأَمّا فِناءُ الدَّارِ أَوِ الْبَيْتِ فَهِيَ: سَاحَتُهُ الأَمامِيَّةُ، والجمع: أَفْنِيَةٌ». بڕوانە: مختار الصحاح: ٣٥٣، والمعجم الوسيط: ٦٢٥.

**يَكُونُ سَبَباً لِلْمُتَعَلِّقِ، وَلِذٰلِكَ لَا يُقَالُ: «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ مَنِيعٍ جَارُكَ» لِانْتِفَاءِ التَّعَلُّقِ الْحَاصِلِ بِالْإِضَافَةِ. فَلَمَّا كَانَ كَذٰلِكَ نُزِّلَ فِعْلُ الْمُتَعَلِّقِ بِمَنْزِلَةِ فِعْلِ الْمُتَعَلَّقِ بِهِ، وَجُعِلَ وَصْفاً لَهُ، فَهُوَ فِي اللَّفْظِ صِفَةُ الْمُتَعَلَّقِ بِهِ، وَفِي الْمَعْنَىٰ صِفَةٌ لِلْمُتَعَلِّقِ. وَلِذٰلِكَ وَجَبَ أَنْ يُوَافِقَ الْمَوْصُوفَ اللَّفْظِيَّ**

---

ـوەکوو وشـەی «رَجُلٌ» لەم نموونانەدا. (**يَكُونُ سَبَباً لِلْمُتَعَلِّقِ**) دەبێتە هۆکار (سَبَبٌ) بۆ ئەم وشانەی کە پەیوەندییان پێوە بەستووە ـوەکوو وشەی «مَنِيعٍ، رَحْبٍ، مُؤَدَّبٌ» لەم نموونانەدا.ـ

بـەڵام ئەگـەر ئـەم پەیوەندییـە نەبوو، ئەوکاتە وشـەکان نابن بە «مُسَبَّبٌ» (**وَلِذَلِكَ لَا يُقالُ**) بۆیـە ناگوترێت: (**مَرَرْتُ بِرَجُلٍ مَنِيعٍ جَارُكَ**) ئـەم نموونەیـە پێـی ناگوترێت «صِفَـةٌ بِحـالِ الْمَوْصُـوفِ» (**لِإنْتِفاءِ التَّعَلُّقِ**) چونکـە ئـەم پەیوەندییـە نییـە (**الْحَاصِلِ بالإِضافَةِ**) کە بەهۆی «إضافة»کردن بۆ لای «ضَمِير»ێک کە ڕاجیع بوو بۆلای وشەی «رَجُلٌ» پەیـدا دەبوو، بۆیـە لێـرەدا هیچ پەیوەندێـک نییە لـە نێوان وشـەی «رَجُلٌ» و وشەی «جَارُكَ».

(**فَلَمَّا كَانَ كَذَلِكَ**) ئینجـا لـە کاتێـک ئـەم سێ وشـەیە «إضافـة» کـران بـۆ لای «ضَمِير»ێـک کـە ڕاجیعـە بـۆ لای وشـەی «رَجُـلٌ» (**نُزِّلَ فِعْلُ الْمُتَعَلِّقِ**) کار و کـردەوە و سـیفەتی «مُتَعَلِّق» واتـە سیفەتی «جَارُهُ، فَناؤُهُ، خُدَّامُهُ» کـە بریتی بوون لە «مَنِيعٍ، رَحْـبٍ، مُـؤَدَّبٌ» گێـڕدران (**بِمَنْزِلَةِ فِعْلِ الْمُتَعَلَّقِ بِهِ**) وەکـوو کار و کـردەوە و سیفەتی «مُتَعَلَّق» واتە: سیفەتی «رَجُل»، بۆیە: (**وَجُعِلَ وَصْفاً لَهُ**) ئەم سیفەتانە «مَنِيعٍ، رَحْبٍ، مُؤَدَّبٌ» کران بە سیفەتی «رَجُل» لە نێو ڕستەکەدا.

(**فَهُوَ فِي اللَّفْظِ**) کەواتـە: ئـەم سێ وشـانە لـە ڕووی «لَفْظ»ـەوە (**صِفَةُ الْمُتَعَلَّقِ بِهِ**) سیفەتی وشـەی «رَجُل»ـن (**وَ فِي الْمَعْنَى**) هەروەهـا لـە ڕووی مانـاوە (**صِفَةُ لِلْمُتَعَلِّقِ**) سـیفەتی وشـەی «جَـارُهُ، فَنـاؤُهُ، خُدَّامُـهُ»ن، چونکـە ڕێگرییەکە سیفەتی «جَـارُهُ» جیرانی پیاوەکەیـە و فراوانییەکـە سیفەتی «فِنـاؤُهُ» حەوشـەی پیاوەکەیە و هەروەهـا ڕێزدارییەکە سیفەتی «خُدَّامُهُ» خزمەتکاری پیاوەکەیە، (**وَلِذَلِكَ وَجَبَ أَنْ يُوافِقَ الْمَوْصُوفَ اللَّفْظِيَّ**)

**وَهُوَ الْمُتَعَلَّقُ بِهِ فِي الْأَحْكَامِ اللَّفْظِيَّةِ -أَعْنِي: الْخَمْسَةَ الْأُوَلَ مِنَ الْعَشَرَةِ- وَهِيَ: الرَّفْعُ وَالنَّصْبُ وَالْجَرُّ وَالتَّنْكِيرُ وَالتَّعْرِيفُ، دُونَ الْأَحْكَامِ الْمَعْنَوِيَّةِ -أَعْنِي: الْخَمْسَةَ الْبَاقِيَةَ- فَإِنَّهُ تُوَافِقُ فِيهَا الْمَوْصُوفَ الْمَعْنَوِيَّ وَهُوَ الْمُتَعَلِّقُ، فَيُقَالُ: «جَاءَنِي رَجُلٌ حَسَنٌ غُلَامُهُ، وَرَأَيْتُ رَجُلاً حَسَناً غُلَامُهُ، وَمَرَرْتُ بِرَجُلٍ حَسَنٍ غُلَامُهُ، وَجَاءَنِي الرَّجُلُ الْحَسَنُ غُلَامُهُ، وَرَأَيْتُ الرَّجُلَ الْحَسَنَ غُلَامُهُ، وَمَرَرْتُ بِالرَّجُلِ الْحَسَنِ غُلَامُهُ»،**

---

بۆیە پێویستە ئەم سێ وشەیە لەگەڵ «مَوْصُوف»ـی «لَفْظِي» خۆیان وەکوو یەک بن **(وَهُوَ الْمُتَعَلَّقُ بِهِ)** کە بریتییە لە وشەی «رَجُل» **(فِي الأَحْكَامِ اللَّفْظِيَّةِ)** لە هەموو ئەو حوکمانەی کە پەیوەندییان هەیە بە لایەنی لەفزەوە **(أَعْنِي الْخَمْسَةَ الأُوَلَ مِنَ الْعَشْرَةِ)** مەبەستم لەو پێنج شتانەیە لە سەرەتای دە شتەکەدا باسمانکردن **(وَهِيَ: الرَّفْعُ)** کە بریتین لە «رَفْع»ـە **(وَالنَّصْبُ)** لە «نَصْب»ـە **(وَالْجَرُّ)** لە «جَرّ»ە **(وَالتَّنْكِيرُ)** لە «تَنْكِير» **(وَالتَّعْرِيفُ)** وە لە «تَعْرِيف»، واتە: دەبێت وشەی «مَنِيع، رَحْب، مُؤَدَّب» لەو پێنچ حوکمە وەکوو وشەی «رَجُل» بن لەم نموونانەدا **(دُونَ الأَحْكَامِ الْمَعْنَوِيَّةِ)** بەڵام لەو حوکمانەی کە پەیوەندییان هەیە بە لایەنی «مَعْنَى»وە هەیە **(أَعْنِي الْخَمْسَةَ الْبَاقِيَةَ)** مەبەستەم لەو پێنج شتانەیە کە لە کۆتایی دە شتەکاندا باسمانکردن کە بریتین لە «إِفْراد» و لە «تَثْنِيَة» و لە «جَمْع» و لە «تَذْكِير» و لە «تَأْنِيث» **(فَإِنَّهُ تُوافِقُ فِيهَا الْمَوْصُوفَ الْمَعْنَوِيَّ)** لەم پێنج شتانەدا پێویستە ئەم سێ وشانە «مَنِيع، رَحْب، مُؤَدَّب» لەگەڵ مەوسووفی «مَعْنَوِي» خۆیان وەکوو یەک بن **(وَهُوَ الْمُتَعَلِّقُ)** کە پێی دەگوترێت «مُتَعَلِّق» و بریتییە لە وشەی «جَارُهُ، فِنَاؤُهُ، خُدَّامُهُ».

**(فَيُقَالُ:)** کەواتە: دەگوترێت: **(جَاءَنِي رَجُلٌ حَسَنٌ غُلامُهُ)** لە حاڵەتی ڕەفعەدا **(وَ)** هەروەها **(رَأَيْتُ رَجُلاً حَسَناً غُلامُهُ)** لە حاڵەتی «نصب»ـەدا **(وَ)** هەروەها **(مَرَرْتُ بِرَجُلٍ حَسَنٍ غُلامُهُ)** لە حاڵەتی جەڕڕەدا، سەرنج بدە: وشەی «حَسَن» لەم نموونانەدا لە «لَفْظ»ـدا سیفەتی وشەی «رَجُل»ـە بەڵام لە «مَعْنَى»دا سیفەتی وشەی «غُلامُه»وە **(وَ)** هەروەها دەگوترێت: **(جَاءَنِي الرَّجُلُ الْحَسَنُ غُلامُهُ)** لە حاڵەتی ڕەفعەدا **(وَ)** هەروەها **(رَأَيْتُ الرَّجُلَ الْحَسَنَ غُلامُهُ)** لە حاڵەتی نەسبەدا **(وَ)** هەروەها **(مَرَرْتُ بِالرَّجُلِ الْحَسَنِ غُلامُهُ)** لە حاڵەتی جەڕڕەدا، سەرنج بدە: وشەی «اَلْحَسَن» لەم نموونانەدا لە «لَفْظ»ـدا

**فَيُوَافِقُ الْوَصْفُ ـأَعْنِي: «حَسَناً» وَ «الْحَسَنَ»ـ الْمَوْصُوفَ اللَّفْظِيَّ ـأَعْنِي: «رَجُلاً» وَ «الرَّجُلَ»ـ فِي الْإِعْرَابِ الثَّلَاثَةِ وَالتَّعْرِيفِ وَالتَّنْكِيرِ؛ وَلَا يُوَافِقُهُ فِي الْإِفْرَادِ وَالتَّثْنِيَةِ وَالْجَمْعِ وَالتَّذْكِيرِ وَالتَّأْنِيث، بَلْ يُعْتَبَرُ حُكْمُهُ فِي ذٰلِكَ بِالْقِيَاسِ إِلَىٰ مَا بَعْدَهُ، فَيَكُونُ حُكْمُهُ كَحُكْمِ الْفِعْلِ مَعَ فَاعِلِهِ؛ لِأَنَّ مَا بَعْدَهُ فَاعِلُهُ، فَإِنْ كَانَ مَا بَعْدَهُ مُقْتَضِياً لِلْإِفْرَادِ وَالتَّثْنِيَةِ**

---

سیفەتی وشەی «الرَّجُل»ـە بەڵام لە «مَعْنَى»دا سیفەتی وشەی «غُلامُهُ»یە، **(فَيُوافِقُ الْوَصْفُ)** کەواتە: سەرنج بدە: لەم نموونانەدا سیفەتەکە وەکوو یەک «مُطابِق» دەبێت **(أَعْنِي)** مەبەستم بە سیفەتەکە وشەی **(حَسَناً، وَ)** هەروەها وشەی **(اَلْحَسَنَ)**ـە لەگەڵ **(الْمَوْصُوفَ اللَّفْظِيَّ)** ئەو وشەی لە لەفزدا بوونەتە سیفەتی **(أَعْنِي (رَجُلاً)** مەبەستم بە مەوسووفەکە وشەی «رَجُلاً» **(وَ)** هەروەها وشەی **(الرَّجُلَ)**، لە چیدا «مَوْصُوف»ـەکە وەکوو سیفەتەکە دەبێت؟ **(فِي الإِعْرابِ الثَّلاثَةِ)** لە هەر سێ ئیعرابەکە واتە: لە ڕەفعە و نەسبە و لە جەڕەدا وەکوو یەک وان **(وَالتَّعْرِيفِ)** هەروەها لە «تَعْرِيف» **(وَالتَّنْكِيرِ)** وە لە «تَنْكِير»یشدا وەکوو یەک وان.

**(وَلا يُوافِقُهُ)** بەڵام سەرنج بدە سیفەتەکە لەگەڵ مەوسووفەکەی وەکوو یەک نین **(فِي الإِفْرادِ)** لە «إِفْراد» **(وَالتَّثْنِيَةِ)** لە «تَثْنِيَة» **(وَالْجَمْعِ)** لە «جَمْع» **(وَالتَّذْكِيرِ)** لە «تَذْكِير» **(وَالتَّأْنِيث)** وە لە «تَأْنِيثْ»ـدا **(بَلْ يُعْتَبَرُ حُكْمُهُ فِي ذَلِكَ)** بەڵکوو لەم پێنج شتەدا حوکمەکەی **(بِالْقِياسِ إِلَى مَا بَعْدَهُ)** بە وشەی دوای خۆی دیاری دەکرێت، واتە: لەم پێنج شتەدا حوکمی وەکوو حوکمی وشەی دوای خۆی دەبێت **(فَيَكُونُ حُكْمُهُ)** کەواتە حوکمی ئەو سیفەتە لەگەڵ مەوسووفە مەعنەوییەکەی لە هەموو ڕوویەکەوە **(كَحُكْمِ الْفِعْلِ مَعَ فَاعِلِهِ)** وەکوو حوکمی فیعل وایە لەگەڵ فاعیلەکەی **(لأَنَّ مَا بَعْدَهُ فَاعِلٌ)** چونکە ئەو وشەیەی لەدوای سیفەتەکە دێت، یا دەبێت بە «فاعل» وەکوو «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ مَنِيعٍ جَارُهُ» یاخود دەبێتە «نائِبُ الْفَاعِل» وەکوو «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ مُؤَدَّبٍ خُدَّامُهُ». **(فَإِنْ كَانَ مَا بَعْدَهُ)** کەواتە: ئەگەر ئەو وشەی لەدوای سیفەتەکە هاتووە **(مُقْتَضِياً لِلإِفْرادِ)** ئەگەر پێویستی پێ بوو وشەکە «مُفْرَد» بێت **(وَالتَّثْنِيَةِ)**

**وَالْجَمْعِ وَالتَّذْكِيرِ وَالتَّأْنِيث فُعِلَ بِهِ ذٰلِكَ، نَحْوُ: «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ حَسَنَةٍ جَارِيَتُهُ»، وَ «مَرَرْتُ بِرَجُلَيْنِ حَسَنَةٍ جَارِيَتُهُمَا»، وَ «مَرَرْتُ بِرِجَالٍ حَسَنَةٍ جَارِيَتُهُمْ»، مَثَلاً، كَمَا سَيَجِيءُ تَحْقِيقُهُ إِنْ شَاءَ اللّٰهُ تَعَالَى.**

---

هەروەها ئەگەر پێویستی پێ بوو وشەکە «تَثْنِيَة» بێت **(وَالْجَمْعِ)** هەروەها ئەگەر پێویستی پێ بوو وشەکە «جَمْع» بێت **(وَالتَّذْكِيرِ)** هەروەها ئەگەر پێویستی پێ بوو وشەکە «مُذَكَّر» بێت **(وَالتَّأْنِيث)** هەروەها ئەگەر پێویستی پێ بوو وشەکە «مُؤَنَّث» بێت **(فُعِلَ بِهِ ذَلِكَ)** ئەوە وشەکە بەگوێرەی پێویستی ڕستەکە گۆڕانکاری بەسەردا دێت **(نَحْوُ)** وەکوو ئەم نموونەیەی کە دەڵێت: **(مَرَرْتُ بِرَجُلٍ حَسَنَةٍ جَارِيَتُهُ)** واتە: بەلای پیاوێکدا ڕۆویشتم کە کەنیزەکەی جوان و قەشەنگ بوو، **سەرنج بدە:** وشەی «حَسَنَةٍ» لەگەڵ «مَوْصُوف»ـە «مَعْنَوِي»ـیەکەی ـکە وشەی «جَارِيَتُهُ»وەـ وەکوو یەک وان و هەردووکیان «مُؤَنَّث»ـن.

**(وَ)** هەروەها وەکوو **(مَرَرْتُ بِرَجُلَيْنِ حَسَنَةٍ جَارِيَتُهُمَا)** واتە: بەلای دوو پیاودا ڕۆویشتم کە کەنیزەکەیان جوان و قەشەنگ بوون، **سەرنج بدە:** وشەی «حَسَنَةٍ» لەگەڵ مەوسووفە مەعنەوییەکەی ـکە وشەی «جَارِيَتُهُما»یەـ وەکوو حوکمی «فِعْل» وایە لەگەڵ فاعیلەکەی واتە: چۆن «فِعْل» ئەگەر پاڵ (إسناد) بدرێت بۆ لای دوو یاخود کۆمەڵێک کەس، سیغەکەی هەر «مُفْرَدْ» دەبێت، لێرەشدا حوکمی سیفەتەکە بە هەمان شێوەیە.

**(وَ)** هەروەها وەکوو **(مَرَرْتُ بِرِجالٍ حَسَنَةٍ جَارِيَتُهُمْ)** **سەرنج بدە:** وشەی «حَسَنَةٍ» لەگەڵ مەوسووفە مەعنەوییەکەی ـکە وشەی «جَارِيَتُهُمْ»ـەـ وەکوو حوکمی «فِعْل» وایە لەگەڵ فاعیلەکەی، واتە: چۆن «فِعْل» ئەگەر پاڵ (إِسْناد) بدرێت بۆ لای دوو یاخود کۆمەڵێک کەس، سیغەکەی هەر «مُفْرَدْ» دەبێت، لێرەشدا حوکمی سیفەتەکە بە هەمان شێوەیە **(كَمَا سَيَجِيءُ تَحْقِيقُهُ)** هەروەکوو لەمەودوا ئەم بابەتە بە وردیی ڕوون دەکەینەوە **(إِنْ شَاءَ اللّٰهُ تَعالَى)** بە پشتیوانی خوای پەروەردگار و مەزن.

ئینجا **سەرنج بدە:** پاش ئەوەی کە زانیت کە «الصِّفَة بِحَالِ الْمَوْصُوفِ» لەو پێنج

شتەدا (ڕەفعە و نەسبە و جەڕڕە و تەعریف و تەنکیر ) وەکوو وشەی پێش خۆی دەبێت، بەڵام لە «إِفْراد» و «تَثْـنِيَة» و «جَمْع» و «تَذْكِير» و «تَأْنِيثْ»ـدا بەگوێرەی وشەی دوای خۆی دەبێت، سەیری ئەم نمونانە بکە:

**یەکەم:** «مَـرَرْتُ بِرَجُـل جَمِيلَـةٍ أُخْتُـهُ» یاخود «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ حَسَنَةٍ أُمُّهُ» **سەرنج بدە:** لەم دوو نموونەیەدا وشەی «جَمِيلَةٍ، حَسَنَةٍ» هەردووکیان لە لەفزدا سیفەتی وشەی «رَجُلٍ»ـن و لە جەڕڕە و تەنکیردا وەکوو ئەون، بەڵام لە «إِفْراد» و «تَأْنِيث»ـدا بەگوێرەی وشەی دوای خۆیانن.

دووەم: «مَرَرْتُ بِرَجُلَيْنِ ضَارِبٍ أَبُوهُما» و «مَرَرْتُ بِرَجُلَيْنِ قَاتِلٍ أَخُوهُمَا» **سەرنج بدە:** لەم دوو نموونەیەدا وشەی «ضَارِبٍ، قَاتِلٍ» هەردوکیان لە لەفزدا سیفەتی وشەی «رَجُلَيْن»ـن و لە جەڕڕە و تەنکیردا وەکوو ئەون، بەڵام لە «إِفْراد» و «تَذْكِير»دا بەگوێرەی وشەی دوای خۆیانن.

سێیەم: «سَلَّمْتُ عَلَى اِمْرَأَةٍ نَاصِرٍ أَبُوهَا» یاخود «تَكَلَّمْتُ مَعَ فَتاةٍ غَاضِبٍ أَخُوهَا» **سەرنج بدە:** لەم دوو نموونەیەدا وشەی «نَاصِرٍ، غَاضِبٍ» هەردووکیان لە لەفزدا بوونە «صِفَة» بۆ وشەی «اِمْرَأَةٍ، فَتاةٍ» و لە جەڕڕە و تەنکیردا وەکوو ئەون، بەڵام لە «إِفْراد» و «تَذْكِير»دا بەگوێرەی وشەی دوای خۆیەتی.

* ◌ *

# الْبَدَلُ

**قَالَ: وَالْبَدَلُ وَهُوَ عَلَىٰ أَرْبَعَةِ أَضْرُبٍ: بَدَلِ الْكُلِّ مِنَ الْكُلِّ، نَحْوُ: «رَأَيْتُ زَيْداً أَخَاكَ»، وَبَدَلِ الْبَعْضِ مِنَ الْكُلِّ، نَحْوُ: «ضَرَبْتُ زَيْداً رَأْسَهُ»، وَبَدَلِ الِاشْتِمَالِ، نَحْوُ: «سُلِبَ زَيْدٌ ثَوْبُهُ». وَبَدَلِ الْغَلَطِ، نَحْوُ: «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ حِمَارٍ».**

---

## وانەی شەستوشەشەم: باسی «بَدَل» و جۆرەکانی

**(قالَ:)** مامۆستا «جار اللّه» دەفەرموێت: **(وَالْبَدَلُ)** بەشی سێیەم لەو بەشانەی کە تابیعی موعرەبن بریتییە لە «بَدَلْ»؛ ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: **(وَهُوَ عَلَى أَرْبَعَةِ أَضْرُبٍ)** «بَدَلْ» چوار جۆری هەیە: **جۆری یەکەم** پێی دەگوترێت **(بَدَلِ الْكُلِّ مِنَ الْكُلِ)** واتە: ئیسمێک دەبێتە «بَدَلْ» لەبری تەواوی ئیسمێکیتر **(نَحْوُ)** وەکوو **(رَأَيْتُ زَيْداً أَخَاكَ)**، سەرنج بدە: وشەی «أَخاكَ» لەم نموونەیەدا بووە بە «بَدَل الْكُلّ» لەبری وشەی «زَیداً»؛ **(وَ) جۆری دووەم** پێی دەگوترێت **(بَدَلِ الْبَعْضِ مِنَ الْكُلِ)** واتە: ئیسمێک دەبێتە «بَدَلْ» لەبری بەشێکی ئیسمێکیتر **(نَحْوُ)** وەکوو **(ضَرَبْتُ زَيْداً رَأْسَهُ)**، سەرنج بدە: وشەی «رَأْسَهُ» لەم نموونەیەدا بووە بە «بَدَلُ الْبَعْضِ مِنَ الْكُلِّ» لەبری وشەی «رَأْسَهُ» چونکە وشەی «رَأْس» بەشێکە لە زەید. **(وَ) جۆری سێیەم** پێی دەگوترێت **(بَدَلُ الإِشْتِمالِ)** واتە: ئیسمێک دەبێتە «بَدَلْ» لەبری بەشێکی ئیسمێکیتر کە شموولی هەموو «مُبْدَلُ مِنْهُ» دەکات **(نَحْوُ)** وەکوو **(سُلِبَ زَيْدٌ ثَوْبُهُ)**، سەرنج بدە: وشەی «ثَوْبُهُ» لەم نموونەیەدا بووە بە «بَدَلُ الإِشْتِمال» لەبری وشەی «زید» چونکە وشەی «ثَوْبُهُ» شموولی هەموو لاشەی زەید دەکات. **(وَ) جۆری چوارەم** پێی دەگوترێت **(وَبَدَلُ الْغَلَطِ)** واتە: ئیسمێک بە هەڵە دەبێتە «بَدَلْ» لەبری بەشێکی ئیسمێکیتر **(نَحْوُ)** وەکوو **(مَرَرْتُ بِرَجُلٍ حِمارٍ)**، سەرنج بدە: وشەی «حِمارٍ» لەم نموونەیەدا بووە بە «بَدَلُ الْغَلَط» لەبری وشەی «رَجُلْ».

**أَقُولُ: الثَّالِثُ مِنَ التَّوَابِعِ الْبَدَلُ، وَهُوَ عَلَىٰ أَرْبَعَةِ أَضْرُبٍ: لِأَنَّهُ إِنْ كَانَ الْبَدَلُ كُلَّ الْمُبْدَلِ مِنْهُ فَبَدَلُ الْكُلِّ مِنَ الْكُلِّ، نَحْوُ: «رَأَيْتُ زَيْداً أَخَاكَ»، فَإِنَّ «الْأَخَ» كُلُّ «زَيْدٍ»؛ وَ إِلَّا فَإِنْ كَانَ بَعْضَهُ فَبَدَلُ الْبَعْضِ مِنَ الْكُلِّ، نَحْوُ: «ضَرَبْتُ زَيْداً رَأْسَهُ»، فَإِنَّ «الرَّأْسَ» بَعْضُ «زَيْدٍ»؛ وَ إِلَّا**

---

**(أَقُولُ)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(الثَّالِثُ مِنَ التَّوابِعِ)** بەشی سێیەم لەو بەشانەی کە تابیعی موعرەبن **(الْبَدَلُ)** بریتییە لە «بَدَلْ»؛ ئینجا مامۆستا دەفەرموێت: **(وَهُوَ عَلَى أَرْبَعَةِ أَضْرُبٍ)** «بَدَلْ» چوار جۆری هەیە:

**جۆری یەکەم:** پێی دەگوترێت «بَدَلِ الْكُلِّ مِنَ الْكُل»، **(لأَنَّهُ إِنْ كَانَ الْبَدَلُ كُلَّ الْمُبْدَلِ مِنْهُ)**[1] چونکە ئەگەر ئەو ئیسمەی دەبێتە «بَدَلْ» تەواوی «مُبْدَلُ مِنْهُ»ی دەگرتەوە، **(فَ)** ئەو کاتە پێی دەگوترێت: **(بَدَلُ الْكُلِّ مِنَ الْكُلِّ)** چونکە ئیسمێک دەبێتە «بَدَلْ» لەبری تەواوی ئیسمێکی‌تر **(نَحْوُ)** وەکوو **(رَأَيْتُ زَيْداً أَخَاكَ)** سەرنج بدە: **(فَإِنَّ الأَخَ)** وشەی «أَخاكَ» لەم نموونەیەدا **(كُلُّ زَيْدٍ)** پێی دەگوترێت «بَدَل الْكُلّ» چونکە تەواوی وشەی «زَيْد» دەگرێتەوە.

**جۆری دووەم:** پێی دەگوترێت «بَدَلُ الْبَعْضِ مِنَ الْكُلِّ» **(وَ إِلَّا)** بەڵام ئەگەر ئەو ئیسمەی دەبوو بە «بَدَلْ» تەواوی «مُبْدَلُ مِنْهُ»ی نەدەگرتەوە، ئەو کاتە تەماشا دەکەین: **(فَإِنْ كَانَ بَعْضَهُ)** ئەگەر تەنها بەشێکی «مُبْدَلُ مِنْهُ»ی دەگرتەوە، **(فَ)** ئەو کاتە پێی دەگوترێت **(بَدَلُ الْبَعْضِ مِنَ الْكُلِّ)** چونکە ئیسمێک دەبێتە «بَدَلْ» لەبری بەشێکی ئیسمێکی‌تر **(نَحْوُ)** وەکوو **(ضَرَبْتُ زَيْداً رَأْسَهُ)** سەرنج بدە: **(فَإِنَّ الرَّأْسَ)** وشەی «رَأْس» لەم نموونەیەدا **(بَعْضُ زَيْدٍ)** پێی دەگوترێت «بَدَل الْبَعْضِ» چونکە وشەی سەر بەشێک لە لاشەی «زَيْد» دەگرێتەوە.

**جۆری سێیەم:** پێی دەگوترێت «بَدَلُ الاشتِمالِ» **(وَ إِلَّا)** بەڵام ئەگەر ئەو ئیسمەی دەبوو بە «بَدَلْ» تەواوی «مُبْدَلُ مِنْهُ»ی نەدەگرتەوە، هەروەها بەشێکی «مُبْدَلُ

---

[1] هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ﴾ سەرنج بدە: ئایەتی دووەم بە «بَدَلُ الْكُلِّ مِنَ الْكُلِّ» هەژمار دەکرێت لەبری ئایەتی یەکەم. بڕوانە: شرح التصریح: ١٩٢/٢.

**فَإِنْ كَانَ مُشْتَمِلاً عَلَيْهِ فَبَدَلُ الِاشْتِمَالِ، نَحْوُ: «سُلِبَ زَيْدٌ ثَوْبُهُ»، فَإِنَّ «الثَّوْبَ» مُشْتَمِلٌ عَلَىٰ «زَيْدٍ»؛ وَإِلَّا فَبَدَلُ الْغَلَطِ، نَحْوُ: «مَرَرْتُ بِرَجُلٍ حِمَارٍ»، وَيُسَمَّىٰ بَدَلَ الْغَلَطِ، لِوُقُوعِ الْغَلَطِ فِي مُبْدَلِهِ؛ فَإِنَّ الْقَائِلَ**

مِنْهُ»شی نەدەگرتەوە، ئەوکاتەش تەماشا دەکەین: **(فَإِنْ كَانَ مُشْتَمِلاً عَلَيْهِ)** ئەگەر هاتوو ئەو ئیسمەی دەبوو بە «بَدَلْ» شموولی دەهات بۆ سەر تەواوی «مُبْدَلُ مِنْهُ»ی، **(فَـ)** ئەو کاتە پێی دەگوترێت: **(بَدَلُ الإِشْتِمالِ)**[1] چونکە وشەی «بَدَلْ» شموولی هەموو «مُبْدَلُ مِنْهُ» دەکات **(نَحْوُ)** وەکوو **(سُلِبَ زَيْدٌ ثَوْبُهُ)** **سەرنج بدە: (فَإِنَّ الثَّوْبَ)** وشەی «ثَوْب» لەم نموونەیەدا **(مُشْتَمِلٌ عَلَى زَيْدٍ)** پێی دەگوترێت «بَدَلُ الاشتِمالِ» چونکە هەموو لاشەی «زَيْد» دەگرێتەوە.

**جۆری چوارەم:** پێی دەگوترێت «بَدَلُ الْغَلَطِ» **(وَ إِلَّا)** بەڵام ئەگەر ئەم ئیسمەی دەبوو بە «بَدَلْ» تەواوی «مُبْدَلُ مِنْهُ»ی نەدەگرتەوە، هەروەها بەشێکی «مُبْدَلُ مِنْهُ»شی نەدەگرتەوە، هەروەها شموولیشی نەدەهات بۆ سەر تەواوی «مُبْدَلُ مِنْهُ»ی، **(فَـ)** ئەو کاتە پێی دەگوترێت: **(بَدَلُ الْغَلَطِ، نَحْوُ)** وەکوو **(مَرَرْتُ بِرَجُلٍ حِمارٍ)** **سەرنج بدە:** وشەی «حِمارٍ» لەم نموونەیەدا پێی دەگوترێت: «بَدَلُ الْغَلَطِ» چونکە هیچ موناسەبەیەکی نییە لەگەڵ وشەی زەید.

**(وَيُسَمَّى بَدَلَ الْغَلَطِ)** بۆیە پێی دەگوترێت «بَدَلُ الْغَلَطِ»: **(لِوُقُوعِ الْغَلَطِ فِي مُبْدَلِهِ)** چونکە هەڵەکە لە وشەی «مُبْدَل»ـەکە ڕووی داوە **(فَإِنَّ الْقَائِلَ)** چونکە ئەو کەسەی

---

١. هێندێک لە زانایان لە پێناسەی «بَدَلُ الإِشْتِمالِ» دەفەرموون: «هُوَ الَّذِي بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْمُبْدَلِ مِنْهُ مُلابَسَةٌ بِغَيْرِ الْكُلِّيَّةِ وَالْبَعْضِيَّةِ» هەروەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ﴾ **سەرنج بدە:** وشەی «قِتالٍ فِيهِ» بە «بَدَلُ الإِشْتِمالِ» هەژمار دەکرێت لەبری وشەی «الشَّهْرِ الْحَرامِ»، چونکە جەنگ و شەڕکردن شموولی هەموو مانگەکان دەکات؛ یاخود هەروەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُتِلَ أَصْحَٰبُ ٱلْأُخْدُودِ ۝ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلْوَقُودِ﴾ **سەرنج بدە:** وشەی «النَّارِ» بە «بَدَلُ الإِشْتِمالِ» هەژمار، دەکرێت لەبری وشەی «الأُخْدُودِ» چونکە وشەی «الأُخْدُودِ» شموولی دێتە سەر ئاگر و سووتاندن. بڕوانە: شرح المفصل: ٢/٢٥٨، الفوائد والقواعد: ٣٧١، وشرح التصريح: ٢/١٩٢، ومعاني النحو: ٣/١٧٧، والنحو الوافي: ٣/ ٣٤٤، وشرح كافية ابن الحاجب الكوردي:٢/٣٣٠.

**إِنَّمَا أَرَادَ أَنْ يَقُولَ: «مَرَرْتُ بِحِمَارٍ»، فَغَلِطَ فَقَالَ: «بِرَجُلٍ»، ثُمَّ اسْتَدْرَكَ فَقَالَ: «بِحِمَارٍ»، فَهُوَ بَدَلٌ مِمَّا فِيهِ الْغَلَطُ.**

**وَفَائِدَةُ الْبَدَلِ: رَفْعُ اللَّبْسِ، فَإِنَّكَ إِذَا قُلْتَ: «ضَرَبْتُ زَيْداً» مَثَلاً، يَحْتَمِلُ أَنْ ضَرَبْتَ رَأْسَهُ أَوْ غَيْرَ رَأْسِهِ، وَ إِذَا ذَكَرْتَ «رَأْسَهُ»، رَفَعْتَ اللَّبْسَ.**

**وَتَحْقِيقُهُ: أَنْ يُذْكَرَ اسْمٌ أَوَّلاً، ثُمَّ يُذْكَرَ اسْمٌ آخَرُ،**

قسەی کردووە (إِنَّمَا أَرادَ أَنْ يَقُولَ) لە ڕاستیدا مەبەستی ئەوە بووە کە تەنها بڵێت: (مَرَرْتُ بِحِمارٍ) واتە: من بە لای گوێدرێژێکدا تێپەڕیم، (فَغَلِطَ فَقَالَ:) بەڵام کابرا هەڵەی کرد و گوتی: «مَرَرْتُ (بِرَجُلٍ)» واتە: من بە لای پیاوێکدا تێپەڕیم (ثُمَّ اِسْتَدْرَكَ فَقالَ:) پاشان پەلەی کرد و گوتی (بِحِمارٍ) بەلای گوێدرێژێک (فَهُوَ بَدَلٌ مِمَّا فِيهِ الْغَلَطُ) کەواتە: وشەی «بِحِمارٍ» لە ڕستەکەدا بووە بە «بَدَلٌ» لەبری ئەو وشەی کە هەڵەی تێدا کراوە، بۆیە بەشێک لە زانایان هیچ ئیعتیبارێکی بۆ دانانێن و بە بەشێک لە «بَدَلٌ» هەژماری ناکەن، هەر بۆیەش لە قورئانی پیرۆز ئەم جۆرە «بَدَل»ـە نەهاتووە، [1] هەروەها لە هۆنراوەی ڕەوانبێژانی زانستی «بَلاغَة»ش کەم «وَارِدٌ» بووە.

## سوود و قازانجی «بَدَلٌ»

(وَفَائِدَةُ الْبَدَلِ) سوود و قازانجی «بَدَلٌ» لە نێو ڕستەدا (رَفْعُ اللَّبْسِ) بریتییە لە لابردنی گومان و نەهێشتنی ناڕوونی (فَإِنَّكَ إِذَا قُلْتَ) چونکە ئەگەر تۆ گوتت: (ضَرَبْتُ زَيْداً) من لە زەیدم دا (مَثَلاً) بە نموونە (يَحْتَمِلُ) ئەگەری هەیە (أَنْ ضَرَبْتَ رَأْسَهُ) کە تۆ لە سەری زەیدت دابێت (أَوْ غَيْرَ رَأْسِهِ) یاخود لە ئەندامێکیترت دابێت، بەڵام (وَ إِذَا ذَكَرْتَ رَأْسَهُ) ئەگەر وشەی «رَأْسَهُ»ت باس کرد ـکە بەدەلەـ (رَفَعْتَ اللَّبْسَ) ئەوە گومان و ناڕوونی لە ڕستەکەدا نامێنێت.

(وَتَحْقِيقُهُ:) حەقیقەتی «بَدَلٌ» بریتییە لەوەی (أَنْ يُذْكَرَ اِسْمٌ أَوَّلاً) کە سەرەتا ئیسمێک باس بکرێت (ثُمَّ يُذْكَرَ اِسْمٌ آخَرُ) پاشان لەدوای ئەو ئیسمێکیتریش باس

١. بڕوانە: شرح المفصل: ٢٥٨/٢، والكامل في اللغة والأدب: ٢٧/٢.

**وَيُجْعَلَ الْأَوَّلُ فِي حُكْمِ السَّاقِطِ لِيَحْصُلَ بَيَانٌ مَا لَا يَحْصُلُ بِدُونِ ذٰلِكَ.**

**وَيَجِبُ أَنْ يَكُونَ فِي بَدَلِ الْبَعْضِ وَالِاشْتِمَالِ ضَمِيرٌ يَرْجِعُ إِلَى الْمُبْدَلِ مِنْهُ لِيَرْتَبِطَا مَعاً كَمَا عَرَفْتَ فِي الْمِثَالِ.**

---

بكرێت، (**وَيُجْعَلَ الأَوَّلُ فِي حُكْمِ السَّاقِطِ**) ئینجا لە ڕووی ماناوە ئیسمی یەکەم وەکوو ئەوە وایە کە باس نەکرابێت (**لِيَحْصُلَ بَيانٌ**) بۆ ئەوەی ڕوونکردنەوەیەک لەناو ڕستەدا دروست بێت (**مَا لَا يَحْصُلُ بِدونِ ذَلِكَ**) کە بەبێ هاتنی «بَدَلْ» ئەم جۆرە ڕوونکردنەوەیە دروست نابێت.

ئینجا مامۆستا دێتە سەر بابەتێکی‌تر و دەفەرموێت: (**وَيَجِبُ أَنْ يَكُونَ فِي بَدَلِ الْبَعْضِ**) پێویستە بۆ ئەو ئیسمەی کە دەبێتە «بَدَلْ» لە «بَدَلُ الْبَعْض» و (**وَالاِشْتِمالِ**) هەروەها لە «بَدَلُ الاِشْتِمال» (**ضَمِيرٌ**) کە «ضَمِير»ێکی تێدا بێت (**يَرْجِعُ إِلَى الْمُبْدَلِ مِنْهُ**) کە بەدەلەکە بگێڕێتەوە بۆ لای «مُبْدَلُ مِنْهُ» (**لِيَرْتَبِطَا مَعاً**) بۆ ئەوەی ڕستەی «بَدَلْ» و «مُبْدَلُ مِنْهُ» لەگەڵ یەکتر پەیوەندییان هەبێت (**كَمَا عَرَفْتَ فِي الْمِثالِ**) هەروەکوو لە نموونەکانی ڕابوردوو ئاماژەمان پێ‌کرد، نموونەی «بَدَلُ الْبَعْض» وەکوو «ضَرَبْتُ زَيْداً رَأْسَهُ» نموونەی «بَدَلُ الاِشْتِمال» وەکوو «سُلِبَ زَيْدٌ ثَوْبُهُ».

بەڵام، لە «بَدَلُ الْكُلِّ مِنَ الْكُلِّ» پێویست ناکات کە «ضَمِير»ێکی تێدا بێت بیگێڕێتەوە بۆ لای «مُبْدَلُ مِنْهُ»، چونکە لە «بَدَلُ الْكُلِّ» هەردوو وشەی «بَدَلْ» و «مُبْدَلُ مِنْهُ» بە یەک شت حیساب دەکرێن، بە پێچەوانەی جۆرەکانی‌تر، چونکە لەوێدا «بَدَلْ» و «مُبْدَلُ مِنْهُ» بە یەک شت حیساب ناکرێن، بۆیە پێویستە کە «ضَمِير»ێکی تێدا بێت بیگێڕیتەوە بۆ لای «مُبْدَلُ مِنْهُ».

* ◌ *

**قَالَ: وَتُبْدَلُ النَّكِرَةُ مِنَ الْمَعْرِفَةِ، وَعَلَى الْعَكْسِ. وَيُشْتَرَطُ فِي النَّكِرَةِ الْمُبْدَلَةِ مِنَ الْمَعْرِفَةِ أَنْ تَكُونَ مَوْصُوفَةً.**

**أَقُولُ: يَجُوزُ أَنْ تُبْدَلَ النَّكِرَةُ مِنَ الْمَعْرِفَةِ، وَالْمَعْرِفَةُ مِنَ النَّكِرَةِ. فَالْبَدَلُ وَالْمُبْدَلُ مِنْهُ إِذاً يَكُونَانِ عَلَى أَرْبَعَةِ أَقْسَامٍ: لِأَنَّهُمَا [١] إِمَّا أَنْ يَكُونَا مَعْرِفَتَيْنِ، نَحْوُ: «رَأَيْتُ زَيْداً أَخَاكَ»؛ [٢] أَوْ نَكِرَتَيْنِ، نَحْوُ: «رَأَيْتُ رَجُلاً أَخاً لَكَ»؛**

## وانه ی شه‌ستوحه‌وته‌م: باسی «أَحْكَامُ الْبَدَل»

(قالَ:) مامۆستا «جار الله» ده‌فه‌رموێت: **(وَتُبْدَلُ النَّكِرَةُ مِنَ الْمَعْرِفَةِ)** دروسته ئیسمێکی «نَكِرَة» ببێته «بَدَل» له‌بری ئیسمێکی «مَعْرِفَة» **(وَعَلَى الْعَكْسِ)** وه هه‌روه‌ها دروسته ئیسمێکی «مَعْرِفَة» ببێته «بَدَل» له‌بری ئیسمێکی «نكِرَة» **(وَيُشْتَرَطُ فِي النَّكِرَةِ الْمُبْدَلَةِ مِنَ الْمَعْرِفَةِ)** به‌لام به مه‌رج گیراوه ئه‌گه‌ر ئیسمێکی «نَكِرَة» ببێ به «بَدَل» له‌بری ئیسمێکی «مَعْرِفَة» **(أَنْ تَكُونَ مَوْصُوفَةً)** که ئیسمه نه‌کیره‌که وه‌سفدار بکرێت بۆ ئه‌وه‌ی نزیک بێته‌وه له «مَعْرِفَة».

**(أَقُولُ)** مامۆستا «عبدالغني» ئه‌رده‌بیلی ده‌فه‌رموێت: منیش ده‌ڵێم: **(يَجُوزُ أَنْ تُبْدَلَ النَّكِرَةُ مِنَ الْمَعْرِفَةِ)** دروسته ئیسمێکی «نَكِرَة» ببێته «بَدَل» له‌بری ئیسمێکی «مَعْرِفَة» **(وَالْمَعْرِفَةُ مِنَ النَّكِرَةِ)** وه هه‌روه‌ها دروسته ئیسمێکی «مَعْرِفَة» ببێته «بَدَل» له‌بری ئیسمێکی «نَكِرَة» **(فَالْبَدَلُ وَالْمُبْدَلُ مِنْهُ إِذاً)** که‌واته: «بَدَل» و «مُبْدَلُ مِنْهُ» **(يَكُونانِ عَلَى أَرْبَعَةِ أَقْسامٍ:)** ده‌بن به چوار به‌شی سه‌ره‌کی، له‌به‌ر چی؟

به‌شی یه‌که‌م: **(لأَنَّهُمَا إِمَّا أَنْ يَكُونَا مَعْرِفَتَيْنِ)** چونکه «بَدَل» و «مُبْدَلُ مِنْهُ» یا هه‌ردووکیان ئیسمێکی مه‌عریفه‌نه **(نَحْوُ:)** وه‌کوو **(رَأَيْتُ زَيْداً أَخاكَ)**، سه‌رنج بده: له‌م نموونه‌یه‌دا وشه‌ی «أَخَاكَ» بووه به «بَدَلْ» له‌بری وشه‌ی «زَيْداً»، هه‌روه‌ها هه‌ردووکیشیان «مَعْرِفَة»نه.

به‌شی دووه‌م: **(أَوْ نَكِرَتَيْنِ،)** یاخود «بَدَل» و «مُبْدَلُ مِنْهُ» هه‌ردووکیان ئیسمێکی نه‌کیره‌نه **(نَحْوُ:)** وه‌کوو **(رَأَيْتُ رَجُلاً أَخاً لَكَ)**، سه‌رنج بده: له‌م نموونه‌یه‌دا وشه‌ی

**[٣] أَوْ يَكُونَ الْبَدَلُ مَعْرِفَةً، وَالْمُبْدَلُ مِنْهُ نَكِرَةً، نَحْوُ: «رَأَيْتُ رَجُلاً أَخَاكَ»؛ [٤] أَوْ عَلَى الْعَكْسِ، نَحْوُ قَوْلِهِ تَعَالَىٰ:** ﴿لَنَسْفَعًا بِٱلنَّاصِيَةِ ۝١٥ نَاصِيَةٍ كَٰذِبَةٍ﴾.

**وَيُشْتَرَطُ فِي هٰذَا الْقِسْمِ -أَعْنِي: فِي النَّكِرَةِ الْمُبْدَلَةِ مِنَ الْمَعْرِفَةِ- أَنْ تَكُونَ مَوْصُوفَةً، مِثْلُ: «نَاصِيَةٍ»، فَإِنَّهَا وُصِفَتْ «بِكَاذِبَةٍ»؛ وَذٰلِكَ لِأَنَّ الْأَصْلَ فِي الْكَلَامِ هُوَ الْبَدَلُ،**

---

«أَخاً لَكَ» بووە بە «بَدَلْ» لەبری وشەی «زَيْداً» هەردووکیشیان نەکیرەنە.

**بەشی سێیەم: (أَوْ يَكُونَ الْبَدَلُ مَعْرِفَةً)** یاخود «بَدَل» ئیسمێکی مەعریفەیە **(وَالْمُبْدَلُ مِنْهُ نَكِرَةً)** بەڵام «مُبْدَلُ مِنهُ» ئیسمێکی نەکیرەیە **(نَحْوُ:)** وەکوو **(رَأَيْتُ رَجُلاً أَخَاكَ)** **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «أَخَاكَ» بووە بە «بَدَلْ» ـکە ئیسمێکی «مَعْرِفَة»یە- لەبری وشەی «رَجُلاً» ـکە ئیسمێکی «نَكِرَة»یە-.

**بەشی چوارەم: (أَوْ عَلَى الْعَكْسِ)** یاخود «بَدَل» ئیسمێکی نەکیرەیە بەڵام «مُبْدَلُ مِنهُ» ئیسمێکی مەعریفەیە **(نَحْوُ:)** وەکوو (﴿لَنَسْفَعًا بِٱلنَّاصِيَةِ ۝١٥ نَاصِيَةٍ كَٰذِبَةٍ﴾)[1]، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ» بووە بە «بَدَلْ» ـکە ئیسمێکی نەکیرەیە- لەبری وشەی «بِالنَّاصِيَةِ» ـکە ئیسمێکی مەعریفەیە- **(وَيُشْتَرَطُ فِي هَذَا الْقِسْمِ)** بەڵام بە مەرج گیراوە لەم بەشەدا **(أَعْنِي: فِي النَّكِرَةِ الْمَبْدَلَةِ مِنَ الْمَعْرِفَةِ)** مەبەستم ئەوەیە ئەگەر ئیسمێکی «نَكِرَة» ببێتە «بَدَل» لەبری ئیسمێکی «مَعْرِفَة» **(أَنْ تَكُونَ مَوْصُوفَةً)** کە ئیسمە نەکیرەکە وەسفدار بکرێت بۆ ئەوەی نزیک بێتەوە لە مەعریفە **(مِثْلُ)** وەکوو وشەی **(نَاصِيَةٍ، فَإِنَّهَا وُصِفَتْ بِكَاذِبَةٍ)** ئەوا ئێستە ئەم وشەیە وەسفدار کراوە بە وشەی «كَاذِبَةٍ».

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: بۆچی دەبێت ئیسمە نەکیرەکە وەسفدار بکرێت؟ مامۆستا دەفەرموێت: **(وَذَلِكَ)** هۆکارەکەی ئەوەیە: **(لأَنَّ الأَصْلَ فِي الْكَلامِ هُوَ الْبَدَلُ)** چونکە ئەو وشەیەی کە ئیعتیباری بۆ دەکرێت و ئەسڵە لە نێو ڕستەکەدا بریتییە لە «بَدَلْ»، چونکە «مُبْدَل مِنْهُ» لە حوکمی نەبوون و «سُقُوط»ـدایە

---

١. سوره العلق: لآیە: ١٥-١٦.

**فَلَوْ كَانَ نَكِرَةً غَيْرَ مَوْصُوفَةٍ، وَالْمُبْدَلُ مِنْهُ مَعْرِفَةً لَكَانَ لِلْفَرْعِ مَزِيَّةٌ عَلَى الْأَصْلِ.**

**وَيُبْدَلُ أَيْضاً الظَّاهِرُ مِنَ الضَّمِيرِ وَعَلَى الْعَكْسِ، فَيَحْصُلُ بِحَسَبِ ذٰلِكَ أَرْبَعَةُ أَقْسَامٍ أُخَرَ؛ وَأَنَا أَذْكُرُ أَمْثِلَةَ بَدَلِ الْكُلِّ مِنَ الْكُلِّ كَمَا فِي أَقْسَامِ الْمَعْرِفَةِ وَالنَّكِرَةِ. فَعَلَيْكَ بِاسْتِخْرَاجِ أَمْثِلَةِ سَائِرِ الْأَبْدَالِ. فَالظَّاهِرُ مِنَ الظَّاهِرِ قَدْ عَرَفْتَ، وَالضَّمِيرُ مِنَ الضَّمِيرِ، نَحْوُ: «زَيْدٌ ضَرَبْتُهُ إِيَّاهُ»، وَالظَّاهِرُ مِنَ الضَّمِيرِ، نَحْوُ: «زَيْدٌ ضَرَبْتُهُ أَخَاكَ»،**

---

**(فَلَوْ كَانَ نَكِرَةً)** کەواتە ئەگەر بێت و بەدەڵ ئیسمێکی نەکیرە بێت و **(غَيْرَ مَوْصُوفَةٍ)** وەسفدار نەکرێت، لە کاتێکدا **(وَالْمُبْدَلُ مِنْهُ مَعْرِفَةً)** ئەو وشەیەی کە بووە بە «مُبْدَل مِنْهُ» ئیسمێکی مەعریفە بێت **(لَكَانَ لِلْفَرْعِ مَزِيَّةٌ عَلَى الأَصْلِ)** ئەو کاتە فەرعەکە ـ کە «مُبْدَل مِنْهُ»وە ـ خسووسیەتی زیاتر دەبێت لە ئەسڵەکە ـ کە «بَدَل»ـە ـ.

**(وَيُبْدَلُ أَيْضاً الظَّاهِرُ مِنَ الضَّمِيرِ)** هەروەها دووبارە، دروستە ئیسمێکی «ظَاهِرْ» ببێت بە «بَدَل» لەبری ئیسمێکی «مُضْمَرْ» **(وَعَلَى الْعَكْسِ)** وە هەروەها دروستە ئیسمێکی «مُضْمَرْ» ببێتە «بَدَل» لەبری ئیسمێکی «ظَاهِر» **(فَيَحْصُلُ بِحَسَبِ ذَلِكَ أَرْبَعَةُ أَقْسامٍ أُخَرُ)** کەواتە: بەم پێیە بێت چوار بەشیتریش دروست دەبن:

**بەشی یەکەم: (فَالظَّاهِرُ مِنَ الظَّاهِرِ)** نموونەی ئەوەی کە ئیسمێکی «ظَاهِرْ» ببێتە «بَدَل» لەبری ئیسمێکی «ظاهِر» **(قَدْ عَرَفْتَ)** لە پێشدا باسمانکرد وەکوو «رَأَيْتُ زَيْداً أَخاكَ».

**بەشی دووەم: (وَالضَّمِيرُ مِنَ الضَّمِيرِ)** نموونەی ئەوەی کە ئیسمێکی «ضَمِير» ببێتە «بَدَل» لەبری ئیسمێکی «ضَمِير» **(نَحْوُ)** وەکوو **(زَيْدٌ ضَرَبْتُهُ إِيَّاهُ)**، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «إِيَّاهُ» ـ کە «ضَمِير»ێکی «مُنْفَصِل»ـە ـ بووە بە «بَدَلْ» لەبری وشەی «هاء» ـ کە «ضَمِير»ێکی «مُتَّصِل»ـە ـ.

**بەشی سێیەم: (وَالظَّاهِرُ مِنَ الضَّمِيرِ)** نموونەی ئەوەی کە ئیسمێکی «ظَاهِرْ» ببێتە «بَدَل» لەبری ئیسمێکی «ضَمِير» **(نَحْوُ)** وەکوو **(زَيْدٌ ضَرَبْتُهُ أَخاكَ)**، **سەرنج**

**وَعَكْسُهُ، نَحْوُ: «ضَرَبْتُ زَيْداً إِيَّاهُ».**

**بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «أَخَاكَ» ـکە ئیسمێکی «ظَاهِر»ە‌ـ بووە بە «بَدَلْ» لەبری وشەی «هاء» ـکە «ضَمِير»ێکی «مُتَّصِل»ـە‌ـ.

**بەشی چوارەم: (وَعَكْسُهُ)** نموونەی ئەوەی کە ئیسمێکی «ضَمِیر» ببێتە «بَدَل» لەبری ئیسمێکی «ظَاهِرْ» **(نَحْوُ)** وەکوو **(ضَرَبْتُ زَيْداً إِيَّاهُ)**، **سەرنج بدە:** لەم نموونەیەدا وشەی «إِيَّاهُ» ـکە «ضَمِير»ێکی «مُنْفَصِل»ـە‌ـ بووە بە «بَدَلْ» لەبری وشەی «زَيْد» ـکە ئیسمێکی «ظَاهِر»ە‌ـ.

**ئاگاداری: یەکەم:** بەشێک لە زانایانی «نَحْوُ» پێیان وایە دروست نییە کە ئیسمێکی «ضَمِیر» ببێتە «بَدَل» لەبری ئیسمێکی «ظَاهِرْ»، چونکە دەڵێن: شتی ئاوا نە لە شیعر و نە لە پەخشاندا نەهاتووە، ئەمە بۆچوونی «ابن مالك» و چەند زانایەکیترە، **دووەم:** هەروەها دەڵێن دروست نییە ئیسمێکی «ضَمِیر» ببێتە «بَدَل» لەبری «ضمير»ێکیتر، ئەگەر هاتبێتیش، «ضَمِير»ی دووەم دەبێتە «تَأْكِيدْ» نەوەکوو «بَدَلْ»، ئەمە ڕا و بۆچونی زانایانی بەسری و کووفی لەسەرە[1].

* ◌ *

---

١. بڕوانە: شرح المفصل: ٢٦٨/٢، وشرح جمل الزجاجي: ٢٥٩/١، والفوائد والقواعد: ٣٧٦، وشرح كافية ابن الحاجب الكوردي: ٤٠٠/٢.

# عَطْفُ الْبَيَانِ

**قَالَ: وَعَطْفُ الْبَيَانِ، وَهُوَ أَنْ تُتْبِعَ الْمَذْكُورَ بِأَشْهَرِ اِسْمَيْهِ، نَحْوُ: «جَاءَنِي أَخُوكَ زَيْدٌ، وَأَبُو عَبْدِ اللهِ زَيْدٌ».**

**أَقُولُ: الرَّابِعُ مِنَ التَّوَابِعِ عَطْفُ الْبَيَانِ؛ وَهُوَ أَنْ تُتْبِعَ الْمَذْكُورَ بِأَشْهَرِ اسْمَيْهِ، أَيْ: تَجْعَلَ أَشْهَرَ اسْمَيْهِ تَابِعاً لَهُ،**

---

## وانەی شەستوهەشتەم: باسی «عَطْفُ الْبَيَانِ»

**(قالَ:)** مامۆستا «جار الله» دەفەرموێت: **(وَعَطْفُ الْبَيَانِ)** بەشی چوارەم لەو بەشانەی کە تابیعی موعرەبن بریتییە لە «عَطْفُ الْبَيان»؛ ئینجا مامۆستا پێناسەی دەکات و دەفەرموێت: **(وَهُوَ)** «عَطْفُ الْبَيانْ» بریتییە لەوەی کە وشەیەک یاخود شتێک دوو ناوی هەبن، ئینجا **(أَنْ تُتْبِعَ الْمَذْكُورَ بِأَشْهَرِ اِسْمَيْهِ)** کامە ناو لە نێو خەڵکیدا دیارتر و مەشهوورترە بیکەیتە «تَابِعْ» بۆ ناوی یەکەم و لەدوای ئەو باسی بکەیت **(نَحْوُ)** وەکوو **(جَاءَنِي أَخُوكَ زَيْدٌ)** سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «زَيْدٌ» پێی دەگوترێت «عَطْفُ الْبَيانْ»، چونکە ئەو لە وشەی «أَخُوكَ» دیارتر و مەشهوورترە لە نێو خەڵکیدا، هەروەها ئیعرابی هەردووکیشیان وەکوو یەک وایە؛ **(وَ)** هەروەها وەکوو «جَاءَنِي **(أَبُو عَبْدِاللهِ زَيْدٌ)**» **سەرنج بدە: لەم نموونەیەشدا** وشەی «زَيْدٌ» پێی دەگوترێت: «عَطْفُ الْبَيانْ» چونکە ئەو لە وشەی «أَبُوعَبْدُاللهِ» دیارتر و مەشهوورترە، هەروەها ئیعرابی هەردووکیشیان وەکوو یەک وایە.

**(أَقُولُ)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(الرَّابِعُ مِنَ التَّوابِعِ عَطْفُ الْبَيانِ)** بەشی چوارەم لەو بەشانەی کە تابیعی موعرەبن بریتییە لە «عَطْفُ الْبَيانِ»؛ ئینجا مامۆستا پێناسەی دەکات و دەفەرموێت: **(وَهُوَ)** «عَطْفُ الْبَيانْ» بریتییە لەوەی کە وشەیەک یاخود شتێک دوو ناوی هەبن، ئینجا **(أَنْ تُتْبِعَ الْمَذْكُورَ بِأَشْهَرِ اِسْمَيْهِ)** کامە ناو لە نێو خەڵکیدا دیارتر و مەشهوورترە بیکەیتە «تَابِعْ» بۆ ناوی یەکەم و لەدوای ئەو باسی بکەیت **(أَيْ:)** واتە: **(تَجْعَلَ أَشْهَرَ اِسْمَيْهِ تَابِعاً لَهُ)**

**بِأَنْ تَذْكُرَهُ بَعْدَهُ، نَحْوُ: «جَاءَنِي أَخُوكَ زَيْدٌ، وَأَبُو عَبْدِ اللَّهِ زَيْدٌ»، فَإِنَّ الْجَائِيَ هَذَا كَمَا يُقَالُ لَهُ: «الْأَخُ» وَ «أَبُو عَبْدِ اللَّهِ»، يُقَالُ لَهُ أَيْضاً: «زَيْدٌ»، فَإِنْ كَانَ «زَيْدٌ» أَشْهَرَ اسْمَيْهِ عِنْدَ النَّاسِ مِنَ «الْأَخِ» وَ «أَبِي عَبْدِ اللَّهِ» تَذْكُرُ ثَانِياً بَيَاناً لِلْأَوَّلِ؛ وَ إِنْ كَانَ بِالْعَكْسِ فَبِالْعَكْسِ، نَحْوُ: «جَاءَنِي زَيْدٌ أَخُوكَ**

---

کامە ناو لە نێو خەڵکیدا دیارتر و مەشهوورترە بیکەیتە «تَابِعْ» بۆ ناوەی یەکەم (**بِأَنْ تَذْكُرَهُ بَعْدَهُ**) بە شێوەیەک کە لەدوای ئەو باسی بکەیت (**نَحْوُ**) وەکوو (**جَاءَنِي أَخُوكَ زَيْدٌ**) سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «زَيْدٌ» پێی دەگوترێت «عَطْفُ الْبَيانْ» چونکە ئەو لە وشەی «أَخُوكَ» دیارتر و مەشهوورترە لە نێو خەڵکیدا، هەروەها ئیعرابی هەردووکیشیان وەکوو یەک وایە.

(**وَ**) هەروەها وەکوو (**جَاءَنِي أَبُو عَبْدِاللَّهِ زَيْدٌ**)، سەرنج بدە: لەم نموونەیەشدا وشەی «زَيْدٌ» پێی دەگوترێت: «عَطْفُ الْبَيانْ» چونکە ئەو لە وشەی (**أَبُو عَبْدِاللَّهِ**) دیارتر و مەشهوورترە، هەروەها ئیعرابی هەردووکیشیان وەکوو یەک وایە، (**لِأَنَّ الْجَائِيَ هَذا**) چونکە ئەو کەسەی کە هاتووە (**كَمَا يُقَالُ لَهُ الأَخُ وَ أَبُو عَبْدِاللَّهِ**) هەر وەکوو چۆن پێی دەگوترێت: «أَخُوكَ» و «أَبُوعَبْدُاللَّهِ» (**يُقَالُ لَهُ أَيْضاً زَيْدٌ**) بە هەمان شێوەش پێی دەگوترێت زەید، بەڵام چونکە وشەی «زَيْدٌ» لەناو خەڵکیدا مەشهوورترە بۆیە ئەو بووە بە «عَطْفُ الْبَيانِ» (**فَإِنْ كَانَ زَيْدٌ**) بەڵام ئەگەر بێت و وشەی «زَيْد» (**أَشْهَرَ اِسَمَيْهِ عِنْدَ النَّاسِ**) دیارترو مەشهوورتر بێت لە نێو خەڵکیدا (**مِنَ الأَخِ وَأَبِي عَبْدِاللَّهِ**) لە وشەی «أَخ» و «أَبُوعَبْدِاللَّهِ» (**تَذْكُرُهُ ثَانِياً**) ئەوە لەدوای وشەی یەکەم باسی دەکەی (**بَياناً لِلأَوَّلِ**) تا ببێتە «عَطْفُ الْبَيانْ» بۆ ئیسمی یەکەم، (**وَ إِنْ كَانَ بِالْعَكْسِ**) بەڵام ئەگەر وشەی «أَخ» و وشەی «أَبُوعَبْدِاللَّهِ» دیارترو مەشهوورتر بوون لە وشەی «زَيْد» (**فَبِالْعَكْسِ**) ئەوە حوکمەکەش بە پێچەوانەیە، (**نَحْوُ**) وەکوو (**جَاءَنِي زَيْدٌ أَخُوكَ**) سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «أَخُوكَ» پێی دەگوترێت «عَطْفُ الْبَيانْ»، چونکە لە نێو خەڵکیدا ئەو لە وشەی «زَيْد» دیارتر و مەشهوورترە، هەروەها ئیعرابی هەردووکیشیان وەکوو یەک وایە.

**وَأَبُو عَبْدِ اللَّهِ». وَهٰذَا مَذْهَبُ الْمُصَنِّفِ، وَالْآخَرُونَ لَا يُفَرِّقُونَ بَيْنَ أَنْ يُذْكَرَ الْأَشْهَرُ أَوَّلاً أَوْ آخِراً.**

**وَفَائِدَةُ عَطْفِ الْبَيَانِ: إِيضَاحُ الْمَتْبُوعِ.**

---

**(وَ)** هەروەها وەکوو «جَاءَنِي زَيْدٌ **(أَبُو عَبْدِاللَّهِ)**» **سەرنج بدە: لەم نموونەیەشدا** وشەی «أَبُو عَبْدِاللَّهِ» پێی دەگوترێت «عَطْفُ الْبَيانِ»، چونکە لەناو کۆمەڵگەدا ئەو لە وشەی «زَيْد» دیارتر و مەشهوورترە، هەروەها ئیعرابی هەردووکیشیان وەکوو یەک وایە. **(وَهَذا مَذْهَبُ الْمَصَنِّفِ)** ئەمەی کە باسمانکرد ـ کە کام ئیسم لە نێو خەڵکیدا دیارتر و مەشهوورترە ئەو لە پلەی دووەم باس دەکرێت و دەبێتە «عَطْفُ الْبَيانْ»ـ ئەمە بیروبۆچوونی مامۆستا «جار اللّٰه» زەمەخشەری و هێندێک لە زانایانیترە وەکوو شێخی جورجانی [1]، **(وَالأَخَرُونُ)** بەڵام بەشێکیتر لە زانایان **(لاَ يُفَرِّقُونُ)** جیاوازی ناکەن **(بَيْنَ أَنْ يُذْكَرَ الأَشْهَرُ أَوَّلاً أَوْ أَخِيراً)** لە نێوان ئەوەی کە کامە ئیسم لە نێو خەڵکیدا دیارتر و مەشهوورترە ئەو لە پلەی یەکەم یاخود لە پلەی دووەم باس بکرێت بۆ ئەوەی ببێتە «عَطْفُ الْبَيانْ»، بەڵکوو دەفەرموون: ئەوەی دووەم دەبێتە «عَطْفُ الْبَيانْ» و تەواو.

## سوود و قازانجی «عَطف البَيَان»

**(وَفَائِدَةُ عَطْفِ الْبَيانِ)** سوود و قازانجی ئەو وشەیەی کە دەبێتە «عَطْفُ الْبَيانْ» بریتییە لە **(إِيضاحُ الْمَتْبُوعِ)** ڕوونکردنەوەی ئەو ئیسمەی کە یەکەم جار باس کراوە، «جَاءَنِي أَخُوكَ» چونکە ئەگەر تۆ بە کەسێک بڵێیت: برای تۆ هاتە لای من، ڕەنگە زۆر ڕۆشن و دیار نەبێت، چونکە ڕەنگە کابرا چەند برایەکی هەبێت، بەڵام ئەگەر گوتت «زَيْدٌ» ئەو کاتە هیچ گومان و ناڕوونییەک لە لای کابرا نامێنێت.

◦ ◦

---

١. بڕوانە: شرحالتصريح: ٢/ ١٤٩.

.......................................................................................................

## جیاوازی نێوان «بَدَلْ» و «عَطْفُ الْبَيانِ»

**یەکەم:** واجبە کە «بَـدَلْ» لەگەڵ «مُبْدَلُ مِنْهُ» وەکوو یەک بن لـە «تَعْرِيف» و لە «تَنْكِير»دا بەڵام لە «عَطْفُ الْبَيان»ـدا واجب نییە هەردوو ئیسمەکان ـ واتە: «تَابِعْ» و «مَتْبُوعْ»ـ وەکوو یەک بن.

**دووەم:** بە هیچ شێوەیەک دروست نییە ئەو ئیسمەی دەبێتە «عَطْفُ الْبَيانْ» ڕاناو (ضَمِيرْ) بێت، بەڵام دروستە «ضَمِيرْ» هەم ببێتە «بَدَلْ» هەم ببێتە «مُبْدَلُ مِنْهُ».

**سێیەم:** بـە هیچ شـێوەیەک دروسـت نییە ئەو ئیسـمەی دەبێتـە «عَطْفُ الْبَيانْ» ڕستە (جُمْلَة) بێت، بەڵام دروستە «جُمْلَةَ» هەم ببێتە «بَدَلْ» هەم ببێتە «مُبْدَلُ مِنْهُ».

**چوارەم:** بـە هیچ شـێوەیەک دروسـت نییـە ئەو ئیسـمەی دەبێتە «عَطْفُ الْبَيانْ» نە «فِعْل» بێت نە «تَابِعُ الْفِعْل»، بەڵام دروسـتە «فِعْل» هەم ببێتە «بَدَلْ» هەم ببێتە «مُبْدَلُ مِنْهُ».

**پێنجەم:** بـە هیچ شـێوەیەک دروسـت نییە ئەو ئیسـمەی دەبێتە «عَطْفُ الْبَيانْ» بـە تەنهـا خۆی ئامانـج و مەبەسـت بێت لە نیسـبەت و ئیسـنادی ڕستەکەدا، بەڵام لە «بَدَلْ» تەنها ئەو وشەیەی دەبێتە «بَدَلْ» بە تەنها خۆی ئامانج و مەبەستە لە نیسبەت و ئیسـنادی ڕسـتەکەدا، چونکە «مُبْدَلُ مِنْهُ» وەکوو ئەوە وایە کە هەر باسـی نەکرابێت (فِي حُكْمِ السُّقُوطِ)[1].

* ◌ *

---

١- بڕوانە: شـرح المفصل: ٢٧٤/٢، معانی النحو: ١٨٥/٣، وشـرح التسـهيل: ٣/ ٢٠٢، والفوائد والقواعد: ٣٧٦.

# عَطْفُ النَّسَقِ

**قَالَ: وَالْعَطْفُ بِالْحُرُوفِ، نَحْوُ: «جَاءَنِي زَيْدٌ وَعَمْرٌو». وَحُرُوفُ الْعَطْفِ تُذْكَرُ فِي بَابِ الْحُرُوفِ إِنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَىٰ.**

**أَقُولُ: الْخَامِسُ مِنَ التَّوَابِعِ الْعَطْفُ بِالْحُرُوفِ، وَيُقَالُ لَهُ: النَّسَقُ، نَحْوُ: «جَاءَنِي زَيْدٌ وَعَمْرٌو»؛ فَـ «عَمْرٌو» مَعْطُوفٌ وَ «زَيْدٌ» مَعْطُوفٌ عَلَيْهِ.**

## وانەی شەست‌ونۆهەم: باسی «العَطْفُ بِالْحُروفِ»

**(قالَ:)** مامۆستا «جار الله» دەفەرموێت: **(وَالْعَطْفُ بِالْحُرُوفِ)** بەشی پێنجەم: لەو بەشانەی کە تابیعی موعرەبن بریتییە لە «الْعَطْفُ بِالْحُرُوفِ»، **(نَحْوُ)** وەکوو ئەم نموونەیە: **(جَاءَنِي زَيْدٌ وَعَمْرٌو)**، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «عَمْرٌو» بە هۆی یەکێک لە حەرفەکان «عَطْف» کراوەتەوە سەر وشەی «زَيْدٌ». **(وَحُرُوفُ الْعَطْفِ)** حەرفەکانی «عَطْف» **(تُذْكَرُ فِي بَابِ الْحَرْفِ)** لە بابی سێیەمی ئەم کتێبە باسیان دەکرێت **(إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى)** بە پشتیوانی خوای پەروەردگار بە درێژی ڕوونیان دەکەینەوە.

**(أَقُولُ)** مامۆستا «عبدالغني» ئەردەبیلی دەفەرموێت: منیش دەڵێم: **(اَلْخَامِسُ مِنَ التَّوابِعِ)** بەشی پێنجەم: لەو بەشانەی کە تابیعی موعرەبن بریتییە لە **(اَلْعَطْفُ بِالْحُرُوفِ)** کە ئەمە زاراوەی زانایانی ئەهلی «بَصْرَة»یە، **(وَ)** هەروەها **(يُقالُ لَهُ)** ئەم بابەتە پێی دەگوترێت: **(عَطْفُ النَّسَقِ)** ئەمەش زاراوەی زانایانی ئەهلی «كُوفَة»یە [1] **(نَحْوُ)** وەکوو ئەم نموونەیە: **(جَاءَنِي زَيْدٌ وَعَمْرٌو)**، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا **(فَعَمْرٌو مَعْطُوفٌ، وَ زَيْدٌ مَعْطُوفٌ عَلَيْهِ)** وشەی «عَمْرٌو» پێی دەگوترێت «مَعْطُوف»، بە هۆی یەکێك لە حەرفەکان «عَطْف» کراوەتەوە سەر وشەی «زَيْدٌ»، بۆیە وشەی

---

١. بڕوانە: شرح المفصل: ٢٧٤/٢، معاني النحو: ١٨٥/٣، وشرح التسهيل: ٣/ ٢٠٢، والفوائد والقواعد: ٣٧٦.

**وَحُرُوفُ الْعَطْفِ تُذْكَرُ فِي بَابِ الْحُرُوفِ إِنْ شَاءَ اللّٰهُ تَعَالَىٰ.**

❋ ❋ ❋

«زَيْدٌ» پێی دەگوترێت «مَعْطُوفٌ عَلَيْه» **(وَحُرُوفُ الْعَطْفِ تُذْكَرُ فِي بَابِ الْحُرُوفِ)** حەرفەکانی «عَطْف» لە بابی سێیەمی ئەم کتێبە باسیان دەکرێت **(إِنْ شَاءَ اللّٰهُ تَعَالَى)** پشتیوان بە خوای پەروەردگار.

## جیاوازی نێوان «عَطْفُ الْبَيانِ» و «الْعَطْفُ بِالْحُروفِ»

ئینجا ئەگەر کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: جیاوازی چییە لە نێوان «عَطْفُ الْبَيانِ» و «الْعَطْفُ بِالْحُروفِ»؟ لە وەڵامدا دەڵێین: لە «عَطْفُ الْبَيان»ـدا وشەی «مَعْطُوفُ» و وشەی «مَعْطُوفُ عَلَيْهِ» هەردووکیان یەک شتن و هیچ جیاوازییەکیان نییە، وەکوو «جَاءَنِي أَبُو عَبْدِاللّٰهِ زَيْدٌ»، سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «زَيْدٌ» پێی دەگوترێت: «عَطْفُ الْبَيانْ» لەگەڵ وشەی «أَبُو عَبْدِاللّٰهِ» هەردووکیان یەک شتن بەبێ جیاوازی و بە یەک کەس دەگوترێن، بۆیە پێویستی بە هیچ حەرفێک نییە کە بکەوێتە نێوانیان.

بەڵام لە «الْعَطْفُ بِالْحُروف»ـدا وشەی «مَعْطُوف» و وشەی «مَعْطُوفُ عَلَيْهِ» بە یەک شت حیساب نین، بەڵکوو دوو ئیسم یاخود دوو شتی لە یەکتری جیاوازن، وەکوو «جَاءَنِي زَيْدٌ وَ بَكْرٌ» سەرنج بدە: لەم نموونەیەدا وشەی «زَيْدٌ» پێی دەگوترێت: «مَعْطُوفُ عَلَيْهِ» لەگەڵ وشەی «زَيْدٌ» هەردووکیان بە یەک کەس ناگوترێن، بگرە بە دوو کەس دەگوترێن، لەگەڵ یەکتری جیاوازن، بۆیە پێویستی بە حەرفێک هەیە کە بکەوێتە نێوانیان.[1]

° °

١. بڕوانە: شرح الأنموذج في النحو: تصحيح وتعليق الشيخ سيد مسلم بن السيد عبدالقادر القشمي: ل، ١٧٣.


توابع المُعْرب
التوكيد
الصفة
البدل
عطف البيان
العطف بالحروف
بدل الكل
بدل البعض
بدل الإشتمال
بدل الغلط
الصفة بحال الموصوف
الصفة بحال المتعلق
اللفظى
المعنوى

* ◌ *

## لە کۆتاییدا

مامۆستایانی بەڕێز و خوێنەرانی سەنگین، لای بەڕێزتان ئاشکرایە کە جگە لە قورئانی پیرۆز هیچ نووسراوێکی‌تر بێ‌عەیب و کەم‌وکورتی نییە، بۆیە هیوادارم لە هەر شوێنێک هەڵەیەکتان بەرچاو کەوت بە گەورەیی خۆتان چاکی بکەن و ئاگادارم بکەنەوە، هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی مامۆستا «عبد الرحیم البیسانی (٥٠٢ ٥٩٦هـ)» بێت کە دەفەرموێت: «**إنّي رَأَيْتُ أَنَهُ لا يَكْتُبُ أَحَدٌ كتاباً في يَوْمِهِ إلّا قال في غَدِهِ: لَوْ غُيِّرُ هذا لكان أَحْسَن، ولو زِيدَ هذا لَكانَ يُسْتَحْسَنُ، وَلَوْ قُدِّمَ هذا لَكانَ أَفْضَلَ وَلَوْ تُرِكَ هذا لَكانَ أَجْمَلَ، وهذا مِنْ أَعْظَمِ الْعِبَرِ، وهذا دَليلٌ عَلى اِستِيلاءِ النَّقْصِ عَلى جُمْلَةِ الْبَشَرِ**»[1].

دەپاڕێمەوە لە خوای پەروەردگار لەبەر خاتری ناوە جوانەکانی و سیفاتە بەرزەکانی بە گەورەیی خۆی لە هەڵە و کەم‌وکورتییەکانم ببورێت و لە گوناهی خۆم و دایک و باوکی بەڕێزم و تەواوی خۆشەویستانم خۆش بێت، داواکارم ئەم کتێبەشم لێ قەبووڵ بکات کە جگە لە ڕەزامەندی خوای پەروەردگار و خزمەتی قورئانی پیرۆز و فەرمایشتەکانی سەروەرمان، هیچ نیازێکی‌ترم نەبووە و نییە.

**«وصلّى اللّٰه على سيّدنا محمّد وعلى آله وصحبه وسلّم»**

* ◌ *

**قەزای خەلیفان / سۆران ـ هەولێر ـ کوردستان**

**١٦/ ذو القعده ١٤٤٤ی کۆچی**

**١٥/ جۆزەردان ٢٧٢٣ی کوردی**

**٥/ جولای ٢٠٢٢ی زایینی**

---

١. بڕوانە: كشف الظّنون عن أسامي الكتب والفنون: حاجي خليفة، دار الفكر، بيروت- لبنان، طبعة جديدة ومنقحة ، ١٤٢٧هـ ٢٠٠٧ م

# دانراوەکانی نووسەر

١. شەرحی ئیستیعارەی عەللامە مەلا ئەبووبەکری میر ڕۆستەمی (چاپ کراوە)

٢. شەرحی «أنموذج»ی عەللامە «جار الله الزّمخشري» (چاپ کراوە)

٣. شەرحی کتێبی «الإظهار»ی پێشەوا بورکەوی (لە قۆناغی پیتچنیدایە)

٤. «الملا عبدالله الهرتلي و جهوده العلميّة» (بەم زووانە دەکەوێتە بەر دیدی خوێنەران)

# سەرچاوەكان


١. أساس البلاغة: جارالله أبو القاسم محمود بن عمر الزمخشري، دار صادر بيروت ـ لبنان، (١٤٣٠ـ ٢٠٠٩م)

٢. الإنصاف في مسائل الخلاف: كمال الدين أبو بركات الأنباري، بيروت ـ لبنان ـ (١٤٢٨هـ ـ ٢٠٠٧م)

٣. التحفة السنية بشرح مقدمة الآجرومية: محمد محيي الدين عبدالحميد، مكتبة الشرق ـ بغداد

٤. جامع الدروس العربية: الشيخ مصطفى الغلاييني: دار الفكر ـ بيروت ـ لبنان الطبعة الأولى: (١٤٢٦هـ ـ ٢٠٠٦م)

٥. الجمل في النحو: الخليل بن أحمد الفراهيدي: دار الجيل ـ بيروت ـ لبنان الطبعة الخامسة، ١٩٩٥م.

٦حاشية الصبان على شرح الأشموني على ألفية ابن مالك، المكتبة العصرية ـ بيروت ـ لبنان، الطبعة الأولى ١٤٢٥هـ ٢٠٠٤م.

٧.شرح ابن عقيل على ألفية ابن مالك: دار الطلائع ـ القاهرة ١٤٢٥هـ ـ ٢٠٠٤م.

٨. شرح التسهيل: جمال الدين محمد بن عبدالله ابن مالك، دار الكتب العلمية ـ بيروت ت لبنان الطبعة الثانية ٢٠٠٩.

٩.شرح التصريح على التوضيح الشيخ خالد بن عبد الأزهري، دار الكتب العلمية ـ بيروت ـ لبنان الطبعة الثانية ١٤٢٧هـ ٢٠٠٦م.

١٠. شرح جمل الزجاجي: ابن عصفور، دار الكتب العلمية ـ بيروت ـ لبنان الطبعة الأولى ١٤١٩هـ ١٩٩٨م.

١١. شرح كافية ابن الحاجب: رضي الدين محمد بن الحسين ، دار الكتب العلمية ـ بيروت ـ لبنان الطبعة الثانية ١٤٢٨هـ ٢٠٠٧م.

١٢. روح المعاني في تفسير القرآن العظيم والسبع المثاني: محمود الآلوسي، دار إحياء التراث العربي ـ بيروت ـ لبنان.

١٣. الزمخشري: أحمد محمد الحوفي، الهيئة المصرية العامة للكتاب، الطبعة الثانية.

١٤. سير أعلام النبلاء: محمد بن أحمد الذهبي، مؤسسة الرسالة ـ بيروت، ١٩٨٨م.

١٥. شرح المفصل للزمخشري: موفق الدين أبو البقاء يعيش بن علي، دار الكتب العلمية ـ بيروت ـ لبنان.

١٦. شرح شذور الذهب في معرفة كلام العرب: جمال الدين ابن هشام الأنصاري، دار الكتب العلمية ـ بيروت ـ لبنان.

١٧. وفاة الوفيات: محمد بن شاكر الكتبي، دار الصادر ـ بيروت ـ لبنان.

١٨. الكامل في اللغة والأدب: محمد بن يزيد المبرد، مؤسسة المعارف بيروت ـ لبنان.

١٩. الكتاب: عمرو بن عثمان بن قنبر الملقب بسيبويه، الطبعة الأولى، دار الكتب العلمية ـ بيروت ـ لبنان.

٢٠. الكشاف عن حقائق غوامض التنزيل و عيون الأقاويل في وجوه التأويل: الامام أبو القاسم جاراللّٰه محمود بن عمرو بن محمد الزمخشري، الطبعة الرابعة: دار الكتب العلمية ـ بيروت ـ لبنان.

٢١. كشف الظنون عن أسامي الكتب والفنون: مصطفى بن عبداللّٰه القسطنطيني، الطبعة الأولى، دار الكتب العلمية ـ بيروت ـ لبنان.

٢٢. الكناش في فني النحو والصرف: الملك المؤيد عماد الدين أبو الفداء اسماعيل بن الأفضل، المكتبة العصرية ـ صيدا ـ بيروت ـ لبنان.

٢٣. لسان العرب: الإمام ابن منظور، دار الحديث ـ القاهرة ١٤٢٣هـ .

٢٤. مختار الصحاح: محمد بن أبي بكر عبد القادر الرازي، دار الرسالةـ الكويت.

٢٥. معاني النحو: د. فاضل صالح السامرائي، دار الفكر الأردن ـ عمان الطبعة الثانية، ٢٠٠٣م.

٢٦. المعجم الوسيط: إبراهيم مصطفى ـ أحمد الزيات ـ حامد بن عبد القادر ـ محمد النجار ـ مجمع اللغة العربية دار الدعوة لاط ـ لات.

٢٧. المقتضب: المبرد، محمد بن يزيد، دار الكتب العلمية ـ بيروت ـ لبنان.

٢٨. المفتاح في الصرف: أبوبكر عبدالقاهر بن عبد الرحمن بن محمد الجرجاني، مؤسسة الرسالة ـ بيروت، لبنان،

٢٩. المقاصد النحوية في شرح شواهد الألفية: محمود بن أحمد العيني مطبوع مع خزانة الأدب ـ دار الصادر لاط ـ لات.

٣٠. المقتصد في شرح الإيضاح عبد القاهر الجرجاني، دار الكتب العلمية ـ بيروت ـ لبنان.

٣١. النحو الوافي: عباس حسن، مكتبة المحمدي ـ بيروت ـ لبنان، الطبعة الأولى، ١٤٢٨ـ ٢٠٠٧م.



ئەم کتێبە:

**یەکەم:** بە شێوەیەکی زانستی ورد نووسراوە، هەردوو مامۆستای بڕوانامەبەخش: بەڕێز **دکتۆر مادح بەرزێوەیی**-ئەندامی لیژنەی ئەنجومەنی زانستی لە وەزارەتی ئەوقاف-و ڕێزدار: **پرۆفیسۆر د.جمیل سورچی**-ڕاگری کۆلێژی زانستە ئیسلامییەکان-پێداچوونەوەیان بۆ کردووە و پەسندنامەیان لەسەر نووسیووە.

**دووەم:** تەواوی «مَتن» و شەرحی ئەم کتێبە لەگەڵ پێنج نوسخەی کۆن و نوێ بەراورد کراوە بەمەبەستی ساغکردنەوەی هێندێک ڕستە و ڕاستکردنەوەی هێندێک وشە کە لە هێندێک نوسخە بە هەڵە نووسراون.

**سێیەم:** تەواوی «مَتْن» و شەرحی ئەم کتێبە بە شێوەیەکی درووست «إعراب»دار کراوە، ئەمەش کارئاسانییەکی زۆر دروست دەکات بۆ فەقێ و فێرخوازانی زانستە شەرعییەکان.

**چوارەم:** لە دەیان شوێن -بە شێوەیەکی ڕوون- جیاوازی لە نێوان بابەتە هاوشێوەکان کراوە، وەکوو جیاوازی نێوان «اسم الجنس» و «النكرة».

**پێنجەم:** هەموو «قال»ەکان کراون بە وانەیەکی سەربەخۆ و هەموو وانەیەکیش ناونیشانی بابەتەکەی لە سەرەتادا نووسراوە.

نووسەر




